# سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر توركیا و كاریگەرییەكەی لەسەر كوردستان

# (١٩٢٣-١٩٢٦)

**نووسینی**

**بەیار مستەفا سەیفەدین**

**وەرگێڕانی**

**سەرمەد ئەحمەد**



هەولێر - ٢٠١٠



دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكریانی

- **(كتێبی توكیاناسی-١)**
- **سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر توركیا و كاریگەرییەكەی لەسەر كوردستان**
- نووسینی: بەیار مستەفا سەیفەدین
- وەرگێڕانی: سەرمەد ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: وریا بوداغی
- ژمارەی سپاردن: (٨٤)
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- چاپی یەكەم: ٢٠١٠
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)

زنجیرەی كتێب (٥٣١)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

**پێشکەشە بە..**

خێزانە خۆشەویستەکەم، کە زۆر لە بارگرانی وەرگێڕانی ئەم کتێبەی لە کۆڵکردمەوە.

سەرمەد ئەحمەد

# ناساندن

بابــەتی سیاســەتی بــەریتانیا بەرامبــەر تورکیــا، تــەوەرێکی بنــەڕەتی و گرنگــی زنجیرە توێژینەوەکانی بەریتانی تایبەت بە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە مێژووی نـوێ و هاوچـەرخ پێکدێنن، ئەمــەش بــەهۆی ئــەوەی بــەریتانیا لــەدوای جــەنگی دووەمــی جیهــانی ڕۆڵێکــی کاریگەری لە دووبارە دارشتنەوەی سیاسەتی وڵاتانی ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕسـت گێـڕاوە. بـەریتانیا پلانی بۆ فراوانخوازی و دروستکردنی وڵاتــان و قــەوارەی سیاســی تــازە کــە لەســەر پاشمــاوەی دەوڵەتی عوسمانی پێکبهێنرێت، داڕشتووە. تورکیا یەکێك لەو قەوارانە نەبووە، بەڵام داڕمــانی دارامــاتیکی دەوڵــەتی عوسمــانی و داگیرکردنــی ئــەنادۆل لەلایــەن هاوپەیمانانــەوە، هــەروەها سەرکەوتنی مستەفا کەمال لە جەنگی سەربەخۆیی، هــەموو ئەمانــە وایکــرد دەوڵــەتی تــازە پێگەیــشتوو بــەناوی "تورکیــا" وە دەربکــەوێت، ســەرانی ئــەو دەوڵــەتش بــە تورکــانی نــوێ بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمالەوە ناونران.

ئەو بۆیەرە نوێیە، لەپاڵ فاکتەری گرنگی دیکە وەك ســەرکەوتنی ئــەزموونی ســۆڤێتی لــە روسیا_ تەنها بۆ نمونە_ پاڵیان بە بەریتانیاوە نا چاو بــە سیاســەتەکانی لەبەرامبــەر تورکیــا بخشێنێتەوە، ئەویش لەسەر بنەمای نزکبوونەوە نەوەك دوورکەوتنەوە، لە کەشێکی دیپلۆماسی و تێکگەیشتنی هاوبەش کە لە کۆنگرەی لۆزان بە سەرکەوتنی گــەورەی دیپلۆماســی تورکــان، هەژمارکرا. ئەوەی هانی بەریتانیای دا کە زۆر لە تورکیا نزیك ببێتەوە ئەوە کە تورکیا لــە زۆر ڕێگەوە رایگەیاندبووکە لە چوارچێوە ڕۆهەڵاتییە ئیسلامییەکەی دەردەچێت و بەگەرمی بــەرەو ڕۆژئاواییبوون و سکولاریزم و مۆدێرنە و نوێخوازی ئەوروپی دەچێت.

بەڵام هاوکێشە سیاسیە تازەکە کە بەریتانیا بەرامبــەر کۆمــاری تورکیــای گرتەبــەر، وایکــرد یەکێك لە پێکهاتە سەرەکیەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵات لەبەین بــەرێت، کەمەبەســتمان کــوردە، ئــەو هاوکێشەیە لەسەر حسابی مافە سروشتیەکانی گەلی کوردە و هیواکانی دامەزرانــدنی قەوارەیــەکی سیاسی نەتەوەیی کوردی بەناوی (کوردستان)ەوە، هات. ئەو دەوڵەتە کوردییەش هەر لە بنەماوە لە چوارچێوەی ئەو وڵات و قەوارانە هات کە بەریتانیا لە کۆتــایی جەنگەکــە پلانــی پێکهێنــانی بــۆ دارشتبوون، بەمەش فاکتەرێکی سەرەکی بۆ هەڕەشــەکانی بــەردەم سیاســەتی



تورکی، ئەو سیاسەتەی کە لەسەر بنەمای هەوڵدانی بەردەوام بۆ سـڕینەوەی ناسـنامەی نەتــەوەیی گەلی کورد و تواندنەوەی کورد لە بۆتەی دەوڵەتی نەتەوەیی تورکی دامەزرابوو.

گومانی تێدا نیە، خۆدان لە قەرەی بابەت و توێژینەوەیەك کــە تایبــەت بێـت بــە سیاســەتی وڵاتانی زلهێز بەرامبەر وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێویستی بە پایەی تایبەتی خۆی هەیــە، ـــ سوپاس بۆ خودا ـ ئەو پایانەش تارادەیەکی زۆر لــە توێــژەری ئــەکادیمی دکتــۆر بــەیار مــستەفا سەیفەدیندا هەیە، ئەو بابەتە کە لە بنــەمادا تێزێکــی ماســتەرە بــەناوی ( سیاســەتی بــەریتانی بەرامبەر تورکیا و کاریگەرییەکەی لە کوردستان ١٩٢٣-١٩٢٦ )، توێــژەر مانــدوو نەناســانە و بابەتیانە و راستگۆیانە کاری بۆ شیکردنەوەی رەوشی ئەوسا کردووە و بیروڕاو دیــدە جیاوازەکــانی بەدەرخستووە و خۆی پابەندنی میتۆدی زانستی کردووە، بەرگەی ناخۆشییەکانی ســەفەرکردن بــۆ کتێبخانەکانی بەغدا و موسڵ و ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵی گرتووە، هــەموو ئەومانەشــی لــەپیناوی گەشتن بە زانست و فێربوون دەستگرتن بە بەرپرسیــارێتی ئــەکادیمی بــووە، توێــژەر لــە نووسـینی نامەی ماستەرەکەدا سەرکەوتوو بووەو پلەی (نایاب)ی بەدەستهێناوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کــە پابەندی مێتۆد و بابەتیبوون و شیکردنەوەی وردی رووداوە مێژووییە بەیەکەوە گریدراوەمان بووە، پــشتی بــە بابــەت و سەرچــاوە و ژێــدەری هەمــەجۆر بەســتووە، کــە هەنــدێکیان بۆیەکــەمجارە بەکاردەهێنرێن، ئەمەش هاندەرێکی گەورە بوو، بۆ تویژەر کە لە کاروانی ئەکادیمی خۆی بەردەوام بێت و نامەی دکتۆراکەی بەناوی ( پرسی کورد لە پەیوەندیەکانی ئــەمریکا ـــ تورکــای ١٩٩١ـــ ١٩٩٩) پێشەکش بکات، واتا زیاتر لە هەمان پــسپۆرێتی قوڵبــووەوە، مەبەســتمان پەیوەندییــە نێودەوڵەتیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەت لەگەڵ تورکیا، ئەمەش هانی ژمارەیەك قوتــابی خوێندنی باڵا لە مێژوو لە زانکۆی دهۆکی دا ، کە توێژەر خۆشی ئەندامی دەستەی مامۆستایانی کۆلیژی ئادابی هەمان زانکۆیە، کە هەمان هەنگاو بــۆ تویژینــەوەی پەیوەندییــە نیودەولەتیــەکان بەتایبەت پەیوەندییەکانی وڵاتانی زلهێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست وەك عــیراق و ئێــران و تورکیــا، بنێن. بەوهیوایەی کە ئەو کەلێنەی کە کتێبخانەکان لە عێراق بەگشتی و لە هــەرێمی کوردســتان بەتایبەت، هەیە، پڕ بکاتەوە.

**د. سەعاد حەسەن جەواد**
**زانکۆی دهۆك/ کۆلیژی ئەدەبیات**
**٢٠١٠/٩/٩**

# پێشەکی

لە سەروبەندی کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانیدا، سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر تورکیا بەتایبەتی و ڕۆژهەڵاتی ناوین بە گشتی، وایکرد دووبارە نەخشەی سیاسی سەرجەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکێشرێتەوە، بەرژەوەندییەکانی وایکرد چەند قەوارەو دەوڵەتی سیاسی لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی دۆڕاو لە ناوچەکە دابمەزرێنێ وەك عێراق و ئوردن....سەرباری قەوارەیەك بە ناوی کوردستانیش، بەڵام پەیدابوونی بزووتنەوەی کەمالی لە تورکیا و دەرکەوتنی رووسیای سۆڤێتی پلانەکانی بەریتانیای لە ناوچەکە شێواند، ئەمەش پاڵی پێوەنا دووبارە چاو بە پلان و حسابەکانی بخشێنێتەوەو بە قوربانیکردنی کوردستانیش لای بەریتانیا گرنگییەکی زۆری نەبوو، چونکە ئەمە بەرژەوەندییەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هیندستان دەپاراست و پەیوەندییە باشەکانی بە رژێمی نوێی کەمالی لە تورکیا بۆ سەردەمی پێشوو دەگەڕاندەوە، سەرباری پارێزگاریکردنیش لە ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور).

کۆمەڵێ فاکتەر کۆبوونەوە بۆ هەڵبژاردنی بیرۆکەی (سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر تورکیا و کاریگەرییەکەی لەسەر باشووری کوردستان١٩٢٣-١٩٢٦) تا ببێتە بابەتی ئەو توێژینەوەیە، سەرباری گۆدەنگییە بێ هاوتاکەی بابەتەکە و ناسینی ئەو بنەمایانەی کە سیاسەتی هەریەکە لە بەریتانیا و تورکیای لەسەر دامەزراوە، هەروەها ئەو بارودۆخەی، کە وایکرد نەخشەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆی کوردی تێدا نەبێت، بەڵام کەمی توێژینەوەی مێژوویی تایبەت بەم بابەتە لە زانکۆکانی کوردستان و عێراق و کەمییەکی بەرچاو لە پەرتوکخانەکان لە پاڵنەرە گرنگەکانی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بوون، لە پاڵ ئەمە ئەو ڕۆڵەی کە تورکیا کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت دەیگێڕێت لە ڕێگریکردن لە هەر ئاراستەیەك کە بە ئامانجی چارەسەری ریشەیی کێشەی کوردی دەدرێت، ئەمە وای لە توێژەرانی کورد کردووە کە بەرپەرچدانەوەی ئەو جۆرە بابەتانە پێویست بێت، بۆ ئەوەی بواری ئەوەیان هەبێت زیاتر لە سیاسەتی تورکیا و هێزە نێودەوڵەتییەکانی دیکە بگەن، کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاریگەرە.



توێژینەوەکە جەختی لەسەر بەدوایەکداهاتنی پەرەسەندنەکانی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر تورکیای کردۆتەوە، هەر لە سەروبەندی گرێدانی کۆنگرەی لۆزان(١٩٢٢-١٩٢٣) و کۆتاییهاتنی بە پەیماننامەی سێ قۆڵی(عێراقی-تورکی — بەریتانی) لە ١٩٢٦. چوارچێوەی گشتی تێزەکە بۆ توێژینەوە لە گۆڕانکاریانەی کە بەسەر هەڵوێستی بەریتانیا بەرامبەر تورکیاداهاتووە ئاراستەکراوە، لەگەڵ جەختکردن لەسەر کاریگەرییەکانی ئەو گۆڕانکاریانە لەسەر چارەنووسی باکووری کوردستان. بۆ ئەوەی وێنەکە تەواو بێتە بەرچاو، ڕەنگدانەوەی ململانێی تورکی- بەریتانی لەسەر کێشەی کوردی بە گشتی تێبینیکراوە، بەتایبەتی تەوەری گفتوگۆکانی سیاسەتمەدارانی بەریتانی لەگەڵ بەرپرسانی تورك و ناکۆکییەکانیان لەبارەی کێشەی کوردەوە بووە، کورد ببووە فاکتەری کێشمەکێشی نێوان هەردوو لا.

ئەم تێزە لە پێشەکییەك و پێنج بەش پێکهاتووە لەگەڵ کۆتاییەك کە گرنگترین دەرئەنجامەکانی کە ئەم تێزە پێی گەیشتووە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو زانیاری و راستیانەی کە لەبەردەستدان، هەروەها کۆمەڵێ پاشکۆ و نەخشەی پێویست. لە بەشی یەکەمدا تیشك خراوەتە سەر ئەو پەرەسەندنانەی کە هەردوو پرسی تورکی و کوردی لە ماوەی نێوان(١٩١٩-١٩٢٢) بە خۆیانەوە بینیوە و ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر هەڵوێستی بەریتانیادا هاتووە لەبەرامبەر هەردوولادا. ئەمەش پاشخانێکی مێژوویی بۆ تێزەکە پێکهێناوە، هەروەها ئەو قۆناغە دووبارە نەخشە کێشانەوەی ناوچەکەی بەخۆیەوە بینی دوای ئەوەی پڕۆژەی (کوردستان و ئەرمینیای سەربەخۆ) بەهۆی دەرکەوتنی بزووتنەوەی کەمالی لەباربران، سەرباری ئەوەی ئەمە بووە ئەو بنەمایەی کە پەیوەندییەکانی بەریتانیا لەگەڵ تورکیا لەسەر بونیاد نرا. ئەو بەشە بەهۆی ئەوەی کە لە توێژینەوەی دیکەدا بابەتی ئەو ماوەیەیان باسکردووە، بە کورتی هاتووە*.

هەرچی بەشی دووەمە کە رووماڵی قۆناغەکانی گرێدانی کۆنگرەی لۆزانی کردووە، باسی لەو فاکتەرانە کردووە، کە پاڵی بە بەریتانیا و هاوپەیمانان لەلایەك و تورکەکان لەلایەکی دیکەوە نا بۆ دووبارە داڕشتنەوەی پەیمانی سیڤەر و گرێدانی کۆنگرەیەکی نوێ لە لۆزان، ئەو

* بۆ نموونە سەیری: م.س لازارێف، المسألة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ترجمة عبدي حاجي، بيروت، ١٩٩٨؛ هەروەها سەیری: آلاء حمزة الفتلاوي، السياسة البريطانية تجاه تركيا ١٩١٩-١٩٢٣، رسالَة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الآداب، جامعة بغداد، ٢٠٠٠؛ هەروەها سەیری: سحر عباس خضير، سياسة الولايات المتحدة تجاه تركيا ١٩١٧-١٩٢٣، أطروحة دكتوراه مقدمة إلى مجلس كلية الآداب، جامعة بغداد، ٢٠٠٢ بکە.

گۆنگرەیە لەسەر بنەمای هاوسەنگی هێزی نوێ گرێدرا، بەوەی کە کەمالییەکان تورکیایان وەك دەوڵەتێکی یەکگرتووی نوێ جاڕدا، ئەمەش دوای سەرکەوتنە گەورەکانی بەسەر هاوپەیمانان و بە دەرکردنی یۆنانییەکان بە یەکجارەکی لە خاکی تورکیا بە مۆرکردنی ئاگربەستی (مۆدانیا) پاداشتکرا. جەخت لەسەر گرنگترین قۆناغەکانی کۆنگرەکە و ئەو دەستکەوتە سیاسییە گەورانەی، کە تورکەکان لەسەر حسابی باکووری کوردستان لەم کۆنگرە بەدەستیان هێنا کراوەتەوە. لێرەوە پێویستی دەکرد لەسەر کارکردەکانی ئەو پەیمانە لەسەر کورد بوەستین، چونکە ئەو بەندانەی لە پەیمانی سیڤەر تایبەت بوون بە کورد، رەشکردەوە، ئەوکاتە پڕۆژەی ((کوردستانی سەربەخۆ)) لە لێدوانەکانی سیاسەتمەدارانی بەریتانی بەرەبەرە بزردەبوو.

لە بەشی سێیەم، لەژێر رۆشنایی کێشەی ویلایەتی موسڵ باس لە پەیوەندییەکانی بەریتانی- تورکی کراوە. سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر تورکیا تا رادەیەکی زۆر بە پەرەسەندنەکانی ئەم کێشەوە کاریگەر بووە، لە سایەی سووربوون و بانگەشەو داواکارییەکانیان بۆ ویلایەتەکە و دەستی هەڵنەگرتنی بەریتانییەکان هەمدیسان پێوەی، ئەمە وایکرد دانووستاندنەکانیان لە بازنەیەکی بۆشدا دەسوڕایەوە، ئەمەش پاڵی بە بەریتانییەکان نا بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی سیاسیان کۆمەڵەی نەتەوەکان بەشداری پێ بکەن، هەرچەندە تورکییە بەتوندی ئەم ئاڕاستەیەی رەتکردەوە و کە رازی نەدبوو لایەنی سێیەم لەسەر ویلایەتی موسڵ بێتە ناو ململانێکەوە. کۆمەڵەی نەتەوەکانیش بە رۆڵی خۆی بە یەکلاییکردنەوەی ململانێکە بۆ بەرژەوەندی خۆی بەریتانییەکانی بێ هیوا نەکرد. هەروەها لەم بەشەدا هەوڵە سەربازییەکانی تورکیا بۆ بڕینی سنووری ویلایەتەکە و رێوشوێنە بەریتانییە دژەکانیش بە ئامانجی کاریگەر نواندن لەسەر بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان خراوەتەڕوو.

هەرچی بەشی چوارەمە، ئەوا رووبەڕووی توێژینەوەی ئەو بۆیەرانە بۆتەوە، کە وای لە هەردوولاکە(بەریتانی- تورکی) کردووە، کە کار بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی کۆتایی بۆ کێشەی موسڵ بکەن، کە ببووە تاکە رێگری بەردەم ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانیان. هەروەها لەم بەشدا دانووستاندنەکانی بەریتانی- تورکی خراوەتەڕوو، کە لە سەروبەندی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ١٦ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ دەستی پێکردووە و تا حوزێرانی ١٩٢٦ خایەندووە، بە واژووکردن لەسەر پەیماننامەی (عێراقی — بەریتانی — تورکی) کۆتایی هات.

بەشی پێنجەم باس لە کاریگەری سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر تورکیا لە باکووری کوردستان بە تایبەتی و کێشەی کوردی بە گشتی دەکات، هەر لە واژووکردن لەسەر



پەیمانی لۆزانەوە تا گرێدانی پەیماننامە سێ قۆڵییەکە. بەریتانیا دوای واژووکردنی پەیمانی یەکەم بە کردەوە دەستبەرداری بیرۆکەی دامەزراندنی قەوارەی کوردی لە باکووری کوردستان بوو، هەرچەندە خۆی پابەندی دابینکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان لە ویلایەتی کێشە لەسەر کرد، بەڵام ئەم پابەندیە — ئەگەرچی بەریتانیا لە زیاتر لە جارێك و لە زۆر لێدوان دەریبڕیووە- جگە لە بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستێك، کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی دەکرد، هیچی دیکەی لەدواوە نەبوو، لە بەدەستهێنانی دۆستایەتی کورد (کە زۆربەی دانیشتووانی ویلایەتەکە کوردبوون) تا بێلایەن کردنیان و هەوڵە دووبارە ببووەوەکانی بۆ هەڕەشەکردن لە تورکەکان بە بەردەوام ئاماژەدان بۆ بەکارهێنا نی کارتی کوردی کۆتایی هات. هەروەها لەم بەشدا بانگەشەکانی تورکی سەبارەت بە هەبوونی رۆڵی بەریتانی لە راپەڕینی کوردیساڵی ١٩٢٥ گفتوگۆ کراوە، سەرباری بەرووخستنی پێگە و مەودای کاریگەری کورد لەسەر ئەو دانووستاندنانەی کە بەر لە واژووکردنی پەیمانە سێ قۆڵییەکە کران و کاریگەری پەیمانەکە و هەڵکەوتە قورسەکەی لەسەر پێگە و داهاتووی سیاسی کوردان بەیانکراوە.

لە توێژینەوەی بابەتەکە سەختی زۆری دەورەیداوە، لە نێوانیاندا نەبوونی سەرچاوە و بەڵگەنامەی تایبەت لە پەرتووکخانەکانی هەرێم و سەختی دەستکەوتنیان لە پەرتووکخانەکانی سەر بە زانکۆکانی بەغدا و زانکۆی موسڵ، هەروەها زۆربەی سەرچاوەی نامە نووسراوەکان بە زمانی بیانین لە زمانی ئینگلیزی و تورکی و لە شوێنی تایبەتی و گشتیدا دابەشبوونە، ئەمەش کات و ماندوبوونیکی زیاتری دەویت تا دەست دەکەون و وەردەگێڕدرێن. سەرباری ئەمەش ئەو پەرەسەندن و رووداوە گەورانەی کە عێراق پێیدا تێپەڕیووە، لە ماندووبوونی قوتابی خوێندنی باڵای زیاد کردووە، بۆ ئەمە ئاماژە بە سوتانی زۆربەی کتێبخانە گشتیەکان و خانەی کتێب و بەڵگەنامەکان و سەنتەرە رۆشنبیریەکان ناکەم.

خوێندکار سەختی دیکە زۆر دەبینێ، جیایی و تێك ئاڵاوی داتاکان و بیروڕاکان و زۆری رووداوەکان و بەیەکداهاتنیان لەو ماوەیەی کە توێژینەوەکە دیاریکردووە، ئەرکی خوێندکاری تا ڕادەیەکی زۆر ئاڵۆزکردووە، کارێکی ئاسان نەبووە کە هەڵسوکەوت لەگەڵ راکانی بەرپرسانی بەریتانی بەو وەسفەی باسکراوە بکرێت بەتایبەتی بەرامبەر پرسی کورد. هەروەها ئەمە حاڵی مامەڵەکردن لەگەڵ رووداوە زۆر و بەیەکداهاتووەکانیشە، نەدەکرا ئەو پەرەسەندنانەی کە

باکووری کوردستان بە خۆیەوە بینی لەوەی کە لە دەستە خوشکەکەی لە باشووری کوردستان روویەدات جیا بکەینەوە.

هەولّدراوە، کە زانیارە رەسەنەکان بەختی باشتریان لە تێزەکە بەر بکەوێت، بۆیە جەخت لەسەر بەڵگەنامەکانی کاروباری دەرەوە Documents on British Foreign Policy بکرێتەوە کە لە ساڵی ١٩١٩ – ١٩٣٩، بڵاوکراوەتەوە، دانەیەکی لە کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی بەغدا پارێزراوە. ئەو زانیاریانەی تێیدا هاتوون، دوای بەراورد و وردبوونەوە یارمەتی لە نووسین و دەوڵەمەندکردنی بەشەکانی تێزەکە بەبێ دیاریکردن داوە. هەروەها بەڵگەنامەکانی بەریتانی لەبارەی پرسی کوردی لە تورکیا ١٩٢٤-١٩٣٧، Ingliz Belgelerile Turkey'de Kurt Sorunu 1924-1938))، کە................١٩٢٥. فایلەکانی خانەی پەرتووک و بەڵگەنامەکانی عێراقی یارمەتی روونکردنەوەی چەند لایەنێکی دیاریکراوی ناو هەردوو بەشەکانی سێیەم پێنجەمی داوە. راپۆرت لەبارەی کێشەی سنووری عێراق – تورکیا League of Nations, Question of the frontier Between Turkey and Iraq, Report submitted to the Council by the Commission instituted by the Resolution of September 30th, 1924، کە کۆمەڵەی نەتەوەکان ئامادەی کردبوو هەروەها راپۆرتەکانی دەسەڵاتی بەریتانی لەبارەی ئیدارە لە عێراق لەماوەی ساڵانی١٩٢٠-١٩٢٥ Colonial Office, Iraq Report on Iraq Administration... و راپۆرتی تایبەت ١٩٢٠-١٩٣١ کە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان و چاپەمەنییە فەرمییەکانی هەردوو حکوومەتی بەریتانی و تورکی وەك British Documents on Atatürk1919-1938 " و"(Musul-Kerkuk ile iligili Arşiv Belgeleri)1525-1919" و " Colonial Office,Lausanne Conference on Near Eastern Affairs 1922-1923" ئەوانە زانیاری بە بەهای تێدابوون کە بۆ بابەتەکە لە زۆر لایەنەوە بەکەڵك بوو.

سەرباری گرنگی بێ هاوتای کە ئەو گروپەی لەسەرەوە باسکران و ئەو وردییەی کە لە وردەکاری رووداوەکان هەیانە، بەڵام هێشتا بە دیدێکی تاك لایەنە دەمێنێتەوە، چونکە بەریتانیا تێیدا نوێنەرایەتی تێروانینیکی توندڕەو دەکات لەبەرامبەر تورکەکان بەتایبەتی لە بەشەکانی یەکەم و دووەم کە لەبارەی پرسی کوردەوە زۆر تێکەڵاوی نا رۆشنی تێدایە، بەڵام سەبارەت بە تورکیا، ئەوا زۆربەی جار زیادەڕۆی لە دوژمنداری بۆ بەریتانییەکان کردووە و لە روانگەیەکی تەسك کە تەنها خزمەتی ئامانج و بەرژەوەندییە بکات بەو شێوەیە مامەڵەی



لەگەڵ بەڵگەنامەکانی تایبەت بە پرسی کورد کردووە. هەروەها هەندێجار زۆر زیادەڕۆیی لە مەزەندەکانی سەبارەت بە رووداوە پەیوەندیدارەکانی بە پرسی کوردەوە دەکرد بە تایبەتی سەبارەت بە راپەڕینی کوردی ساڵی ١٩٢٥.

کتێبەکانی هەمەجۆر زمانەکان کۆڵگەی بابەتەکە پێکدێنن و نووسینی توێژەرانی تورك بەشدارییەکی جیاواز لە سەرچاوەکانی بابەتەکە رۆڵ دەگێڕن، جا چ ئەوانەی بە زمانی ئینگلیزی نووسراون وەك نووسینەکانی M.K.Oke: Chronology of Mosul Question 1918-1926 و The Armenian Question 1914-1923 و نووسینی S.R.Sonyle: Turkish Diplomacy 1918-1923، یان ئەوانەی بە زمانی تورکی نووسراون وەك نووسینی Mehmet Gonlűből:Olaylarla Turk Dis Politikasi، و نووسینی Ismail GÜldas: Lozan Biz Turkler ve Kurtler. نووسینی نووسەرانی رۆژئاوایی وەك H.N.Howard و L.Evans و R.Olson و David McDowall رۆڵیکی گرنگیان لە روونکردنەوەی شتە شاراوەکانی بینی و زانیارییەکانیان پڕ بوون لە راڤەی زانستی، لەبەرئەوەی مۆرکێکی ئەکادیمی و دۆکیۆمینیتی پیوەدیار بووە. هەوروەها سەبارەت بەو نووسینانەی کە بۆ زمانی عەرەبی وەرگێردرابوون وەك نووسینی هینری فۆستەر: دامەزراندنی عێراقی نوی،نووسینی منچاشفیلی: عێراق لە ساڵانی ئینتیدابی بەریتانی.

لە چوارچێوەی شیکردنەوەی سەرچاوەکانی بابەتەکەدا، دەبوو ئاماژە بە نووسینی هەندێ سیاسەتمەداری بەریتانی بکەین لەوانەی کە پۆستی هەستیاریان لەو قۆناغەدا وەرگرتووە، وەك نووسینی Arnold J.Toynbee:The Islamic World, Survey of International Affairs 1925, Vol.I و نووسینی Arnold T. Wilson: Clash of Loyalties Mesopotamia, 1917-1920 و نووسینی ادموندز: کورد و تورك و عەرەب....و خاتوو بێڵ لە کتێبی: چەند بەشێك لە مێژووی نزیکی عێراق و کتێبی لۆنکریك: عێراقی هاوچەرغ لە ساڵی ١٩٠٠ تا ١٩٥٠ ....، کە زانیاری زۆری تێدابوو، هەرچەندە هەندێجار بیروڕای حکوومەتی دەردەبڕی یا سۆز بەسەریدا زاڵ بووە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە پێگەی کتێبە عەرەبییەکانی وەك نووسینەکانی محەمد عەززە دروزە و مستەفا ئەلزەین و سەبیح عبدالقادر (ئەفسەری پێشووی سوپای تورکی) و ئەحمەد نوری ئەلنەعیمی و مستەفا حلمی بکەین، هەرچەندە ناوەرۆکەکانیان پڕ زانیارین،

بەڵام لەو لایەنەوەی کە پەیوەندی بە بابەتی توێژینەوەکەمان هەیە، سۆزاوین. نووسینەکانی دیکە و توێژینەوە ئەکادیمیەکان روڵییان لە چەسپاندنی زۆرێك لەو راستیانەی لێرە هاتوون هەبووە.

نامە و تێزە زانکۆییەکان، ئەوانەی تایبەتن بە مێژوو و پەیوەندییەکانی تورکیا لە نیو سەرچاوەکاندا پانتاییەکی دیاریکراوی تایبەتی داگیرکردووە، تێزی دکتۆرای قاسم خەلەف عاسی ئەلجومەیلی (عێراق و بزاڤی کەمالی١٩١٩-١٩٢٣) کە بە ئاستە زانستی و پڕ زانیاری و قوڵی شیکردنەوەکانی دەناسرێتەوە.

لێرەدا پێویستە جارێکی دیکە ئاماژە بەو رەوشە سیاسییە بدەین کە عێراق پێیدا گوزەری کردووە لە حاڵەتی پەشێوی و نائارامی کە لەسەر زۆربەی ژیانی رۆژانە رەنگی داوەتەوە، وای لێکردووین کار بەوە بکەین کە هەیە و کار بەوانەی دەستمان کەوتووە بکەین، بۆیە کەمی لە هەندێ سەرچاوە بۆ چارەسەری چەند خاڵێکی دیاریکراو هەر بە شتێکی هەراسانکەر مایەوە. بۆ نموونە سەرباری هەوڵی زۆر بۆ چنگ کەوتنی رۆژنامەی ئینگلیزی و عەرەبی و عێراقی کە بێ گومان لە دەولەمەندکردنی بابەتەکە بە زانیاری زۆر و هەمەچەشن بەشداری دەکرد، بەڵام خوێندکار لەم هەوڵەی سەرکەوتوو نەبووە، بۆیە لەم هەوڵەی ئێستا ئامانجمان بووە چەندی لە توانادا بێت لەم رەوشە پێشکەش بکرێت.

**بەیار مستەفا**

# بەریتانیا و پەرەسەندنی کێشەی تورکی (١٩١٨-١٩٢٢)

ئەو دۆڕانە توندانەی کە لە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانی تووشی دەوڵەتی عوسمانی بوو بەتایبەتی لە بەرەی عێراق و شام[1]، حکوومەتی ئیتیحادییەکانی ناچارکرد دەست لەکاربکێشێتەوە و ژمارەیەك لەسەرانی لە پێشەوەیان ئەنوەر و تەلعەت و جەمال بۆ دەرەوەی وڵات رایان کرد. لە ١٤ تشرینی یەکەمی ١٩١٨ حکوومەتێکی تازە بە سەرۆکایەتی ئەحمەد عزەت پاشا دامەزرا. ئەو حکوومەتە لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨ لەسەر مەرجەکانی شەڕ وەستانی مۆدرۆس رازی بوو[2].

بەریتانیا بە راوێژ لەگەڵ هاوپەیمانان مەرجەکانی شەڕ راگرتنی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دارشت[3]، بەڵام رێگەی بە هەریەکە لە فەرەنسا و ئەمریکا نەدا، راستەوخۆ دەستی تێوەر بدەن[4]، ئەمەش بە گوێرەی ئەو دیدگایەی کە بەریتانیا تاکە وڵاتێکە گەورەترین زیانی ماددی و مرۆیی لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی لێکەوتووە، بەریتانیا هێز و بنکەی لە ناوچەکە هەبوو، هەروەها دەسەڵاتی کردارەکی لە ئاوە هەرێمایەتییەکانی عوسمانی دوای شەڕ راگرتنەکە بۆ کەشتیگەلی بەریتانی بوو[5].

---

١- بۆ وردەکاری زیاتر سەیری: آ. روي لئونە رد، مختصر حرب عموي تاريخي، مترجمي كليسلي: حجاز فخري، استانبول، ١٩٢٥م، ل ل٣٢-٣٣؛ عمر الديراوي، الحرب العالمية الاولى، ط٥، بيروت، ١٩٧٧، ل ل٤٦٥-٤٦٩.

2- Bernard Lewis, Emergence of Modern Turkey, Second Edition, Great Britain, 1968, P.239.

3- J.C. Hurewitz, Diplomacy in the Near and Middle East 1914-1956, New York,1972, Vol.II,PP.36-37;Paul C.Helmriech, From Paris to Sevres, U.S.A,1974, PP.341-342.

٤- مدام جوليس، الوطنية العثمانية، ترجمة احمد رفعت، القاهرة، د.ت، ل ١٣.

٥- كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبدالكريم، ط٢، بغداد، ١٩٨٤، ل ٣٢٤.



ئەو شەڕراگرتنە بە ٢٥ ماددەکەیەوە بۆ تورکەکان قورس بوو، دوای ئەوەی کە بەریتانیا و هاوپەیمانان چاوتێبڕینیان لە موڵکەکانی عوسمانی بەدیهێنا، دەوڵەتی عوسمانی لەناوبرد[1]. بە گوێرەی ئەو بەندانە هێزەکانی هاوپەیمانان چەند پێگەیەکی جۆراوجۆری گرنگی وڵاتیان داگیرکردبوو، بە ئەستەمبۆڵی پایتەختیشەوە، کە هێزەکانی بەریتانی تێدا جێگیرکرابوو[2]. هەرچەندە وڵاتانی هاوپەیمانان دەستیان بە پێشبڕکێ کرد بۆ ئەوەی بەشی خۆیان لە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری وەربگرن، بەڵام بەریتانیا لەرێگەی هەوڵەکانی لەو گۆنگرانەی کە لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمان دەیبەستا بەشی گەورەی بەرژەوەندییەکانی زامنکرد، بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی سیاسەتەکانی دیاری دەکرد.

لە ١٨ ی کانوونی دووەمی ١٩١٩، بە رێککەوتنی لایەنە دیارەکان((کۆنگرەی ئاشتی)) لە پاریس کرایەوە[3]، هەموو چاوەکان لەسەر ئەم کۆنگرەیە بوو، چونکە تێیدا نەخشەی نوێی جیهان دەکێشرێتەوە و چارەنووسی گەلان دیاری دەکات[4]. ئاسایی بوو کە چارەنووسی دەوڵەتی عوسمانی تێیدا بخریتەڕوو، یا ئەوەی کە لە کۆنگرەکەدا پێی دەگوترا ((پرسی تورکی)) لە بەندی پینجەمی کارەکانی کۆنگرە هاتبوو. ئەو پرسە لە ناوەڕۆکەوە گرنگی و کاریگەری جیهانی وروژاند. ئەو گۆنگرەیە جگە لەوەی کە تەنها هەوڵێك بوو لەلایەن سیاستمەداران بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ پرسی لە مێژینەی رۆژهەڵات هیچی دیکە نەبوو[5]. ئەو پرسەی کە چەندین جاروبار نەوەك تەنها بە رێگری بەردەم ئاشتی جیهانی دادەنرا، بەڵکو بەو فتیلە دادەنرا کە کێشمەکشی ترسناك و ململانێی گەورەی نێوان وڵاتانی گەورەی ئەورووپی دادەگیرساند[6]. هەروەها کۆنگرەی پاریس کێشەیەکی گرنگ و ئاڵۆزی وەك کێشەی تورکیا رووبەڕوو نەبووەوە، ئەمەش لە زاری سەرۆك وەزیرانی بەریتانی لوید جۆرج جەختی لێکراوەوە کاتێ گوتی:

---

1- J.C.Hurewitz,Op.Cit., PP.36-37.

2- Stanford.J.Shaw and Ezel K. Shaw,History of the Ottoman Empire and Modern Turkey,Vol. Π,Six Edition,Great Britain,1988,PP.328-329.

3- Paul C.Helmriech,Op.Cit.,P.3.

4- H.W.V.Temperley,AHistory of the Peace Conference of Paris, Oxford, 1969, Vol.I,P.145.

٥- انهت معاهدة كوجك –كينارجة(٢١ تموز ١٧٧٤) الحرب الرووسية العثمانية التي بدأت في ١٧٦٨.

6- Harry N.Howard,The Partition of Turkey 1913-1923, New York, 1966, P.217 .

"سەبارەت بە یەکلاییکردنەوەی تورکیا، ئەوا زۆرترین سەختیمان بینی کە لە هیچ وڵاتێکی نەیاری دیکەمان نەبینی"[1].

شاندی وڵاتانی بەشداربووی جەنگەکە بەرەو پاریس چوون، بە مەبەستی بەدەستهێنانی زۆرترین سوود لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی و میراتە دەوڵەمەندەکەی، ئەو شاندانە بۆ ئەم مەبەستە پلان و نەخشەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، سەرباری لێدوانە ئاشکراکانی بەریتانیا سەبارەت بەوەی کە ناخوازیت سووکایەتی بە مافی تورکەکان لە ئەستەمبوڵ بکات، بەڵام لە کۆنگرەکەدا دژی ئەو لێدوانە ئاشکرایانەی وەستا، کاتێ لەسەر دەرکردنی تورکەکان لە بەشی ئەورووپی ئەستەمبوڵ پێداگیری کرد. بەڵکو بەریتانیا بەکردەوە پلانی بۆ ئەوە دادەرشت کە راستەوخۆ و بە تەواوی دەسەڵاتی بەسەر تورکیا دا بسەپێنێ و حکوومەتێکی لۆکاڵی کارتۆنی دابمەزرێنێ و کاروبارەکان بەدەستی خۆی بێت، هەروەها دەیویست ئەنادۆڵ بکات بە نیمچە داگیرگەیەکی سەربەخۆی و دەسەڵاتیشی بەبێ کێبڕکێ بەسەر ویلایەتە عەرەبییەکان هەبێت[2]. لە راستیدا بەریتانیا هەوڵی زۆری دەدا چەندی بکرابووایە لە دەوڵەتی عوسمانی هەڵوەشاوە جنکی بکەوتایە، هەروەها کاری بۆ زامنکردنی هاوسەنگی هێزی نوێ کرد، بەوەی هەرگیز رێگەی بە عوسمانییەکان نەدا بۆ پۆستەکانی جارانیان بگەڕێنەوە[3]. هەریەکە لە فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئەمریکاش[4] بەدوای چاوتێبڕین و پلانەکانیان کەوتن و هەوڵی بەدیهێنانیان دەدا،

---

١- الاء حمزة الفتلاوي، السياسة البريطانية تجاه تركيا ١٩١٩-١٩٢٣، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ٢٠٠٠، ل ٣٦.

2- H.W.V.Temperley ,Op.Cit.,Vol.I,P.14

- سحر عباس خضير، سياسة الولايات المتحدة تجاه تركيا ١٩١٧-١٩٢٣، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية الآداب، جامعة بغداد، ٢٠٠٢، ل ٢٦٠.

٣- برهان الدين ابابكر ياسين، كوردستان في سياسة القوى العظمى ١٩٤١-١٩٤٧، ترجمة: هوراس سوار، كوردستان، ٢٠٠٠، ل ٤٠.

٤- بو وردەکاری زیاتر لە بارەی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە دەوڵەتی عوسمانی سەیری:

-John A.DeNovo ,American Intrest and Policies in the Middle East, U.S.A ,1963 , PP.27-88

- هشام سوادي هاشم السوداني، العلاقات الامريكية العثمانية ١٩٠٨-١٩٢٠ دراسة تاريخية، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية التربية- جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ل ل ١٨٣-٢١٥.



بەڵام بە پلەیەکی کەمتر لە بەریتانیا. بۆیە تەنها ئەمە لەسەر وڵاتانی هاوپەیمانان مایەوە کە بە هاتنی ٣٠ ی کانوونی دووەمی ١٩١٩ رای بگەیەنن کە دەوڵەتی عوسمانی لەسەر نەخشەی سیاسی نەماوە[1]. ئەو دانیشتنانە تایبەتانەی کە چارەنووسی موڵکەکانی عوسمانی گفتوگۆ کرد، بە گەردەلول وەسفکراوە، دەمەقاڵێ لە نێوان وڵاتانی هاپەیمانان زۆربوو، لە کۆتاییدا بیرۆکەی ((ئینتیداب)) بەرجەستەکرا[2]، ئەوەش لە راستیدا جگە لە ئامرازێك بۆ دابەشکردنی وڵاتانی داگیرکراو لە نێوان وڵاتە سەرکەوتووەکان نەبێت هیچی دیکە نەبوو، هەروەك لۆرد کریزن[3] لەبەردەم ئەنجوومەنی لۆردات دانی پیانا[4].

---

1- Harry N.Howard, The Partition …,P.2210

٢- ئینتیداب: سیستەمێکە ژەنەراڵ ئەیان سمتسی سەرۆك وەزیرانی باشووری ئەفریقیا لە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانی دایهێناوە، وڵاتانی سەرکەوتوو جەنگەکە وەك شێوازێکی نوێ بۆ بەرێوەبردنی موستەعمەرات و ئەو موڵکانەی کە لە وڵاتانی دۆڕاوی جەنگەکە وەرگیراون، بەکاریان هێنا، ئەو سیستەمە گەلان بۆ سێ دەستەی(A و B و C) دابەش دەکات، وا دانرا کە ئەو گەلەی کە نەتوانێ خۆی خۆی بەرێوەببات، بۆیە پێویستی بە سەرپەرشتی گەلانی دیکە هەیە، کە لەو پێشکەوتووترە. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی سیستەمی ئینتیداب سەیری:

کمال مظهر احمد، اضواء علی قضايا دولية في الشرق الاوسط، بغداد، ١٩٧٨، ل ٧٣.

هەروەها لە بارەی ئیتیداب و چارەنووسی موڵکەکانی عوسمانی سەیری:

- Paul C.Helmreich,Op.Cit.,PP.26-27.

٣- لۆرد کریزن (١٨٥٩-١٩٢٥): پیاوی دەوڵەتی ئینگلیزی بوو، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٨٠ وەك سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی زانکۆی ئۆکسفۆرد هەڵبژێر درا، دیارکەوت و لە ساڵی ١٨٩٨ وەك نوێنەر لە پەرلەمانی ئینگلیزی وەرگیرا، دواتر بووە جێگری گشتی سکرتێری بەریتانی و جێگری پادشای هیندستان، لەماوەی (١٨٩٥-١٨٩٨) بووە وەزیری دەرەوە و لە ١٩١٦ خۆی لە چەکی ئاسمانی بەریتانی بینیووە و بووە یەکێك لە کۆڵگەکانی دائیرەی جەنگی بەریتانی لە ١٩٢٢ لە حکوومەتەکەی لۆید جۆرج بووە وەزیری دەرەوە و سەرکردایەتی دانووستانەکانی بەریتانیا لەگەڵ تورکان لە لۆزان زۆر بە لیهاتوویی کرد، لە ساڵی ١٩٢٤ بەتەواوی وازی لە سیاسەت هێنا، سەیری:

-Encyclopedia Britannica, Vol.6, PP.900-901; Harold Niclason, Curzon: The last Phase 1922-1925, New York, 1939.

٤- کمال مظهر احمد، کردستان ...، ل ل ٣٢٨-٣٢٩.

هەرچۆنێك بێت، ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەسەڵاتی بە بەریتانیا و ئەمریکا بەخشی بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ئینتیداب بەسەر ئەرمینیا و ئەستەمبۆڵ و تەنگەبەرەکان بکەن[1]، تاکو فەڕەنسا و ئیتاڵیا دووربخەنەوە، هەروەها ئەرمینیا بۆ بەریتانیا ئەوەندە گرنگ نەبوو[2]، چونکە دەرامەتی زۆری نەبوو بۆ وەبەرهێنان[3]، بەڵام سەرۆك ویڵسن[4] دوای رارایەکی زۆر دژایەتی ئەو پڕۆژەیەی کرد، پاساویشی بۆ ئەمە ئەوەبوو کە وڵاتەکەی لە حاڵەتی جەنگدا نییە لەگەڵ تورکیا، پێ دەچێت ویڵسن هەستی بەوە کردبێ بەریتانیا مەبەستییەتی لەگەڵ هاوپەیمانان لە تەنگەبەرەکانیان دووربخاتەوە، رەوشی کریستانەکانی ئەرمینیای خرابووە ئەستۆ، ئەمەش ئەو شتە بوو ئەمریکا حەزی پێ نەدەکرد[5].

لوید جۆرج لە هەمبەر هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت بە بابەتی ئینتیدابکردن بەسەر تەنگەبەرەکان، هەستی بە نائومێدیەکی زۆر کرد، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوەی نەدەگەیاند کە

---

١- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی پرۆژەی ئینتیدابی ئەمریکی بەسەر تورکیا سەیری:

-L.Evans, United State Policy and the Partition of Turkey 1914-1924, Baltimor, The Jonn Hopkins Press, 1965, P.218ff; Harry.N.Howard, The King-Crane Commission An American Inquiry in the Middle East, Beirut,1963,P.170 ff.

٢- بو زانیاری زیاتر لە بارەی ئینتیدابی بەریتانی بەسەر ئەرمینیا دوای جەنگەکە سەیری:

-Akaby Nassibian, Britain and the Armenian Question 1915-1923,New York ,1985,P.120 ff.

٣- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٧.

٤- ۆدرۆ ویڵسن: بیست و هەشتەمین سەرۆکی ئەمریکا بوو، لە شاری ستونتی ویلایەتی ڤێرجینیا لە دایك بووە، یاساو مێژوو و فەلسەفەی لە هەردوو زانکۆی کۆلۆمبا و برنستۆن خوێندووە و بڕوانامەی دکتۆرای بە دەستهێناوە، دواتر بۆتە مامۆستای زانکۆ لە زانکۆکانی هۆبکنز و برانمر و فیلادلفیا، دواتر لە ١٩٠٢ تا ١٩١٠ پۆستی سەرۆکی زانکۆی برنستۆن وەرگرت، دواتر لە نێوان ساڵی ١٩١٠ تا ١٩١٢ بووە حاکمی ویلایەتی نیوجرسی، ساڵی ١٩١٣ دوای ئەوەی پارتی دیموکرات ئەویان پاڵاوت بۆ هەڵبژاردنەکان، سەرکەوتوو بوو لە بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆکایەتی ئەمریکا، تا ساڵی ١٩٢١ لەم پۆستەی مایەوە. سەیری:

- Encyclopedia Amricana,3rd Edition,Oxford,1961,PP.6-12.

5- Harry. N.Haward, The Partition …,P.220



بەریتانیا دەستبەرداری بەدیهێنانی پڕۆژەکانی بێت لە ناوچەکە، لەسەرەتای گفتوگۆکردنی کێشەی تورکیا لە کۆنگرەی پاریس، بەریتانیا یادداشتێکی پێشکەشکرد کە سیاسەتەکانی لە بەرامبەر هەرێمە ئاسیاییەکان و ئەوروپییەکانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی لە خۆگرتبوو[1]، تێیدا ئاماژەی بۆ پێویست بوونی دانانی بە مافەکانی هەریەکە لە سووریە و عێراق و دورگەی عەرەبی و فەلەستین و ئەرمینیا نابوو[2]. لە ٣٠ کانوونی دووەم لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی هاوپەیمانان لوید جۆرج هەرێمیکی دیکەی لەو هەرێمانەی کە بڕیاربوو دابڕێنرێن زیاد کرد ئەویش هەرێمی کوردستان بوو، بۆ ئەوەی ببێتە ناوچەیەکی دابڕکەری نێوان موسڵ و تورکیا[3]. کۆبوونەوەکە ئەم بڕیارەی خوارەوە دەرکرد: ((هاوپەیمانان و وڵاتانی هاوکار لەسەر ئەوە رازین کە ئەرمینیاو سوریە و میزۆپۆتامیا و کوردستان و فەلەستین و دورگەی عەرەبی دەبێت بە یەکجاری لە ئیمپراتۆری تورکی دابڕێنرێن...))[4].

هەموو بنەدەکانی یادداشتەکەی بەریتانیا بۆ تورکەکان زۆر قورس بوو، بەڵام ئەوەی زیاتر ئەوانی والێکرد هەست بە ریسوایی بکەن ئەو بەندانە بوون کە گلۆپی سەوزی بە یۆنان دەدا تاکو ناوچەکانی تورکی بە ئەزمیرەوە داگیر بکەن. کە رەوشیکی عەسکەری و سیاسی ترسناکی دروستکرد، یەکەم بەشەکانیشی دەستپێکردنی جەنکی یۆنانی تورکی بوو[5].

لە ناوەڕاستی ئاداری ١٩١٩ لە چوارچێوەی کونگرەی ئاشتی پێدەچوو رەوشی نێودەوڵەتی گرژ بێت و گەیشتبێتە بن بەست، دوای توندبوونەوەی ململانێی نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا لەبارەی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی رێکەوتنامەی سایکس پیکۆ[6]، ململانێیەکی توندی شاراوە

---

1 - Harry. N.Howard, King-Crane …,P.12.

2 - H.W.V.Temperley , Op.Cit.,Vol, I,P.24.

3 - Harry. N.Haward, The Partition …,PP.220-221.

4 -Ibid, P.221.

٥- بۆ زیانیاری زیاتر لە بارەی ئەو دوو لێژنەیە و کارەکانی و گرنگترین راسپاردەکانی، سەیری:

-Harry.N.Haward, King-Crane…,P.36; Erik J.Zurches, Turkey,A Modern History, London. NewYork, 1994,P.152 “

٦- پاشەکشەی رووسیا لە جەنگەکە و وازهێنانی لە ناوچەی دەسەڵات بە رێککەوتنی نهێنی لەگەڵ فەڕەنسا و بەریتانیا، رەوشێکی تازەی هێنایە ئاراوە، ململانێی بەریتانی فەڕەنسی بە پلەی یەکەم لە بارەی موسڵ و فەلەستینەوە بوو، بەپێ رێککەوتنامەی نهێنی سایکس پیکۆ موسڵ لە ناوچەی دەسەڵاتی فەڕەنسی بوو، بەڵام

لە نێوان چوار زلهێزەکە[1] بۆ دابەشکردنی پاشماوەی زەوی و موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئارادابوو، ئەمەش لەگەڵ خواست و هیواکانی ئەو گەلانەی کە پێشتر لەژێر چەپۆکی حوکمی عوسمانی دەیانناڵاند یەکانگیر بوو، ئەو گەلانە بەهیوا بوون وڵاتی تایبەتی خۆیان دابمەزرێنن، ئەمەش زیاتر رەوشی نێودەوڵەتی نالەبارکرد، لە نیو ئەو ناوەندە پڕ لە داواکاری و دژە داواکاری، چارەسەر لەلای شاندی ئەمریکی هات، کاتێ سەرۆك ویڵسن بیرۆکەیەکی خستەڕوو تەواو لەگەڵ بیرۆکەی مافی چارەنووس دەگونجا، بە گوێرەی ئەو بیرۆکەیە دەبوو لیژنەی نێودەوڵەتی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بنیردریت، تاکو ئەرکی وەرگرتنی رای دانیشتووان لەبارەی بڕیاری شێوەی حکوومەتەکانیان لە ئەستۆ بگرێت، سەرباری ئەوەی ئەو بیرۆکەیە بەتوندی لەلایەن بەریتانیا و فەرەنسا هەتاکو ئیتاڵیاش بەرپەرچدرایەوە، بەڵام ئەمریکا توانی دوو لیژنە (کنك گراین و هاربۆرد) بۆ زەویەکانی دەوڵەتی عوسمانی بنیریت[2], ئەو دوو لیژنەیە راسپاردەکانیان لەشێوەی راپۆرت پێشکەشکرد، بەڵام بەئەنقەست لەلایەن بەریتانیاو فەرەنساوە پشتگوێخرا، ئەوەی لیرە بۆ ئیمە گرنکە ئەوەیە کە دیاریترین راسپاردەی دوو لیژنەکە پێویست بوونی گەڕانەوەی (ئەزمیر)ی بۆ تورکەکان دەکرد و دامەزراندنی دەوڵەتی ئەستامبۆڵ کە تەنگەبەرەکان و کیلکیا (قیلقیا) لەخۆ بگرێت، بە مەرجی تاکە هێزێکی ئینتیداب بەریوەی ببات کە ئەویش بەریتانیایە، یا ئەمریکایە، هەروەها پێشنیازی پێکهێنانی دەوڵەتیکی کوردی کرد کە هەموو کوردانی دانیشتووی فارس و عێراق و تورکیا لە خۆ بگرێت، لە چوارچێوەی ئەو سنوورە پێشنیازکراوەی سەرەوە، ئەو دەوڵەتەش لەژێر ئینیتدابێکی یەکگرتوو لەگەڵ عێراقدا بێت[3].

---

بەریتانیا ویستی بەدەستی بهێنێت، پاساویشی بۆ ئەمە نەمانی هەرەشەی رووسی بوو لە وڵاتی دوو رووبارەکە، چیدی پێویست بە بوونی ناوچەی دابڕاوی فەرەنسی لە نێوان خۆی و لە نێوان ناوچەی دەسەڵاتی رووسی نەبوو، بەریتانیا ئەوەی ویستی دەستی کەوت، سەیری:

-کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ٣٠٩ .

١- مەبەست لە سەرۆکەکانی هەریەکە لە ئەمریکا(ویلسۆن) و بەریتانیا(لۆید جۆرج) و فەرەنسا(کلیمنسو) و ئیتاڵیا (ئۆرلاندۆ)، سەیری:

-کمال مظهر احمد، اضواء ...، ل ٧٣.

٢- سەیری تویژینەوەی دووەم لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بکە.

٣- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی پێکهێنانی هەردوو لیژنەکە سەیری:



بەڵام هەرچییەك ئەو دوو لیژنەیە کردیان و پێشکەشیان کرد، وەك ئەوە وابوو، کە کەسێك لە دەرەوەی میگەل گۆرانی بڵێ[1]. چونکە ئەو راسپاردانەی پێشکەشیکردن، لەگەڵ پلانەکانی بەریتانیا و و فەرەنسا نەدەهاتەوە. هەروەها بەلایەنی کەمەوە لەم قۆناغەدا رازی نەبوونی ئەمریکا لەسەر بابەتی ئینتیداب ئەو پلانانەی پەکخست[2].

لە شەوی ١٤و ١٥ ئایاری ١٩١٩ هێزەکانی یۆنانی بە پاڵپشتی سیاسەتی بەریتانیا و فەرەنسا و بە رازی نەبوونی ئیتاڵیا چوونە ناو ئەزمیرەوە[3]، لە ژێر پارێزگاری هێزی دەریایی پادشایەتی بەریتانی، یۆنانییەکان زۆر خراپەکاریان دەرهەق بە دانیشتووانە مەدەنییە تورکەکانی ئەزمیر کرد[4]، رۆژنامە جیهانییەکان ئەوکات ئەو کردەوانەیان گواستەوە، کە

---

- Harry.N.Haward, King-Crane…,P.36; Erik J.Zurches, Turkey,A Modern History, London. NewYork, 1994,P.152 “

- احمد عثمان ابو بکر، "کردستان في وثائق کنك-کراین"، مجلة شمس کوردستان، اربیل، العدد ٧، اذار ١٩٧٢، ل ١١.

1- Harry N. Haward, King Crane…,P.313.

2- L. Evans, Op.Cit.,P.129“

-سحر عباس خضیر، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٣.

٣- ئیتاڵیا لەو دەمەدا داوای جێبەجێکردنی بەندەکانی رێککەوتنامەی نهێنییەکەی کە لەگەڵ هاوپەیمانان لەمیانەی جەنگەکە مۆری کردبوو، کرد، کە بە گوێرەی ئەو رێککەوتنامەیە بەشی خۆی لە موڵکەکانی عوسمانی بەدەستکەوت، دوای ئەوەی ئەو داواکارییە لەلایەن بەریتانیا و فەرەنساوە پشتگوێخرا، ئیتاڵیا بڕیاریدا یەشێك لە خاکی تورکی داگیر بکات، ئەمەش وای لە لوید جۆرج کرد پلانێك بۆ دابەشکردنی هەموو بەشەکانی دەوڵەتی عوسمانی پێشکەش بکات، بەگوێرەی ئەو پلانەش ئیتاڵیا ئینتیداب بەسەر کەنارەکانی باشوور و چەند ناوچەیەکێ جیای ئەنادۆڵەوە دەکات، ئەم پلانەش بە هۆی نارەزایەتی ئەمریکاوە سەرکەوتوو نەبوو. بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:
- Harry N. Haward, King Crane…,P.233

٤- بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

-L.Evans,Op.Cit.,P181“

- ادوارد کار، العلاقات الدولیة في عشرین سنة ١٩١٩-١٩٣٩، تعریب سمیر شیَخاني، الجزء الاول، بیروت، د.ت، ل ١٩“ قاسم خلف عاصي الجمیلي، تطورات السیاسیة الداخلیة الترکیة ١٩٢٣-١٩٢٨، رسالَة ماجستیر مقدمة إلی کلیة الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٥، ل ١٩.

کاریگەری لەسەر زۆربەی گەلانی تورکی هەبوو[1]، کە لە ڕێگەی پێکهێنانی ڕێکخستنی میللی لە ژنان و پیاوان کە پێی دەگوترا کۆمەڵەکانی بەرگریکردن لە ئەنادۆڵ و روملی، ئەو تورەییەی دەربڕی[2]. ئەو ڕێکخستنانە ناوکی بزووتنەوەی نیشتیمانی تورکیا لە دواتر پێکهێنا، کە مستەفا کەمال[3] سەرکردایەتی کرد، کە حکوومەتی سوڵتان لە ١٥ ی ئایار بۆ بەرقەرارکردنی سیستەم بۆ ئەنادۆڵی نارد[4]. هەوڵە سەختەکانی حکوومەتی سوڵتان بۆ ڕێگەدان بە بەشداریکردن لە کۆنگرەی پاریس، شانبەشانی ئەو پەرەسەندنانە بوو، وەڵامی ئەو هەڵوێستەی نە درایەوە، کاتێ کلیمانسۆ سەرۆك وەزیرانی فەرەنسی بانگهیشتی کردن بۆ پاریس[5].

---

1- Zaki Arikan,Mütarekç ve Işğal Donemi izmir,Başinil (30 Ekim 1918-8 Eylul 1922),Turkey,1989.

٢- بۆ وردەکاری لە بارەی کاردانەی دانیشتووان سەیری:

-Memorandum by Mr.Rayan,Constantinople, 23-6-1919 , BDA, (1919-1938), Edited by Bilal.N.Şimşir,Vol.I(April 1919- March 1920), Ankara, 1973,Enclosure in No.10,P.31 “

- حنا عزو بهنان، التطورات السياسية في تركيا ١٩١٩-١٩٢٣، رسالَة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٩، ل ٤٤.

٣- مستەفا کەمال لە ساڵۆنیك لە باوکێکی فەرمانبەری سادە لە دایك بووە، ساڵی ١٩٠٥ لە کۆلیژی جەنگی دەرچووە، لە ساڵی ١٩١٠ لەگەڵ شاندی سەربازی چۆتە فەرەنسا، ساڵی ١٩١١ بەشداری شەڕی تەرابلس و ساڵی ١٩١٣ بەشداری شەڕی بەلقانی کردووە، لە بۆلگاریا بە پاشکۆی سەربازی دامەزراوە، لە میانەی یەکەم جەنگی جیهانی فەرمادەی فیرقەی ١٩ بووە لە دەردەنیل، ئازایەتیەکێ زۆری لەمیانەی هەڵمەتەکانی بەریتانیا بۆ سەر دەردەنیل و گالیبۆر پێشانداوە، بەهۆیەوە نازناوی (پاشا)ی پی بەخشراوە، بۆ زانیاری زیاتر سەیری:

-امين مةحمود سعيد وكريم خليل ثابت، سيرة مصطفى كمال وتاريخ الحركة الوطنية في الاناضول، القاهرة، ١٩٣٣، ل

٤- محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية والمسألَة الشرقية، القاهرة، ١٩٧٦، ل ٤٢٠.

5- Letter From Curzon to the French embassador, Foreign Office, 5-3-1920, DBFP,Ed. By Donglas and W.N. Medlicott and M.E. Lambert, First Sir,Vol.13, Enclosure in No.13, London, 1963, P.12 ; Calthorp to Curzon, Constantinople, 6-6-1919,BDA,Vol.I, No.3, P.6.



شاندی تورکی لە ئایاری ١٩١٩ بە سەرۆکایەتی فەرید پاشای سەرۆك وەزیران گەیشتە پاریس، لە ١٧ ی ئایاری ١٩١٩ یادداشتێکی پێشکەشی کۆنگرەی ئاشتی کرد، هەرچەندە دانی بە هەڵەکانی حکوومەتی پێشووی تورکی کرد لە میانەی جەنگەکە، بەڵام باسی لەوەکرد کە گەلی تورکی لەلایەن دەستەیەکی گومڕا و ئەلقە لەگوێی ئەڵمانەوە حوکمکراوە، هەروەها لە یادداشتەکەی باسی لە چارەنووسی دەوڵەتی عوسمانی کرد و داوای پاراستنی یەکێتی وڵاتەکەی کرد و جەختی لەوە کردەوە کە "گەلی عوسمانی بە هیچ شێوەیەك بە دابەشکردنی ئیمپراتۆرەکەی لە ژێر ئینتیدابی جۆراوجۆر رازی نابێت". لە هەمان رۆژدا ئیتاڵیاش وەك یۆنانییەکان هەمان شتیان لە ناوچەی سکالانوڤای تورکی دووبارە کردەوە، ئەمەش هاوپەیمانانی هەراسانکرد بەتایبەتی بەریتانیا، بۆیە لوید جۆرج بەتوندی ئەو هەڵسوکەوتەی ئیتاڵیای مەحکومکرد[1].

بۆ هەر چاودێریکی ڕووداوەکان ئاشکرابوو، کە تورکیا لە هەڵوێستێکی وای نەبوو، کە بتوانێت بەرگەی داواکاری و جووڵانەوانە بگرێت، بەریتانیا و فەرەنسا هەڵوێستێکی توندیان لە بەرامبەر تورکیا وەرگرت، کلیمانسۆ لە وەڵامی یادداشتەکەی تورکیا کە پێشکەشی ئەنجوومەنی هاوپەیمانانی کرد بوو، رەخنەی گرت و گوتی: "هیچ وڵاتێك لە هەموو ئاسیا و ئەفریقیا نییە، کە حوکمی تورکی تێیدا کۆتایی بە خۆشگوزەرانی ئابووری و هێنانە خوارێی ئاستی رۆشنبیری ......نەهێنابێ....تورکەکان لە هەرشوێنێ بن....جگە لە ماڵوێرانی هیچی دیکەیان نەکردووە"[2]. هەروەها گوتی: "تورکەکان سەلماندیان کە لێهاتوو نین و ناشارەزان لە بەڕێوەبردنی ئەتنییە ناتورکییەکان، ئەمەش بەهۆی خراپی بەڕێوەبەرێتییەکەیان و زوڵم و ستەمە جۆراجۆرەکانیان لە سەدە درێژەکانەوە، بۆیە پێویستە هیچ نەتەوەیەك بە ئیدارەی تورکییەوە گرێ نەدرێت"[3]. هەڵوێستی لوید جۆرج لەگەڵ هاوتاکەی کلیمانسۆ زۆر جیا نەبوو.

---

1- Harry Haward, The Partition …,PP.234-237

2- Answer to the Turkish Delegates, Paris 23-6-1919,DBFP, Ed. By Donglas and W.N. Medlicott and M.E. Lombert, London,1957, First Sir,Vol.4, AP.Pendix No.426,P.646.

٣- بلەج شيركو، القضية الكردية، بيروت، ١٩٨٦، ل ٧٩" احمد تاج الدين، الاكراد: تاريخ شعب وقضية وطن، القاهرة، ٢٠٠١، ل ١٠٤.

بۆیە سەیر نییە کە شاندی تورکی لە ٤ی تەمووز پاریس جێبهێڵێت دوای ئەوەی لە ئەرکەکەی سەرکەتوو نەبێت[1].

شانبەشانی ئەمەش، بزووتنەوەی نیشتیمانی لە هەردوو ئاستی سیاسی و سەربازی لەناو ئەنادۆڵ دەستی بە گەشەو پەرەسەندن کردبوو، ئەو رەوشەش مستەفا کەمالی وەك سەرکردەیەکی خاوەن توانای بەرز لە مامەڵەکردن لەگەڵ جەماوەر بەدیارخست، ئەو لەوکاتەدا پێشەوایەتی خەباتی نیشتیمانی و رزگاریخوازی تورکەکانی لە دژی هێزی داگیرکەر دەکرد[2]. دوای ئەوەی سوڵتان وەك پشکنەری گشتی سوپای سییەم دیاریکرد، لە ئایاری **١٩١٩** بە گەیشتنی مستەفا کەمال بۆ سامسون، سەرەتای دابەشبوونی تورکیا بۆ دوو سەربازگە دەستی پێ کرد[3]. دوای ئەوەی بارگەوبنەی خۆیان تێدا داگوتا، بڕیاریدا دەست بە پرۆسەی رزگاری وڵات بکات، پەیوەندی بە کەسانێکەوە کرد کە متمانەی پێی هەبوون، وەك عیسمەت بەگ و عەلی فواد و حوسێن رەئوف بەگ و رەئفەت بەگ و ئەوانی دیکە و هەموو ئەوانەی کە خودان پلەو پایەی سەربازی باڵا بوون. لە هەمان کاتدا پێشەوایەتی هەڵمەتێکی هۆشیاری خەڵکی ئەنادۆڵ لەبارەی داگیرکاری بیانی کرد[4]، داوای لێکردن بزووتنەوەی خەباتی چەکداری دژ بە

---

١- سەبارەت بە گەشتەکەی شاندی تورکی و دانووساندنەکان و سەرنەکەوتنەکانی سەیری: -

- Calthorpe to Curzon , Constantinople , 23-7-1919, DBFP, I.sir, Vol.4, AP. Pendix to No.466, PP.698-703

٢- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل ٢٤-٢٥.

3- Kemal H. Karpat, Turkey's Politics, New Jersey, 1959, P. 34.

٤- محمد عزة دروزه، تركيا الحديثة، بيروت، ١٩٤٦، ل ١٣.

بەریتانیا بیروڕای جیا لە بارەی سەرەتای بزووتنەوەی نیشتیمانی تورکی کە مستەفا کەمال لە ئەنادۆڵ پێشەوایەتی دەکرد، کە بە بزووتنەوەی کەمالی ناسرا، هەبوو. بەرپرسانی بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ وەك ژەنەراڵ میلان (کاپتنی کەشتیگەلی بەریتانی لە دەریای رەش) و ئەدمیراڵ کالسورب (کۆمیساری باڵای بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ) و ئەوانی دیکە، وایان دەبینی کە ئەمە پیلانێکە لە وەزارەتی جەنگی عوسمانی لە ئەستەمبۆڵ وەك نەخشەیەکێ دەولی گەورەی ئەودیوی سنوور لەلایەن ئەڵمان و بلاشیفەکان نەخشەی بۆ کێشراوە، بەتایبەتی زۆربەی فەرمانبەرانی ئەو وەزارەتە لەوانە بوون کە سەروکاریان بە ئەوروپاوە هەبووە، بەهۆی ئەوەی لەشاندە سەربازیە نێردراوەکان بۆ ئەوروپا بوون، هەشیان بوون لەو باوەڕەدابوون کە بزووتنەوەکە لەلایەن ئەندامانی



داگیرکەران دروستبکەن و داوای دەرگردن لە وڵاتیان لێ بکەن، لەم چالاکییەشیدا پشتی بەو ناوبانگە جەماوەریەی کە لە جەنگی گالیبۆلی دەستی کەوتبوو دەبەست[1].

مستەفا کەمال پەیوەندی بە کۆمەڵەکانی بەرگری لە ئەنادۆڵ و رۆملی ـ کۆمەڵەکانی بەرگری لە مافەکان ـ کرد[2]. بڕیاردرا رێوشوێن بۆ گرێدانی کۆنگرەیەك لە ئەرزەروم بۆ نوێنەرانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بگیرێتەبەر[3]. لە **٢٣**ی تەمووز ئەمە ئەنجام درا[4]. لە

---

پێشووی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرقی بە **پاڵپشتی** ئەڵمان و بەلشەفی ریکخراوە، بەڵام پەرەسەندنی رووداوەکانی ئەنادۆڵ ئەو ئیشکالەی رەواندەوە، راپۆرتە بەریتانییەکان ئەوانەی کە لە ئەنادۆڵەوە دەگەیشتن ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە بزووتنەوەکەی ئەنادۆڵ بزووتنەوەیەکێ نیشتیمانی ناوخۆییەو مستەفا کەمال بە **پاڵپشتی** پیاوە سەربازییەکانی پێشووی عوسمانی پێشەوایەتی دەکات.....بە چاوپۆشین لە پەیوەستیە هەرێمایەتی نێودەوڵەتیەکانی، بەڵام ئەمە رێگەی لەوە نەگرت کە بەریتانیا گرنگی بە چالاکییەکانی ئەو بزووتنەوەیە نەدات و نیگەران و مەترسی لەبەرامبەری پێشان نەدات. وای وێنا دەکرد کە پیلانگێڕییەکێ ئیسلامی گەورەیە و ئیمپراتۆری بەریتانی لە ئاسیا کردۆتە ئامانج, سەیری:

-A.L.Macfie,British Views Of Turkish National Movment in Anatolia , 1919- 1922, Middle Eastern Studies, London, Vol.38,NO.3, July, 2002, PP.27- 43.

1- Bernard Lewis,Op.Cit., P.242f.

٢- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی کۆمەڵەکانی بەرگری لە ئەنادۆڵ سەیری:

- Selahattin Tansel, Mondros'tan Mudanya'ya Kadar,I.Cilt,Ankara, 1973, S.S.145-150.

3- Desmond Steward, The Middle East Temple of Janus, Great Britain, 1972. P. 239.

٤- کۆنگرەکە لە بینایەی قوتابخانەیەك لە ئەرزەروم گرێدرا، ٣٥ نوێنەری ویلایەتەکانی رۆژهەڵات ئامادەی بوون، مستەفا کەمال بەو ئامانجەی کە کۆنگرەکەی بۆ سازکردبوو، کۆنگرەکەی کردەوە، پرۆگرامە شۆڕشگێڕیەکەی لە بەرگریکردن لە مافەکان و ویستی گەلی روونکردەوە و گوتی: "بە دیهێنانیان پێویست دەکات حکوومەتیك کە هێزەکەی لە گەلەوە وەرگرتبی دابمەزریت، ئەو حکوومەتە بەبێ مەرج و کۆت سەربەخۆبیت. بە مۆرکردنی پرۆتۆکۆلی ئەماسییە، جەخت لەمە کرایەوە، کە بوو بە وەسیقەی یەکەمی دەستووری تورکیای نوێی دانرا. سەیر:

- A.L.Macfie, Ataturk, London and NewYork, 1994,PP. 71-74“

٤ئەیلولی ١٩١٩ کۆنگرەیەکی دیکەی لە سیواس بەدواداهات[١]. ئەو گۆنکرەیە بڕیارگەلێکی گرنگی دەرکرد، کە دواتر بووە هەنگاوی سەرەکی سیاسەتی مستەفا کەمال.

چالاکییەکانی مستەفا کەمال، سولّتان و ئەندامانی حکوومەتەکەی نیکەران کرد، لەدوای ئەویش بەریتانیای نیکەران کرد، کە داوای لە حکوومەتەکەی سولّتان کرد، مستەفا کەمال بۆ ئەستەمبۆڵ بانگ بکاتەوە، بەلام مستەفا کەمال ئەمەی رەتکردەوە و حکوومەتی سولّتانیش مەرسومیکی دەرکرد و دامەزراندنی هەلّوەشاندەوە، ئەویش لەلای خۆیەوە بە ئاشکرا رایگەیاند کە دەستی لە پۆستە فەرمییەکان کێشاوەتەوە، ئەمەش جەماوەرێتی ئەوی زیادکرد و زۆربەی عەسکەرییەکان پالّپشتی خۆیان بۆی دەربڕی، ئەمەش زیاتر هانی دا تاکو لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەردەوام بێت[٢].

بەریتانیا لەو پەرەسەندنە مەترسیدارانەی کە بزووتنەوەی نیشتیمانی تورکی بەخۆیەوە بینی زۆر دوور نەبوو، چاوەڕێی هەلێکی دەکرد بۆ ئەوەی بزووتنەوەکە لەبار ببات، لەوکاتەدا و لە میانەی گرێدانی کۆنگرەی سیواس بەریتانیا هەولّی دا چەند عەشیرەتێکی کوردی لەدژی بزووتنەوەی کەمالی بورژێنێ، بەتایبەتی ئەوەی لە مەلاّتیە لەگەڵ کاپتن نۆئێل روویدا[٣]، کاتێ

---

- احمد نوري النعيمي، الحياة السياسية في تركيا الحديثة ١٩١٩-١٩٣٨، بغداد، ١٩٩٠، ل ١٩.

١- ئەو کۆنگرەیە هەنکاوێکی پێشکەوتووی بۆ بەدیهێنانی پرەنسیپەکانی کۆنگرەی ئەرزەروم پێکهێنا، لەم کۆنگرەیەدا کەسایەتی مستەفا کەمال خۆی سەپاند، کۆنگرەکە لە ١١ ی ئەیلولی ١٩١٩ بە دەرکردنی بەیاننامەیەك کۆتایی هات، پرەنسیپەکانی کرنگرەی ئەزەرۆمی لە خۆگرتبوو، بندەکانی دواتر بوونە بنەمای میساقی نیشتیمانی، دیاریترین پەرەسەندنی گۆنگرەکە ئەوەبوو کە بڕیاردرا سەرجەم پەیوەندیەکان بە حکوومەتی فەرید پاشا بپچڕێندریت و داوای دەست لەکارکێشانەوەی لێبکرێت، مستەفا کەمال بە سەرۆکی بزووتنەوەی نیشتیمانی هەلّبژێر درا. سەیری:

-Geofrey Lewis, Turkey, London, 1965,P.60.

٢- جاسم محمد عبدالله، مصطفى كمال اتاتورك، مجلة كلية التربية، الجامعة المستنصرية، بغداد، العدد(٨)، ٢٠٠١، ل ٩٨.

٣- کاپتن نۆئیل: یان مێجەر نۆئیل: ئەفسەرێکی بەریتانی بوو، زانیاریەکێ فراوانی هەبوو، بەزمانی فارسی قسەی دەکرد، زانیارییەکی زۆری لە بارەی دەروونی هۆزەکان و سەرۆکەکانی هۆزەکان رۆژهەلاّت هەبوو، لە نێو بەختیاریەکان لەمیانەی یەکەم جەنکی جیهانیدا لە دژی ئەلّمان چالاك بووە، لە سالاّنی کۆتایی جەنگەکە



داخوازییەکی کوردی بۆ دامەزراندنی والەیەکی کورد بۆ ناوچەی خەربوت[١]، بەلاّم مستەفا کەمال ئەو هەولّەی لەباربرد[٢]. لەلایەکی دیکەوە سەرباری ئەوەی حکوومەتەکەی فەرید پاشا سەرەتا ئەو هۆشدارییەی رەتکردەوە، بەلاّم پاشگەزبووەوە و لە یەکی تشرینی یەکەم دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد و حکوومەتێك لەلاییەن علی رەزا پێکهێنرا، کە مەیلی نیشتیمانپەروەری هەبوو[٣].

دوای ئەو پەرەسەندنە ناوخۆیانەی تورکیا و بەهاتنی کۆتایی سالّی ١٩١٩ لوید جۆرج هیچ هیوایەکی لە جێبەجێکردنی ئینتیابی ئەمریکی بەسەر هیچ ناوچەیەکی تورکیا لا نەما، بۆیە پێویستە بوو لەسەری لەگەڵ فەرەنسا لەبارەی یەکلاییکردنەوەی کێشەی تورکی رێکبکەوێت، لە تشرینی دووەمی ١٩١٩ رێککەوتن لەسەر ئەوە کرا، کە شاندی بەریتانیا فەرەنسا لە لەندەن چاویان بە یەك بکەوێت[٤]، لە بەردەوامی چاوپێکەوتنی نێوان هەردوو شاندەکە، گەیشتنە رێککەوتن لەسەر چەند خالّێکی گرنگ،بەلاّم سەرەڕای ئەمەش پەرەسەندنەکانی دوایی کە بزووتنەوەی نیشتیمانی تورکی لەناو ئەنادۆڵ بەخۆیەوە بینی، کە مەترسییەکەی گەیشتە ئەوەی کە هەرەشە لە هێزی بیانی لە ئاسیای بچووك بکات و لە سەرەتای شوباتی ١٩٢٠ بووە هۆی پێکدادانی نیوان فەرەنسییەکان و کەمالییەکان[٥]، ئەمەش رەوشەکەی بەیەکجاری گۆری و ئەوکات فەرەنسییەکان لەوە گەیشتن کە سیاسەتی لوید جۆرج بەرامبەر تورکەکان تەنها لە بەرژەوەندی بەریتانیادایە، فشاری زیاتر خستنە سەر تورکەکان بۆ ئەوەی لە ئەستەمبۆڵ دابڕێن، تەقینەوە لە

---

توانی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ ژمارەیەکێ زۆر لە سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان ببەستێ، تا وای لێهات بە کوردی قسە بکات، هەرچەندە سالاّنێکی کەم کاری لە کوردستان کرد، بەلاّم هەست و سوزی ژمارەیەکێ زۆری بۆ خۆی راکێشا هەتا بە (لۆرانسی کورد) ناونرا. سەیری: کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ل ١٨٦-١٨٧

1- From Robeck to Curzon, BDA, 8-9-1919, Vol.I, P.19; A.L.Macfie , Atatürk, PP.76-78

٢- محمد محمد توفيق، كمال اتاتورك، مصر، ١٩٣٦، ل ٧٦.

3- Geofry Liwes,Op.Cit.,P.61.

٤- للتفاصيل ينظر: الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ٥٣.

5- S. R. Sonyel, Turkish Diplomacy 1918-1923, London, 1982,P.26.

رەوشەکە دێنێتە ئاراوە کە زیان لێکەوتووی یەکەم فەرەنسا دەبێت، چونکە هێزی فەرەنسی لە باشوور بوو، کە بزووتنەوەی کەمالی تێیدا چالاك بوو، بۆیە پێی باشتر بوو لە تورکەکان نزیك ببێتەوە[1]، لە بەرامبەریشدا لوید جۆرج بە شێوەیەکی کاتیێ فشاری لەسەر تورکەکان کەمکردەوە.

کۆنگرەی یەکەمی لەندەن ۱۹۱۹ سەرەتای قۆناغی پەیوەندییەکانی نێوان بەریتانیا و فەرەنسا بوو، فەرەنسا بە حساباتە کۆنەکانی داچۆوە و چاوی بەو پەیوەندیانەدا خشاندەوە، بەرەبەرە لە بەریتانیا دوور دەکەوتەوە. هەروەها لەم قۆناغەدا نەیاری ئەمریکا بۆ پلانەکانی بەریتانیا و فەرەنسا لە دەوڵەتی عوسمانی بەدیارکەوت[2].

مستەفا کەمال گۆڕانکارییە نوییەکانی سەر هەردوو ئاستی نیوەخۆیی و دەرەکی قۆزتەوە، ئەو پەرەسەندنانەی بە باشترین شیوە لە پلانی دووبارە هێنانەوەی تورکیا بۆ ریزی کۆمەڵکەی نێودەوڵەتی بەکارهێنا . لەسەر ئاستی ناوخۆیی بزووتنەوەی بەرگری میللی لەو ماوەیەدا زۆر چالاك بوو، هەموو تویژەکانی گەلی تورکی گرتەوە و چالاکییەکانی بە ئەستەمبوڵیش گەیشتن و هەڵمەتێکی بەرفراوانی ئاودیوکردنی پارەو خواردەمەنی و جبەخانە بۆ ئەنادۆڵ دەستی پێکرد[3]، ئەمەش پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ بەرژەوەندی بزووتنەوەی نیشتیمانی.

---

١- لە شوباتدا ئەو هێزە فەرەنسی و ئەرمەنییەی کە بۆ داگیرکردنی کیلیکیا هاتبوون رووبەرووی بزووتنەوەی کەمالیستەکان بوونەوە و بەرگریان کرد و هێرشەکەیان راگرت، لە کاردانەوەی ئەمەشدا بزووتنەوەکە بەهەزاران ئەرمەنی ماراشی کوشت و راگواست، لەوکاتەدا هەردوو حکوومەتی بەریتانی و فەرەنسی هوشداریەکیێ توردیان بە حکومەتی تورکی دا و هەرەشەیان کرد کە تورکان لە ئەستەمبوڵ دادەبڕن ئەگەر سنووریك بۆ هەڵسوکەوتەکانی مستەفا کەمال و لایەنگرانی دانەنریت، پی دەچوو حکوومەتی سوڵتان لە توانای دانەبێت کارێکی وا بکات، هەروەها هەردوو حکوومەتی بەریتانیا و فەرەنساش لە هەڵوستێکی وانەبوون بتوانن هەرەشەکەیان جێبەجێ بکەن، سەیری:

- :Curzon to Robeck, Foreign Office, 10-2-1920, DBFP,1sir, Vol.13, No.3, P.2; Robeck to Curzon, Constantinople, 17-2-1920, DBFP, I.Sir, Vol.13, No.4,P.3.

2- Erik j. Zurches,Op.Cit.,P.144 .

٣- قاسم نويخلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل ٣٠-٣١.



بەڵام لەسەر ئاستی دەرەوە، نیشتیمانپەروەرانی تورك لە گرێدانی چەند رێککەوتنێکی گرنگ سەکەوتوو بوون[1] و پەیوەندی باشیان بە رووسیاوە گرێدا، کە بەهاوسۆزیەکی زۆرەوە سەیری بزووتنەوەی نیشتیمانی تورکی دەکرد[2]. تورکیا ئەوکات زۆر زۆر پێویستی بە هاوپەیمانێکی بەهێزی وەك رووسیا هەبوو، ئەمەش هەڵوێستی رووسیا لە دژایەتیکردنی پرۆژەی بەریتانی و فەرەنسی لە دابڕاندنی ئەستامبوڵ بەرجەستە دەکرد، کاتیێ لینین لە ئەیلولی ۱۹۱۹ رایگەیاند کە ((قوستەنتینیە هەر بەدەستی موسوڵمانان دەمێنێتەوە))[3]. ئەم هەڵوێستەش سەرەتای قۆناغێکی تازەی دیاریکرد، کە پەیوەندییەکانی نێوان کەمالییەکان و رووسیای سوڤێتی پەرەسەندنێکی راستەوانەی لەم قۆناغەدا بەخۆیەوە بینی، کە مستەفا کەمال تا دوا سنوور بۆخۆی قۆزتەوە، هەروەك دواتر روونەبێتەوە[4].

---

١- رەوشی تازەی ناوخۆیی زەمینەیەکی باشی بۆ هێزە نیشتیمانپەروەرەکانی تورکی پێکهێنا، کە لە ژێر دەسەڵاتی کازم قەرە بەکیر دابوو، شەڕی ئەرمەنی لە (ساری کەمیش) کرد، ئەمەش یارمەتیدا لە ئەیلولی ۱۹۲۰، سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنێت، لەدەرەنجامی ئەمەشەوە ئەرمنیەکان ناچاربوون لە ۲ی کانوونی یەکەمی ۱۹۲۰ پەیماننامەی Cumru واژوو بکەن، گرنگی ئەم پەیمانەش لەوەدا بوو کە یەکەمین پەیمانە لە نێوان حکوومەتی ئەنقەرە و لایەنێکی دەرەکی مۆردەکرێت. هەروەها بوو بە بنەمایەك کە یارمەتی حکوومەتی نیشتیمانپەروەرانی دا پەیماننامەی قارس لەگەڵ کۆمارەکانی ئەرمینیا و جۆرجیا و ئازەربایجانی سۆڤیتی لە ۱۳ ی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۱ مۆر بکات، ئەمە سەرباری ئەو کاریگەریە باشەی ئەو پەیمانانە لەسەر بەرزکردنەوەی ورەی تورکەکانی ناوخۆ، دەرگای هاوکاری لەگەڵ رووسیای سۆڤیتی کردەوە. سەیری:

-B.Ponomaryov and Others;History of Soviet Foreign Policy 1917-1946,Translated by David Skvirsk , Moscow,1969,P.161"

-حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٨١.

٢- والتر لاكور، الاتحاد السوفيتي والشرق الاوسط، نقله إلى العربية نخبة من الاساتذة الجامعيين، بيروت، ١٩٥٩، ل ٤٢.

٣- عادل محمد خضير، الممرات التركية وتاثيرها في العلاقات التركية السوفيتية، الجامعة المستنصرية، معهد الدراسات الاسيوية والافريقية، بغداد، ١٩٨٣، ل ٢٢.

4- B.Ponomaryov and Others, Op.Cit.,PP.154-165

لەپاڵ لێهاتوویی و زیرەکی مستەفا کەمال، سیاسەتی بەریتانی گۆڕێکی بەهێزی بە بزوتنەکە بەخشی، لەوکاتەی کە سولتان و حکوومەتەکەی سووربوون لەسەر پێشکەشکردنی سازشی زیاتر بۆ بەریتانییەکان، لە پرەنسیپی ((ژیانیکی لاواز باشتر لە لەناچوون))[1]، ئەوا بەریتانیا هیچ وەلامێك یا ئاسانکارییەکی لەبەرامبەر پێشان نەدەدا. لەجیاتی ئەوەی پێگەی حکوومەتەکە بەهێز بکات، هانی دەدا، رووبەڕووی بەرگریکارانی نیشتیمانپەروەران ببێتەوە، ئەمەش وایکرد زۆربەی تورکەکان لە دەوری مستەفا کەمال کۆببێتەوە و بزووتنەوەکەی مۆرکێکی شۆڕشگێڕی و نیشتیمانپەروەری بپۆشێت.

لەبەرامبەر رووداوە روو لەسەرە ترسناکەکانی ئەنادۆڵ و زیادبوونی گرفتەکانی بەریتانیا و هاوپەیمانان لە ماوەی دوای جەنگەکە، بەتایبەتی ئەو هێزە کەمەی لە خاکی تورکیا مابووەوە بەشی ئەوەی نەدەکرد بزووتنەوەی نیشتیمانی پی سەرکوت بکەن، بریتانیا و فەرەنسا بڕیاریاندا ئەستەمبۆڵ لە رووی عەسکەرییەوە داگیر بکەن، بەتایبەتی ئەوکات بزووتنەوەی نیشتیمانی تێیدا بەهێز ببوو، هاوپەیمانان بە ناچارکردنی حکوومەتی علی رەزا پاشا بۆ دەست لەکارکێشانەوە لە ٢ی ئاداری ساڵی ١٩٢٠ رێگەیان بۆ ئەو داگیرکارییە خۆشکرد، لە ئاداری ١٩٢٠ حکوومەتێکی تازە بەسەرۆکایەتی ساڵح پاشا دامەزرا[2].

لە بەرەبەیانی ١٦ی ئاداری ١٩٢٠ هێزەکانی بەریتانیا لەژێری فەرماندەیی ژەنەراڵ (هینری ویڵسن) و بە پاڵپشتی فەرەنساو ئیتالیا بە کردەوە ئەستەمبۆڵیان داگیرکرد، بەبێ ئەوەی ئەم دووانە لەو پرۆسەی داگیرکارییە بەشداری بکەن، هیچ هێزێکی سەربازی وشکانی یا دەریایی بۆ ئەم مەبەستە نەناردووە[3].

---

١- دانکورت. أ. روستو، ((السياسة الخارجية للجمهورية التركية))، في: مناهج السياسة الخارجية في دول العالم، إشراف روي مكريدس، ترجمة حسن صعب، مراجعة يوسف ايبش، بيروت-نيويورك، ١٩٦١، ل ٣٩١.

٢- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ٣٤.

٣- داجوبرت فون مبكوش، مصطفى كمال المثل الاعلى، تعريب كامل، ل . مسيحة، بيروت، ١٩٣٣، ل ٢٥٣.



شانبەشانی ئەم پەرەسەندنە، ئەنجوومەنی نێردراوانی عوسمانی[1] ناڕەزایەتی لەبەرامبەر ئەو داگیرکارییەی، ئەمەش وایکرد هێزی داگیرکەر ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە دەستگیر بکات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەنجوومەنەکە بڕیاری وستانی کارەکانی دەربکات و خۆی هەڵبوشێنیتەوە و ساڵح پاشاش لە ٢ی نیسانی ١٩٢٠ دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بکات، بەمەش دووبارە بوار بۆ گەڕانەوەی داماد فەرید پاشا هەڵکەوت، کە بە لایەنگری بۆ سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر تورکیا ناسرابوو[2]. هەردوای دامەزراندنی حکوومەتەکەی بیاننامەیەکی دەرکرد و ملکەچی خۆی راگەیاند[3]. هەروەها هەنگاوێکی ترسناکی هاوێشت کە حکوومەتەکانی بەرلەخۆی خۆیان لێبواردووە، ئەویش ئەوەبوو رایگەیاند کە نیشتیمانپەروەران یاخیبوون لە دژی حکوومەتی سولتان، بە ئاماژەی ئەویش بوو شێخی ئیسلام لەلای خۆیەوە فەتوایەکی دەرکرد ئەو رایەی پشت ئەستوور دەکرد[4].

کاردانەوەی کەمالییەکان بەرامبەر ئەو پەرەسەندنانە بەهێز بوو، سەرباری ئەوەی لە لای نوێنەرایەتی و ئەنجوومەنەکانی یاسادانانی بیانی ناڕەزایەتیان دەربڕی، فەرمانێکیشیان دەکرد بەوەی هەر ئەفسەرێك یا کەسێکی بەریتانی لە ئەنادۆڵ کە بەدەستیان بکەوێت دەستگیر بکەن. مستەفا کەمال بڕیاریدا رێوشوێنی نوێ بۆ هەڵبژاردنەوەی ئەنجوومەنی نوی نوێنەران بگرێتە بەر کە نوێنەرایەتی گەلی تورکی بکات. ئەم رێوشوێنانە وایکرد لە ٢٣ی نیسانی ١٩٢٠

---

١- ئەنجوومەنی نێردراوانی عوسمانی: یەکێك لە دەستەکانی ئەنجوومەنی عمومی عوسمانی بوو کە بەگوێرەی دەستوور ساڵی ١٨٧٦ دامەزرا، ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە لەوانە پێکهاتبوون کە لەلایەن بازنەکانی هەڵبژاردن بەگوێرەی ریژەی دیاریکراو بۆ هەر ٥٠ هەزار کەس ئەندامیکی نێر بڕیاری لێدراوە، زۆربەی کات کۆبوونەوەکانی ئاشکرابوو، هەجۆر دەسەلاتی هەبوو، وەك گفتوگۆی یاساکان و هەموارکردنیان یا رەتکردنەوەیان و گفتوکۆی بودجە و بواری خەرجکردنیان. سەیری:

- عصمت برهان الدين عبدالقادر، دور النواب العرب في مجلس المبعوثان العثماني (١٩٠٨-١٩١٤)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب-جامعة الموصل، ١٩٨٩، ل ل٢٩-٣٤.

٢- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل ٣٤-٣٥.

3- S.R Sonyel,Op.Cit.,P. 28.

4- G.Lewis, Op,Cit.,P. 60 “

- داجوبرت فون مبكوش، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٥٨-٢٥٩.

ئەنجوومەنی نوێ نوێنەران دانیشتەکانی خۆی لە ئەنقەرە دەستپێکاتەوە، کە ٣٥٠ نوێنەری لە خۆگرتبوو کە ١٨یان لە ئەنجوومەنی کۆن بوون و مستەفا کەمالیش وەك سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنە هەلبژێردرا و عیسمەت پاشاش وەك سەرۆك ئەرکان دیاریکرا[1]. بە گوێرەی ئەو گۆڕانکارییە نوێیانە، لە وڵاتدا دوو حکوومەت هەبوون، یەکێکیان لە ئەستەمبوڵ بوو لە لایەن بەریتانیا و هاوپەیمانان پاڵپشتی لیدەکرا، دووەمیش لە ئەنقەرە پشتی بە گەل دەبەست و لە پێناوی رزگاری تورکیا دژ بە سیاسەت و پلانەکانی بەریتانیا خەباتی دەکرد.

دەبوو بزووتنەوەی رزگاری نیشتیمانی سێ شەڕی جۆراوجۆر و سەرەکی لە سێ بەرەی جیا بەرپا بکات: لە رووی سیاسییەوە، دژ بە حکوومەتی سوڵتان لە پێناوی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی نیشتیمانی لە تورکیا، لەرووی عەسکەرییەوە، دژ بە هێزە بیانییەکان ئەوانەی خاکی تورکیایان داگیرکردووە، لە رووی دیپلۆماسییەوە، لە پێناو زامنکردنی داننانی نێودەوڵەتی بە سەربەخۆیی تورکیا و یەکێتی خاکەکەی[2].

ئامانجی بەریتانیا و هاوپەیمانان لە کۆبوونەوەی سان ریمۆ(١٩ تا ٢٦ ی نیسانی ١٩٢٠)[3] ئەوەبوو بگەنە رێککەوتنێك لەبارەی پرسی تورکییە، کە دەمەقاڵێ لەبارەیەوە زیاتر لە ساڵێکی خایەند، پێ دەچوو حکوومەتەکەی لوید جۆرج هێشتا لە وەرگرتنی سیاسەتی توند بەرامبەر تورکیا بەردەوام بووە، نەیتوانی پەرەسەندنە نوێیە نیوخۆیی و نێودەوڵەتیەکان لەخۆبکرێت، کە تورکیا و ناوچەکە پێیایدا گوزەری کردووە، بەڵام ئەوەی لێرە تیبینی دەکرێت ئەوەیە کە ئاڕاستەیەکی ئۆپۆزسیۆن لە ناو حکوومەت دەرکەوت، کە تێکەڵەیەك لە بەرپرسانی عەسکەری و سیاسی و چەند وەزیرێك و سەرکردەی ئەرکانی بەریتانی لە وانەی لە چەند وڵاتێکی ئیسلامی ژێردەستەی بەریتانی دامەزرا بوون، نوێنەرایەتیان دەکرد. ئەوانە هۆشیارداری توندیان بە لوید

1- Frank D. Chambers, This age of Conflict 1914-1943, NewYork, 1943,P. 344; Stanford.J. and Ezel K. Shaw, OP.Cit.,P.349.

2- H.B.Sharabi ,Government and Politics of the Middle East in Twentinth Century, Princeton,1962,P. 34;

- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ٣٥.

٣- بۆ وردەکاری لە بارەی کۆبوونەوەی سان ریمۆ و پرسی تورکی سەیری:

- Paul C.Helmriech,Op.Cit.,PP.307-309.



جۆرج لەبارەی توندڕەویکردن لە مەرجەکانی ریککەتنامەکە دا[1]، بەڵام لوید جۆرج کە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵای هاپەیمانانی دەکرد، گوێی بەو هۆشدارییانە نەدا و مەجەکانی پەیماننامەکەی مۆرکرد، کە دەستکەوتی ئابووری و سیاسی بۆ بەریتانیا تێدا بوو.

مەرجە سەرەکییەکانی دەقی رێککەوتنامەکە باسی لە تەنگەبەرەکان و داهاتووی بەشە ئەورووپییەکەی تورکیا و بابەتی قەرەبووکردنەوەو هەردوو پرسی کورد[2] و ئەرمەن و پرسی پەیوەندییەکانی یۆنان — تورکیا و پرسی ئەزمیری کردبوو[3]. لوید جۆرج لە ٢٠ی نیسانی ١٩٢٠ لەبەردەم ئەنجوومەنی عمومی بەریتانی لە لێدوانێکی رایگەیاند:" پێویستە ئیمە پارێزگاری لە تەنگەبەرەکان بکەین، ئەمەش لە کرۆکی بەرپرسیارێتیمانە، هەروەها فەلەستین و ولاتی میزۆپۆتامیا و موسڵ، هەرچی فەڕەنسییەکانن ئەوا پارێزگاری لە کیلیکیا دەکەن، ئیتاڵییەکانیش پارێزگاری لە هەرێمی ئەدالیا دەکەن"[4].

بەندەکانی رێککەوتنامەی سان ریمۆ هێڵە سەرەکییەکانی پەیماننامەی سیڤەری پێکهێنا، کە دواتر لەگەڵ تورکیا مۆرکرا، کەمترین شت لەبارەی ئەو بەندانەوە بگوتریت، ئەوەیە کە تا دوا پلە سوکایەتی و سەرشۆڕی بۆ تورکەکانی تێدابوو، کە لوتکەی سیاسەتی بەریتانیای لەناوچەکە بەرجەستە دەکرد، چونکە بەریتانیا دەستکەوتی گەورەی بەهۆیەوە بەدەستهێنا، لەسەر حسابی گەلانی ناوچەکە، هەر چ نەبێ خۆ بەهۆیەوە ویلایەتی موسڵی لە فەڕەنسا سەندەوە[5].

لە ١١ی ئایاری ١٩٢٠ شاندی حکوومەتی ئەستەمبوڵ لە سیڤەر(گەرەکێکی پایتەختی فەڕەنسا) دەقی پەیماننامەی ئاشتیان وەرگرت، بەهۆی ئەوەی مەرجی زۆر سەختی تێدابوو،

1- S.R.Sonyel ,Op.Cit.,P.77.

٢- سەیری تەوەری دووەمی بەشی یەکەم بکە.

3- J.C.Hurewitz ,Op.Cit.,PP.75-76.

4- Quoted in: Harry Haward, The Partition …,P.243.

5- ئەوانی لە سان ریمۆ کۆبوونەوە گەیشتنە دوو رێککەوتن، یەکێکیان سیاسی بوو، کە باسمان کرد، دووەمیان نەوتی بوو کە لە نێوان فەڕەنسا و بەریتانیا مۆرکرا و ناوچە دەولەمەند بە نەوتەکانی خاکی عوسمانی سەرلەنوێ دابەشکرایەوە. سەیری:

- J.C.Hurewitz,Op.Cit.,Vol.Π,PP.75-77.

شاندەکە تووشی شۆك هات[1]. ئەوکاتەی بەندەکانی پەیماننامەکە لە تورکیا راگەیەنرا، تەوژمیکی نارەزایەتی تورەیی هەموو لایەکی تورکیای گرتەوە، سوڵتان وای وەسفکرد کە ((کۆمەڵێ بەڵایە ئامانجییەتی تەواوی وڵات ویران بکات))[2]، بەڵام فەرید پاشا هەرچەندە لایەنگیری بەریتانیا و هاوپەیمانان بوو، هیچی لەبەردەم نەمایەوە جگە لەوەی پرتستۆی بکات[3]. لەمیانەی چاوپێکەوتنی بە مەندوبی سامی بەریتانی لە حوزێرانی ١٩٢٠ بیزاری خۆی دەربڕی و داوای کرد بەلای کەمەوە ئەو هەموارکردنەی کە سوڵتان داوای کردووە جیبەجی بکرێت. پێی راگەیاند کە ناتوانێت واژووی لەسەر بکات، ئەو بۆ تاوتویکردنی بۆ پاریس دەچێت[4].

فەرید پاشا لە ناوەڕاست ی حوزێرانی ١٩٢٠ بۆ پاریس چوو، دوای ئەوەی ژمارەیەك پەیوەندی کرد، لەوێ بەناوی سوڵتان و حکوومەتەکەی لە ٦ی تەمووزی ١٩٢٠ پاداشتێکی پێشکەش کرد[5]. هەرچۆنێ بێت فەرید پاشا و حکوومەتەکەی لەوە دڵنیابوون کە هەوڵەکانیان بۆ گۆڕینی هەڵوێستی بەریتانیا سوود ی نابێت، بۆیە لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠ ناچاربوو پەیماننامەکە لە سیڤەر لە فەرەنسا مۆر بکات، بۆیە ناوی لینراوە پەیماننامەی سیڤەر[6]. لە هەمان کاتدا هەریەکە لە بەریتانیا و ئیتاڵیا و فەرەنسا ڕێککەوتنێکی سێ قۆڵیان مۆرکرد، کە بەهۆیەوە دوو وڵاتەکەی دوایی ناوچەی فراوان لە تورکیایان بەرکەوت[7].

مۆرکردنی ڕێککەوتنامەکە لەسەر دڵی تورکەکان زۆر بەگرانی کەوت، بە لێدانی مردن بۆ دەوڵەتی عوسمانی هەژمارکرا[8]. ئەگەر جیبەجی بکرابووایە تورکیا بۆ دەوڵەتۆچکەیەك کە لە

---

١- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٧٥.

2- Robeck to Curzon, Constantinople ,27-5-1920, DBA,Vol.2, No.36, PP.119-120.

٣- احمد عبدالرحيم مصطفى، في اصول التاريخ العثماني، بيروت، ١٩٨٢، ل ٣٠٦.

4- Robeck to Curzon,Constantinople, 1-6-1920, DBFP,I.Sir,Vol.13, No.78, PP. 82-84.

5- Harry N. Howard, The Partition …,P. 144.

6- J.A.S.Grenville. The Major Intenational Treaties 1914-1973, London, 1974,P. 73-77; Paul C.Helmrich,OP.Cit., P.320.

٧- جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ترجمة جعفر الخياط، ج ١، بغداد، ١٩٥٩، ل ١٥٠.

8- G.Lewis,Op.Cit., P.66.



ئەستەمبۆڵ و چەند یەشێکی باکووری ئەنادۆڵ پێکدەهات[1]، بەڵام ئەوەی ڕەوشەکەی زیاتر ئاڵۆزکرد، ئەوەبوو کە سوپای یۆنانی بە هاوکاری گەشتیگەلی بەریتانی و فەرەنسی ناوچەی ئاسکی شەهری لە ئەنادۆڵ لە کۆتایی حوزێران داگیرکرد و لەبەرامبەردا هێزی کەمالییەکان پاشەکشەیان کرد[2]، بەڵام ئەو پەرەسەندنانە لەبەرژەوەندی بزووتنەوەی نیشتیمانی بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال بوو، کە وا وەسفی پەیماننامەکەی کردبوو کە (دەرکردنی حوکمی لە سیدارەدانە بۆ تورکیا)[3]. بۆیەکەمجار بوو کە هەستی نیشتیمانی شوێنێ لای هەموو گەلی تورکی داگیر بکات، کە هەموو چاویان بڕیبووە ئەنقەرە وەك تاکە هیوای ڕزگاربوون[4]. لە تەواوی وڵات کۆبوونەوە ریکخرا و نارەزایەتی لەسەر پەیمانەکە دەربڕدرا، مستەفا کەمال ئەو تورەییەی زۆرەی خەڵکی قۆزتەوە لە دژی حکوومەتی ئەستەمبۆڵی بەکارهێنا و بە خیانەتکاری تۆمەتبارکرد[5]، لەرووی سەربازییەوە بە شێوەیەکی تەکتیکی لەبەرامبەر هێزە یۆنانیە پێشکەوتووەکان پاشەکشەی کرد، چونکە دڵنیا بوو لەوەی کە سەرکەوتن بەسەر سوپایەکی هاوچەرخی پاڵپشتیکراو لەلایەن هاوپەیمانانەوە سوود ی نابێت[6]، بەڵام لە هەمان کاتدا جیهادی لەدژی وڵاتانی هاوپەیمان جاڕداو کە سوورن لەسەر لەناوبردنی گەلی تورکی[7].

بەهۆی ئەو فشارە زۆرەوە، حکوومەتی فەرید پاشا لە ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ دەست لەکارکێشانەوەی پێشکەشکەش کرد. لە ٢١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠[8] دوایین حکوومەتی عوسمانی بە سەرۆکایەتی تۆفیق پاشا پێکهات، کە ئەندامی لایەنگری نیشتیمانپەروەرانی لەخۆکرتبوو، بۆنموونە عزەت پاشا[9].

---

١- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٧٦.

٢- سحر عباس خضير، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٣٦.

٣- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٧٧.

٤- سر ريد بولارد، بريطانيا والشرق الاوسط من اقدم العصور حتى ١٩٥٢، ترجمة حسن احمد السلمان، بغداد، ١٩٥٦-١٩٥٧، ل ١٠٤.

٥- كمال مظهر احمد، كردستان ...، ل ٣٥٠.

6- G.Lewis,Op.Cit., P.66 .

٧- سحر عباس خضير، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٣٦.

٨- كمال مظهر احمد، كردستان ...، ل ٣٥٠.

٩- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل ٣٧-٣٨.

بەریتانیا دوای ئەوەی وای لە حکومەتی فەرید پاشا پەیمانەکە مۆربکات، تەکتیکێکی نوێی بۆ رووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکارییە تازەکان گرتەبەر، کاتێ وازی لە پاڵپشتیکردنی حکومەتی فەرید پاشای هاوپەیمانی کۆنی هێنا، بەریتانیا لەمەدا دوو ئامانجی سەرەکی پێکا: فەرەنساو ئیتاڵیای پێ رازی کرد کە ئەوکات مەترسیان لەسیاسەتی بەریتانیا هەبوو[1]. دووەم، بەدیهێنانی خواستی وڵاتانی هاوپەیمان لە دروستکردنی وەزارەتیك کە نیشتیمانپەروەرانی تێدا بێت و بۆ ئەوەی جۆرە گفتوگۆییەك لەنێوان هەردوو حکومەتەکەی ئەنقەرە وئەستەمبوڵ بێتەدی و شاندێك بۆ ئەنادۆڵ بۆ ئەو مەبەستە نێردرا[2]. بەمەش هەڵەکانی مستەفا کەمال بۆ بەدەستهێنانی هاوسۆزی و پاڵپشتی دەرەکی بۆ کێشەکەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەمەش خۆی لە مۆرکردنی رێککەوتنێك لە نێوان حکومەتەکەی و رووسیای سۆڤیێتی لە ٢٤ ئابی ١٩٢٠ دەبینێتەوە[3]، ئەمەش رێگەی بۆ خۆشکرد تاکو یارمەتی یەکتری بدەن لە دژی دوژمنی هاوبەشیان، ئەم رەوشە هاندەرێك بوو بۆ هێزە کەمالییەکان تاکو ئەرمەنەکان بکشێنێتەوە و پرۆژەی دەوڵەتی ئەرمەنی[4] لە خاکی تورکی کۆتایی پێ بێنێت[5]. لەلایەکی دیکەوە بەریتانیا

1- Robeck to Curzon,Constantinople,22-11-1920, DBA,Vol.2, No.150, P.377.

2- S.R .Sonyle,Op.Cit.,P. 88.

٣- جاسم محمد شطب، العلاقات السوفيتية-التركية ١٩١٧-١٩٢٣، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب – جامعة بغداد، ١٩٩٥، ل ١١٧

٤- پەیمانی سیڤەر رێگەی بە ئەرمەندا کە ببنە لایەنێکی واژووکەری پەیمانەکە، دوای ئەوەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنی بڕیاردا کە ویلایەتەکانی ئەرزەرۆم و وان و بەتلیس و ترابزۆن و خەربوت و سیواسی دەگرتەخۆی. سەرۆکی ئەمریکی ویلسۆن رێگەی دا سنووری نێوان تورکیا و دەوڵەتی نوێی ئەرمەنی دیاری بکرێت، بەڵام دەرکەوتنی بزووتنەوەی کەمالی و دژایەتیکردنی بۆ پەیمانی سیڤەر و ململانێی وڵاتانی گەورە لەسەر مولکەکانی عوسمان وایکرد پرۆژەی ئەرمەنی تەنها بە مەرەکەبی سەر کاغەز بمێنێتەوە، سەیری:

- Osmanlli Belgererinde Ermeniler 1915-1920, T.C.Başbakanlik Devlet Arşivleri genel mudur Lugu Osmanli Arşivi daire Başbanligi, Ankara, 1994,P.263 ff. ;Akaby Nassibian,Op.Cit., PP.180-335.

5- Kamal H.Karpat, Op.Cit.,P.37 "

- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٧٨-٨١.



لەگەڵ هاوپەیمانان رێککەوت کە کۆنگرەی دووەم لە لەندەن لە ١٠ ی تشرینی دووەم ببەسترێت کە تا یەکی کانوونی یەکەمی ١٩٢٠ بەردەوام بوو[1].

ئەوەی لەو کۆنگرەکەدا ئامادەبووان سەبارەت بە تورکیا پێی گەیشتن ئەوە بوو کە هەردوو شاندی فەرەنسی و ئیتاڵی پێشنیازیانکرد کە لە پێناوی گەڕانەوەی ئاشتی بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبێت سیڤەر هەموار بکرێت[2]، بەڵام لوید جۆرج لە بەرگریکردن لە سیاسەتەکەی خۆی بەردەوام بوو، ئەمەش وایکرد لە هەڵوێستی توند بێت و بە ئاشکرا لە حکومەتەکەی لەلایەك و هەر دوو وڵاتی فەرنسا و ئیتاڵیا دووركەوتەوە. ئەمەش وایکرد ناکۆکی لە ناو حکومەتەکەی لوید جۆرج پەیدا ببێت، دوای ئەوەی هەندێ پیاوی حکومەتەکەی بە سیاسەتی حکومەت رازی نەبوون[3].

بە کۆتایی هاتنی ساڵی ١٩٢٠ کاروبارەکان بە بەرژەوەندی حکومەتی ئەنقەرە دەچووە پێش لە سەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و دەرەکی، دوای زامنکردنی سنووری باشوور و باکووری رۆژهەڵات لەگەڵ رووسیا، کەمالییەکان بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێزە یۆنانییەکان لە بەرەی رۆژئاوا دەستی بەتاڵ بوو، کە لە ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢١ دەستی بە هێرشێکی بەرفراوان کرد[4]. هەرچەندە یۆنان لەسەرەتادا بەسەر کەمالییەکان سەرکەوت، بەڵام کەمالییەکان لە کۆتاییدا توانیان دۆڕانیکی خراپیان تووش بکەن، هێزی کەمالییەکان لە رووی ژمارە و چەکەوە لەوان باشتر بوو، ئەو شەرە لە ئینۆنۆ روویدا و بە گرنگترین شەڕی سەربەخۆیی دادەنرێت[5].

کاریگەری ئەو سەرکەوتنە لەسەر ئاییندەی تورکیا زۆر گەورە بوو، فەرەنسای بە تەواوی چاوی بە هەڵوێستی خۆی لە پەیمانی سیڤەر گێڕایەوە، رازی نەبوو بەشێوەیەی ئێستای پەسندی بکات[6]. هەروەها هەڵوێستی ئیتاڵیا هەمان شێوە بوو[7]، هەرچی بەریتانیا بوو ناچاریوو

١- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٠.

٢- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٥.

3- S.R .Sonyle,Op.Cit., P. 86.

٤- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٨٦-٨٧.

5- S.R .Sonyle, Op.Cit., P.91"

- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٧.

6- Harding to Curzon, Paris, 12-12-1920,DBFP, I. Sir,Vol, 13, No. 194,P.202.

٧- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٨.

سیاسەتەکانی بەرامبەر تورکیا نەرم بکات، لوید جۆرج رازی بوو لەسەر ئەوەی چەند هەمواركردنێك بەسەر پەیمانی سیڤەر بکرێت[1]. هەر ئەمەش بوو هۆکاری بانگکردن بۆ گرێدانی گۆنگرەی سێیەمی لەندەن کە لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٢١ بەسترا، بۆ ئەوەی سەر لە نوێ باسی پرسی تورکی بکاتەوە،(بریانی) سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا بە پێیەی سەرۆکی کۆنگرەکە بوو، داوەتی فەرمی حکوومەتی یۆنانی و حکوومەتی تورکی ـ حکوومەتی ئەستەمبۆڵ ـ ی کرد، بەمەرجێ مستەفا کەمال یان نوێنەریکی ئەو[2] یاوەری شاندی تورکی بکات، ئەمەش نیمچە داننانێك بوو لەلایەن هاوپەیمانان بە حکوومەتەکەی، بەڵام تا دوای جێبەجێکردنی مەرجەکان لەسەری رازی نەبوو. لەسەرەتای شوباتی ١٩٢١ بەکر سامی بۆ بەشداریکردن لە کارەکانی گۆنگرە بۆ لەندەن نارد[3].

کۆنگرەکە لە ٢١ی شوباتی ١٩٢١ کرایەوە و کارەکانی تا ٢ی ئاداری ١٩٢١ ی خایاند، ئاشکرا دیاربوو کە هەڵوێستی بەریتانیا بەوەی کە بگونجی لەگەڵ گۆڕانکارییە نوێیەکان لەبارەی تورکیا نەگۆڕابوو، کە هێشتا لایەنگیری یۆنانی دەکرد، گفتوگۆیەکی دووروودرێژ لە نێوان بەکر سامی و لوید جۆرج روویدا، کە بە شێوەیەکی سەرەکی لەبارەی پرسی ئەزمیر و هەمواركردنەکان لە بەندەکانی سیڤەر بوون، سەبارەت بە ئیمتیازاتە بیانییەکان و کوردستان و کاروباری قەزایی و پۆستە، هەروەها کۆنکرە پرسی دیاریکردنی ژمارەی سوپا و ئەو هێزانەی تاوتویکرد کە بۆ تورکیا هەیە هەیان بێت[4]. لە سەرەتادا بەکر سامی لەسەر پێشنیازەکانی لوید جۆرج رازی بوو، بەڵام دوای راویژ بە ئەنقەرە، رازی بوونی لەسەر پەیمانەکەی بەستەوە بە سەروەرێتی تورکیا[5].

بەکر سامی داوای لە لوید جۆرج کرد، لە دەرەوەی چوارچێوەی کۆنگرەکە قسەوباس بکەن، لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەی کە لە ٤ ی ئاداری ١٩٢١ ئەنجامدرا، ئەوەی بۆ دەربڕی کە تورکیا خوازیارە لەگەڵ بەریتانیا بگاتە تێگەیشتن، سازشی زۆری لەبارەی پرسی

١- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٢.

2- Harding to Curzan, Paris, 26-1-1921, DBFP, Edited by W.N.Medlcott and Others, London, 1970, I.Sir,Vol.17, No.20, P.29.

٣- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٠٣-١٠٤.

٤- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٢.

٥- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٨.



تەنگەبەرەکان کرد و باسی لەوە کرد کە تورکیا نایەوێت گرفت لە موسڵ و وڵاتانی عەرەبی بۆ بەریتانیا بنێتەوە، چونکە ئەمە بەرای ئەو بایی ئەوە ناکات نرخی دۆستایەتی بەریتانیا لە پێناوی بدەین، ئەوەی پێشنیاز کرد کە قەوقاز ببێتە شورای جیاکەرەوەی نێوان تورکیا و وڵاتانی باکوور(رووسیای سۆڤیێتی)[1].

بەکر سامی بوونی لەندەن بۆ گرتنی پەیوەندی و چاوپێکەوتن جۆراوجۆر قۆزتەوە، هەرچەندە رێککەوتنی لەگەڵ بەریتانیا مۆرنەکرد، بەڵام رێککەوتنی لەکەڵ هەریەکە لە فەرەنسا و ئیتاڵیا و رووسیا مرۆکرد[2]. هەرچەندە ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی لەسەر هیچ یەکێك لەو رێککەوتنتانەی کە بەکر سامی لە لەندە مۆری کرد رازی نەبوو، بەڵام دەستکەوتی سیاسی زۆر گرنگی بۆ ئەنقەرە بەدەستهێنا، لەکاتێکدا وڵاتانی هاوپەیمان سەبارەت بە پرسی تورکییەوە دابەشببوون، وڵاتانی هاوپەیمان وەك حکوومەتێکی شەرعی دانییان پیانا، ئەمەش رێگەی بۆ مستەفا کەمال خۆشکرد، تاکو پرسەکە عەسکەری لەلایەك و سیاسی لەلایەکی دیکەوە چارەسەر بکات[3]. گرنگترین دەستکەوتی حکوومەتی ئەنقەرە لەوکاتەدا ئەوەبوو، لە ١٦ی ئاداری ١٩٢١ رێککەوتنامەی دۆستایەتی و بێلایەنی لەگەڵ رووسیا مۆرکرد[4]. هەرچەندە رووسیا ئامانجی خۆی لە مۆرکردنی ئەو رێککەوتنامەیە هەبوو[5]، بەڵام تورکیاش ئامانجی خۆی هەبوو[1]. گرنگی

1- S.R .Sonyle, Op,Cit,PP. 100-102.

٢- بەگوێرەی ئەو رێککەوتنەی کە لەگەڵ فەرەنسییەکان لە ١١ی ئازاری ١٩٢١ مۆرکرا، هەریەکە لەلای خۆیەوە چالاکی سەربازی دوژمنکارانەی دژ بەیەکتری راگرت، هەروەها پرسی سنوور و ئابووری گفتوگۆ کرا، بەگوێرەی رێککەوتنی بەکر سامی لەکەڵ ئیتاڵییەکان لە ٢١ ی ئازاری ١٩٢١، ئیتاڵیا خۆی بەوەوە پابەند کرد کە یارمەتی تورکیا دەدا تاکو تەراقیا و ئەزمیر دەگەڕێنێتەوە، لەبەرامبەردا ئیمتیازاتی ئابوری فراوان لە تورکیا دەست دەکەویت، سەیری:

- جورج لنشوفسكي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٥٥" حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٣.

٣- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٤.

٤- جاسم محمد شطب، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٦٣ -١٦٤ .

٥- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئامانجەکانی رووسیا سەیری:

- صبحي ناظم توفيق تركيا والتحالفات السياسية ميثاق سعد آباد.معاهدة الصداقة السوفيتية في وثائق المثليات العراقية في استانبول وانقرة١٩٣٠-١٩٥٣، بغداد، ٢٠٠٢، ل ل٢٩-٣٠.

پەیمانەکە لەوەدابوو، هەموو پابەندی وپەیوەستیەکان و پەیمانەکانی پێشووی نێوان روس و تورك ڕەشکردەوە، بنەمایەکی نوێی لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردولا دانا[2]. ئەمە سەرباری دەستکەوتە دیپلۆماسی و سیاسییەکانی حکوومەتی ئەنقەرە[3]، هەروەها بەهۆی ئەم ڕێککەوتنە یارمەتی سەربازی و دارایی گرنگ و گەورەی بەدەستکەوت کە لە جەنگی لە دژی یۆنان یارمەتیدا[4]. سەباری ئەمەش شاندی تورکی ئامادەبوونی لە لەندەن هەڵقۆزتەوە و ڕێککەوتنی دۆستایەتی لەگەڵ شاندی ئەفغانی لە ١ی ئاداری ١٩٢١ مۆرکرد[5].

شاندی تورکی لە ١٧ی ئاداری ١٩٢١ لەندەنی بەجێهێشت، بەبێ ئەوەی پرسی تورکی یەکلایی بکاتەوە، ئەمەش لە بەرئەوەی لوید جۆرج خواستێکی جیدی لەمەدا نەبوو[6]، شاندی یۆنانیش دەسەلاتێکی شاراوەی بۆ هێرشکردنە سەر ئەنادۆڵ پێدرا و لەندەنی جێهێشت[7].

هێزەکانی یۆنان لە ٢٣ی ئاداری ١٩٢١ دەستی بە هێرشێکی نوێ کرد، هەرچەندە لەسەرەتادا بالادەست بوو، توانی هەردو ناوچەی ئەفیون و قەرە حەسار داگیر بکات، بەلام شکستی هێنا دوای ئەوەی لە ناوچەی ئەینونۆی دووەم لە نیسانی ١٩٢١ گیریخوارد. دواتر لە ٢٤ی ئابی ١٩٢١ هێرشێکی نوێی لە نزیك رووباری سەقاریا کرد، ئەمەش کۆتاییەکی مەرگەساتئامیز بوو بۆ یۆنانییەکان و لەبەرامبەر سەرکەوتنێکی گەورە بۆ تورکەکان[8].

---

١- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئامانجەکانی تورکیا سەیری:

- سەرچاوەی پێشو ، ل ل ٢٩-٣٠.

٢- كمال المنوفي، تطور العلاقات السوفيتية التركية، مجلة السياسة الدولية، القاهرة، السنة السابعة، العدد ٢٤، ابريل١٩٧١، ل ١١٦.

٣- لە بارەی بەندەکانی پەیمانەکە سەیری:

-J.A.S.Grenville,Op.Cit.,PP.77-79

٤- الكسي فاسليف، رووسيا في الشرقين الادني والاوسط: من الرسولية الى البراجماتية، ترجمة المركز العربي للصحافة والنشر، مراجعة حمدي الحافظ، موسكو، د: ت، ل ٣٢.

5- S. R. Sonyel, Op.Cit.,1982,P.113.

٦- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٠.

7- Lord Kinross,Atatürk: The Rebirth of Nation,London,reprinted in 1990, P.264.

٨- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٩٦-١٠٣.



ئەو سەرکەوتنانەی تورکیا هەڵوێستی حکوومەتی ئەنقەرەی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەهێزکرد، لەبەرامبەر شکستی توندی سیاسەتەی لوید جۆرج بەرامبەر تورکیا، هەروەها داننانی ولاتانی بە حکوومەتی ئەنقەرەی خیرا کرد، بروسکەکانی پیرۆزبایی لە هیندستان و ئێران و عێراق و ئەفغانستان و رووسیا و ئەمریکا و ئیتاڵیا لە نوسینگەی مستەفا کەمال کەڵەکە ببوون[1].

مستەفا کەمال بڕیاریدا سەرکەوتنە سەربازی و سیاسییەکانی بۆ بەهێزکردنی تورکیا بخاتەگەڕ، لە رووی دیپلۆماسییەوە هەستی بەوە کرد کە دەستکەوتی دیپلۆماسی لە ڕێگەی گرێدانی پەیماننامەی سەربەخۆ لەگەڵ ئەو ولاتانەی کە لە دەورەی سیاسەتی بەریتانیا ناخولێنەوە دیتە دەست، پەیمانی قارس یەکەمین ئەو پەیمانانە بووە، کە حکوومەتی ئەنقەرە لەگەڵ کۆمارەکانی ئەرمینیا و ئازەربایجان و جۆرجیای سۆڤێتی لە ١٣ تشرینی یەکەمی ١٩٢١ مۆریکرد[2]، هەروەها پەیمانی ئەنقەرە لە ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢١ لەگەڵ فەرەنسا مۆری کردووە[3].

ئەو پەیمانانە، بەتایبەتی پەیمانی ئەنقەرە، بەگەورەترین سەرکەوتنی دیلۆماسی بۆ حکوومەتی ئەنقەرە دادەنرێت و گورزیکی کوشندەش لە سیاسەتی دوژمنکاری و دابڕاندن کە حکوومەتی بەریتانی بەرامبەر تورکیا دەیگرتەبەر. ڕێککەوتنامەی قارس دەربڕی سەرنەکەوتنی سیاسەتی بەریتانی لە قەوقاز و ئاسیای بچووك بوو. ئەو ڕێککەوتنە بە

---

١- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ٤٨.

2- Memorondum by Curzon Respecting Intervention Between Greece and Turkey, Foreign Office, 7-10-1920, DBFP, I.Sir, Vol.17 , No.405, PP.431-433“

- محمد عزة دروزة، سەرچاوەی پێشو، ل ٥١.

٣- گرنگترین دەستکەوتی کەمالییەکان لەم ڕێککەوتنە، بریتی بوو لە کۆتاییهێنان بە حاڵەتی جەنگ لە نێوان هەردولا و ئازادکردنی دیلەکان بوو، ئەمەش بواری زۆری بە کەمالییەکان دا تاکو بۆ شەڕی یۆنان دەستیان بەتاڵ بێت، و بەرەی باشووری زامن بکەن، سەیری:

- ذوقان قرقوط، المشرق العربي في مواجهة الاستعمار، مصر، ١٩٧٧، ل ١٦٣-١٦٤.

-Bernard Lewis,OP.Cit.,PP. 251-252; Stanford.J. Shaw and Ezel K. Shaw, Op.Cit., P.361.

(گورزێك بۆ شان و شكۆی هەموو ولاتانی رۆژئاوا لە رۆژهەلاتی دوور) وەسفكرا. ئەو رێككەوتنە وایكرد پەیوەندییەكانی توركیا لەگەڵ ئەو كۆمارانە رێكبخرێتەوە، سەرباری پەیوەندی دۆستایەتی كە لەگەڵ هەریەكە رووسیا و ئەفغانستان گرێیدا، بەمەش بەرەیەكی وا دروستبوو كە مەترسی بۆ بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا و رۆژئاوای لە رۆژهەلات بەگشتی و لە هیندستان بەتایبەتی دروست دەكرد، سەرلەنوێ دێوەزمەی هەڕەشەی رووسی بۆ دەسەلاتی بەریتانیا گەڕایەوە[١]. سەبارەت بەرێككەوتن لەگەڵ ئیتالیا، وایكرد هاوپەیمانێكی بەهێز بۆ بەریتانیا بۆ دۆستی دوژمنی بەریتانیا بگۆڕێت[٢]. سەبارەت بە پەیماننامەی لەگەڵ فەڕەنسا، بۆ سیاسەتی بەریتانیا قورس كەوت، چونكە ناكۆكی قوڵی نێوان بەریتانیا و فەڕەنسای سەبارەت بە پرسی توركیای بەدەرخست، كە وایكرد فەڕەنسا دان بە حكوومەتی ئەنقەرە بنێت، بەمەش فەڕەنسا یەكەم دەوڵەتی هاوپەیمانان بوو دانی بە حكوومەتی ئەنقەرە نا[٣]، هەروەها دانی بە زۆرترین داواكارییە هەرێمایەتییەكانی توركیا نا[٤]، بەریتانیا بە فەرمی لەسەر ئەمە نارازی بوو بە (ناكۆكییەكی توندی رێككەوتن و پەیماننامەی هاوپەیمانان و سیاسەتی لێگەیشتن و هاوكاری هاوبەشی نێوانیان) دینا[٥].

ئەو پەرەسەندنانە یارمەتی بەدەرخستنی رەوتی سیاسی نوێی لە بەریتانیای دا، كە بە توندی فشاری دەخستە سەر حكوومەتی لوید جۆرج تاكو پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ توركەكان ببەستێ بۆ ئەوەی ئاشتی لە هیندستان و رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەرقەرار بێت[٦]. هەوڵەكانی ئەو رەوتە لایەنگرەی توركیا لەلایەن خودی لوید جۆرج و لۆرد كریزنەوە بەرپەرچدرایەوە، بەلام حكوومەتی بەریتانی پێشتر گەیشتبووە ئەو بڕوایەی كە پێویستە پەیمانی سیڤەر هەمواربكرێت، ئەمەش لەو یادداشتەی كە لۆرد كریزن پێشكەشی هەردوو حكوومەتی

١- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٢٦.

٢- سر ريد بولارد، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٥.

٣- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٥.

٤- دانكورات ا. روستو، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٩٢.

5- Quoted in: Curzon to Harding, Foreign Office 3-11-1921, DBFP, I.Sir, Vol.I, No. 432, P.461.

٦- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٢٨-١٢٩.



فەڕەنسا و ئیتالیای كرد، گوزارشتی لێكرا، ئەو یادداشتە ئەو پێشنیازانەی كە بڕیاربوو گفتوگۆی لەسەر بكرێت، لەخۆگرتبوو، لەو كۆنگرە چاوەڕوانكراوەكە لەلایەن وەزیرانی دەرەوەی ولاتانی هاوپەیمانان بۆ هەمواركردنی پەیمانی سیڤەر گرێدەدرێت[١].

لەوكاتەدا یوسف كەمالی وەزیری دەرەوەی حكوومەتی ئەنقەرە بە راسپاردەی مستەفا كەمال سەرۆكایەتی شاندێكی توركی بۆ سەردانی پایتەختی چەند ولاتێكی ئەوروپی كرد، تاكو بتوانیت دانınان و پاڵپشتی بۆ گیشەی توركی بەدەست بهێنێت. لە ئاداری **١٩٢٢** شاندنی توركی بەرەو مەرسیلیا بەرێكەوت، دوای ئەوەی رەزامەندی حكوومەتی بەریتانی وەرگرت، حكوومەتی بەریتانیش لەلای خۆیەوە بروسكەیەكی بۆ سەرۆك وەزیرانی حكوومەتی ئەستەمبۆڵ كرد، رێگەی پیدا هەركاتێ بیەویت دەتوانێ نوێنەرێك بۆ لەندەن بنێرێت، ویستی ململانێی نێوان هەردوو حكوومەتی ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵ توند بكات[٢]. یوسف كەمال سەركەوتوو نەبوو لە رازیكردنی حكوومەتی ئەستەمبۆڵ بۆ نوێنەرایەتی كردنی لەبری ئەویش، حكوومەتی ئەستەمبۆڵیش لەلای خۆیەوە شاندێكی هاوشێوەی بە سەرۆكایەتی عیزەت پاشا نارد[٣].

هەركە یوسف كەمال گەیشتە لەندەن دووجار چاوی بە لۆرد كریزن كەوت، ویستی باوەڕی پێبهێنێت كە بەرژەوەندییەكانی نێوان توركیا و بەریتانیا یەكانگیر نابن، هەوڵیدا لە گرنكی رێككەوتنی لەگەڵ رووسیا كەمبكاتەوە، رایگەیاند كە تەنها رێككەوتنێكی دۆستانەیە و دژ بە بەریتانیا نیە. جەختی لەسەرئەوە كردەوە كە توركەكان لە گرێدانی رێككەوتننامە ئازادن لەگەڵ هەر ولاتێك بیانەوێت لێی نزیك ببنەوە، هەروەها ئەوەشی زیادكرد كە ئەو چەكە رووسیەی دەستیان كەوتووە، تەنها بۆ مەبەستی بەرگرییە[٤]، بەلام لۆرد كریزن بەو دڵنەواییەی

1- Memorandum of Proposal for Discussion at Conference of Allied Foreign Minister, on the Revision of the Treaty of Severs , 30-12-1921, DBFP,I.Sir, Vol.17, No. 496, enclosure,PP. 530-556 .

-الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٢٨-١٢٩.

2- Rumbold to Curzon, Constantionople 5-2-1922, DBFP, I.Sir, Vol.17, No.523, minute.I, P.11.

٣- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣١.

4- Memorandum of an Anterview Between the Curzon and Yussuf Kamal, Foreign Office, 10-3-1922. DBFP,I.Sir, Vol.17, No.555,PP. 657-658.

یوسف کەمال باوەڕی نەهێنا، بەڵام وەك هەنگاوی یەكەمی ئاشتی جەختی لە پێویستی جاڕدانی شەڕراگرتنێك لە نێوان حكوومەتەكەی و یۆنان كردەوە. هەرچی عزەت پاشابوو ئەوا زیاتر لە دووجار لۆرد كریزنی بینی[1].

ئەم چاوپێكەوتنانە دەرەنجامێكی وای نەبوو باسبكرێت، چونكە بەریتانیا ئەمەی تەنها بۆ زانینی نیازی كەمالییەكان بۆ شەڕكردن و ئاستی پەیوەندیان بە سۆڤێت و تێڕوانینیان بۆ ویلایەتی موسڵ، دەكرد. بۆیە یوسف كەمال سەرباری ئەو هەموو گۆڕانكارییە نوێیانە، لەوە دڵنیا بوو كە داخوازییەكانیان جارێ بەدی نایەت، بۆیە دوای سەرنەكەوتنی لە ئەركەكەی بۆ پاریس گەڕایەوە، چاوەڕێی دەرەنجامەكانی ئەو كۆنگرەیە بوو كە لەوێ لە ماوەی نێوان ٢٢-٢٦ی ئاداری ١٩٢٢ گرێدەدرێت و ناوی (كۆنگرەی رۆژهەڵاتی دووری) لێنرا[2].

یەكەم رۆژی كۆنگرەكە گەیشتنی هاوپەیمانان بۆ مەرجەكانی سازكردنی شەڕراگرتنی بەخۆیەوە بینی، گرنگترین بەندی داوای وەستاندنی چالاكییە سەربازییەكانی دەكرد بۆ ماوەی ٩٢ رۆژ، كە دەكرێت نوێ بكرێتەوە تا ئاشتی بەرقەرار دەبێت[3]. مەرجەكانی شەڕراگرتن خرایە بەردەم هەریەكە لە ئەسینا و ئەنقەرە و ئەستەمبوڵ، هەریەكە لە ئەسینا و ئەستەمبوڵ پێی رازیبوون، بەڵام ئەنقەرە بۆ پەسندنی مەرجی دانا[4].

هەڵوێستی حكوومەتی ئەنقەرە بە دڵی سیاسەتمەدارانی بەریتانی نەبوو، كریزن هۆشداری پێدان لە هەر دواكەوتنێك و دڵنیاییكردەوە، كە ئەو پێشنیازانە بریتین لە (چارەسەرێكی شەرافەتمەند و دادپەروەر) و رێگە نادات یاری بە هێڵە سەرەكییەكانی بكرێت[5].

---

١- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣٣.

2- Conversation in Paris Between British and Italian Represntatives, March 22-6-1922, DBFP, I.Vol. 17, Chapter 4, P.668"

الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣٤.-

3- Text of Reslution of Paris Eastern Conference of March 1922,ais Finally Agreed upon Between French an British Governments, DBFP, I.Sir, Vol.17, No. 570,PP.756-763.

4- Rumbold to Curzon, Constantinople, 30-1-1922,DBFP, I.Sir, Vol.17, No.513, P. 555.

5- S.R .Sonyle, Op.Cit., P. 164.



بەم هەڵوێستەی مستەفا كەمال سەركەوتوو بوو لەوەی درزی زیاتر بخاتە نێوانی بەریتانیا و هاوپەیمانەكانی (فەرەنسا و ئیتاڵیا)، ئەمەش كاتێ بەدەركەوت كە كریزن بۆ فەرەنسا و ئیتاڵیای پشنیازی كرد كە بۆ دوایین جار هۆشداری بە حكوومەتی ئەنقەرە بدرێت تاكۆ بە شەڕراگرتنەكە رازی بێت[1]، بەڵام ئەم دووانە بەمە رازی نەبوون و سیاسەتەكانیان بەلایەكی دیكەی جیا لە سیاسەتی بەریتانیادا كەوت[2].

سەرباری ئەو فشارە دەرەكیانە، بازنەی نەیارانی سیاسەتی ناوخۆی لوید جۆرج لە فراوان بووندا بوو، كەسایەتی دیاری ناو حكوومەتەكەی لە دیاریترینیان چەرچڵ چووە پاڵیان[3]. هەروەها لەو ماوەیەدا چارلس تاوزەندی ئەندامی پەرلەمانی بەریتانی سەردانێكی ئەنادۆڵی كرد و لەمیانەیدا چاوی بە مستەفا كەمال كەوت، ئەخلاقێكی باشی لەو بۆ بەریتانیا گواستەوە و ئامۆژگاری حكوومەتەكەی كرد كە لە دەركردنی یۆنانییەكان لە ئەنادۆڵ پەلە بكات[4]. ئەو گۆڕانكاری و فشارە نوێیانە وای لە جۆرج لوید نەكرد سیاسەتی خۆی لە ناوچەكە بگۆڕێت، پێی باشتر بوو لە پاڵپشتی یۆنانییەكان لەسەر بەرژەوەندی كەمالییەكان بەردەوام بێت[5].

ئەوكاتە كەمالییەكان تێگەیشتن كە هەوڵەكانیان بۆ گۆڕینی سیاسەتی بەریتان بەرامبەر وڵاتەكەیان، سوودی نابێت، هەروەها لە كاریگەرییەكانی فشارە ناوخۆییەكانی بەریتانیش بۆ گۆڕینی تێڕوانینی لوید جۆرج بۆ توركەكان بێ هیوا بوون، لەوە دڵنیابوون كە ئەگەر بەپەلە نەجولێن، لەوانەیە سەرلەنوێ خۆیان لەبەرامبەر بەریتانیادا ببیننەوە، ئەمەش وای لێكردن چەند رێوشوێنێك لە دەرەوەی سنووری ئەنادۆڵ وەربگرن.

---

1- Curzon to M. Chee tam (Paris) and R.Graham (Roma), Foreign Office 25-4-1922,DBFP, I.Sir, Vol.17, No. 609,PP. 705-707.

٢- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣٦.

٣- لە بارەی هەڵوێستی چەرچڵ لە سیاسەتی لوید جۆرج بەرامبەر كەمالییەكان سەیری:

-Lewis Broad,Winston Churchill 1874-1952, London, 1952,PP.192-194.

4- S.R .Sonyle,Op.Cit., P.150.

5- Debates in The House of Commons and A Speech of The Prime Minister Mr.Loyd George on British Near Eastern Policy, 4-8-1922, BDA,(1919-1937),Edited by Bilal Şimşir,Vol.4(1921-1922), Ankara, 1984,No.137, PP.338-339.

کەمالییەکان ئاگایان لە گرنگی هەڵکەوتی ویلایەتی موسڵ بۆ حکوومەتی بەریتانی هەبوو، ئەمەش بە گوێرەی میساقی نیشتیمانی کەمالییەکان بەشێکی جیانەکراوەی تورکیای هاوچەرخ بوو[1]، بۆ سوککردنی توندی دوژمنداری بەریتانی بەرامبەریان، هەوڵیاندا وەك کارتی فشار بۆ سەر سیاسەتی بەریتانی بەریبهێنن، جووڵانەوەکانیان بۆ لایەنی ئایینی و سیاسی و سەربازی دابەشکرد.

لەلایەنی سیاسییەوە، کۆمەڵە نهێنیەکان لە تەواوی ویلایەتی موسڵ لە چالاکی فراواندا بوون، مژدەی نزیکی گەڕانەوەی تورکەکانی دەدا، ناوی (دۆنانلەر ـ گەڕاوەکان)یان لەخۆنابوو، کەسایەتی دیار و گرنك نوێنەرایەتی ئەو ڕەوتەی لە بەغدا و باشووری کوردستان دەکرد. بە ئاشکرا بانگەوازیان بۆ گەڕانەوەی حوکمی تورکی و ڕزگاربوون لە حوکمی بەریتانیان دەکرد، هەندیکیان پەیوەندی بە مستەفا کەمالەوە کرد و داوای یارمەتی دارایی و سەربازیان لێکرد[2].

بەڵام لایەنی ئایینی، ئەوا شێخ ئەحمەد ئەلسنوسی[3] لە بواری پیادەکردنی فشار بۆ سەر ئیدارەی بەریتانی لە عێراق باشترین خزمەتی پێشکەشی کەمالییەکان کرد، کاریگەرییەکی بەهێزی بەهۆی ئەو بابەتە ئایینیانەی لە دژی بەریتانییەکان لە عێراق دەیوروژاند، نواند[4].

---

١- لەم بانگەشەیاندا پشتیان بە ماددەیەکی میساقی نیشتیمانی بەستبوو، کە پێویست دەکات هەموو ئەو زەویانەی کە زۆرینەی موسوڵمانی(تورکی — کوردی) تیدا نیشتەجێیە، بۆ تورکیا بگەڕێتەوە. سەیری:

- دانکورت أ.روستو، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٩١.

٢- ابراهیم خلیل احمد، ولایة الموصل دراسة في تطوراتها السیاسیة، ١٩٠٨-١٩٢٢، رسالة ماجستیر مقدمة الى کلیة الآداب، جامعة بغداد، ١٩٧٥، ل ٤٦٤ وما بعدها.

٣- دوای محەمەد ئەلمەهدی مامی سەرۆکایەتی تەریقەتی ئەلسنوسی کرد، ئەو تەریقەتە لە ١٨٥٩ لە لیبیا دروستبووە. لە کانوونی دووەمی ١٩٢١ گەیشتە دیاربەکر، نازناوی (جێگری خەلیفەی گەورە و وەزیرەکەی) لە خۆی نا، لە ئایاری ١٩٢١ بۆ ماردین چوو، لەوێ دەستی بە بانگەوازەکەی کرد، دژایەتی پاڵاوتنی مەلیك فەیسەڵی بۆ عێراق کرد، بۆیە ژمارەیەکێ یەکجار زۆر بڵاوکراوەی لە هەموولایەکی ویلایەتی موسڵ و بەشەکانی دیکەی عێراق دابەشکرد. سەیری:

- المصدر نفسە، ل ل ٤٩١-٤٩٤.

٤- ستیفن همسلي لونکریك، العراق الحدیث من سنة ١٩٠٠ الی سنة ١٩٥٠، ترجمة وتعلیق سلیم طه التکریتي، بغداد، ١٩٨٨، ج١، ل ٢٢٦" قاسم خلف عاصي الجمیلي، العراق والحرکة ...، ل ١٥٢.



بەڵام ئەوەی زۆر قورس لەسەر سیاسەتی بەریتانی کەوت، ئەوا لایەنە سەربازییەکەی بوو، کە پاڵپشتی هەردوو لایەنی سیاسی و ئایینییەکەی دەکرد، کە خۆی لە ناردنی هێزێکی سەربازی دیاریکراوی کەمالییەکان دەنواند بۆ ناوچەی ڕەواندز، دواتر بەهێزی دیکە پاڵپشتیان لەو هێزە کرد، لەو ناوچەیەدا تارادەیەکی زۆر ئامانجەکانیان پێکا، تا دووساڵ چالاکییە سەربازییەکانیان بەردەوام بوو[1].

شانبەشانی ئەمە و لەسەر ئاستی دیپلۆماسی، عەلی فەتحی وەزیری ناوخۆی حکوومەتی ئەنقەرە بۆ ئەورووپا نێردرا، دەسەڵاتی تەواوی لە ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورە و متمانەی تەواوی مستەفا کەمال پێدرا بوو، تاکو لەبارەی ئاشتی دانووستاندن بکات. لەڕێگەی بۆ لەندەن، لە پاریس وەستا و دووجار چاوی بە (بوانکاریە)ی سەرۆك وەزیرانی فەڕەنسی کەوت[2]، لە کاتێ چوونی بۆ لەندەنیش، دوای ئەوەی لوید جۆرج ڕازی نەبوو بیبینێ و کریزنیش خۆی نەخۆشکەواند، چاوی بە کۆمەڵێ بەرپرسی بەریتانی کەوت[3]، ئەوکاتە عەلی فەتحی لەوەگەیشت کە هەرچی ڕێگری بەردەم چارەسەری پرسی تورکی هەیە، لە لەندەنەوە دێت، بروسکەی بۆ ئەنقەرە کرد و باوەڕی وابوو کە لوید جۆرج و کریزن بەهۆی هێشتنەوەی ڕەوشی ئێستا بەهیوای ماندووکردنی تورکەکان و سەپاندنی ئاشتییەکی مەرگەسات بەسەریدا، لەسەر (خاپورکردنی تورکیا) سوورن. جەختی لەوەکردەوە کە بۆ بەدیهێنانی خواستە نیشتیمانیەکانی تورکییە پەنا بۆ گۆڕپانی جەنگ بەن[4].

مستەفا کەمال دوای ئەوەی باوەڕی بە گۆڕەپانی شەڕ هێنا کە ململانێکە یەکلایی دەکاتەوە، بڕیاریدا ڕەوشی نێودەوڵەتی بقۆزێتەوە، لە ٢٦ ئابی ١٩٢٢ سەرۆکایەتی سوپاکەی بۆ هێرشێکی گەورە کرد، بە هاتنی ٩ی ئەیلولی ١٩٢٢ دوای هەڵاتنی یۆنانییەکان و شکستیان لەبەرامبەر هێزە کەمالییەکان، هێزەکانی چوونە ناو ئەزمیرەوە[5].

مستەفا کەمال دلخۆشی خۆی بەو سەرکەوتنە گەورە نەشاردەوە و بە (گەورەترین سەرکەوتنی تورکیا نیشتیمانپەروەری بەسەر بەریتانیای ئیمپریالی) وەسفکرد[6]، بەڵام بەوەندە نەوەستا و سوربوو

---

١- سەیری بابەتی دووەم لە بەشی یەکەم بکە.

٢- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٩.

3- S.R .Sonyle,Op.Cit.,P.169.

4- S.R .Sonyle,Op.Cit.,PP.170-171.

5- Frank P.Chambers,Op.Cit., P. 340

6- S.R .Sonyle, Op.Cit.,P.175.

بەرەو تەراقیا و مەزایق بچێت، بەریتانیای لە هەڵوێستیکی ناسك دانا، کـە ئیرەیـی پـێ نـەبرێت. چونکە لە بارێکی وادا نەبوو، بتوانیت جەنگێك هەڵبگیرسینیت و نەزانێت دەرئەنجامەکەی چییە.

لەگەڵ ئەمەش لوید جـۆرج لـە هـەوڵێك بـۆ دەورەدانـی جووڵانـە خێـرا و ترسـناکەکانی کەمالییەکان دەستەوەستان نـەبوو و لـە چـەند لایەکـەوە بـزاوت: لەلایـەك لـە ١٦ی ئـەیلول داوایەکی ئاڕاستەی موستەعمەرات کرد و داوای یارمەتی سەربازی و مەعنـەوی لێکردبـوون، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەمە (هاواری جەنکە)[1]. لەلایەکی دیکەوە، زۆر هەلیـدا هاوپـەیمانی کلاسیکی بەریتانی — فەڕەنسی— ئیتاڵی کۆبکاتەوە و زیندوو بکاتەوە[2].

بەڵام خوێندەوەی لوید جۆرج بۆ رەوشەکە هەڵە بوو و دواکەوتیش، موستەعمەرات جگە لە نیوزلەندا وەڵامدانەوەی داواکەی لوید جۆریان رەتکردەوە[3]، فەڕەنسا رایگەیاند کە ئامادە نییە لەپاڵ بەریتانیا لە دژی تورکەکان بـچێتە جەنگـەوە، چـونکە فەڕەنـسییەکان هـەر لەبنـەماوە دژمنداری تورکەکانیان نەدەکرد، بڕیاریاندا هێزەکانیان لە (جەناق قەلعە و ئەزمیـد)ی تـورکی بکیشنەوە[4]. هەڵوێستی ئیتاڵیاش هێندە لە هەڵوێستی فەرەنسا جیا نەبوو، کاتێ رایگەیاند کە لەگەڵ تورکەکان لە رووی سەربازییەوە ناجەنگێت[5].

شانبەشانی جووڵانەوەی بەریتانی، تورکەکان توانیان لەگەڵ بولگاریا بۆ گـاری هاوبـەش دژ بە یۆنانییـەکان رێککبکـەون، هـەروەها لەگـەڵ سـربیش رێککـەوتن، هەڵوێـستی رووسـیاش زانراوبوو. ئەمەش هەموو رێگـا چـارەکانی حکوومـەتی لویـد جـۆرجی لـە گۆڕنـا. بۆیـە لـە گۆرەپانی نێودەوڵەتی بەتەنیا لەبەرامبەر تورکەکان مایـەوە، جگـە لـە یۆنانییـە دۆڕاوەکـانی بەردەم تورکەکان کەسێ دیکە پاڵپشتی لێ ناکات[6].

بەڵام ئەمە ئەوەی نەدەگەیاند کە بەریتان بە توانا ماددەی مرۆییـە مەزنەکانیـەوە، نـەتوانیت بەسەر تورکەکان سەرکەویت، بەڵام پێی باش بوو ئەو توانایانە نەدۆڕینێ، کە ئەو کات سەخت بـوو

١- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٤.

٢- محمد محمد صالح وآخرون، الدول الكبرى بين الحربين العالميتين١٩١٤-١٩٤٥، بغداد، ١٩٨٣، ل ١٢١.

٣- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٤.

4- S.R .Sonyel,Op.Cit.,P.174.

5- H.B.Sharabi,Op.Cit.,P37.

6- S.R .Sonyle,Op.Cit.,PP. 174-175.



بەدەست بهاتابووایە، بەهۆی ئەو رەوشەی کە ئیمپراتور بەگشتی پیایدا گوزرەی دەکرد. دواتر بۆچی شەڕ بکات؟ ئەوە بۆ بەرگری لە یۆنانییەکان؟ کە ئەمەش لەلای گەلی بەریتانی رەتکراوەیە[1].

حکوومەتی لوید جۆرج بـۆ ئـەوەی شـکۆی ئیپراتۆرەکـەی بپارێزێـت، بـۆ چارەسـەرکردنی پرسەکە پەنای بۆ رێگەی دیپلۆماسی برد، لەسـەر ئـەم بنەمایـە، دوای هـەوڵێکی زۆر کریـزن لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی فەرەنسا و ئیتاڵیا گەیشتە رێککەوتن کە یادداشتێك دابنرێت و تێیدا یۆنان و تورکیا بۆ گرێدانی کۆنگرەی ئاشتی لە ڤینیسیا بـانگ بکـرێن و وڵاتـانی هاوپـەیمان و وڵاتانی دیکەش ئامادەی بن[2]. مستەفا کەمال وەڵامی یادداشتەکەی دایەوە و رایگەیاند کـە دان بە ناوچەوی بێلایەن نانێت و ناتوانێت رێگە لە هێزە نیشتیمانیەکان بگرێت تـاکو تـەراکیا رزگار نەکەن، ئەو هەرێمەی کە هێشتا لە ژێر داگیرکاری یۆنانییەکاندایە[3].

تورکەکان بە چوونیان بۆ ناوی ناوچەی بێلایەن، تەنگژەیەکی سەربازی و سیاسی ترسناکیان هێناکایەوە، کە خەریك بوو جەنگ لە نێوان بەریتانیا و تورکیا بەرپا بکات، بەڵام هەوڵـەکانی فەڕەنسا، بە ناردنی فراکلین بۆیۆنی وەزیـری دەرەوەی، مـستەفا کـەمالی ئـارام کـردەوە دوای ئـەوەی بـەڵێنی جێبـەجێکردنی سـەرجەم داخوازییـە تورکییەکانیـدا، رازی کـرد سـوپاکەی بوەستێنێ[4]. لە کۆتاییدا مستەفا کەمال رازی بوو، ٣ی تشرینی یەکـەمی ١٩٢٢ی وەك وادەی کۆبوونەوە لە مۆدانیا دیاریکرد[5].

کۆبوونەوەکە وەك نەخشەی بۆ کیشرابوو سازکرا، لەلایەنی بەریتانی هارنکتۆنی فەرماندەی کەشتیگەلی بەریتان و لەلایەنی تورکی عیـسمەت پاشا وەك سـەرۆکی کۆنکرەکـە ئامـادەی

١- الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٥٥.

2- British Secretary's Notes of the Conference Between French President of the Council, the British Secretary of State for Foreign Affairs and the Italian Ambassador in Paris, 22-9-1922,DBFP, Vol. 18, No. 48,PP. 66-84.

3- H.B.Sharabi,Op.Cit., P. 37.

4- H.B.Sharabi,Op.Cit.,P.37"

- مصطفى الزين، ذئب الاناضول، لندن — قبرص، ١٩٩١، ل ١٨٢.

٥- تقع مودانيا على الجانب الاسيوي لبحر مرمرة، وتتوسط ازمير وباندرما .ينظر:

- Bernard Lewis,Op.Cit.,P. 254.

بوون، سەرباری ئامادەبوونی نوێنەرانی فەرەنسا و ئیتاڵیا و یۆنان[١]. دوای هەفتەیەك لە گفتوگۆی توند، کە تێیدا هەڵوێستی عیسمەت پاشا بە ئاشکرا رەق بوو[٢]، لە ١١ی تشرینی یەکەم شەرِوەستانی مۆدانیا مۆرکرا[٣].

شەرِوەستانەکە زۆر بەندی بە بەرژەوەندی تورکەکان لەوخۆگرتبوو، سەرباری راگرتنی چالاکییە سەربازییەکان لە ١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢، یۆنانییەکانیشی ناچارکرد بۆ تەراقیا پاشەکشە بکەن[٤]، بەم شێوەیە چالاکییە سەربازییەکان کۆتایی پیهات و تورکەکان تەراقیای رۆژهەڵاتیان بەبێ شەرِ دەستکەوت[٥].

شەرِوەستانەکە بە سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی گەورە بۆ تورکەکان دانرا، هەروەها کۆتایی بە تەنگژەیەك هێنا کە خەریك بوو جەنگ لە نێوان بەریتانیا و تورکیا بەرپا بکات، دوای شەرِوەستانەکە نێوەندە سیاسییەکانی بەریتانی هەموو لۆمەکانیان خستە ئەستۆی سیاسەتی دوژمنکارانەی لوید جۆرج بەرامبەر تورکەکان، ئەمەش رەوشی حکوومەتە ئیئتیلافییەکەی خستە هەڵوێستیکی سەختەوە، چونکە هیچ حسابی بۆ هەڵوێستی تورکەکان نەکردبوو، ویستی بە هێزێکی کەمەوە کارەساتیك بۆ بەریتانیا بە هەڵگیرسانی جەنگێك بنێتەوە کە دەرەنجامی زۆر خراپ دەبوو سەریان و پاساویشی نەبوو، دوای ئەوەی هاوپەیمانەکانی پشتیان تێکرد، ئەو تەنگژەیە هۆکاریك بوو کە لوید جۆرجی ناچار کرد لە ٢٣ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ دەست لەکار کیشانەوە پێشکەش بکات[٦].
بەریتانیا بۆ خاتری بەرژەوەندییەکانی خۆی دەستبەرداری شێوازە کۆنەکانی چ دیپلۆماسی یا جەنکی بۆ فشار خستنە سەر تورکیا بوو، لە پێناوی دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتیانەی کێشەکانیان بەریتانیا شێوازی دیپلۆماسی تازەی لەسەر بنەمای تیکگەیشتن لەگەڵ تورکیای گرتەبەر، لەبەرئەمەش بوو بانگی هەردوو حکوومەتی ئەستەمبوڵ و ئەنقەرە کرا، تاکو ئامادەی کۆنگرەی لۆزان بن[٧].

---

1- S.R .Sonyle,Op.Cit.,P.177.

٢- احمد قدامة، رجال السياسة في الشرق والغرب، دمشق، ١٩٣٩، ل ل ١٢٠ -١٢١.

3- Rumbold to Curzon, Constantinople,11-10-1922, DBFP, Edited by W.N.Medlcott and Others London, 1972, I.Sir, Vol.18, No.119, PP.186-187 .

4- S.R.Sonyle,Op.Cit.,PP.181-182; Stanford.J.and Ezel.K.Shaw, OP.Cit., P.364.

5- G.Lewis,Op.Cit.,P.71.

٦- محمد محمد صالح وآخرون، سەرچاوەی پێشو، ل ١٢١" الاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦٠.

٧- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٧.

# سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر کورد (١٩١٨ ـ ١٩٢٢)

ساڵانی یەکەم جەنگی جیهانی رەوشیکی نوێی هێنایە ئاراوە، کوردستان لەو ناوچانە بوو، کە جەنگی گەورەی لە نێوان لایەنە بەشەر هاتووەکان بەخۆیەوە بینی، ئەمە سەرباری کاریگەرییە ماددی و مرۆیی و سیاسییەکانی ئەو جەنگە لەسەر کورد[1]، لە دابەشکردنی کوردستان و پەکخستنی پەرەسەندنی بزووتنەوەی کوردی[2]، هەروەها کورد بینی دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتی لەو بەشەی کە بەر لەجەنکەکە بەردەتستێدابوو، لەدەستدەدا، هەروەك دەسەلاتی لە بەشی هەرە زۆری مەملەکەتەکەی لەدەستدا، جگە لە ئەستەمبۆڵی پایتەختی نەبێت.

رەوشە نوێیەکە بۆ یەکەمین جار بەم شێوەیە و بەم قەبارە گەورەیە زەمینەیەکی لەباری بۆ لکان و پەیوەندی راستەوخۆ نێوان بەریتانیا و کوردی رەخساند، کاتێ شەڕوەستانی مۆدرۆس (٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨) سازکرا، هێزەکانی بەریتانیا سنووری ویلایەتی موسڵیان بەرەو سەنتەری شارەکە بری بوو، هەر بەمەشەوە نەوەستابوون بەڵکو بەندەکانی رێککەوتنی شەڕوەستانیان بەو شێوەیە لیکدایەوە کە دەستگرتنی تەواو بەسەر ویلایەتە و هەموو خالە ستراتیژییەکانیان بۆ زامن بکات، زیاتریش لەمە کۆبوونەوەی دوایی مۆدرۆسیان بۆ ماوەی دوو هەفتە دواخست، بەر لەوەی رێککەوتنی شەڕوەستاندنەکە لە وادەی دیاریکراوی سەرەوە مۆر

١- بۆ ئازارەکانی کورد و کاریگەریەکانی جەنگەکە لەسەریان سەیری:

- کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ل١٩٧ - ٢٣٤؛ بلەج شێرکۆ، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٧٢ - ٧٦.

٢- بەشە رۆهەڵاتییەکەی هەر لە چوارچێوەی ئێراندا مایەوە، لەبەرئەوەی ئێران نەهاتبووە ناوچەنگەکەوە، بەشەکەی دیکە ببوو بە دوو کەرتەوە، بەشی باکووری هەر بەناو لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی دابوو، بەشی باشووری کەوتبووە چنکی ئینگلیزەکانەوە، سەیری

- کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ل ٣٥٤-٣٥٥.



بکرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی بوار بە هێزەکانیان بدرێت تاکو تەواو ویلایەتی موسڵ داگیر بکەن[1].
لە ٧ی ئایاری ١٩١٩ ئارلۆند ویڵسنی حاکمی سیاسی بەریتانی لە کەرکوك[2] رووی لە سەرکردە کوردەکان کردوو گوتی:" حکوومەتی خاوەنشکۆ حەزدەکات دڵنیاتان بکاتەوە کە بەرژەوەندییەکانی کورد لە کۆنگرەی ئاشتی بە هیچ شێوەیەك چاوپۆشی لێناکرێت....."[3].

بەڵام یەکەم پەیوەندی راستەوخۆ لە نێوانیان بەماوەیەك بەر لە یەکەم جەنگی جیهانی دەستی پێکرد، دەستپێشخەری پەیوەندییەکە لەلایەن کوردە هات، شەریف پاشا[4] لە ٢٣ی تشرینی یەکەمی ١٩١٤ یادداشتێکی بۆ سیر کۆکس نارد، دوای ئەوەی شەریف پاشا خزمەتەکانی لەبارەی کاروباری کورد پێشکەشی حکوومەتی بەریتانی کرد، بۆ یەکێتی کورد

1- G.Atiyyah, Iraq, the Emergence of a State, 1908-1921, Asocial Political Study, Beirut, 1973, P.167.

٢- سێر ئارلۆند تالبۆت ویڵسن(١٨٨٤ - ١٩٤٠) یەکێك لە بەناوبانگترین ئەفسەرانی هەڵمەتی بەریتانی بوو بۆ سەر عێراق، دوای پرسی کۆکس بووە حاکمی مەلەکی گشتی لە عێراق لە ساڵی ١٩١٨، لەسەردەمی ئەودا شۆڕشی بیستی عێراق بەرپا بوو، لەوانەبوو کە پێی باش بوو عێراق راستەوخۆ حوکمبکرێت، رۆڵێکی گرنگی لە لکاندنی کوردستانی باشوور بە عێراقەوە هەبووە، سەیری:

- A.T.Wilson,Clash of Loyalties Mesopotamia1917-1920, London, 1931“

- دیفید کورن، رجلان أقحما الأكراد بالعراق، مناورات كوكس- ولسن، ترجمة: حميد عبدالملك، جريدة الاتحاد، السليَمانية، العدد٣٢٦، ٩-٧-١٩٩٩.

٣- السر ارنولد ولسن، الثورة العراقية، ترجمة وتعليق: جعفر الخياط، ط١، بيروت، ١٩٧١، ل ١٨٣.

٤- شەریف پاشا (١٨٦٥-١٩٥١): کوڕی سەعید پاشای خەندانە، لە نێوان ساڵانی ١٨٩٨-١٩٠٨ پۆستی بالوێزی دەوڵەتی عوسمانی لە وڵاتی سوید وەرگرت، بە دامەزرێنەری کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کوردی دادەنرێت، ناوی لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس ١٩١٩ بە کێشەی کوردەوە لکا، کە لەو کۆنگرەیە نوێنەرایەتی کوردی کرد، لای نوێنەرانی هاوپەیمانان و ئەرمەن بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردی چالاك بووە، . سەیری:

- روهات الاكوم، شريف باشا سنوات عاصفة لديبلوماسي كوردي، ترجمة: شكور مصطفى، كوردستان العراق، ٢٠٠٤، ل ل ١٧-٢٣.

- فەرهاد پیربال، رۆژنامەگەری کوردی بە زمانی فەرەنسی، هەولێر، ١٩٩٨، ل ل٤٢-٤٤.

داوای یارمەتی لە بەریتانیا کرد و سەرباری چەند پێشنیازێکی کردەیی وەك ئۆتۆنۆمی بۆ کورد پێشکەشکرد[1]. شەریف پاشا ئەو داواکاریانەی لە حوزێرانی ١٩١٨ لە میانەی دووبارە چاوپێکەوتنەوەی بە سێر کۆکس لە میرسیلیا، دووبارەکردەوە[2]. ئارڵۆند ویڵسن وای بینی کە "کارلێکی بەریتانیا لەگەڵ کورد لەم قۆناغە بەلای کەمەوە، دەیویست ئەوەی بۆ عەرەب کردی بۆ کوردیش بیکات"[3]. پێدەچوو لایەنی بەریتانی جۆرێك لە وەڵامدانەوەی بۆ داواکاری کوردی هەبوو بێت، ئەمەش لەو پەروێزەی ئارڵۆند ویڵسن لە وەڵامی سێر کۆکس کە دواتر لە سەر یادداشتەکەی شریف پاشا نووسی بەدەردەکەوێت، کاتێ گوتی: "ئەو گرنگی بە هەر گفتوگۆیەك دەدات کە شەریف پاشا پێشکەشی دەکات"[4]. بەڵکو سێر مارك سایکس[5] زیاتریش لەمەچوو کاتێ ئەو پێشنازانەی بە ((کردەیی لە یەکخستنی کورد پشتی پێببەسترێ))[6] دانا.

---

١- احمد عثمان أبو بكر، كردستان في عهد السلام، أربيل، ٢٠٠٢، ل ل ٢٤٥-٢٤٦" السر ارنولد ولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ١٨١ .

٢- المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة: جعفر الخياط، ط٢، بيروت، ١٩٧١، ل ١٨٨" م.س.لازاريف، المسالَة الكردية ١٨٩١-١٩١٧، ترجمة: اكبر احمد، السليَمانية، ٢٠٠١، ل ٥٠٨.

٣- السر ارنولد ويلَسن، سەرچاوەی پێشو، ل ١٨١.

٤- احمد عثمان ابو بكر، كردستان في عهد...، ل ل ٢٤٥-٢٤٦.

٥- سیاسەتمەدار و ئەفسەری بەریتانی بوو، زۆر پۆستی وەرگرتووە، لەوانە (ملحق فخری) لە بالوێزخانەی بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ (١٩٠٥-١٩٠٦)، ئەفسەری هەیئەی ئەرکانی گشتی(١٩١٥-١٩١٦) و سکرتێری لێژنەی بەرگری ئیمپراتوری و سکرتێری سیاسی وەزارەتی جەنگ (١٩١٦-١٩١٩) و جێگری راوێژکاری کاروباری عەرەبی و فەلەستینی لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی ساڵی ١٩١٨، هەروەها ئامادەی کۆنگرەی ئاشتی پاریس ١٩١٩ بوو، ناوی بە رێککەوتنامەی سایکس- پیکۆی ١٩١٦ ەوە لکا، زۆر گەڕۆك بووە کە لە شێوەی کتێب ئەو گەڕانانەی نووسیوە، لە گرنگترینیان (بەناو پینج ویلایەتدا) و (نیشتیمانی ئیسلام، گەرانیك بەناو ١٠ ویلایەتی تورکیای ئاسیایی) و (دوایین میراتی خەلیفە.....) سەیری:

- مارك سايكس، القبائل الكوردیية في الإمبراطورية العثمانية، ترجمة: هەوراز سوار علي، تقديم ومراجعة وتعليق عبد الفتاح علي بوتاني، دهوك، ٢٠٠، ل ل ٢١-٢٢.

٦- احمد عثمان ابو بكر، كردستان في عهد...، ل ٢٤٦؛ سروه اسعد صابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤-١٩١٦، كردستان، ٢٠٠١، ل ل ٧٧-٧٨.



لەلایەکی دیکەوە ئەو ١٤ بەندەی کە سەرۆك ویڵسن لە کانوونی دووەمی ١٩١٨ رایگەیاندن[1] و لێدوانی بەریتانی — فەرەنسی کە لە ٧ تشرینی دووەمی ١٨ دەرچووە، کە تێیدا راگەیەنرا کە ئەو جەنگەی لەبەرەکانی رۆژهەڵات هەردوو حکوومەتی بەریتانی و فەرەنسی بەرپایانکردووە بە ئامانجی " رزگارکردنی تەواو و کۆتایی ئەو گەلانەیە کە رۆژگاریك بوو لە ژێر سەرکوتی تورکی نالاندویانە و دامەزراندنی حکوومەت و ئیدارەی نیشتیمانی خۆیانە کە دەسەڵاتەکەی لە خواست و ئیرادەی دانیشتووانەکەی سەرچاوەی گرتووە"[2]، ئەمانە هانی کوردیان دووبارە ئەو کۆمەڵە و رێکخستنانەی کە لەسەردەمی جەنگەکەدا مات ببوون چالاك بکەنەوە و کۆمەڵە و رێکخستنی نوێ دابمەزرێنن و داوای سەربەخۆیی کوردستان بکەن[3].

---

١- بۆ بینینی ئەو بەندانە سەیری: کەمال مەزهەر ئەحمەد رۆشنایەك لەسەر......ل٥٥ و ئەوانەی دواتر).

شایەنی باسە سەرکردە کوردەکانی ئەوکات هەوڵیاندا داواکاریەکانیان بەم بەندانە پشت ئەستوور بکەن، بۆ ئەوەی سیفەتێکی یاسایی نێودەوڵەتی بدەنێ، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو بەندانە لەسەرۆکی وڵاتیکی زلهێزەوە هاتوون، ئارڵۆند ویڵسن ئەو رووداوی تەوقەکردنەمان بۆ دەگوازێتەوە کە لە میانەی سەردانی بۆ لای ئەو شێخەی کە بریندار بوو و بەندکرا، دوای ئەوەی لە شەڕی دەربەندی بازیان لەبەرامبەر هێزەکانی بەریتانیا شکا، ویڵسن لە شوێنی دەستبەرکردنی سەردانی شێخ مەحمودی کرد لە بارەی رووداوەکە گوتی: " لە سلێمانی کاتی شێخ لە پۆستەکەیدا بوو لە سێ بۆنەدا بینیوومە، لە نەخۆشخانە بینیم بە ویقارەوە هەر دادگاییکردنیکی سەربازی بەریتانی رەتدەکردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی ١٢ (١٤) خاڵەکەی ویڵسۆن و لێدوانی بەریتانی — فەرەنسی کە لە ٨(٧)ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ دەرچووە، لەم دووانە(١٢ خالەکە و بەڵێنامەی فەرەنسی - بەریتانی) کۆپیە کوردییەکەی لە پەراوێزی پەرێکی سپی قوران بۆ کوردی وەرگێڕدرابوو، توند وەك نوشتە لەبن هەنگڵی گرێیدابوو، ئەم چاوپێکەوتنەی ویڵسونی گەورە فەرمانبەری بەریتانی وێنەیەکی لەبیرنەکراوی سەرکردەیەکی کوردی لە مێشکدا تۆمارکردوە کە بۆماوەیەکی درێژ لەگەڵیان جەنکا، ئەمەی دوای ١٠ ساڵ تۆمار کرد، سەیری:

- جرجيس فتح الله، يقظة الكورد: تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥، أربيل، ٢٠٠٠، ل ٢٢١.

٢- بۆ دەقی لێدوانەکە سەیری: فيليب ويلارد ايرلاند، العراق: دراسة في تطوره السياسي، ترجمة: جعفر الخياط، بيروت، ١٩٤٩، ل ٢٦٣.

٣- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کۆمەڵە کوردییەکان سەیری: ینظر: عبد الستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والأحزاب الكوردیية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٩، ل ل٣٧-٤٠؛ هوگر طاهر

به گوێرەی ئەو گۆڕانکارییە نوێیانە لە دوای جەنگەکە قسەوباسێکی زۆر لەبارەی رزگاری کورد لە میانەی دامەزراندنی دەوڵەتیکی سەربەخۆیی کوردی دەکرا[1]، ئەمەش لە لێدوانێکی نوێی بەریتانیا لە ١٨ تشرینی دووەمی ١٩١٨ جەختی لەسەر کرایەوە کاتێ لوید جۆرج لە ئەنجوومەنی عمومی بەریتانی رایگەیاند کە " ئەو کوردانەی کە ئاداری دەسەڵاتی تورکیان چەشتووە، لە سنووری نەتەوەییان مافیان هەیە"[2]. هەروەها لەبەردەم هەمان ئەنجوومەن گەرەنتی پێدان " کوردان بۆ ملکەچی هیچ حکوومەتێکی عەرەبی ناچار ناکرێن"[3]. کورد لە رێگەی نوێنەرەکانیان لە ئەستەمبۆڵ وا لە هاوپەیمانان گەیشتن کە خۆیان شێوازی حکوومەتی داهاتوویان بڕیار لێدەدەن، هەروەها سەربەخۆییش وەردەگرن[4]. بەم شێوەیە، دوای هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمان وەك باقی نەتەوەکانی دیکە هەلێکی مێژوویی بۆ کورد هەڵکەوتبوو تاکو خواستەکانی لە قەوارەی سیاسی بەدەستبێنن، لە رێگەی بە نێودەوڵەتیکردنی کێشەکەیان لە کۆنگرەی ئاشتی کە بڕیار بوو لە کانوونی دووەمی ١٩١٩ لە پاریس ببەسترێت. بزووتنەوەی کوردی لە دوای شەڕوەستانی مۆدرۆس سەرلەنوێ دەستی بە چالاکی نواندن کردەوە[5].

بەریتانییەکان لە ناو ئەو بۆیەرەدا خۆیان لە تەنگ و چەڵەمەدا بینیووە، لەسەریان پێویست بوو، پارێزگاری لە بەرژەوەندییە حەیاتیەکانیان بکەن. لەهەمان کاتدا دەبوو ئەو بەڵێنانەی لەبارەی مافی چارەنووس بە هەموو ئەو گەلانەی کە لە ژێر دەستی حکومی عوسمانی دەژیان دایان بوو، جێبەجێبکەن، بۆیە بەریتانییەکان هەوڵیاندا کورد بۆخۆیان راکێشن بە مەبەستی رووبەڕووبوونەوەی بانگەشەی کۆمکاری ئیسلامی لەلایەن تورکەکان و رووبەڕووبوونەوەی هەوڵەکانی تورکیا کە دەیویست کورد بکات بە دوژمنی بەریتانیا[6].

---

توفیق، دور الصحافة الکوردییة في تطویر الوعي القومي الکوردي ١٨٩٨-١٩١٨ دراسة تاریخیة تحلیلیة، رسالَة ماجستیر مقدمة الی مجلس کلیة الآداب، جامعة صلاح الدین، ٢٠٠٤، ل ل٢٢-٢٣.

١- برهان الدین ابابکر یاسین، سەرچاوەی پێشو، ل ل٣٩-٤٠.

٢- مقتبس من: قاسم خلف عاصي الجمیلي، تطورات واتجاهات...، ل ١٢٨.

٣- سي.جي, ادموندز، کورد وترك وعرب، ترجمة: جرجیس فتح الله، ط ٢، اربیل، ١٩٩٩، ل ١١٤.

٤- سر ارنلد تي ویلسون، بلاد مابین النهرین بین ولاءین، ترجمة: فؤاد جمیل، بغداد، ١٩٩٢، ج٣، ل ٣٣.

٥- المس بیل، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٠٥

٦- برهان الدین أبا بکر یاسین، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٠.



دیاریترین بەرنامەدانەرانی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانی بە شێوەیەکی چڕوپڕ داهاتووی کوردیان لە (کۆنگرەی دائیرە فەرمییەکان لەبارەی کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) کە لە تەلاری وەزارەتی دەرەوە لەندەن لە ١٧ ی نیسانی ١٩١٩ بەسەرۆکایەتی لۆرد کریزنی وەزیری دەرەوە گرێدرابوو، گفتوگۆکرد. ژمارەیەك لەوانە چەند پێشنیازێکیان لەبارەی داهاتووی وڵاتی کوردان پێشکەشکرد، دیاریترین ئەو پێشنیازانەش ئەوەبوو کە ئارلۆند ویڵسن پێشکەشی سەرۆکی کۆنگرەکەی کرد و کە دوو رێگاچارەی بۆ ئیدارەی ناوچە کوردییەکان لە خۆگرتبوو: یەکەم، دامەزراندنی کوردستانیکی خاوەن ئۆتۆنۆمی کە سەنتەرەکەی موسڵ بێت، کە خواستەکانی کورد بەدیبهێنێت و لە داهاتوودا بۆ قەوارەیەکی سەربەخۆیی کوردی بگۆڕێت. دووەم، ویلایەتی موسڵ بکرێتە بەشێك لە وڵاتی میزۆپۆتامیا، کە بە چەند وڵاتۆچکەیەکی کوردی خودان ئۆتۆنۆمی وەك سلێمانی، رەواندز، ئامێدی، جەزیرەی ئیبن عومەر(بۆتان)..... دەورە درابێ و لەلایەن سەرۆکە لۆکالیەکان و راوێژکارانی سیاسی بەریتانی کە راستەخۆ سەربە بەغدا بێت ئیدارە بکرێن[1]. پێ دەچێت لەسەرەتادا ویڵسن رای باشی دابێت، بەتایبەتی رێگەی دووەمی، کاتێ پێشنیازی کرد دیاربەرکر و جەرابلوس و ئورفە ئەم چارەسەر بیانگرێتەوە، پێشنیازی کرد کە ژەنەڕاڵ شەریف پاشا و سەید عبدالقادر شەمدینانی[2] یان کەسایەتییەکانی خانەوادەی بەدرخانیەکان بەرپرسیاریتی حوکمی ئەو وڵاتۆچکانە بگرنە ئەستۆ، بەڵام ویلسون رای وەزیری دەرەوەی پێ باش نەبوو، کاتێ باسی لەوەکرد کە ئەو پێی

---

١- احمد عثمان ابو بکر، کردستان في عهد...، ل ل ٩٨-١٠٠.

٢- سەید عبدالقادر شەمدینانی(١٨٥١-١٩٢٥): کوڕی شێخ عوبێدوڵای نەهری(شەمدینانی)ە، بەشداری لە جەنگی رووسی — عوسمانی کردووە، لە پاڵ باوکی یەکێك بووە لە چالاکەکانی شۆڕشی ١٨٨٠، سوڵتان عبدالحەمید رێگەی پێدا لە مەککە بگەرێتەوە، کە دوای شکستی شۆڕشەکەی باوکی بۆ ئەوێ دوورخرایەوە، لەو ئەستەمبۆڵ نیشتەجێکرا، دوای ئەوەی بە نهێنی دەستی بە چالاکی کرد، بووە ئەندامی ئیتحاد و تەرەقی، دوای ئاشکرابوونی، دووبارە سوڵتان عەبدولحەمید بۆ حیجاز دووری خستەوە. دوای کودەتای دەستووری ساڵی ١٩٠٨ سەرلەنوێ بۆ ئەستەمبۆڵ گەڕایەوە، چەند پۆستی لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرتووە، لە ٢٧-٩-١٩٢٥ بە تۆمەتی پەیوەستی بە بزووتنەوەی کوردییەوە لەگەڵ کوڕێکی و کۆمەڵێك سەرکردەی کورد لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکییەوە لە سێدارەدران. سەیری:

- تەها حسین دۆسکی، کورتەیەك ژین و تێکۆشینا سەید عەبدولقادری نەهری، گۆڤاری ڤەژین،دهۆك، ژمارە (١٦)، هاڤینی ١٩٩٩، ل ل ٣٥-٦٥ .

باشە ئیدارەی ئەو ناوچانە بۆ تورکیا لێ بگەڕێت، چونکە دامەزراندنی پاریزگایەکی سەربەخۆ سەنتەرەکەی دیاربەکر بێت، کوردی ویلایەتی موسڵ دەورژێنێ و هاوسەنگی ناوچەی میزۆپۆتامیا لاسەنگ دەکات، سەرباری تێچوونی سەربازی بۆ پارێزگاری لێکردنی. هەروەها ویلسۆن ئەو کەسایەتیانەی کە لەلایەن وەزیری دەرەوە بۆ بەرپرسیاریتی کوردستان پێشنیازکرابوون، بە نا لێهاتوو بینی و پاساوی هێنایەوە و گوتی: "ئەوانە لە رەوشی ناوچەی هەرێمایەتی دابڕاون، پێناچێت خەڵکی پێشوازیان لێ بکات". لە کۆتاییدا ویلسۆن هاوڕا بوو لەگەڵ کریزن لەبارەی گەڕانەوەی دەسەڵاتی تورکی بۆ دیاربەکر[1].

پێدەچوو دەمەقاڵێ لەبارەی داهاتووی کورد درێژەی کێشا بێت، بەڵام دواتر ئەو رایە بەرجەستە بوو کە ویلایەتی موسڵ بە عێراقی عەرەبی بلکێنرێت، بەڵام دەبێت چەند دەوڵەتۆچکەیەکی کوردی خودان ئۆتۆنۆمی[2]، کە لەلایەن سەرکردە کوردەکان و راوێژکارانی بەریتانی حوکم بکرێن، وەك پشتێنەیەك دەورەی ئەو ویلایەتە بدات[3].

هەرچۆنێ بێت هەوڵەکانی کورد و وەڵامدانەوەی بەریتانی لە کۆنگرەی ئاشتی (١٨ کانوونی دووەمی ١٩١٩- کانوونی دووەمی ١٩٢٠) بەدیاریکراویش لە ٣٠ کانوونی دووەمی ١٩١٩ بۆ واقیع وەرگێڕدرا، کاتێ هاوپەیمانان پێشنیازێکیان بە لوید جۆرج دا "هاوپەیمانان و وڵاتانی هاریکار لەسەر ئەوەی کە ئەرمینیا و سوریە و میزۆپۆتامیا و کوردستان و فەلەستین و دورگەی عەرەبی پێویستە بە یەکجاری لە ئیمپراتوری تورکی دابڕێن، رازین، بەڵام پێویستە ئەمە کاریگەری لەسەر رەوشی بەشەکانی دیکەی ئیمپراتۆرەکە نەبێت"[4].

---

١- احمد عثمان ابو بکر، کردستان في عهد...، ل ١٠٢.

٢- ئۆتۆنۆمی، جۆرێکە لە سیستەمەی سیاسی بۆ حوکمکردن، حکومەتەکانی ئۆتۆنۆمی بەهۆی ئەوەی لەلایەن دەسەڵاتی مەرکەزییەوە رێگەیان پێدراوە، لە بوارەکانی یاسادانان خودان حوکمی خۆیانن، هەروەها ئۆتۆنۆمی دەبەخشرێتە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانیش بۆ ئەوەی ئەو یاسایانە دابنێن کە کۆنترۆڵی گۆڕەپانی چالاکییەکانی دەکات. سەیری:

- المعجم الحديث للتحليل السياسي، تأليف: *Geoffre Roberts and Alistair Edwards*, ترجمة: سمير عبدالرحيم الجلبي، لبنان، ١٩٩٩، ل ل ٣٧-٣٨.

٣- احمد عثمان ابو بکر، کردستان في عهد...، ل ١٠٥.

4- Harry N.Howard, The Partition..., P.221; Paul C.Helmerich , Op.Cit., PP.26-27.



هێنانی ناوی کوردستان لە کۆنگرەی ئاشتی وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ وەك ئەوە وابوو کە مۆرکێکی یاسایی بەسەر پرسی کورددا ببرێت، لەلایەك ئاماژەیەکیش بوو بۆ بە نێودەوڵەتیکردنی کێشەی کورد و بڵاوبوونەوەی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، لەلایەکی دیکەوە پێشنیازەکەی لوید جۆرج کە کوردستانی خستە لیستی ئەو وڵاتانەی کە پێویستە سەربەخۆ بن، بەڵگەیەکی دیکەی گرنگی پرسی کورد بوو لە سیاسەتی دەرەوەی بەریتانی. لەوکاتەدا کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان لەلای خۆیانەوە چالاکی و هەوڵی زۆریان دا، کە بووە هۆی ئەوەی ژەنەراڵ شەریف پاشا وەك نوێنەری کورد لە لای هاوپەیمانان بناسرێت[1]. دوای ئەوەی شەریف پاشا خۆی وەك نوێنەری کورد پێشکەشکرد، دوو یاداشتی بەناوی کوردەوە (٢٢ ئاداری ١٩١٩ و یەکی ئاداری ١٩٢٠) بەرزکردەوە، کە داخوازی[2] کورد و نەخشەی تەواوی کوردستانی لەگەڵ هاوپێچکرابوو[3].

دوای ئەوەی نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردی[4] چاویان بە لیژنەی کینگ کراین (*King-Crane*)[5] نێردەی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ١٣ ئابی ١٩١٩ کەوت، هیوایان بەهێز بوو، دوای

---

١- م.أ.حسرتيان، القضايا القومية في تركيا، ترجمة: سيامند سيرتي، مراجعة وتقديم عزيز داود محمد، سوريا، ١٩٩١، ل ١١.

٢- لە بارەی ناوەڕۆکی هەردوو یاداشتەکە سەیری:

- روهات الاکوم، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٨٤-١٩٥.فؤاد حمه خورشيد مصطفى، القضية الكوردية في المؤتمرات الدولية، أربيل، ٢٠٠١، ل ل ١١٥-١٣١" إبراهيم الداقوقي، اكراد تركيا، دمشق، ٢٠٠٣، ل ل ١٧٢-١٧٣.

- Harry N.Howard, the Partition …, PP.226-227.

٣- سەیری پاشکۆی ژمارە (١) بکە.

٤- دوای ئەوەی ململانێی بەریتانی فەرەنسی لە بارەی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی رێککەوتنامەی سایکس پیکۆ لەلایەك و بەرپابوونی ململانێ لەنێوان چوار زلهێزەکە لە بارەی دابەشکردنی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەکێ دیکەوە، ئەو لیژنەیە بە پێشنیازی ئەمریکی دامەزرا . لەم میانەدا سەرۆکی ئەمریکی ویلسۆن پێشنیازی کرد کە لیژنەیەکێ نێودەوڵەتی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بنێردرێت و رای دانیشتووانەکەی لە بارەی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ وەربگیرێت، ,,,,,، سەرباری ئەوەی بەریتانیا و فەرەنسا بە پێشنیازەکە رازی نەبوون، بەڵام هەر جێبەجێکرا، هێنری کنك بە سەرۆکی لیژنەکە دیاریکرا و چارلس کرین بە جێگری، بۆ زیاتر زانیار لە بارەی لیژنەکە سەیری:

- Harry N.Howard, King- Crane…, P. 36 ff.

٥- پارتێکی کوردی چالاکی بوو لە ساڵانی ١٩١٩ تا ١٩٢٠، لە ساڵی ١٩٢٠ سەلیم بەکر سەرۆکایەتی دەکرد، پێشتریش پارتەکە پشتگیری لە شەریف پاشا بۆ نوێنەرایەتی کورد کردبوو. سەیری:

دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیان لەو ناوچانەی کە زۆربەی دانیشتووانەکەی کوردن کرد، لە خەربوت و دیاربەرکر و وان و بەتلیس و بەشێك لە ئەرزنجان .داوای ویلایەتی موسڵ و دەروازەیەکی دەریاییشیان کرد، هەروەها داوایان کرد دەوڵەتەکەیان خودان سەربەخۆیی خۆی بێت و لە ژێر ئینتیدابی بەریتانی بێت و هیچ پەیوەندییەکی سیاسی بە عەرەب و تورکەوە نەبێت[1]. لیژنەکە لە کورتەی راپۆرتەکەیدا لەبارەی کورد ئەمەی نووسیبوو: "دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێت هەموو کوردانی دانیشتووی فارس و عێراق و تورکیا لەو سنوورەی پێشنیازکراوە لەخۆبگرێت..."[2].

پێدەچوو کێشەی کورد گەیشتبێتە لوتکەی بوژانەوەی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، بەمەش بزووتنەوەی کوردی دەستکەوتێکی سیاسی و نیشتیمانی گەورەی بۆ گەلی کورد بەدەستهێنا، بەڵام پشتگیری بەریتانی لە کێشەی کورد بە نیازی ئەوە نەبوو کە بەشە گرنگەکانی کوردستان بخاتە نێو قەوارە کوردییە سەربەخۆکەوە، ئەو بەشانەش لە کوردستانی باشوور (ویلایەتی موەسڵ) بوون، هەروەها لەو ماوەیەدا بە هیچ شێوەیەکیش باسی لە کوردستانی رۆژهەڵات(ئێران) نەکردبوو، بەڵکو هەر لە رۆژانی یەکەمی کۆنگرەی ئاشتی هەوڵیدا هەڵسوکەوتێکی تایبەت لەگەڵ کوردستانی باشووردا بکات، دەستەیەك لە فەرمانبەرانی خۆی بۆ ئەو ویلایەتە نارد، هەروەها لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ۱۹۱۹ حکوومەتێکی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دامەزراند[3]. توێژەری ئەمریکی هاوارد H.N.HOWARD پێشنیازەکەی لوید جۆرج لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی باڵای هاوپەیمانان لەبارەی دامەزراندنی کوردستانێك لە نێوان ئەرمینیا و میزۆپۆتامیا پێشکەشی کردبوو، بە واقعێك دانا کە "بە دامەزراندنی بەربەستێکی ئارامی نێوان ویلایەتی موسڵ و تورکیای" دانا[4].

هەڵوێستی بەریتانی لەبارەی پرسی کوردەوە لە میانەی چاوپێکەوتنەکەی کریزنی وەزیری دەرەوەی بەریتانی بە هاوتا فەرەنسییەکەی بیجو لە لەندەن لە ۲ی تشرینی دووەمی ۱۹۱۹

---

– ولید حمدي، الکُرد وکردستان في الوثائق البریطانیة دراسة تاریخیة وثائقیة، لندن، ۱۹۹۱، ل ل۲۳۹-۲٤۰.

۱- سحر عباس خضیر، سەرچاوەی پێشو، ل ل ۱۳٤-۱۳٥.

۲- مقتبس من: المصدر نفسه، ل ۱۳۹.

۳- السر ارنولد ولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ۱۸٥.

٤- سەیری کتێبەکەی بکە:

- The partition …, PP.220-221



زیاتر بەدەرکەوت، کە کریزن بە توندی پێشنیازی فەرەنسی لەبارەی کردنەوەی جێ پێیەك لە کوردستان رەتکردەوە و پێی باش بوو چەند قەوارەیەکی کوردی یان قەوارەیەکی کوردی دوور لە "دەسەڵاتی عوسمانی و فەرەنسی" دابمەزرێت[1].

ئەو هەڵوێستەی بەریتانیا کە کریزن لەبارەی کوردستان دەریبڕی لە کۆنگرەکانی دواتریش کە لەگەڵ بەرپرسانی هاوپەیمانان فەرەنسییەکان و ئیتاڵییەکان کۆبووەوە، دووبارەبووەوە، وەك کۆنگرەی لەندەن(۱۷ شوباتی ۱۹۲۰)[2] . هەروەها ئەو کۆنگرەیەی کە لە ۱۳ نیسانی ۱۹۲۰ لە تەلاری وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی بەسترا[3]، هەوڵەکانی بەریتانیا و پرۆژەکانی لەبارەی کوردستانەوە لە ۳۱ نیسانی ۱۹۲۰ لە سان ریمۆ، ئەنجوومەنی باڵای هاوپەیمانان تێڕوانینی بەریتانیای لەبارەی کوردستان وەرگرت[4]. دەرئەنجامی ئەو کۆنگرە و کۆبوونەوانەی نێوان وڵاتانی هاوپەیمان شێوەی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەرجەستەکرد، پەیمانی سیڤەری کە لە ۱۰ ئابی ۱۹۲۰ مۆرکرا، لە بەشی سێیەمی دەروازەی سێیەم ناوی (کوردستان)ی لە سێ بەند(٦۲ و ٦۳ و ٦٤) هێناوە[5].

---

۱- ولید حمدي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ۹۲-۹۳.

۲- احمد عثمان أبو بکر، کردستان في عهد...، ل ۹۲.

۳- المصدر نفسه، ل ۱۱۱.

٤- بۆ زانیاری لە بارەی پرسی کورد لە کۆنگرەی سان ریمۆ سەیری:

- احمد عثمان ابو بکر، کردستان في عهد...، ل ۱۱۸"لازاریف، المسالَة الکوردییة ۱۹۱۷-۱۹۲۳، ترجمة: عبدي حاجي، بیروت، ۱۹۹۱، ل ل ۱۷۱-۱۷۹.

٥- پەیمانی سیڤەر لە سێ بەنددا باسی لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کردبوو، ئەوانیش (٦۲ و ٦۳ و ٦٤) بوون، هەروەها بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەکی سێ ئەندامی درا کە بارەگای لە ئەستەمبوڵ بێت و نوێنەرانی بەریتانی و فەرەنسی و ئیتاڵی تێیدا بن، بە مەرجێ ئەو لیژنەیە لە ماوەی شەش مانگی دوای مۆرکردنی پەیماننامەکە پلانێك لە بارەی ئۆتۆنۆمی بۆ ئەو ناوچانەی کە زۆربەیان کوردنشینن پێشکەش بکات، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش لیژنەیەکێ دیکە کە نوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئێران و نوێنەریکی کوردی تێدایە، بەمەبەستی پشکنین و بڕیاردان سەردانی ناوچەکە دەکەن و دەبێت حکوومەتی عوسمانیش بە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی هەردوولاکە رازی بێت....ئەگەر کوردان لەماوەی ساڵێك لە جێبەجێکردنی پەیمانەکە دوای ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان داوای سەربەخۆیی تەواویان کرد، ئەوا بە گوێرەی ئەو وەسیقەیە دەبێت تورکیا لەسەر بەدیهێنانی ئەو دەستکەوتانە رازی بێت و دەستبەرداری هەموو ئیمتیازات و ماف و

سەرباری هەوڵەکانی شاندی کوردی لە کۆنگرەی ئاشتی بۆ خستنە ناوەوەی بەندێك سەبارەت بە کورد بۆ پەیمانەکە[1]، شوێن پەنجەی بەریتانیا لە تایبەتکردنی چەند بەندێك بە کورد بە روونی دیار بوو[2]. بە گوێرەی بەندەکانی پەیماننامە نوێیەکە، ئەوا قەوارە کوردییە

---

ناوی خۆی بێت لەو ناوچانە .... کە ئەمەش ئەنجام درا، ئەوا هێزی هاوپەیمانان هیچ لارییەکی لەسەر تێکەڵاوبوونێکی ئارەزوومەندانەی ئەو بەشەی کوردستان نیە کە ویلایەتی موسڵ دەگرێتەوە بۆ ئەو دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆیە. بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- فؤاد حمه خورشید مصطفی، سەرچاوەی پێشو، ل ل٥٧-٥٨" زهير عبد الملك، الأكراد وبلادهم كردستان بين سؤال وجواب، السويد، ١٩٩٩، ل ل ١٦٠-١٦١.سەیری پاشکۆی ژمارە ( ٢) بکە.

١- سەرباری ئەوەی کە رێگە بە شاندی کوردی بە سەرۆکایەتی شەریف پاشا نەدرا، ئەوا شاندی کۆمەڵە و کەسایەتی کوردی دیکە لە پێشکەشکردنی داخوازییەکانی گەلی لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس چالاك بوون. شێخ مەحموود لە ٢٠ ئازاری ١٩١٩ نامەیەکێ بۆ کۆنگرەکە ناردو هیوای خواست کە کەسێك هەبیت گوێ لە داخوازییەکانی گەلی گورد بگرێت، کە بەهۆی دەسەڵاتی تورکییەوە زۆری ئازار چەشتووە، هەروەها ئەوەشی زیادکرد کە دەستپێشخەریەکانی کۆنگرە بۆ رزگاری گەلانی چەوساوە موژدەیەکی خێرە بۆ نەتەوەی کوردی، شێخ لەگەڵ نامەکەیدا روونکردنەوەیەکێ لە بارەی رۆلی کورد لە مێژوو و گرنگترین میرنشینە کوردییەکان و ململانێیی عوسمانی هاوپێچکردبوو، جەختی لەوە کردبووە کە کوردستان نیشتیمانی کوردانە....هەروەها لەگەڵیدا واژووی کوردانی سەرجەم لایەکی کوردستانی پێوە بوو. سەیری:

- یاداشتەکانی شێخ (لەتیف) ی حەفید، کەمال نوری ساغیکردۆتەوە، هەولێر، ١٩٩٥، ل ل ٤٠ – ٤١ .

سەید عەبدولقادر نەهری، لەو کەسیاتیە کوردانە بوو کە داخوازییەکانی کوردی بە ناوی کۆمەڵەی کوردستان لە رێگەی شەریف پاشاوە خستەروو بەردەم کۆنگرەی ئاشتی، سەیری:

- احمد عثمان ابوبكر، نظرة في الوضعية الكوردية بعد الحرب العالمية الاولى، مجلة كاروان، اربيل، العدد ٣٢، مايس ١٩٨٥، ل ل ١٣٥-١٣٩.

٢- لەگەڵ ئەوەی کە رێگە بە شاندی کوردی نەدرا بەشداری لە کۆنگرەکەدا بکەن، بەڵام ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە شاندەکە کاریگەریان لەسەر بڕیارەکانی کۆنگرەکە دیاریکراو بووە، هەروەها ئاماژەبوو بۆ ئەو رۆڵە بنەڕەتییەی کە بەریتانیا لە داڕشتنی بەندەکانی تایبەت بەکورد گێراویەتی، ئەمەش بە گوێرەی تێروانینی بەریتانیا بووە بۆ رەوشی ئەوسای ناوچەکە بەم شێوەیە گونجاندوویانە، ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە بۆچی کوردستانی فارسی لە پەیمانەکەدا پشتگوێخرابوو لەگەڵ ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیش بوو. سەیری:



پێشنیازکراوەکە بەلای کەمەوە لە قۆناغی یەکەمی جێبەجێکردنی پەیمانەکە سنووری باکووری[1] دیاریکرابوو، بەم شێوەیە هاوپەیمانان لەو کوردانەیان گەیاند کە لەودیوی سنوورەکانی تورکیا نیشتەجێن، کە لەسەریان پێویستە حکوومەتی داهاتوویان دیاری بکەن، چونکە سەربەخۆی پێدەبەخشرێت[2].

لەسەر ئەم بنەمایە، پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی خودان سەربەخۆیی یان پێکهێنانی چەند قەوارەیەکی خودان ئۆتۆنۆمی کە لە سیاسەتی بەریتانی بەواتای دامەزراندنی ناوچەیەکی دابڕاو لە نێوان تورکی ئەنادۆڵ و ئەو نەتەوانەی کە بە تورکی قسە دەکەن لە ئاسیای ناوەند و قەوقاز دەهات. هەروەها دامەزراندنی کیانێکی کوردی لەلایەك بەواتای کەمکردنەوەی مەترسی پێکهێنانی یەکێتییەکی عەرەبیش دەهات، لەلایەکی دیکەشەوە بەمانای دامەزراندنی ناوچەیەکی دابڕاو لە نێوان تورکیا و کۆماری ئازەربایجانی خودان سەربەخۆیی لە یەکێتی سۆڤێت دەهات، هەروەرها بەمانای دامەزراندنی ناوەچەیەکی دابڕاو لە نێوان تورکیا و ئازەریەکانی ئێران دەهات، زۆربەی هەرەزۆری کورد سونە مەزهەب بوون، دەوڵەتی کوردی سونی لە دەوڵەتی شیعی ئازەریی جیا دەبێتەوە[3].

هەرچی دووەم گرنگی بۆ بەریتانیا ئەوە بوو کە ناوچەی کوردستان بەپێی رێککەوتنامەی سایکس – پیکۆ بەر رووسیا کەوتبوو، دواتر دوای شۆڕشی سۆسیالیستی ئۆکتۆبەر بووە ناوچەیەك، کە هیچ رێککەوتنێکی لە نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا لەبارەیەوە نەکرا، دوای ئەوەی

---

- کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ل ٣٤٥-٣٤٦.

١- باکووری کوردستان: یا کوردستانی مەرکەزی وەك لە هەندێ سەرچاوە هاتووە، ویلایەتەکانی ئەلیازك (معموره العزیز) کە لەم سەناجقانە، مەلاتیا، خەربوت و دێرسیم پێکهاتبوون، دیاربەکر کە لە سەناجقانە ئەرزەرۆم / ئازەربێجان و بایەزید پێکهاتبوون، ویلایەتی وان کە لە هەردوو سەنجەقی وان و هەکاری پێکهاتبوون، و ویلایەتی بەتلیس کە لە سەنجقەکانی کویخ و موش و بەتلیس و سێرت پێکهاتبوون، سەیری:

- کورد و کوردستان، نووسینی کومەڵێك لە پسپۆڕان و ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز، وەرگێڕانی حسێن عوسمان نێرگسەجاری – حسێن ئەحمەد جاف، کوردستان، ٢٠٠٣، ل ١٢.

٢- السر ارنولد ولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ١٩٨.

٣- روبرت اولسن، المسألة الكوردية في العلاقات التركية - الإيرانية، ترجمة وتقديم: محمد إحسان، أربيل، ٢٠٠١، ل ١٣.

بەریتانیا نەیتوانی لەبەرچاوی پێشبڕکێکارانی وەك پارۆیکی چەور قوتی بدا، بۆیە ویستی شوێن پێگەیەك لەو ناوچەیە بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێ دەسەڵاتی خۆی بەسەر عێراق و باشووری کوردستان بسەپێنێ. ئەمە وایکرد هەموو بانگەشەکانی تورکی لەبارەی خاوەنداریێتی عوسمانی بۆ ئەو ویلایەتە دەوڵەمەند بە نەوتە رەت بکاتەوە، چونکە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە کوردستانی تورکیادا، ئەوە بۆ تورکەکان سەخت دەکات کە داوای خاوەنداریێتی ویلایەتی موسڵ بکەن[1].

سێیەم گرنگی بۆ بەریتانیا، دەوڵەتی کوردی بۆ بەریتانیا و هاوپەیمانان کەڵکی جوگرافی و سیاسی دەبێت، دەبێتە فاکتەری لاوازکردنی مەترسییەکانی تورکیا و ئێران و هەتاکو عێراقیش، دەوڵەتێکی کوردی کە ناوچە کوردییەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا و باشووری رۆژهەڵاتی بگرێتەوە، زامنی ئەوەبوو کە کۆماری نوێ تورکی لە داواکردنی خاك مەحروم بکات، هەروەها توانای گەیشتنی بە رێگاکانی هاتوچۆ بۆ قەوقاز و ئێران و عێراق و سوریە کەم دەکاتەوە، بەڵکو بەکردەوە ناوچەیەکی دابڕاوی لە نێوان تورك و عەرەب پێکدەهێنا[2]. هەروەها بوونی دەوڵەتێکی کوردی خەسڵەتێکی ستراتیژی دیکە بە بەریتانیا و هاوپەیمانان دەبەخشێ، چونکە ئەو دەوڵەتە رۆڵی دەوڵەتی دابڕکەر (الدوله العازله - BUFFER- STAT) دەگێڕێت و لەکاتێ هەڵگیرسانی جەنگدا لە نێوان رۆژئاواو رووسیای سۆڤێتی، خاڵێك دەبێت بۆ دەرچوونی چالاکییە سەربازییە خێراکان کە لە هاوپەیمانانەوە ئاراستەی خاکی رووسی دەکرێت، بەتایبەتی کە ئەو دەوڵەتە لە کێڵگە نەوتییەکانی قەوقاز نزیکە[3].

سەرباری ئەمانەش زۆربەی سەرچاوەکانی ئاو و وزەی کارەبایی و سیستەمی ئاودێری لەم دەوڵەتە کوردییە نزیك دەبێت، دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بواری بە بەریتانیا و وڵاتانی هاوپەیمانان دەدا کە ئەو دەوڵەتە کوردییە و دانیشتووانەکەی وەك فاکتەری فشار بۆسەر هەریەکە لە تورکیا و ئێران بەکاربهێنن[4]. سەرەڕای ئەوەش بەریتانیا ویستی بە دەوڵەتکردنی کێشەی کورد بۆ سازشکردن لەگەڵ تورکیا بەکاربهێنێت، لە هەر پەیمانێکی دیکەی نێودەوڵەتی

١- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ١٣٠.

٢- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣.

٣- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ١٣٠.

٤- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٣-١٤.



کە بەدوای سیڤەردا دێت[1]. هەروەها بۆ بچووکردنەوەی بزووتنەوەی کەمالی کە تازە لە ناوچەی کوردستانی باکوور چالاك دەبوو[2].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدان پەیمانی سیڤەر هەرگیز جێبەجێنەکرا، پەیمانەکە هەر لەساتە وەختی مۆرکردنی وەسیقەیەکی مردوو بوو. لەبەر ئەو دژایەتیانەی لەخۆی گرتبوون، " حکوومەتی سوڵتان کە پەیمانەکەی مۆرکردبوو[3]، دەسەڵاتی لە بینینی چاو تێپەڕی نەدەکرد"[4]، کە وایکرد رای گشتی تورکی لە سوڵتان و حکوومەتەکەی بۆ بزووتنەوەی نیشتیمانی کە لە ئەنادۆڵ دەرکەوتبوو، وەربگەڕێت[5]. ئەو نارەزایەتییەی توندە جەماوەرییەی دژی پەیمانەکە بەرپا بوو حکوومەتی فەرید پاشا کە پەیمانەکەی مۆرکرد بوو، ناچارکرد دەست لەکاربکشێنێتەوە[6].

ململانێی توندی نێوان وڵاتانی گەورە لەسەر بەرژەوەندی رۆڵێکی گرنگی لە "لە گۆڕنانی پەیمانی سیڤەردا"[7] گێڕا، بەڵام ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە کە دەرکەوتنی بزووتنەوەی کەمالی رۆڵێکی گەورەی لە داڕشتنەوی نەخشەی سیاسی ناوچەکە هەبوو. کوردستانیش لەو هەرێمەدا بوو کە ئەو دووبارە رێکخستنەوەی بەخۆیەوە بینی، فاکتەری ئایینی و بانگەوازی جیهاد کە سەرانی بزووتنەوەی کەمالی بانگەشەیان بۆ دەکرد رۆڵی خۆی گێڕا، فاکتەری جوگرافیش کاریگەری لەوان کەمتر نەبوو، چونکە مستەفا کەمال بڕیاریدا ناوچەی باکووری کوردستان یا ئەوەی پێی دەگوترێت ئەنادۆڵی رۆژهەڵات بکاتە بنکەی دەرچوونی بزووتنەوەکەی، لەپاڵ ئەمەش مەیلی سەرکردە کوردەکان و دۆستایەتی گەلی کوردی بۆ خۆی بزووتنەوەکەی راکێشا[8]. جا ئەمەش چ بە وروژاندنی هەستی ئایینییان بێت یا بەڵێندان پێیان کە مافە نەتەوەییەکانیان وەردەگرن، وای بانگەوازکرد کە (رزگارکەری کوردستان) و

١- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ١٣٠.

٢- عبدالرحمن قاسملو، كردستان والاكراد، ترجمة: ثابت منصور، بيروت، ١٩٧١، ل ٦١.

٣- سر ريد بولارد، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٤.

٤- كمال مظهر احمد، كردستان...، ل ٣٥٠.

٥- سر ريد بولارد، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٤.

٦- محمد عزة دروزة، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٣

٧- كمال مظهر احمد، كردستان...، ل ٣٥٠.

٨- حامد محمود عيسى، القضية الكوردیية في تركيا، القاهرة، ٢٠٠٢، ل ١٤٦.

(بەرگریکاری خەلیفە) و (دەستبەسەرکەری هێزی داگیرکەری خاکی ئیسلامە کە کریستانی خوانەناس پیسیان کردووە)، ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکەوە بەڵێنی ئەوەی بە کورد دا کە دان بە داخوازییەکانیان لە سەربەخۆیی بە سنوورێك گەورەتر لەوەی لە پەیمانی سیڤەر نەخشەی بۆکێشراوە، دەنێ[1]، نیگەرانی کردن کاتێ هۆشداریکردنەوە کە (ئەرمەن بە پاڵپشتی هاوپەیمانان لە حسابی کورد دەوڵەت دادەمەزرێنن)[2]، لەپاڵ ئەمەش لە بروسکەیەکدا بە جێگری والی دیاربەکری راگەیاندن کە دەبێت شەڕ بکات و هەر کۆمەڵەیەك "دووبەرەکێ لە وڵات بنێتەوە" بەتایبەتی "یانەی کوردی" و "کۆمەڵەی تەعالی کوردی" لەناوبەریت[3]. بەهەرحاڵ، لۆژیکی رووداوەکان ئاماژەیان بۆئەوە دەکرد و جەختیان لەوە دەکردەوە کە بزووتنەوەی کەمالی بزووتنەوەیەکی دەستەبژێرە و لە منداڵدانی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی جیا بۆتەوە و هەموو رەوشێکی بەردەستی لە بیروباوەڕی ئیسلامی یان کورد یان خوێندن لەسەر هەستی نەتەوەیی تورکەکان و هی دیکە بۆ رزگارکردنی خاکی تورکی لە هێزی بیانی قۆزتۆتەوە، بۆیە شایەنی ئەوەیە پێی بگوترێت بزووتنەوەی رزگاری نیشتیمانی یا جەنگی سەربەخۆی نیشتیمانی.

کۆنگرەی ئەرزەرۆم (۳ی تەمووزی ۱۹۱۹) و سیواس (٤-١١ ئەیلولی ۱۹۱۹) ئەوەی لەم دوو کۆنگرەیە کەوتەوە، بەهۆی هەڵەکانی مستەفا کەمال و هاوکاریکردنی بوو لەگەڵ کورد[4]. بڕیارەکانی ئەو کۆنگرانە و بەندەکانی میساقی نیشتیمانی رەنگدانەوەی ئەو راستییەیە بوون[5]. ئەو کۆنگرانەبنەما و پلانی مەدەنی و سەربازی بۆ رزگارکردنی تورکیا دانا و تورکیای بۆ ریزی

١- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ١٣١.

٢- عقيل سعيد محفوض، النهوض والانكسار: تـأملات حول المسالَة الكوردية، النهج، مجلة، العدد(٦٠) دمشق، خريف ٢٠٠٠، ل ٢٢٦.

٣- غازي مصطفى كمال، نطق محتوياتنه عائد وثائق، انقرة، ١٩٢٧، ل ل ١٥٩-١٦٠.

٤- بۆ بەسەرکردنەوەی رۆڵی کورد لە کۆنگرەی ئەرزەرۆم و سیواس سەیری:

- Serbesti,aylik Siyasi Dergisi,Sayi: 1,Istanbol,Kasim,1998,SS.53-55

- كندال، الاكراد وكردستان، حركة التحرير الوطني الفلسطيني"فتح" التعبئة والتنظيم الدراسات)، د.م، ١٩٨٢، ل ل ٨٤- ٨٦.

٥- بۆ وردەکاری لە بارەی کورد و میساقی نیشتیمانی سەیری:

- Serbesti,Aylik Siyasi Dergisi,Sayi: 1,Istanbol,Kasim,1998,SS.15-28.



وڵاتانی سەربەخۆ گەڕاندەوە، سەرباری ئەوەی لە ۲۸ کانوونی دووەمی ۱۹۲۰ هەڵبژاردن رێکخرا و هێزە نیشتیمانییەکان زۆرینەی دەنگیان تێدا بەدەستهێنا، بەندەکانی (میساقی نیشتیمانی) چەسپێنرا، کە پاڵپشتییەکی یاسایی بۆ کەمالییەکان دەستەبەرکرد تاکو داخوازی و ئامانجەکانیان بەم میساقە گرێبدەن، بەو پێیەی لەلایەن دامەزراوەیەك بڕیاری لێدراوە کە گەل هەڵیبژاردووە، سەرباری ئەو سەرکەوتنە سیاسی و تەکتیکییەی کە مستەفا کەمال بەدەستیهێنا، هێزە کوردییە رێکخراوەکانی بەهۆی کادیرە سەربازییە تورکییەکان خستە ژێر دەستی ئەفسەرە تورکەکانەوە، لە ژێر فەرماندەیی (کازم قەرە بەکیر)دا بوون، توانی یەکەم سەرکەوتنی جەنگی سەربەخۆیی لەبەرامبەر هێزەکانی جۆرجی و ئەرمەنی بەدەستبهێنێ[1]. دانکۆرت رۆستۆ لەمبارەیەوە دەڵێت:" تورکیا ساڵی ۱۹۲۰ وەك دەوڵەتی نەتەوەیی دامەزرا....سنوورەکەی لەگەڵ سنووری نەتەوەیی تورکی نەدەگونجا، میساقەکە ئاماژەیەکی فراوانی بە زۆرینەی(عوسمانی موسولمان) کردووە، بەشێوەیەك کە تورك و کورد بگرێتەوە....."[2].

لەراستیدا حکوومەتی سوڵتانیش هەستی بەوەی کردبوو کە دەکرێت گرەو لەسەر کورد بکرێت، نەیدەتوانی شەپۆلی تازەی کێشەی کورد و پلانەکانی بەریتانیا لەبەرامبەر کورد پێشتگوێبخات، بۆیە ئەویش لەلای خۆیەوە پلانی تەکتیکی بۆ دەورەدانی گۆڕانکارییە نوێیەکان داڕشت، سەرباری پێکهێنانی لیژنەیەك لە چەند وەزیرێکی تورك و کەسایەتی کوردی بۆ ئەوەی پێشنیازی بەخشینی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان لە چوارچێوەی دەوڵەتی تورکی تاوتوێ بکەن[3]. عەلی ئیحسان پاشای سەرکردەی سوپای شەشەمی عوسمانی و جێگری پێشووی والی

1- Kandal, (The Kurds Under. The Ottoman Empire) in People Without Country, The Kurds and Kurdistan, Edited by Gerard Chaliand, Translated by M.Pallis London ,1980, P.57 “

- كندال، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٤" خليل علي مراد، القضية الكردية في تركيا١٩١٩-١٩٢٥، في: خليل علي مراد وآخرون، القضية الكوردية في تركيا وتأثيرها على دول الجوار، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، التداول محدود، ١٩٩٤، ل ١٩.

٢- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە:

السياسه .....ل ٤١٣.

٣- صبرية احمد لافي، الأكراد في تركيا، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٥، التداول محدود، ل ٨٣.

موسڵ بۆ ویلایەتە کوردییەکانی باکووری کوردستان نارد، دوای گەیشتنی، هێندەی پێنەچوو سەرکردایەتی ڕێکخراوێکی کوردی بە ئامانجی هاوکاریکردنی کوردان بۆ ئەوەی هانیان بدات ئاژاوە لە باشووری کوردستان کە لەژێر دەستی بەریتانییەکان بووە بنێنەوە[١]. ئیحسان پاشا سەرکەوتنێکی باشی لەناو کوردانی جەزیرەی ئیبن عومەر و هەموو لایەکی باشووری کوردستان (باشووری هێڵی شەڕوەستانەکە) بەدەستهێنا، بەڵام بەریتانییەکان ئاگایان لەم هەنگاوانە هەبوو، هەڕەشەی حکوومەتی سوڵتانیان بە دەستتێوەردانی سەربازی کرد، کە ناچاریکرد لە ١٩ی شوباتی ١٩١٩ فەرمانی دوورخستنەوەی لە پۆستەکەی دەربکات و بۆ ئەستەمبۆڵ گەڕاندییەوە[٢].

ملکەچی حکوومەتی سوڵتان بۆ فشارەکانی بەریتانیا لەبارەی دەستتێوەرنەدانی لە کاروباری کورد، کارێکی ئاسایی بوو، لەبەر ئەوەی ئەستەمبۆڵ لەژێر دەسەڵاتی بەریتانی بوو، هیچ بوارێك بۆ خۆ بواردن لە فشارەکانی بەریتانی لەئارادا نەبوو، بەڵام ئەوەی بەریتانیا لەو سەردەمەدا بوی نیگەران بوو و لێ دەترسا، بەهێزبوون و جەماوەریبوونی بزووتنەوەی کەمالی بوو لە ویلایەتە کوردییەکانی ئەنادۆڵ، زەندەقی لە سەرکەوتنە خێراکانی کەمالییەکان بەسەر دوژمنانی چوو بوو[٣]. لە هەنگاوێکیدا بۆ بەرگرتن بە گەشەی کەمالییەکان، مێجەر نۆئێلی[٤] بە ئەرکێکی تایبەت بۆ ناو باکووری کوردستان راسپارد، بۆ ئەوەی کار بۆ بەرگریکردن لە بانگەوازی ئیسلامی کە تورك دژ بە ئینگلیزی بڵاودەکەنەوە بکات، هەروەها بۆ ڕەواندنەوەی ترسی کورد لەهەمبەر ئەو بانگەشانەی تورکەکان پەخشیان دەکرد بەوەی کە ئەوان(کوردان) دەکەونە ژێر "ڕەحمەتی ئەرمەن" و بۆ ئەوەی دۆستایەتی کورد بۆ پاڵپشتی بەریتانیا بەدەست بێنن[٥]. مێجەر نۆئێڵ چاوی بە کەسایەتییە کوردییەکانی وەك ئەمین عالی بەدرخان و سەید عەبدولقادر نەهری و ئەکرەم جەمیل پاشا

---

١- المس بیل، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٠٥" جرجیس فتح الله، یقظة ...، ل ١٥٩.

٢- جرجیس فتح الله، یقظة...، ل ١٦٠.

٣- خلیل علي مراد، القضیة...، ل ١٤.

٤- سەیری تویژینەوەی دووەمی بابەتی یەکەم بکە.

5 - Hohler to J.Tilley, Constantinople, 21-7-1919, DBFP,I.Sir, Vol.4,No. 464 ,P.693 "

- جرجیس فتح الله، یقظة...، ل ١٤٨.



کەوت و بەسەردانی کردنی ناوچە کوردییەکان لە باکووری کوردستان رازیکردن[١]، ئەو سەردانەش هاوکات بوو لەگەڵ بەرپابوونی بزووتنەوەی چەکداری کوردی لە مەڵاتییە کە بە (بزووتنەوەی مەڵاتییە) ناسرا[٢]، هەروەك دکتۆر عەلی موراد باس دەکات، " ئینگلیز و لەوانەیە حکوومەتی ئەستەمبۆڵیش لە شۆڕشەکە دوور نەبوون"[٣].

هەرچۆنێ بێت ئەوا بزووتنەوەی مەڵاتیە لەگەڵ بەرپابوونی لەلایەن کەمالییەکانەوە لەباربرا، چونکە بەریتانییەکان بەقەد بەرژەوەندییەکانیان لە ناوچەکە نەبێت[٤]، ئەوەندە گرنگیان بە پرسی کورد و داهاتووی گەلی کوردی نەدا، بەریتانییەکان خواستە ڕەواکانی گەلی کوردیان لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ لێدانی بزووتنەوەی کەمالی بەکارهێنا . هەرچەندە بەرپرسانی ئینگلیز نکۆڵیان لەسەردانەکەی مێجەر نۆئێل کرد و بێ ئاگایی خۆیان لەبارەیەوە پیشاندا، بەڵام بروسکە نهێنیەکەی نۆئێل بۆ کۆمیسیۆنی باڵای بەریتانی لە بەغدا لە ٢٣ی ئەیلولی ١٩١٩ ئەو بانگەشانەی بەرپرسانی بەریتانی ڕەتدەکاتەوە و ڕووناکیەکی زیاتر دەخاتە سەر ئامانجەکانی گەشتەکەی ناوبراو بۆ باکووری کوردستان کە باسی لەوە کردوە کە "ئەگەر لەوەی مستەفا کەمال خولڤاندوویەتی تووشی مەترسی بووین، ئەوا ئێمە دەتوانین بەدرخانیەکان و کوردانی دیکە لە ڕێگەی رازیکردنی حکوومەتی تورکی بە دامەزراندنیان وەك وایلی یان موتەسەریفی شارۆچکەکان دژ بە کەمالییەکانیان بەکاربهێنین"[٥].

بەریتانییەکان نکۆڵیان لە بەرپرسیارێتی خۆیان لەبارەی کورد و ئەرکەکەی مێجەر نۆئێل کرد، کە بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی بەرپرسێکی دائیرەی نوێنەری باڵای بەریتانی لە

---

١- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی چالاکییەکانی مێجەر نۆئێل لە باکووری کوردستان سەیری:

- E.W.C.Noel, Kurdistan 1919,Ingiliz Ceviren Bulent Birer,Istanbul, 1999, SS.7-55 .

- یادداشتەکانی مە یجەر نوئیل لە کوردستان، وەرگێرانی حسین احمد جاف و عوسمان نێرکسەرجاری، بەغدا، ١٩٨٤، ل ل١٢-٩٤.

2- Robeck to Curzon , Constantinople , 17-9-1919 , BDA , Vol.I , No.48 , PP.115-120.

٣- سەیری خودی کتێبەکەی نووسەر بکە: القضیة...، ل ١٤.

٤- المصدر نفسه، ل ١٤.

5- British Political Commissioner to Secretary of State, Baghdad, 29-9-1919, BDA, Vol.I, No. 49, P.119 "B.C.Busch, OP.Cit., P.188.

ئەستەمبۆڵ، جگە لە ئەرکێکی بەسەرکردنەوە، هیچی دیکە نەبوو[1]. سەکردەکانی بزووتنــەوەی مەلاَتیــە دوای بــەرپاکردنی بزووتنەوەکــەیان، هــیچ پالَپــشتییەکی مــاددی و مەعنــەویان پێنەگەیشت، بۆ چارەنووسی خۆیان لێیان گەڕان[2].

ئەرکەکەی مێجەر نۆئێل تاکە ڕێوشوێنێکی بەریتانی نەبووە، بۆ ملکەچکردنی تورکــەکان، ئەو ڕاپۆرتانەی کە والی وان بۆ بابولعالی بەرزیکردونەتەوە، ئامــاژە بــۆ بــوونی پەیوەندییــەکی چڕی نێوان بەریتانییەکان لەلایەك و لە نێوان هەریەکە لە سمکــۆ[3] ســەید تــەهای شــەمدینانی[4]

١- كمال مظهر احمد، كردستان...، ل ٣٣٩.

٢- خليل علي مراد، القضية...، ل ١٦.

٣- سمکۆ: ئیسماعیل ئاغــای شــکاك(١٨٩٥-١٩٣٠)، لــە دیــاریترین و گــرنگترین ســەرکردە کوردییــەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاَت بوو، سەرۆکی عەشــیرەتی گــەورەی شــکاك بــوو، ســەرکردایەتی زۆر شۆڕشــی لــە دژی ئێرانییەکان و تورکان کردووە، ژمارەیەکی زۆری لە چەکدار و لایەنگری لێ کۆببووەوە، حکوومەتی ئێرانی بــە حاکمی ڕەهای ناوچەی (قتور) لە کوردستانی ڕۆژهەلاَت دایمەزراند، سمکــۆ کەســیکی بــەهیوا بــوو، هاوکــاری سەرکردە کوردەکانی کوردستانی باکوور و باشوور وەك عەبدولرەزاق بەدرخان و سەید تەها شەمدینانی و شــێخ مەحموود بەرزنجی کرد و پەیوەندی بە بەریتانییــەکان و ڕوســەوە کــردووە، وەك هــەولێك بــۆ ڕازیکردنیــان بــۆ **پالَپشتیکردن** لە هەولەکانی کورد بۆ دامەزراندنی دەولەتی سەربەخۆی خۆی، لە ئازاری ١٩١٨ مارشــەمعونی سەرۆکی ئاشورییەکان کوشت، کە دەمەقالێکی زۆری لە نێوان توێژەران و سیاسەتمەداران هێنایە پــێش. سمکــۆ بە غەدر و خیانەت بە فێلێکی دەسەلاَتدارانی فارسی لە ٢١ی حوزیران ١٩٣٠ کوژرا. سەیر:

- كمال مظهر احمد، دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر، بغداد، ١٩٨٥، ل ٢٥٠

- کریس کوچێرا، مێژووی کورد لە سەدەی (١٩-٢٠)دا، وەرگێرانی محمد رەیانی، تاران، ١٣٦٩، ل ل ٨٨-١٠٤

- Richard Tapper,The Conflict of Tribe and State in Iran and Afghanistan, New York,1983, PP.379-395.

٤- سەید تەها شەمدینانی: کوڕی شێخ محمەد سەدیق و نەوەی شــێخ عوبێــدوڵای نــەهری ســەرکردەی شۆڕشــی ١٨٨١ ی دژ بە هەردوو دەولەتی فارسی و عوسمان، لای دائیرە سیاسییەکانی بەریتانی لە عێراق چــالاك بــووە بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی کورد، هەروەها پەیوەندی زۆری بە زورێك لە بەرپرسانی ئینگلیــزەوە هــەبوو، لای سیاسەتمەداران و ئیدارییەکانی ئینگلیز لە عێراق کەسایەتییەکی باشی هــەبوو، بــۆ وەرگــرتنی شــوێنی شــێخ مەحموود پالێوراو بوو کە ســەرۆکایەتی ئۆتۆنۆمییــەکی کــوردی بکــات، بــەلاَم بەریتانییــەکان ئــەم پلانــەیان هەموارکرد، لەبەرئەوەی لەگەلٚ بەرژەوەندیەکانیان نەدەگونجا. سەیری:



دەکەن، کە تێیدا ئینگلیزی بە دامەزراندنی حکوومەتی کوردی بۆ سمکۆ کە سەلَماس و خوێ و ئورمێ دەگرێتەوە، تۆمەتبارکردووە، هــەروەها حکوومــەتێکی دیکــەش بــۆ ســەید تــەها لــە ناوچەکانی نێوان جەزیرەی ئیبن عومەر (بۆتان) تا ئورمێ درێژدەبێتەوە. هەروەها ئەو ڕاپۆرتانە ئەوەشیان زیادکردووە کە ئامانجی بەریتانیا لەو ڕێوشوێنانە "زالَکردنــی ئەوانەیــە (کــورد) لــە دژی ئێمە(تورك)"[1]. بروسکەیەکی دیکەش کە والی وان ئاڕاستەی کردووە، باس لــەوە دەکــەن کە (دەسەلاَتدارێتی بەریتانی پەیوەندی بە شێخ و زانایان و ســەرۆکە کوردەکــان)ەوە کــردووە و وای تێگەیاندوون کە ئەوان هەولَی بەدیهێنانی بەرژەوەندییــە نیــشتیمانیە کوردییــەکان دەدەن، هەروەها وەك هەولێك بۆ درێژکردنــەوەی قەلَــەمڕەوی بــەریتانی بــۆ شــەمدینان و ئــەورامار و گۆیــان، بەخــشین و پولیــان پێــشکەشکراوە. هــەروەها بروســکەکە بــاس لــە گــرنگترین ئــەو کەسایەتیانەی کە توانراوە ڕازی بکرێن، ئەوانیش شێخ بارزان و شێخ مەحموود حەفید و ئەحمەد فائیق بەدرخان بوون، هەروەها باسی لەوە کردووە کە نامە بۆ سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەورامانی (کە متمانە بە ئینگلیز ناکەن و هیچ دۆستایەتیەکیان لەنێواندا نیە) ناردراوە. هەروەها باســی لە ناردنی کەسێك(ئەحمەد فائیق بەدرخان) لە ڕەواندز (کــە ئینگلیــز بــە کۆمیــدیای نەتــەوەی کوردی هەلَیخەلَەتاندبوو)کردبوو[2].

بروسکەیەکی دیکە کە لە مستەفا نادری والی دیاربەکر بۆ بابولعالی- ئیدارەی نــاوخۆ لــە ١١ی نیــسانی ١٩١٩ بــەرزکرابووەوە، بــاس لــە هــاتنی حــاکمێکی سیاســی ئینگلیــزی لــە سلێمانییەوە بە وێران شەهر بۆ دیاربەکر دەکرد و باسی لە نەقیبێکی دیکەی ئینگلیزی کرد کە لە ئورفاوە بۆ وێران شەهر دێت کــرد، ئەمــەش لــە هــەولێکی بــەردەوامی بــۆ بەدەســتهێنانی دۆستایەتی عەشیرەتی مەلی کوردی. بروسکەکە نیگەرانیەکی زۆری لەهەمبــەر ئــەو هەولَێنــە دەربڕی بوو[3].

لەڕاســتیدا فەرمانبــەرانی تــورکی زێدەڕەوییــەکی زۆریــان لــە هەلَــسەنگاندنی بزووتنــەوە بەریتانییەکان دەکرد، بروسکەیەکی بەپەلە نێــردراو (لــە وەهــبی جێگــری والــی بــەتلیس) بــۆ بابولعالی لە ٢ی تشرینی یەکەکەمی ١٩١٩ ئاماژە بە بوونی پلانێکی ئینگلیزی دەکات، کــە

- سي.جي.ادموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٤وص ١٦٥"سر ارنلد تي .ويلسون، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٠.

١- سەیری پاشکۆی ژمارە (٣).

٢- سەیری پاشکۆی ژمارە (٤) بکە.

٣- سەیری پاشکۆی ژمارە (٥) بکە.

هێزێکی تێکەڵاو لە ئینگلیز و ئەرمەنی پێکهێناوە، ئەو هێزە نزیکەی ١٥٠٠ پیا و بە فرۆکەوە بە نیازن هێرش بکەنە سەر گەلی گۆیان و لاکانی سەعەرد[١].

هەرچەندە فەرمانبەرانی تورکی و حکوومەتی تورکی نیگەرانی زۆریان بەرامبەر بزووتنەوەکانی بەریتانی پیشاندەدا، بەڵام پێدەچوو لەبەرامبەر ئەو جووڵانەوانە بێ توانا بێت، بە بەڵگەی ئەوەی کە زۆر هەل بۆ تورکیا هاتە پێش بوو رووبەڕووبوونەوە و وەڵامدانەوە یان بەلای کەمەوە بۆ کەمکردنەوە مەترسییەکانی ئەو جووڵانەوانە، ئەو نامانەی کە لە نێوان فەرمانبەرانی تورك لەو ناوچانە و سەرۆکەکانیان لە ئەستەمبۆڵ جەخت لەم راستیە دەکاتەوە، لە بروسکەیەکی بەرزکراوە لە (حەیدەر) والی وان بۆ بابولعالی لە ٢٣ ی تەمووزی ١٩١٩ ئەو والیە باس لەوە دەکات کە محمەد ساڵح ی بەڕێوەبەری دارایی لە بەرواری ـ لە ٣١ ئابی ١٩١٩ لە نامەیەکدا داواکارییەك و تکایەکی بەناوی (کۆمەڵەی محمەدی) پێشکەشکردووە، داوای ناردنی قائیمقامێکی کردووە، ئەگەر ئەمەش نەکرا، هیوای خواستووە سەرباز بنێرین بەلای کەمەوە تاکە ژەندرمەیەکیش بێن. "هەرگیز نابێت" وەڵامی بابولعالی بوو، چونکە دەرەنجامەکانی ئەو جووڵانەوەیە زۆر لەوە روونترە باس بکرێت......"[٢]. لە بروسکەیەکی جێگری والی وان (مەحەت) بۆ بابولعالی لە ١٢ کانوونی یەکەمی ١٩١٩، باس لە داواکاری خەڵك و عەشیرەتەکانی موسڵ دەکات سەبارەت بە ناردنی کاربەدەستێکی عوسمانی بۆ ئەو ناوچانەی کە لە ئینگلیز رزگاریان کردووە، بۆ ئەوەی کاروباریان بۆ هەڵسوڕێنی، هەروەها تکاکراوە کە چەك و ئەفسەری تورکیان بۆ رەوانە بکات[٣].

بابولعالی هیچ گرنگییەکی بە وەڵامدانەوەی ئەو داواکاریانە نەدا، بەڵکو پشتگوێیخستن. وەڵام نەدانەوەی بابولعالی بۆ ئەو تکا و پاڕانەوانە و بەکارنەهێنانی وەك کارتێکی فشار بۆ سەر ئینگلیز لەو قۆناغە چارەنووسسازەی تورکیا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بابولعالی نەیدەویست بەریتانیا تورە بکات و جەنگێکی نوێ کە ئەو نەیدەویست بەرپا ببێت، بقەومێنێ. هەروەها ئەو نەیدەویست پاڵپشتی لە کوردان بکات، چونکە هێشتا دەسەڵاتی بەسەر بەشێکی زۆری وڵاتەکەیان داگرتبوو، ئەوانیش بەلای خۆیانەوە داوای مافەکانیان دەکرد، سەرباری ئەوەش

١- سەیری پاشکۆی ژمارە (٦) بکە.

٢- سەیری پاشکۆی ژمارە (٧) بکە.

٣- سەیری پاشکۆی ژمارە (٨) بکە.



حکوومەتی بابولعالی لە توانای دانەبوو، دەسەڵاتی راستەقینەی بەسەر هەموو لایەکی وڵاتدا هەبێت، دەسەڵاتەکەی لە ئەستەمبۆڵی پایتەخت تێپەڕی نەدەکرد، سەرباری ئەوەش توانای دارای و سەربازی وای نەبوو کە بتوانێت رۆڵی یارمەتیدەری بزووتنەوە دژ بە ئینگلیزەکان بدات، هەروەها نەیدەویست مستەفا کەمال و بزووتنەوەکەی ئەو رەوشە نوێیە بقۆزننەوە کە بێ گومان لە پاڵپشتیکردن و ئیدارەکردنی بزووتنەوەی چەکداری دژ بە ئینگلیزی لێ دەکەوتەوە.

بەهۆی داهاتوو و کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئاڵۆزی و جووڵانەوە زۆرەکانی ناوخۆی عوسمانی شانبەشانی ئاڵۆزیە نێودەوڵەتییەکان بەردەوامبوو، ئەگەر بزووتنەوەکەی مستەفا کەمال بەخێرایی گەشەی کرد و زۆر سەرکەوتن بەدوایەکدا بەدەستهێنا، پەیمانی سیڤەری بەکردەوە پوچەڵکردەوە، تێکئالانی بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی هاوپەیمانان بەها یاسایی و نێودەوڵەتیەکەیان بەتاڵکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دیپلۆماسیەتی بەریتانی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی تا سەرەتاکانیساڵی ١٩٢١ ئاماژەی بە دروشمی (کوردستانی سەربەخۆ) دەکرد، بەڵام کۆنگرەی لەندەن کە لە ٢١ شوبات تا ١٤ ی ئاداری ١٩٢١ ریکخرا، واتە دوای شەش مانگ لە پەیمانی سیڤەر، بە روونی راستی هەڵوێستی بەریتانی لەبارەی کێشەی کوردستانی بەدەرخست[١].

دانیشتەکانی کۆنگرەکە کە شاندی هاوبەشی هەردوو حکوومەتی ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵی تێیدا بەشداریانکرد، ماوەی دوو هەفتەی خایاند و کێشەی کوردی لە کۆنگرەکەدا بەروونی ورژێنرا. شاندی تورکی کە بەکر سامی (وەزیری دەرەوەی ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورە) سەرۆکایەتی دەکرد، هەولێدا هاوپەیمانان بەوە رازی بکات کە کێشەی کورد کێشەیەکی نێوخۆیە و ناخرێتە بەر گفتوگۆی وڵاتانی گەورەی دیکەوە، کاتێ گوتی: "شاندەکە هەر نوێنەرایەتی تورکیا ناکات بەڵکو نوێنەرایەتی کوردستانیش دەکات، چونکە لە نێو شاندەکەدا شاندی ناوچە کوردییەکانی وڵاتی تێدایە"[٢]، بەڵام کریزن بە قسەی هاوتا تورکییەکەی رازی نەبوو، رۆژی ٢٦ شوباتی بەتەواوی بۆ گفتوگۆی پرسی کوردی تایبەتکرد. هەرلایەنە ویستی لایەنەکەی دیکەی بە بیروڕای خۆی رازی بکات[٣].

١- جلیلي جلیل وآخرون، الحركة الكوردیة في العصر الحدیث، ترجمة: عبدي حاجي، بیروت، ١٩٩٢، ل ١١٥" فؤاد حمه خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٠.

٢- م.س. لازریف، المسألَة الكوردیة ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٦٧.

٣- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەو کۆبوونەوەکە و گفتوگۆکانی لە بارەی کێشەی کورد، سەیری: المصدر نفسه، ل ل ٢٦٧-٢٦٨" فؤاد حمه خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٨١-٨٢.

نەتەوەخوازانی کوردی ئەستەمبوڵ، ئەوانەی بە نیگەرانییەوە چاودێری پەرەسەندنە نوێیەکانیان دەکرد، هەوڵیان دا بەریتانییەکان بەوە رازی بکەن کە باوەڕ بە بانگەشەی تورکەکان لەبارەی کوردستان نەکەن و هانیان دان کە پابەندی بەندە تایبەتەکانی پەیمانی سیڤەر ئەوانەی پەیوەستن بە کوردە بن. لە چاوپێکەوتنەی کە لە نێوان شاندێکی کوردی و رامبۆڵی کۆمیساری باڵای بەریتانی لە ئەستەمبوڵ لە ٢ی ئاداری ١٩٢١ ئەنجامدرا، ئەندامانی شاندە کوردییەکە جەختیان لەوەکردەوە کە ئەوان بەتەواوی ئەو بیرۆکەیە رەتدەکەنەوە کە شاندی حکوومەتی ئەنقەرە نوێنەرایەتی هیوا ئاواتەکانی کوردیش دەکات، هەروەها نیگەرانی خۆیان لەو پاشەکشەیەی هاوپەیمانان دەربڕی و باسیان لەوەکرد کە "بۆ کەس نییە گۆڕانکاری بەسەر ماددەی (٦٤)ب پەیمانی سیڤەردا بهێنێت، کە تێیدا هاتووە کە دەبێت ئەو ناوچانەی زۆرینەی دانیشتووانەکەی کوردن، تێکەڵاو یەکدەخرێت"[1].

ترس و نیگەرانی کورد لە شوێنی خوی بوو، بەریتانیا ئامادەیی خۆیان بۆ چاوخشاندنەوە بەهەر پەیمانێك پێشاندا کەناوی کوردستانی سەربەخۆی تێدا هاتبێت[2]. لەبروسکەی ئاراستەکراوەوە لەندەن لەلایەن وەکیلی دەوڵەت لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی بۆ وەکیلی وەزارەتی داگیرکەکان، ئاماژەیەکی روون بە هەڵوێستی نوێی بەریتانی لەبارەی پرسی کوردەوە داوە و باسی ئەوەی کردووە کە " لەوانەیە ماددەی ٦٤ ی پەیمانی سیڤەر هەموار بکرێت، بە شێوەیەك هەموو ئاماژەیەك بۆ دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ لە داهاتوودا، لاببرێت"[3].

سروشتی گفتوگۆکانی پرسی کورد لە کۆنگرەی لەندەن، هەڵوێستی لایەنەکانی بەوردی دیاریکرد، کریزن لەبارەی ئەو پرسانەی کە بە بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆری عوسمانییەوە پەیوەست بوون لەگەڵ بەکردا بەگژیەکداچوون، سەرباری ئەوەی بەردەوام لەبارەی بەخشینی ئۆتۆنۆمی کوردان قسەی دەکرد، بەڵام لە کۆتاییدا ئامادەیی وڵاتانی هاوپەیمانی بۆ سازشکردن بۆ تورکەکان پێشاندا، بەتایبەتی لەبارەی هەردوو پرسی کوردی و تورکی.

---

1- Quoted in: David McDowall, A Modern History of Kurds ,London: 1-B.Touris Publishers ,1996,P.138“

- عزيز الحاج، القضية الكوردية في العشرينات، ط ٢، بيروت، ١٩٨٥، ل ١٣٨.

2- David Mc Dowall ,OP.Cit., P.138.

٣- عزیز الحاج، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣٩.



وەڵام و بەرسڤەکانی کریزن ئاماژەیان بۆ هەموو ناوهێنانێکی کوردستانی سەربەخۆ دەکرد، تەنها ئاماژەی بە ((سەربەخۆیی ناوخۆیی کوردی لە ناو تورکیا))، کرد. بۆیە شاندی تورکی ئەم هەڵەی قۆزتەوە و رایگەیاند کە "حکوومەتی ئەنقەرە ئامادەیە پێشوازی لە لیژنەیەك بکات کە لێکۆڵینەوە و راپرسی گشتی ساز بکات... بەهەر حاڵ حکوومەت بە پرەنسیپی سەربەخۆیی لۆکاڵی بۆ ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتووانەکەی کوردن رازی بوو..."[1].

بەمشێوەیە بەریتانیا بە کردەوە دەستبەرداری داخوازی سەربەخۆیی کوردی بوو و تەنها بە سەربەخۆیی لۆکاڵی بۆ ویلایەتە کوردییەکانی باکوور رازی بوون. هەتاکو ئەم داخوازییەش زۆر نارۆشنی تێدابوو، بەشێوەیەك تورکەکان دواتر توانیان نکۆڵی هەموو پابەندیەك بکەن بەرامبەر کوردان[2].

لەگەڵ هەموو ئەو دەستکەوتانەی گەورانەی کە تورکەکان بە شێوەیەکی گشتی لە کۆنگرەی لەندەن لە رووی سیاسی و نێودەڵەتییەوە بەدەستیان هێنا، کە خۆی لە گۆڕینی زۆربەی لایەنەکانی پەیمانی سیڤەر بۆ بەرژەوەندی تورکەکان دەنواند، بەڵام ئەمە توێنیتی ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی و مستەفا کەمالی نەشکاند، بەڵام کۆنگرەکە جگە لە ئاڵۆزی و زیانی زیاتر لە پەیوەندییەکانی تورکی — بەریتانی لەلایەك و لەبارەی داهاتووی کورد و کوردستان لەلایەکی دیکەوە، هیچی دیکەی لێ نەکەوتەوە.

لەکاتێکدا گفتوگۆکان لە نێوان تورکەکان لەلایەك و بەریتانیا و هاوپەیمانان لەلایەکی دیکەوە لە کۆنگرەی لەندەن، لەو پەری توندی دابوو، بەرپرسانی بەریتانی لە وەزارەتی موستەعمەرات و ئەستەمبوڵ قسەیان لەبارەی شێوازی سوود وەرگرتن لە کورد بۆ فشار دروستکردن لەسەر تورکەکان دەکرد، بۆ ئەوەی دەستکەوتی سازشی زیاتریان جنگ کەوێت. ئەو هەوڵێنە دوای کۆتایی هاتنی کۆنگرەی لەندەن لە ١٤ ی ئاداری ١٩٢١ زیاتر جیدی و چالاك بوون، بەبێ ئەوەی ئەنجامێکی رازیکەری بۆ بەریتانیا هەبێت، لە کۆنگرەی قاهیرە(١٢ تا ٣٠ ی ئاداری ١٩٢١) بیروبۆچوونی تازەی بەریتانی لەبارەی کورد بە شێوەیەکی روون بەرجەستەبوو، ئەمەش بەهۆی کاریگەری سەرکەوتنەکانی کەمالییەکانەوە بوو لە ئەنادۆڵ

---

١- م.س.لازريف، المسالَة الكوردية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ل ٢٦٨-٢٦٩.

٢- المصدر نفسه، ل ٢٧٠.

هات، ئامانجی بنەڕەتی بریتی بووە لە نەخشە کێشانی سیاسەتی بەریتانیا بە کەمترین تێچوون لە هەردوو رۆژهەلاتی دوور و ناوەڕاست[1].

لە کۆنگرەکەدا پرسی کوردستان وەك پرسێکی میحوەری گفتوگۆی لەسەر کرا، لیژنەیەکی تایبەت پێکهێنرا و ناوی لێنرا (لیژنەی کوردستان)، چەرچەڵی وەزیری داگیرکەکان و سەرۆکی کۆنگرەکە سەرۆکایەتی کرد. لە کۆنگرەی قاهیرەدا دوو ئاراستەی یەکتربڕ بۆ چارەسەری کێشەی کورد دەرکەوتن: ئاراستەیەك سێر پرسی کۆکس[2] و خاتوو گیرتەرود بێڵ[3] و سێر هێنری

---

1- Saad Eskander, Southern Kurdistan under Britain's Mesopotamian Mandate: From Separation to Incorporation,1920-1923, Middle Eastern Studies, London, Vol.37, NO.2, April 2001,PP.156-157"

- یاسین طه ظاهر العسكري، مؤتمر القاهرة والمسألَة الكوردیية في العراق، في: المفصل في تاريخ العراق، بغداد، ٢٠٠٢، ل ٨١٦.

٢- کۆکس: ئەفسەر و دیپلۆماتکاری بەریتانی، لە ساڵی ١٨٨٤ پەیوەندی بە حکوومەتی هیندییەوە کرد، ماوەی ساڵانی ١٨٩٦ تا ١٩١٤ لە کەنداوی بەسەر برد، لە نیسانی ١٩٠٤ پۆستی موقیمی سیاسی بەریتانی لە کەنداو وەرگرت، دواتر بووە ئەفسەری سیاسی لە هەڵمەتی میزۆپۆتامیا، لەماوەی ١٩١٨-١٩٢٠ پۆستی وەزیری رێپێدراوی بەریتانی لە ئێران پێدرا، لە ساڵانی ١٩٢٠ تا ١٩٢٣ بۆ عێراق گەڕایەوە و بوو بە نوێنەری باڵای حکوومەتی بەریتانی لە عێراق، دوای دەست لە کارکێشانەوەی لە ١٩٣٣ بووە سەرۆکی کۆمەڵەی جوگرافی پادشایەتی، سەیری:

- سي.جي.ادموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦٥.

٣- خاتوو بێڵ: گیرۆنرود لوسیان بێڵ (١٨٦٨-١٩٢٦)، لە بەریتانیا لە دایکبووە و گەورە بووە، لە زانکۆی ئۆکسفۆرد خوێندنی باڵای تەواو کردووە، لە مێژوودا پێسپۆڕێتی وەرگرتووە، دواتر سەردانی ولاتانی ئەوروپی و ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراستی کردووە، لەماوەی جەنگی یەکەمدا لەگەڵ خاچی سوردا کاریکردووە، دواتر بۆ کارکردن پەیوەندی بە نووسینگەی هەواڵگری بەریتانی لە قاهیرە کرد، دواتر بە حکوومەتی هیندەوە کرد و لەوێش بۆ هەڵمەتی بەریتانی بۆ سەر عێراق ناردرا، بۆ یەکەمجار لە بەسرە لە ٢٦-٦-١٩١٦ دامەزرا، پەیوەندی بە دەستەی کارمەندانی سێر پرسی کوکسەوە کرد و لەگەڵ ئەودا بەردەوام بوو تا کۆتایی کارەکەی لە ١٩٢٣، دواتر لە بە سکرتێری رۆژهەلاتی نوێنەری باڵای بەریتانی دامەزرا، زمانی عەرەبی باش دەزانی، پەوەندی توندی بە مەلیك فەیسەڵ و ژمارەیەك سەرکردەی عەشایەری عەرەبی و کوردییەوە لە عێراق هەبوو،



دوبس[1] و ئەوانی دیکە نوێنەرایەتییان دەکرد، ئەو ئاراستەیە داوای لەبەریتانیا دەکرد کە گرنگی بە کوردستانی باشوور بدات[2]، ئاراستەکەی دیکە لەلایەن چەرچڵ ی وەزیری موستەعمەرات و هەریەکە لە میجەر سۆن[3] و مێجەر لۆنکەریك[4] پاڵپشتی دەکرا، ئەو

---

سەرباری ئەوەی لەسەر سیاسەتی بەریتانی لە عێراق کاریگەری هەبوو، زۆر کتێبی نووسی لە دیاریترینیان (من مراد الی مراد) و (رسائل المس بيل) و (سوريه- البادیه المعموره)، سەیری:

-: محمد یوسف القريشي، المس بيل واثرها في السياسة العراقية، بغداد، ٢٠٠٣، ل ٢١.

١- هێنری دوبس: (١٨٧١-١٩٣٤)، لە گەورە کارمەندانی حکوومەتی هیندی بوو، شارەزای کاروباری دارایی بوو، لە مانوونی دووەمی ١٩١٥ گەیشتە عێراق، بۆ ئەوەی ببێتە چاودێری داهاتەکان، دوای کوکس لە ساڵی ١٩٢٣ بوو بە نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق، کاریگەریەکیٚ زۆر لەسەر سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا بەرامبەر عێراق هەبوو، هەوڵێکی زۆری بۆ لکاندنی کوردستانی باشوور بە عێراقەوە نەدا، بۆ ئەوەی نیگەرانیەکانی کەمینەی عەرەبی سوونی فەرمانڕەوا لە عێراق ئارام بکاتەوە، سەیری:

- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ل، ١٨-١٩.

٢- یاسین طه ظاهر العسكري، سەرچاوەی پێشو، ل ٨١٦.

٣- مێجەر سۆن: لە بەناوبانگترین کارمەمدانی بەریتانی بووە کە لە کوردستان کاری کردووە، بە جلی بازرگانێکی ئەفغانی و ناوێکی خواستراو(میرزا غولامەدین شیرازی) لە سەرەتای سەدەی بیستەم گەشتێکی بەناو کوردستان کردووە، لەمیانەی گەڕانی بەناو کوردستاندا زمانی کوردی وەك هەر کوردیك زانیوە. لە بارەی ئەو گەشتانەی کتێبێکی نووسیوە بەناوی(رحله متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكوردستان- E.B.Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise)، دوای ئەوەی لە سایەی ئینتیدابی بەریتانی هاتە ناو کوردستانی باشوور رۆژنامەی (تێگەیشتنی راستی) بەی زمانی کوردی لە بەغدا دەرچواندووە، کە دژایەتی شێوازی حوکمرانی شێخ مەحموودی لە سلێمانی دەکرد، بۆیە دوای بەدیلگرتنی شێخ مەحموود بووە حاکمی سیاسی سلێمانی، هانی کلتوری کوردی داوە، سەیری:

- کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ل٣٦-٣٧.

٤- ستیڤن همسلی لۆنکریك: یەکێك بووە لەو ئەفسەرانەی لە میانەی هەڵمەتی بەریتانی بۆسەر عێراق لە یەکەم جەنگدا هاتۆتە عێراقەوە، لەماوەی ئینتیدابدا پۆستی ئیداری گرنگی بەدەستەوە گرتووە، سەرباری ئەوەی بە نووسینی کتێبێك لە بارەی مێژووی عێراق و ناوچەکە بەناوبانگە، کە بە گرنگترین سەرچاوە لە مێژووی هاوچەرخی عێراق دادەنرێت، سەیری:

ئاڕاستەیە وا دەبینی کە دەبێت بەروونی ئیدارەی کۆکس (دەوڵەتی عێراق) جیاوازی هێڵی نێوان خەڵکی کورد و خەڵکی عەرەب بکات، شارەکانی هەولێر و کفری و کەرکوك بە هیچ شێوەیەك شاری عەرەبی نین. بەهەر حاڵ ئەو ئاڕاستەیەی کە کوکس نوێنەرایەتی دەکرد، لە کۆتاییدا سەرکەوت، ئەو نامانەی کە لە نێوان چەرچڵ و کوکس ئاڵوگۆڕ کران بە روونی ئەوەی بەدەرخست کە بەریتانیا لەبارەی کورد خودان سیاسەتێکی روون نیە[1].

هەرچۆنێك بێت، کەمالییەکان بە سازشەکانی بەریتانیا و وڵاتانی هاوپەیمانان رازی نەبوون، هەرچەندیش ئەو سازشانەیان تا دوا پلە بۆخۆیان قۆزتەوە، لەبەرامبەریشدا بەریتانیا ئارەزووی نەدەکرد چیتر سازیشی زیاتر پێشکەش بکات بەشێوەیەك کار لە بەرژەوەندییەکانی بکات، پێدەچوو بەریتانییەکانیش گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی کە کەمالییەکان بە دەستکەوتی سازشەکانی هەردوو کۆنگرەی لەندەن و قاهیرە رازی نەبوونە، بۆیە دووبارە پەنایان بۆ هەمان شێوازی کۆنبردەوە، بۆ فشارکردنە سەریان تاکو ناچاریان بکەن هەڵوێستیان نەرم بکەن. ناوەڕۆکی یادداشت و نامەکانی دائیرە سیاسییەکانی بەریتانیا لەماوەی مانگەکانی نیسان و ئایار و حوزێرانی ١٩٢١ باسی لە "پرسی سوود وەرگرتن لە نیشتیمانپەروەرانی کورد لە دژی نەتەوەپەرستانی تورکی"، کردبوو، لەو نامانەدا دەرکەوتووە کە بەریتانییەکان زانیاریان لەبارەی پەیوەندی کورد بە یۆنانەوە هەبووە. سەرچاوە بەریتانییەکان پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە هاوپەیمانی کورد لەگەڵ یۆنانییەکان بەهۆی ئاڵۆزی نەتەوەیی و ئایینی نێوانیان سەرکەوتوو نابێت، کورد لایەنی دۆڕاوی هاوکێشەکە دەبێت، ئەو یادداشتانە باسیان لە داخوازییەکانی کورد بۆ بەرپرسانی بەریتانی لە ویلایەتی موسڵ کردووە، بۆ ئەوەی رێگەیان پێ بدەن بیکەنە پێگەی بەرخودان لە دژی کەمالییەکان[2].بەرپرسانی بەریتانی لەگەڵ کەسانی

---

- ستیفن همسلي لونكريك، أربعة قرون من تاريخ العراق، ط٦، بغداد، ١٩٨٥، ل ل٥-٦.

1- R.Olson, The Emergence of Kurdish Nationalism and Sheikh Said Rebellion, University of Texas, Austen, 1989, PP. 62-63.

٢- بزووتنەوەی (قۆجگیری) کە لەناوچەی دیرسیمی کوردی لە ساڵی ١٩٢١ دەرکەوت بە یەکەم هەڕەشەی کرداری کوردی لە دژی کەمالییەکان دادەنریت، سەرانی بزووتنەوەکە داوای مافی ئۆتۆنۆمیان وەك کەمترین مافی کورد کرد، کرنگی شۆڕشەکە لەوەدابوو هاوکاتبوو لەگەڵ داگیرکاری یۆنانی بۆ ناوچەکانی رۆژاوای تورکیا، ئەمەش وای لە کەمالییەکان کرد بانکەشە بۆ بوونی هەماهەنگیەکێ هەواڵگری بەریتانی — یۆنانی لەگەڵ



خانەوادەی بەدرخانییەکان پرسی پێشکەشکردنی پاڵپشتی و جۆری پاڵپشتییەکەیان تاوتوێکرد، باس دەکرێت کە بەرپرسێکی بەریتانی بە یەکێك لە نەوەکانی بەدرخانی راگەیاندووە کە "بەریتانیا نایەویت کورد ویلایەتی موسڵ بکەنە پێگەیەك لە دژی کەمالییەکان، چونکە ئەمە گرفت بۆ بەریتانیا دەنێتەوە"، بەڵکو پێشنیازی کرد کە "پاڵپشتی سادە بە بزووتنەوەی کوردی لە ناوچەکانی ناوەوەی ئەنادۆڵ دوور لە سنووری ویلایەتی موسڵ پێشکەش دەکەن". پێ دەچێت بەریتانیا بە کردەوە هانی عەبدولرەحمان بەگ برای ئەمین عالی بەدرخانی دابێت، تا سەردانی بەیروت بکات، "بۆ ئەوەی لەگەڵ فەرەنسییەکان هەماهەنگی بکات و لەبارەی ئەو ناوچەیەی کە دەوڵەتەکەیان لێ دادەمەزرێنن، گفتوگۆ بکات"[1].

هەرچۆنێ بێت لە ساڵی ١٩٢١ ەوە هەردوو وەزیری موستەعمەرات و دەرەوەی بەریتانی لەسەر پرەنسیپی دانووستاندن نەکردن لەگەڵ تورکەکان رێککەوتن، هەروەها لەسەر پاڵپشتیکردن لە نیشتیمانپەروەران و نەتەوەخوازانی کورد و درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆیان رێککەوتن[2]، راولنسۆن ـ گەورە فەرمانبەری دەزگای هەواڵگری بەریتانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ـ راپۆرتێکی لێکۆڵینەوەیی لەبارەی رەوشی سیاسی و عەسکەری بزووتنەوەی کەمالی و پێگەی کورد لەو بزووتنەوەیە نووس، راپۆرتەکە بنەمایەکی بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشێکی کوردی لە دژی کەمالییەکان دانا، هەروەها بەکارهێنا نی کورد بۆ لاوازکردنی هەڵوێستی سەربازی و سیاسی کەمالییەکان روونکردەوە[3].

---

سەرانی بزووتنەوەکە لە دژی ئەوان بکەن، لەو رۆژەوە کەلینی نێوان هەردوو نەتەوەی تورك و کورد گەورەتر دەبێت، سەیری:

-R.Olson,Op.Cit.,PP.33-37; Evin Aydar,ÇiÇek, KoÇgiri Ulusal kurtuluş Hareketi, Stokholm, 1999

1- R.Olson,Op.Cit., PP.63-64.

٢- روبەرت ئۆلسن، راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٠٩.

٣- بۆ زانینی ناوەڕۆکی راپۆرتەکە سەیری:

- R.Olson, Op.Cit., P.76 f.

لە ڕاستیدا پلانەکە زۆر جوان نەخشەی بۆ کێشرا بوو و ڕێکخرابوو، بەڵام لەلایەن گەورە کارمەندانی وەزارەتی موستەعمەرات و کارمەندانی دائیرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی ناوبراو، بە توندی ڕەتکرایەوە، پاساویشیان بۆ ئەمە ئەوەبوو کە "بەرتانیا لە ڕاپەڕینی کوردان هیچ دەستکەوتێکی نابێت، چونکە کورد دەسەڵات و شارەزاییان لە ناوچەکانی باکووردا نییە کە دەبێت لەوێوە لە دژی کەمالییەکان ڕاپەڕن"، هەروەها یەکێکیان ئەوەشی گوت کە "شۆڕشی کوردی گرفتی گەورە بۆ کەمالییەکان دەنێتەوە، بەڵام ئەو ناوچانەی شورش دەبینین، پێویستیان بە کەسانی کارگێڕ و پسپۆری کاروباری دەرەوە دەبێت وەك ئەوەی لە حیجاز روویدا... بە سروشتی ڕەوشەکە ناکرێت ئەو ڕەوشەی کە شۆڕشی عەرەبی ١٩١٦ی تێیدا روویدا بەو ڕەوشەی کوردانی باکوور تێیدا دەژین بەراورد بکرێت..."، یەکێکی دیکە گوتی "ئەگەر ئێمە پێشنیازەکەی ڕاولنسۆنمان وەرگرت و هانی کوردمان بۆ شۆڕش لە دژی تورکەکاندا و دەستکەوتی سیاسیمان لەم شۆڕشە دەستکەوت، ئایا لەو کاتەدا واز لە کوردان دێنین تا تورکەکان بەئارەزووی خۆیان چیانبەسەر بێنن، ئایا کۆلۆنێل ڕاولنسۆن لە هاندانی ئەرمن بۆ سەر رووس پەندی وەرنەگرت؟!...."[1].

پلانە نوێیەکەی بەریتانیا سەرکەوتنی بە دەستنەهێنا، پاڵنەرەکانی بەرپرسانی بەریتانی بۆ دژایەتیکردنی پلانە نوێیەکە بۆ پاڵپشتی کورد هەرچیەك بێت، ئەوا ساڵی ١٩٢١ بە ساڵی سەرکەوتنی کەمالییەکان دەژمێردرێت: لەلایەك لەرووی سەربازی بەسەر یۆنایەکان[2]، لەلایەکی دیکەوە ساڵی ڕێککەوتنەکان و پاڵپشتی و داننانی نێودەوڵەتی بوو بۆیان[3]. بزووتنەوەی کەمالی بە کردەوە توانی ناوچەی لە ئەنادۆڵ بە تورکیای هاوچەرخەوە تێکەڵاو بکات، ئەو ناوچەیەی کە بە شێك بوو لە پڕۆژەی دەوڵەتی کوردی کە لە پەیمانی سیڤەر لەسەری ڕێککەوتبوو[4]. بە کۆتایی هاتنی ساڵی ١٩٢١ جگە لە کرانەوە بەرووی ڕژێمی کەمالی هیچ

١- روبەرت ئۆلسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ل ١٢٦-١٢٨.

٢- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٩٦-١٠٣.

٣- سەیری بابەتی یەکەمی بەشی یەکەم بکە.

٤- برهان الدين ابا بكر ياسين، سەرچاوەی پێشو، ل ٤١" نطق غازي مصطفى كمال طرفندن، انقرة، ١٩٢٧، ل ٤٧٥.



لەبەردەم سیاسەتی بەریتانی نەمایەوە. ئارەزوو و پێویستی زۆری بەریتانیا بۆ ئاشتی لەگەڵ تورکیا وایکرد پلان و سیاسەتەکانی بەرامبەر کورد سنووردار بکات.

هاوشان لەگەڵ هەڵوێستە نوێیەکەی بەریتانیا، ئەوا هەوڵەکانی کەمالییەکان بۆ وەرگرتنی سازشی زیاتر لەبەریتانیا هیچ لاواز و پاشەکشەی نەکرد، ئەو بزووتنەوەیە وای بینی کە پێویستی بە هێزی یارمەتیدەری زیاتر هەیە، بۆ ئەوەی هاوسەنگی بەرژەوەندییەکانی بە ئاڕاستەی لاوازکردنی زیاتری هەڵوێستی بەریتانی بەرێت[1]، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە ئەفسەرێکی کورد کە ناوی ئەحمەد تەقی[2] بوو ڕاسپێردرا تاکو هەماهەنگی و هاوکاری نێوان کەمالی و کورد لە ڕەواندز لە باشووری کوردستان بکات.

لە ئایاری ١٩٢١ مەفرەزەیەکی تورکی گەیشتە ڕەواندز، لە ڕاکێشانی پاڵپشتی عەشایەرە کوردییەکانی دژ بە بەریتانیا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا، لە سەرەتای تەمووزی ١٩٢١ کردەی سەربازی چالاك دژ بە ئینگلیز دەستی پێکرد، دیاریترینیان دەرکردنی ئینگلیزبوو لە ڕەواندز بە یارمەتی کوردان[3]. ئەو سەرکەوتنانە بە دامەزراندنی قائیمقام و ئەنجوومەنیکی ئیداری لە ڕەواندز بە بڕیاری ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی لە ئاداری ١٩٢٢

١- سروه اسعد صابر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٣٤.

٢- ئەحمەد تەقی: کەسایەتیەکیَ نیشتیمانپەروەری کوردی بوو، وەك نزیکترین کەس لە شێخ مەحموود دەرکەوت، لە دەستتێوەردانەکانی تورکیا لە باشووری کوردستان ڕوڵی بەجوانی دەرکەوت، بازنەی بەیەکگەیشتنی نێوان شێخ مەحموود کەمالییەکان بوو، سەیری:

- ئەحمد تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا، ڕێکخستن و ئامادەکرن بۆ چاپ جەلال تەقی، بەغدا، ١٩٧٠، ل ل ٤٦-٤٩.

٣- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی قۆناغە سەرەتاییەکانی دەستتێوەردانی تورکان سەیری:

- هاملتون، طريق في كوردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، ط٢، أربيل، ١٩٩٩، ل ٦٧" س.جي. ادمونز، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٢.

تاجی بەسەرنرا. بۆ پاراستنی ئەو سەرکەوتنە گەورانەش عەلی شەفیق ناسراو بە ئۆزدەمیر کە ژەنەراڵ ێکی چەرکەسی بوو بۆ ناوچەکە نێردرا[1].

پێدەچوو ستراتیژی تورکەکان فشار خستنە سەر بەریتانیا بێت لە عێراق، لە ڕێگەی نانەوەی نائارامی و ئاژاوە لە کوردستانی باشوور، ئەو ستراتیژەش پشتی بە ناردنی هێزی نا نیزامی بەستبوو، کە بەشێوەیەکی دووبارەبووەوە دەنێردرا، ئەرکی ئەوەبوو کە جەنگی پارتیزانی لە ناو ناوچەی کوردی ئەنجام بدات و شێوازی ترس و دەمچەورکردن لەگەڵ سەرکردە کوردییە عەشایەرییەکان بەکاربهێنێت.

سەرکەوتنە خێراکانی تورکەکان لە باشووری کوردستان ترسی لای بەریتانییەکان دروستکرد، بەریتانییەکان بابەتەکەیان بەهەمەجۆر ڕێگا چارەسەرکردبوەو، لە نێوانیاندا هەوڵی ڕازیکردنی نێوەندە کوردییەکان لەبارەی ڕێگەدان بە گەڕانەوەی شێخ مەحموود بەرزنجی لە تاراوگەکەی لە هیندستان لە ئەیلولی ١٩٢٢ و سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی بە حاکمی سلێمانی[2].

گەڕاندنەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی لەلایەن بەریتانیاوە، هەڵوێستە ترسناکەکەی ئیدارەی ئینگلیزی چارەسەر نەکرد، بەڵکو گرفتی بەریتانییەکان زیادکرد، دوای ئەوەی شێخ لە دۆزینەوەی چارەسەرێکی دیپلۆماسی بۆ کێشەی کورد لەلای بەریتانییەکان بێ هیوا بوو، بە نهێنی پەیوەندی بە کەمالییەکان کرد[3]، بە ئاشکرا لایەنگری بەریتانیای دەکرد، بەیتانیا توانی نامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوانیان ئاشکرا بکات[4].

---

1- Colonial Office, Iraq Report on Iraq Administration, October 1920-March 1922, London, 1923, PP.115-116“

- ئەحمەد باوەر، ئۆزدەمیر و کورد، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ل ١٣-١٤.

2- Colonial Office, Iraq Report on Iraq Administration, October 1920-March 1922, PP.115-117.

٣- کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی ٢، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٨٦.

٤- جگە لە ئۆزدەمیر، پەیوەندی شێخ و کەمالییەکان لە ریگەی زۆر کەسی دیکەوە بووە، هەریەکە لە رەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی رۆڵێکی گەورەیان لەم بوارەدا بینیووە، بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز غەفور خان



دەستتێوەردانەکانی تورکیاو ئەو ئاڵۆزییە گەورانەی نایانەوە، هاوکات بوو لەگەڵ گرێدانی کۆنگرەی لۆزان، کە یەکەم دانیشتنی لە ٢٠ تشرینی دووەمی ١٩٢٢ کرا، بۆیە بەریتانیا چالاکی سەربازی و دیپلۆماسیەکان خۆی لە باشووری کوردستان زیاد کرد، لە ١٣ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢پەلەی لە بڵاوکردنەوەی پەیمانی عێراقی - بەریتانی کرد کە لە ١٠ی هەمان مانگ بەسترا بوو، هەروەها شانبەشانی ئەم کارە بەیاننامەیەکی هاوبەشی بەریتانی - عێراقی کە باسی لە مافەکانی کورد کردبوو بڵاوکردەوە[1]. لەلایەکی دیکەوە هەڵمەکانی پاکسازی لە سەرەتاکانی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ دەستی پێکردبوو تا دانیشتنەکانی کۆنگرەی یەکەمی لۆزان(٢٠ تشرینی دووەمی ١٩٢٢ تا ٢٣ نیسانی ١٩٢٣) بەردەوام بوو، هێزەکانی بەریتانی توانی لە ١٤ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ کۆیە بگەڕێنێتەوە، بە شەش مانگ دواتریش لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ ڕەواندزیش بگەڕێنێتەوە[2].

وەڵامدانەوەی کوردان بۆ بزوتنەوەکانی تورکە کەمالییەکان، ڕەنگدانەوەی سەرنەکەوتنی سیاسەتی بەریتانی بو لە باشووری کوردستان، هەروەها دەربڕی بێ هیوایی کوردیش بوو لەبەرامبەر وەڵامدانەدانەوەی بەریتانیا بۆ خواست و ئاواتە نەتەوەییە ڕەواکانی کورد. لەلایەکی دیکەشەوە پەرچەکرداری بەریتانییەکان بۆ بزووتنەوەی ڕەواندز، ترۆپکی سووربوون ی بەریتانیای بۆ دەستگرتن بە ویلایەتی موسڵ- کوردستانی باشوور دەرخست، کە دەمەقاڵێ

---

ناودەشت، کە خانەوادەیەکێ بەناوبانگی ڕانیەیە، و عەبدوڵڵا ئاغا کەسایەتی ناسراوی کۆیە، کەسێکی دیکە کە بە سیتۆ ناسرابوو لە ئامێدی ڕۆڵێکی گرنگیان لە پەیوەندی شێخ و کەمالیدا بینی، ئەمەش بووە نارەزایەتی ئینگلیزەکان کە بە خێرایی ویستیان سنوورێکی بۆ دابنێن. سەیری:

- كمال مظهر احمد، وثيقة سرية هامة حول موقف الإنكليز من الشيَخ مةحموود وحركاته، ترجمة: عبدا لله بابان، مجلة گولان العربي، العدد(٦٤)، أربيل، أيلول ٢٠٠١، ل ل ٥٠-٥٩.

1- Peter Sluglett, Britain in Iraq 1914-1932,London,1976,PP.75-86

- م.س.لازاريف، المسألة الكوردية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٣٢.

2- Colonial Office, Special Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the progress of Iraq During the period 1920-1931,London,1931, PP.40-41

- ابراهيم خليل احمد، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٥١٧-٥١٩.

لەبارەیەوە لە ١٩٢٣ تا ١٩٢٦ خایاند، تا وای لێهات ئە کێشەیە بووە دیارخەری سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر کورد.

پەرەسەندنەکانی ئەم دواییەی کوردستان و سەرکەتنە دەرەکی ناوخۆییەکانی مستەفا کەمال و ئەو ئالۆزیانەی لە گۆرەپانی نێودەوڵەتی لە ئارادابوو، وایان لە بەریتانیا کرد بە سیاسەتەکانیدا کە لە بنەماوە بەرامبەر پرسی کورد و کوردستان نارۆشنبوو، بچێتەوە. ئارلۆن ویلسۆن ئەو ئاراستەیە نوێیەی بەریتانیای دەربڕی کاتێ گوتی"پێویستە ئەو کوردانەی کە لە دەرەوەی سنووری ویلایەتی موسڵ دەژین جێبهێڵێن و بۆ تورکەکان وازیان لێبهێنین چیان لێدەکات و لێناکات..."[1]. ئەمەش پالپشتی لەو رایە دەکات کە دەڵێت: "هیچ بەڵگەیەك نییە ئاماژە بە پالپشتی بەریتانیا بۆ بزووتنەوە نەتەوەییە کوردییەکانی کوردستانی باشوور بدات لە دوای ساڵی ١٩٢٢ ەوە"، لە راستیدا هاندانی بزووتنەوە نەتەوەییە کوردییەکانی باشووری کوردستان هەرشە بوو بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا[2].

ئەو نارۆشنی و دووفاقیەی کە لە سیاسەتی بەرتانیا لەبەرامبەر کوردستانی باکوور بەتایبەتی و کوردستانی باشوور[3] بەگشتی هەبوو ئەمە لەلایەك، هەروەها سەرکەوتنەکانی مستەفا کەمال بەسەر یۆنان و هاوپەیمانان و دورکەوتنەوەی فەرەنسا و ئیتالیا لە بەریتانیا و دژایەتیکردنی پرۆژەکانی لە ناوچەکە[4] لەلایەکی دیکەوە، وایکرد بەندەکانی پەیمانی سیڤەر تایبەت بە کورد لەناوبچێت، نەوەك هەر ئەوەندە بەڵکو وایکرد ئەو بنەمایەی کە پەیمانی سیڤەری لەسەر بونیاد نرابوو، بڕوخێت. لەو کاتەدا پرۆژەی " کوردستانی سەربەخۆ " یان خودان ئۆتۆنۆمی بە ئاشکرا بووە پرۆژەیەکی بێ بەها و هێز و دەنگی لە دەستدا[5].

هەروەها ناکرێت رۆڵی رووسیا لە تەگەرە خستنە بەردەم پرۆژە کوردییە بەریتانییەکان لەبەرچاو نەگیرێت، ئۆلسن لەو باوەڕەدایە کە "بەریتانیا بۆ بەرژەوەندی کوردان پێی باش نەبوو

١- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە: شۆرشەکەی عێراق لاپەرە ١٩٩ - ٢٠٠

٢- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤.

٣- لۆنگریك ئەو دژایەتیەی دەربڕی گوتی: " کێشە کە لە کوردستانی باشوور ئەوە بوو کە رژێمێکی باشتر لە بەربلاوی دابنرێت". سەیری کتێبەکەی خۆی بکە

- Iraq from 1900 to 1950, 3rd Edition, Beirut, 1968, P.103.

٤- سەیری بابەتی دووەمی بەشی یەکەم بکە.

٥- محسن محمد المتولي، کُرد العراق١٩١٤-١٩٥٨، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠١، ل ١٠٧.



دەست لە کوردستانی باکوور وەربدات، بۆ ئەوەی زامنی پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ کەمالییەکان بۆ بکات"[1]. بەریتانییەکان لەبەردەم دوو رێگاچارە دابوون: "یا ئەوەتا دۆستایەتی لەگەڵ تورکەکان دەکەن یان تورکەکان بۆ رژێمی تازەی رووسیا لێ دەگەڕێن..."، لەراستیدا رێگەی دووەم بۆ بەریتانیا بە کارەسات دادەنرا، بۆیە بەریتانیا پێشینەی بە بەرژەوەندییە ستراتیژی و ئابووریە تایبەتەکانی خۆی دا[2].

لە راستیدا کوردستان هەر نەبووە قوربانی بەرژەوەندی و گۆڕانکارییە نوێیە نێودەوڵەتییەکان، بەڵکو فاکتەری زاتی پەیوەندیدار بە سروشتی کێشەی کوردەوە هەبوون، وای لە بەریتانیا کرد سیاسەتی کاتێ ناجۆر و شێواو بەرامبەر کورد بگرێتەبەر، هـ . ئا . ئەسکویسی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی لە ماوەی جەنگەکە رایگەیاند کە "پرسی کورد یەکێکە لەو کێشە سەختانەی کە بەرۆکی ئیمپراتۆری بەریتانی گرتووە". ئەم تێبینیە لەلای بۆنارلۆی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی ساڵی ١٩٢٠ یش دەبینرا کاتێ گوتی "پرسی کورد لەو پرسانە بوو کە سەرنجی نوێنەرانی هاوپەیمانی لە دانووستاندنەکانی ئاشتی لە پاریس راکێشا، کێشەکە رەهەندی تایبەتی هەیە و کاریگەری زۆری لەسەر ئاراستەی سیاسەتی بەریتانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبێت، بەتایبەتی پەیوەندییەکانی حکوومەتی بەریتانی بە تورکیا و ئەرمینیا و عەرەبی عێراق"[3].

نەبوونی هەستێکی نەتەوەیی یەکگرتوو لە نێو کورد بەرامبەر هەڵوێستی بەریتانیا لە هەمبەر کێشەی کورد کاریگەری خۆی هەبوو، تۆینبی ARNOLD J.TOYNBEE لەمبارەیەوە رایگەیاند کە "جگە لە ژمارەیەکی کەم لەوانەی بە رەچەڵك کوردبوون و لە ئەستەمبوڵ یا رۆژئاوا گیرسابوونەتەوە، ئەوانەی کە ریشە عەشایەرییەکەیان لە نیشتیمان لە دەستدابوو، بەردەوام هەستی نەتەوەیی کوردی لەلایەنی هەڵدابووە لە دژایەتیکردن، جا چ تورکی یا بەریتانی یا عەرەبی یا هەر بێگانەیەکی دی بێت، ئاماژەیەکی لاواز لەسەر بوونی هەستێکی نەتەوەیی پۆزەتیڤی کوردی یەکگرتوو هەیە، بە ویلایەتی موسڵیشەوە، بەڵکو هیچ ئارەزوویەك بۆ دەربڕینی یەکگرتووی نەتەوەیی بە شێوەیەکی سیاسیان لا نیە. ئاسۆیی سیاسی کورد سنووردارە و بە رایەڵەی عەشیرەت یا سەرۆك هۆزە

١- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە، المسألة...، ل ١٧.

٢- برهان الدين أبا بكر ياسين، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٢.

٣- عثمان علي، الإنكليز والبحث عن سياسة في كوردستان١٩١٨-١٩٢٠، ل ١١.

جۆراوجۆر و پێشبڕکێکارەکانەوە بەندە . سیاسەت بۆ کورد هەر بە پرسێکی کەسێ، تاکی لە روحیدا مایەوە"[1].

لە نیسانی ١٩٢٠ لۆرد کریزن نیازی حکوومەتەکەی بۆ بینی نوێنەرانی کورد پێشاندا، بۆ ئەوەی لەبارەی ئۆتۆنۆمی کوردی گوێ لە بیروبۆچوونیان بگرێت، لەسەر ئەم بنەمایە رێنمایی بە بەغدا و ئەستەمبۆڵ درا، بەڵام وەڵامەکە هاندەر نەبوو، نوێنەری باڵا لە ئەستەمبۆڵ وەڵامی دایەوە کە هیچ کوردێك نییە کە بەریتانییەکان بۆ رێکخستنی حکوومەتی کوردستان پشتی پێببەستن. وەزارەتی دەرەوەش وەڵامی دایەوە کە "کوردێکی لێهاتوو نییە کە بتوانێ بەراستی نوێنەرایەتی هەموو کوردستان بکات"[2]. کارمەندانی بەریتانیا لە عێراقیش جەختیان لەوە کردەوە کە کورد هەستی نەتەوەییان نیە. لوید جۆرج گوتی "لەو کاتەدا هەوڵم داوە بەدوای هەستی نەتەوەی کورد لە ئەستەمبۆڵ و بەغدا بگەرێم، بینیم کە ئەستەمە کوردێك بدۆزیتەوە کە زۆربەی کورد پاڵپشتی لێ بکات"[3]. توێژەرێکی کورد باس لەوە دەکات کە "ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی فەرنسی پڕە لە بروسکەی ناردراوی سەرانی عەشیرەتە کوردییە گرنگەکان بۆ هەردوو حکوومەتی بەریتانی و فەڕەنسی کە هەوڵەکانی (شەریف پاشا) بۆ رازی کردنی وڵاتانی گەورە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیان پرتستۆ(مەحکوم)کرد و رایانگەیاند کە سورن لەگەڵ (براکانیان لە ئایین) تورکەکان بمێننەوە"[4].

لە ئەنجامدا، نائارامی رەوشی سیاسی لە عێراق و کوردستان و تورکیا و ئێران، سەرباری ناکۆکی لە بیروڕای وەزارەتەکانی بەریتانی لەبەرامبەر پرسی کوردی و عێراق، بەڵکو هەتاکو لە نێوان کارمەندانی بەریتانیش خۆیاندا، وایکرد بەریتانیا سیاسەتێکی کەموکوڕ بەرامبەر کورد بگرێتەبەر، لە کاتێکدا کە وەزارەتی هیند و دەرەوە پێیان باش دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێ و ئەمەشیان راگەیاند، ویڵسن هەڵوێستەکەی پێشووی دووبارەکردەوە، کە ئەو جۆرە

---

١- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە:

-The Islamic World, Survey of International affairs 1925, Vol.I, London, 1927, PP.279-280.

٢- عثمان علي، الإنكليز والبحث عن سياسة... ص ١١" سیامند ز. عثمان، ملاحظات تاريخية حول نشأة الحركة القومية الكوردیية، مجلة دراسات كوردیية، العدد(١-٢)، باريس، كانون الثاني ١٩٨٤، ل ٣١.

3- Harold Niclason, CURZON; The last Phase 1922-1925, New York, 1939, P.329.

٤- سیامند ز.عثمان، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٣١-٣٢.



سیاسەتە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر سیاسەتی بەریتانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لێدەکەوێتەوە، هەروەها ئەدمیرال کالتون (یەکەم مەندوبی سامی بەریتانی لە تورکیا) رایگەیاند کە "کوردستانی ئازاد، هاوسێیەك دەبێت بۆ وڵاتی عێراقی نوێ سوپاسگوزار نابێت..."[1]. لە کۆتاییشدا رای ویڵسن وەرگیرا، بەرپرسانی بەریتانی گەیشتنە ئەو رایەی کە: "بەریتانیا باشووری کوردستان وەك بەشێك لە عێراق دەهێڵێتەوە و باکووری کوردستانیش بۆ تورکیا دەبێت"[2].

بەم شێوەیە ئامانجەکانی سیاسەتی بەریتانیا لەسەروبەندی پەیمانی لۆزان بە ئاڕاستەی دابڕاندنی کوردستانی (ویلایەتی موسڵ) لە هەر قەوارەیەکی سیاسی کوردی داهاتوو دیاریکرا، بەڵکو وایلێهات بەریتانیا دەستبەرداری هەر پڕۆژەیەك بوو کە بە ئامانجی "دامەزراندنی وڵاتێکی سەربەخۆ لەو ناوچانە" پاڵپشتی لێدەکرا، واتە لە کوردستان بە گشتی بووە کاریکی ئەستەم[3].

---

١- م.س.لازاريف، المسألَة الكردية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ١٦٥.

2- S.H.Longrigg, OP.Cit., P.107.

لەبەرامبەردا ژەنەڕاڵ نۆئیل لەو باروەڕدابوو کە کورد زۆریان ئازار چەشتووە و لەسەر دەستی تورکان بۆ ماوەی چوارسەد ساڵ چەوساونەتەوە، ئەوان مافی ئەوەیان هەیە لە تورکیا جیا ببنەوە، دەوڵەتی کوردی تورکیا لاواز دەکات، هەروەها کوردان لەسەر بنەمای پرەنسیپەکانی ویلسۆنی سەرۆکی ئەمریکی کە جەخت لە بەخشینی مافی چارەنووس دەکات، داوای مافەکانیان دەکەن. نۆئێل وای لەبەریتانیا دەبینی کە هێزێکی شارستانی وایە کە یارمەتی کورد دەدات بۆ بەدیهێنانی خواستە نەتەوەییەکانیان....بەڵام تێزە و راکانی نۆئیل بەرپرسانی بەریتانی بەتایبەت ئەوانەی پەیوەست بوون بە عێراقەوە وەك ویلسۆن و سی جی ئادمۆنز و خاتوو بێلی پێ رازی نەکرا، ئەوانە بەردەوام رەخنەیان لە هەڵوێستی نۆئیل لە بارەی کوردەوە دەگرت. بە شلەژانی پرسی کوردی لە نێوان پرۆژەکانی ویلسۆن و پێشنیازەکانی نۆئیلدا، ئیدارەی بەریتانی پرۆژەکانی ویلسۆنی پێ باشتر بوو، کە توانی حکوومەتەکەی بەوە رازی بکات (کوردستانەکەی نۆئیل کاریکی وەهمییە) . هەرچی بۆ عێراقە ویلسۆن وای دەبینی کە عێراق گرنگیەکێ واقعی هەیە، لەبەر ئەوەی پێشنیازەکان زیاتر لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆر دەگونجی .... بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی نۆئیل و کورد سەیری:

- E.W.C.Noel,A.G.E, S.7ff"

- مێجەر نوئێل، سەرنجدانێکێ بارۆدوخی کورد، ئامادەکردنی عبدالرقيب یوسف، لە عەرەبیەوە وەرگێڕانی سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ل٥٢ -٧٨" دیفید کورن، سەرچاوەی پێشو.

3- Colonial Office, Special Report … 1920-1931, PP.255-256 .

# بەریتانیا و قۆناغی یەکەمی کۆنگرەی لۆزان

**(٢٠ تشرینی دووەمی ١٩٢٢ ـ ٣١ کانوونی دووەمی ١٩٢٣)**

سەرکەوتنەکانی تورکەکان لە مۆدانیا، بارێکی نوێی لە ناوچەکە هێنایە ئارایەوە، ئەمەش پاڵی بە وڵاتانی هاوپەیمانانەوە نا کە بۆ رێکخستنەوەی رەوشەکە کۆنگرەیەکی نوێ بۆ تاوتوێکردنی پرسی رۆژهەڵات بە هەموو ئاڵۆزییەکانی گرێبدات، نەوەك تەنها بۆ دۆزینەوەی چارەسەر یان یەکلاییکردنەوەی جەنگی یۆنانی تورکی[1]، بەڵکو بۆ بڵاوکردنەوەی ئاشتی لە ناوچە ناتورکییەکان کە پێشتر وڵاتی عوسمانیان پێکهێنابوو، هەروەها دامەزراندنی رژێمێکی تازە بۆ ئیدارەی تەنگەبەرەکان. سەرباری چاوخشاندنەوە بە ئیمتیازاتەکان. واتە بە کورتی کۆبوونەوەکە لە پێناوی دووبارە دارشتنەوەی پەیمانی سیڤەر رێکخرابوو، کە نشتیمانپەروەرانی تورك تێکیانشکاندبوو[2].

بەریتانیا دەستی بە ئامادەکاری بۆ سازکردنی کۆنگرەکە کرد و لۆرد کریزن گرنگی زۆری بە پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو و چالاکی بۆ رووبەڕووبوونەوەی داخوازییەکانی قۆناغی نوێ و بۆ ئیتاڵیا و فەرەنسای پێشنیازکرد،کە کۆنگرەکە لە سویسرا لە لۆزان ببەسترێت[3].

1- Mehmet Gönlubol , Olaylarla Türk Diş Politikasi , Ankara , 1982, Basinci baski, Cilt.I (1919-1973),S.51

٢- سحر عباس خضیر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٥٩.

٣- هەڵبژاردنی لۆزان بۆ گرێدانی کۆنگرەکە لەسەر پێشنیازی کریزن بوو، لەبەرئەوەی شوێنێکی بێ لایەن بوو، رێگای گەیاندنی باشی لەگەڵ ئەستەمبۆڵ هەبوو، هەروەها هوتێلی باشیشی هەبوو، سەرباری هۆکاری دیکە. شایانی باسە تورکان پێیانن باش بوو، کە کۆنگرەکە لە ئەزمیر ببەستریت، بۆ ئەوەی وەك کارتێکی فشاری دیکە بۆ کاریگەری نواندن لەسەر هەڵوێستی بەریتانیا بەکاری بهێنن، بەڵام پێشنیازەکەی تورکی رووبەڕووی رەتکردنەوەی توند بوو لەلایەن کریزنەوە بووەوە، سەیری:



بەریتانیا بۆ گرێدانی کۆنگرەکە زۆر بە پەرۆش بوو، ئەمەش لەبەر زۆر هۆکاربوو: گرنگترینیان، زیانێکی زۆری بە هۆی سیاسەتەکانی لوید جۆرج بەرکەوتبوو، کە دارێژەری پەیمانی سیڤەر و سیاسەتی دوژمنداریکردن بەرامبەر تورکەکان بوو، لەم دواییەدا ناچاربوو کە شانۆی سیاسی بۆ هەتاهەتایی جێبهێڵێت، راستی کرد کاتێ گوتی "لە سیڤەر بۆ مۆدانیا پاشەکشە بوو، لە مۆدانیا بۆ لۆزان شەرڕاگرتن بوو"[1]. هەروەها هاوپەیمانانی بەریتانیاش لە بارێکی باشتر لە بەریتانیا نەبوون، فەرەنسا بە کاروباری ئەڵمانی خەریك ببوو[2]، ئیتاڵیا تورکیای بە دوژمنی ترسناکی خۆی نەدەزانی، بەڵکو بەدەست تەنگژەیەکی سیاسی توندەوە دەینالاند، بەهۆی دەستگرتنی فاشییەکان بەسەر دەسەڵاتی وڵات[3]. سەرباری ئەمانەش ئەو فشارە زۆرەی کە لەناوەوەی بەریتانیا داوای پێویست بوونی گەڕانەوەی سەربازە بەریتانییەکانیان بۆ وڵات دەکرد.

هەرچەندە هەموو ئەمانە متمانەیەکی زیاتری بە تورکەکان بەخشی و بوارێکی زیاتر بۆ گەمەی سیاسی هێشتەوە، بەڵام رەوشی خۆشیان ئاسان نەبوو، تورکیا بەدەست دەرەنجامەکانی جەنگە بەردەوامەکانی لە ١٩١١ەوە دەینالاند[4]، کە بووە هۆی دواکەوتەیی لە لایەنی

- Curzon to Harding, foreign Office,12-10-1922,DBFP,I.Sir,Vol,18, No.121, P.189; Curzon to Harding, foreign Office,13-10-1922,DBFP, I.Sir,Vol, 18,No.123, Minut. I,PP.194-195.

1- H.B.Sharabi ,Op.Cit.,P.37.

٢- فەرەنسا زنجیرەیەك گەرەنتی سەربازی و سیاسی بە ئامانجی زامنکردنی خۆی و جیهان لە دژی ئەگەری سەرهەڵدانی هێزی ئەڵمانی، ئەو گەرەنتیانەش سێ شێوەی هەبوون: - دیاریکردنی جبەخانەی جەنگی ئەڵمانی، داماڵینی چەك لە ناوچەی راین و داگیرکردنی کەرتی چەپی روباری راین و ناوچەکانی دیکە وەك جۆرێك لە گەرەنتی کردن، سەیری: -

- ج.ب.دیروزیل، التاریخ الدبلوماسي في القرن العشرین، الجزء الأول (١٩١٩-١٩٤٥)، ترجمة خضر خضر، لبنان، ١٩٨٥، ل ل ٢٠ - ٢٣ .

٣- م.س.لازاریف، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٩ .

٤- ئەو جەنگانە لە جەنگی ئیتاڵی – تورکی ساڵی ١٩١١ لە لیبیا دەستی پێکرد و بە جەنگی بەلقانی و یەکەم جەنگی جیهانی کۆتایی هات.....بۆ وردەکاری سەیری:

کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ....، سەرباری ئەو هەموو ناکۆکیانە، دەبوو تورکە کەمالییەکان سەنتەری بڕیاریان یەکبخەن، ئەمەش بۆ ئەوەی هەڵوێستیان لەبەرامبەر وڵاتانی هاوپەیمانان بەهێز بکەن، چونکە خاوەنی دوو حکوومەت بوون یەکێکیان لە ئەنقەرە ئەوەی دیکەیان لە ئەستەمبۆڵ بوو. کریزن سووربوو لەسەر ئەوەی کە هەردوو حکوومەتەکە بانگهێشت بکات، فەرەنساش لەمەدا پاڵپشتی کرد[1]. ئامانجەکەی لەمەدا روون بوو، ئەمەش بۆ لاوازکردنی هەڵوێستی شاندی تورکی لە دانوستانەکان. بەکردەوە لە ٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ بانگەوازی هەردوو حکوومەتەکەی بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی لۆزان کرد[2].

مستەفا کەمال ئاگاداری ئەو نیازە خراپەی کریزن بوو، کاتێ بانگهێشتی هەردوو حکوومەتەکەی کرد، ئەو بانگهێشتە وادەکات ناکۆکی و دژایەتی نێوان تورکەکان لە قۆناغێکی هەستیاری مێژووی وڵات زیاد دەکات، بۆیە رێگەی نەدا ئەو مەرامەی بهێنێتەدی. لە ٣١ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ وەڵامی کریزنی دایەوە کە حکوومەتی ئەنقەرە ئامادەیە بە زووترین کات نوێنەری خۆی بۆ لۆزان بنێرێت، بەڵام رازی نییە حکوومەتی ئەستەمبۆڵ لەمەدا هاوبەشی بکات و نوێنەرایەتی تورکیا بکات، چونکە پشت بە هیچ دەسەڵاتێکی شەرعی نابەستیت، هەروەها ئەوەشی زیاد کرد کە ئەو بانگهێشتە لەگەڵ بوونی شەڕاگرتنی مۆدانیا و ناوەڕۆکەی ناکۆکە، چونکە حکوومەتی دەسەڵات لایەنیکی شەرڕاگرتنەکە نەبوو[3]، هەروەها هەڕەشەی کرد و گوتی "بەشداری حکوومەتی ئەنقەرە واتا بەشداری نەکردنی حکوومەتی ئەنقەرە لە کۆنگرەکەدا"[4]، بەڵام کریزن ئەمەی بەهەند وەرنەگرت. بەدوای رامبۆڵدی بالیۆزی بەریتانی لە ئەنقەرەی نارد، بۆ ئەوەی بە مستەفا کەمال رابگەیەنێت کە وەزارەتی دەرەوە بە

- حسین لبیب، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٠٥-١٠٨.

1- Curzon to Harding , foreign Office, 12-10-1922, PDFP, I.Sir, Vol.18, No.121,P.191.

2- Curzon to A . Gerddo (Washington) , C . Eliot (Tokyo) , H.Pering (Bucharest), A.Yong(Belgrade), Lindly(Athens), Rumbold (Constantinople), foreign Office,26-10-1922, PDFP, I.Sir, Vol.18, No.134, PP.208-209.

3- Quoted in: Rumbold to Curzon,Constantinople,13-10-1922, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.141,minute.I,P.213.

4- Quoted in: Ibid,P.214.



پەلە هەوڵی وەرگرتنی چەند هەنگاوێکی پێویست دەدات، بۆ گەیاندنی تورکیا بە لۆزان، وە پێویستی بەشداریکردنی هەردوو حکوومەتەکە: ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵ، پێویستە رێوشوێنی ناردنی تاکە شاندێك بۆ لۆزان بگرنە بەر بۆ ئەوەی پەیمانەکە مۆر بکەن، حکوومەتی فەرەنسی لەم رێوشوێنە یارمەتی دا[1].

مستەفا کەمال زۆری چاوەڕێ نەکرد، بە هەلێکی بینی کە دەبێت بیقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی کە تەخت(عرش) هەیەتی، لەناوبەرێت، بە راسپاردەی ئەو ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢ بە کۆی دەنگ بڕیارێکی دەرکرد کە ئەمەی لەخۆگرتبوو: "گەلی تورکی مافی خۆیەتی شێوەی ئەو حکوومەتەی نوێنەرایەتی دەکات دیاری بکات، حکوومەتی ئەستەمبۆڵ کە پشت بە حکومی تاکەکەسێ دەبەستێت، لە ١٦ی ئاداری ١٩٢٠ ەوە کە ئەو رۆژەیە کە ئەستەمبۆڵ داگیرکراوە، بە حکوومەتێکی کەوتوو دەزانێت"[2].

بەمەش سەڵتەنەت بە قانوون نەما، سوڵتان وەحیدەدین جگە لە دەسەڵاتی ئایینی (خەلافەت) کە پێشتر بۆی دیاریکرابوو، هیچ دەسەڵاتێکی دیکەی نەما، ئەمەش تەوفیق پاشای ناچارکرد لە ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ دەست لەکاربکێشێتەوە، دوای ئەوەی لە یارمەتێدانی رامبۆڵد بێ هیوا بوو، رەفعەت پاشا بەناوی حکوومەتی ئەنقەرە کاروباری حکوومەتی ئەستەمبۆڵی بەرێوەبرد[3].

بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت، کاریگەری لەسەر هەڵوەشاندنەوەی سەرجەم پابەندییەکان و پەیمانەکان و بڕیارە داراییەکان هەبوو، کە حکوومەتی ئەستەمبۆڵ لەوەتەی ١٦ ئازارەوە لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمانان بەستاویەتی، ئەوانەی بە پووچەڵ و بێ بەها دانا[4]. کاردانەوەی بەریتانیا ئەوە بوو داوای لە ئیتاڵیا و فەرەنسا کرد کە تورکەکان بۆ دانانی بە

1- Curzon to Rumbold, foreign Office 2-11-1922, DBFP, I.Sir,Vol.18, No.147, PP.219-220

2- Quoted in: G. Lewis,Op.Cit., P.73.

3- Harry N.Howard, The Partition…, P.278; Rumbold to Curzon, Constantinople,4-11-1922, DBFP, I.Sir,Vol.18, 18, No. 151, PP. 226-227.

4- Curzon to Harding (Paris) and R. Graham (Rome),Foreign Office, 30-10-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 139, minute. 2, P. 212.

ڕەوایەتی پابەندییەکان و بڕیارە داراییەکانی حکوومەتی ئەستەمبۆڵ ناچار بکەن، کە لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمانان کراون و وەك بڕگەیەکی پێویست لە بڕگەکانی پەیمانی نوێ دابینێن[1]. فەرەنسا و ئیتاڵیا لەسەر ئەوپێشنیازانەی بەریتانیا ڕازی بوون، بەمەرجی وەك مەرجی دەستپێکردنی دانووستاندنەکان دانەنرێت[2].

لەبۆتەی ئەو پەرەسەندنانە، دوای پەیوەندی کردن بە بەریتانییەکان، سوڵتان وەحیدەدین بڕیاریدا لە ئەستەمبۆڵ ڕابکات، دوای ئەوەی هەستی بە ترس لەسەر ژیانی کرد، لە ١٦ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ داوای لە هارنگتۆنی فەرماندەی کەشتی گەلی بەریتانی کرد لەمەدا کۆمەکی بکات، لە بەیانی ڕۆژی دواتر بە نهێنییەوە چووە ناو کەشتی ملایۆی بەریتانی بۆ ئەوەی بەرەو دوورگەی ماڵتا بچێت[3]. لە هەمان ڕۆژدا حکوومەتی ئەنقەرە یادداشتێکی لە ژەنەراڵ هارنگتۆن پێگەیشت کە ڕوونی کردەوە کە سوڵتان لە ژێر پاراستنی بەریتانی دایە و بە کەشتییەکی جەنگی بەریتانی ئەستەمبۆڵی جێهێشتووە[4]. دەستپێشخەری بەریتانیا بۆ پارێزگاری لە ژیانی خەلیفە، سەرەتای لەدەستدانی کاریگەری خەلیفە بوو بەسەر موسڵمانان لەو داگیرکانی بەریتانی بوو. چونکە حکوومەتی بەریتانی چاوەڕێی کاریگەری پۆزەتیڤ بوو لەسەر ئەو ڕەفتارەی دوایی نواندی، بەڵام ڕووبەڕووی ڕەخنەی ئەوان بووەوە، بەتایبەتی لە هیندستان[5].

---

1- Curzon to Harding (Paris) and R. Grohom (Rome), Foreign Office, 30-10-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 139, minute. 2, P. 212.

2- Harding to Curzon, Paris 7-11-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 171, P.248.

3- Erik J. Zuches, Turkey. A Modern History, London and New York, 1994, P.138 ; Henderson to Curzon,Constantinople , 17-11-1922, DBFP,I.Sir , Vol.18, No.200, P.283

٤- لە ڕۆژی دووەمی یادداشتەکە و بە ڕاسپاردەی مستەفا کەمال ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی کۆبووە، بڕیاریدا سوڵتان وەحیدەدین لە پرستەکەی وەك خەلیفە لابەریت، کە بەم ڕەفتارە خراپەی پرستەکەی ناوزڕاند، کە بۆ ناوی نەتەوەی تورکی خراپ بوو، لەبری ئەو عەبدولمەجید(ی دووەم) ئەفەندی وەك خەلیفەی موسولمانان هەڵبژێردرا، سەیری:

- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ١٢٢.

٥- ألاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦٤.



بەم شێوەیە دوای ئەوەی مستەفا کەمال گۆڕەپانەکەی بۆ چۆڵ بوو، لە هەڵبژاردنی شاندەکە کە نوێنەرایەتی تورکیایان لە لۆزان دەکرد سەرپشك بوو، گرنگی بە دەستە هەڵبژێردراوەکە بۆ نوێنەرایەتیکردنی تورکیادا، سوربوو لەسەر ئەوەی کە عیسمەت پاشا کەسێ شایستەیە بۆ سەرۆکایەتیکردنی شاندەکە، دوای ئەوەی پۆستی وەزیری دەرەوەی پێبەخشرا، هەریەکە لە ڕەزا نور وەزیری تەندروستی و حسین بەگ شارەزای دارایی هەڵبژێردران بۆ ئەوەی یاوەری عیسمەت پاشا بۆ لۆزان بکەن، سەرباری ئەندامانی دیکەی لاوەکی[1]، بەم شێوەیە تورکەکان ئامادەکاری باشی خۆیان بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەکە کرد.

سەرۆکی فیدرالیزمی سویسری م. هاپ لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ ڕێورەسمی کۆنگرەی کردەوە[2]. کریزن سەرۆکایەتی شاندی بەریتانی بۆ کۆنکرەکە کرد و هەریەکە لە ڕامبۆڵد Rumbold ورەیان Rain و ئادەم بلوك Adam Block یاوەریانکردو بەو پێیەی بەتەمەنترین ئەندام بوو، وەك سەرۆکی کۆنگرە هەڵبژێدرا[3]، لە هەمانکاتدا باریی Barrere و بومبارد Bompord، سەرۆکایەتی شاندی فەرەنسیان کرد و گارزونی Garzoni ومونتانا Montagna، هەرچی شاندی یۆنانی بوو لەلایەن فەنزیلوس سەرۆکایەتی دەکرا، لەپاڵ بەشداریکردنی شاندی ئەمریکی و یۆگسلاڤیا و ڕۆمانیا و بولگاریا و ئەلبانیا و بەلجیکا و سوید و نەرویج مەکسیك و یەکێتی سوڤێت و بەرازیل[4].

لە کۆنگرەکەدا کریزن ڕێگەی قسەی بە عیسمەت پاشا دا، ئەویش لەلای خۆیەوە وتەیەکی پێشکەشکرد و داوای لە وڵاتانی هاوپەیمان کرد وەك وڵاتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەری تەواو مامەڵە لەگەڵ تورکیا بکەن، وەك ئەوەی لەگەڵ تەواوی وڵاتە بەشداربووەکانی کۆنگرەکە دەکرێت، وتارەکەی بە دوژمنداریکردن و دەمارگیری بەرامبەر بەریتانیا و هاوپەیمانانی بەگشتی

---

١- بۆ وەستان لەسەر هۆکار و پێوەرەکانی هەڵبژاردنی عیسمەت پاشا و یاریدەدەرانی سەیری:

-Mehmet Gönlubol,A.G.E,S.52;Zuches,Op.Cit.,P.68.

٢- فؤاد حمه خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٧ .

3- Harry. N.Howard, The Partition…., P. 278.

4- S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 191-192.

ناسرا[1]. عیسمەت پاشا داوای کرد سەرۆکایەتی لیژنەیەك لەو لیژنانەی کە لەسەری کارەکانی کۆنگرە دابەش ببوو، بکات[2]، بەڵام داواکەی بۆ چەندین جار لەلایەن کریزنەوە رەتکرایەوە[3].

بە سەیرکردنی ئەم دابەشکردنە، بە ئاشکرا پێدەچوو بەریتانیا لەسەر ئەو بابەتانەی پەیوەستن راستەوخۆ بە بەرژەوەندییەکانی سوربوو لەسەر ئەوەی خۆی بەدەستیانەوە بگرێت، وەکو پرسی تەراقیا و تەنگەبەرەکان و موسڵ و پرسی کەمینەکان[4]. سروشتی ئەو بارودۆخەی کە کۆنگرەکەی پێدا گوزەری کرد وایکرد کۆبوونەوەکان بۆ دوو قۆناغ دابەشبکرێت: یەکەمیان لە دەستپێکی گرێدانی کۆنگرەکە تا ١٤ی شوباتی ١٩٢٣ی خایاند، تییدا گفتوگۆی کێشەکانی لیژنەی یەکەم کرا، کە کریزن لە ٢٢ تشرینی دووەم سەرۆکایەتی کرد، ئەویش پرسی تەراقیا و سنووری تورکیا لە ئەوروپا بوون، دوای ئەوەی هەردوولا گفتوگۆی پرسەکانیان بە وردی کرد، هەموولایەنەکان پێشنیازەکانیان پێشکەشکرد. بڕیاردرا بابەتەکە بۆ لیژنەی لاوەکی کە ژنەرال میگانی فەرەنسی سەرۆکایەتی دەکرد رەوانە بکرێت[5].

لە ٢٤ تشرینی دووەم ویگان راپۆرتی لیژنەکەی خوێندەوە، کە رایسپارد ناوچەیەکی لە چەك داماڵدراو لە دەریای رەش تا رووباری مارتیزا بگرێتەوە و لە پشت ئەویش تا

1- Mehmet Gönlubol,A.G.E,S 52; Erik J.Zurches,Op.Cit., P. 168.

٢- کارەکانی کۆنگرەکە بەسەر ٣ لیژنەی سەرەکی دابەشکرابوو، کە چەند لیژنەیەکی لاوەکی دیکەی لێدەکەوتەوە: یەکەم کریزن سەرۆکایەتی دەکرد و گرنگی بە کێشەی تەنگەبەرەکان و سەربازیەکان دەدا، دووەم، کامیێل بارییەی فەرەنسی سەرۆکایەتی دەکرد، گرنگی بە کێشە دارایی و ئابوری و ئیمتیازاتە بیانییەکان دەدا، هەرچی لیژنەی سییەم بوو کە بۆ تاوتویکردنی رەوشی بیانیەکانی تورکیا راسپێردرابوو، کامیلیۆ کارزۆنی سەرۆکایەتی دەکرد. نوێنەرانی وڵاتانی بەشداربوو لەسەر ئەم رێکخستنە ناڕازی نەبوون، بۆیە کۆنگرە دەستی بەکارەکانی کرد/ سەیری:

- Harry. N.Howard, The Partition…, P.297; Curzon to Crow, Lausanne 21-11-1922, DBFP,I.Sir,Vol, 18, No. 212, P. 322.

3- S. R. Sonyel,Op.Cit., P.192.

4- Mehmet Gönlubol,A.G.E,S. 52.

٥- للوقوف علی تفاصیل تلك المناقشات والآراء، ینظر: آلاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦٩-١٧٠"



دەریای ئیجە بچێت، بەشی دووەمی راپۆرتەکەی بۆ بەخشینی دەریچەیەکی دەریایی بۆ بولگاریا تایبەتکرابوو[1].

بەهۆی توندی عیسمەت پاشا، کریزن دەستبەرداری شتی لاوەکی دیکە بوو بۆ تورکەکان، سەبارەت بە هێڵی ئاسنی سەربەخۆ و هێڵی ئاسنی رۆژهەڵات کە لە مارتیزا دەستی پێ دەکرد، بەڵام عیسمەت پاشا سوربوو لەسەر ئەوەی کە کەرەباغ بە تورکیا ببەخشریت، هەرچەندە ژەنەڕاڵ هارنگتون پێشتر لە مۆدانیا بە لێنی بە تورکیا دابوو، بەڵام کریزن بەتەواوی ئەو داخوازییەی رەتکردەوە و هۆشیداری لەوەدا کە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تورکیا بچێتە ناو ململانێ لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمان و وڵاتانی بەلقان[2]. عیسمەت پاشا لە رەوشێکی وادا نەبوو بتوانێ سازشی زیاتر لە بارەی کەرەباغ پێشکەش بکات، بەهۆی ئەو فشارە زۆرەی لە ناوەوەی تورکیا هەبوو، ئەنجومەنی گەورەی نیشتیمانی بروسکەی بۆکرد و داوای لێکرد پێویستە داوای سنووری ١٩١٣ و سازکردنی ریفراندۆم بۆ تەراقیای رۆژئاوا بکات، هەندێ ئەندامی پەرلەمانی تورکی تا ئاستی هەرەشەکردن لە بەریتانیا وڵاتانی هاوپەیمانان چوون، ئەگەر هاتوو شاندی تورکی بەدەست بەتاڵی بگەرێنەوە، ئەوا کارەساتی گەورە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرپا دەبێت، بۆیە پاشا زیاتر دەستی بە داخوازییەکانیەوە گرت[3].

لە راستیدا، سەرباری ئەوەی کە هەردوولا لەبەرامبەر یەکتریدا قسەیان رەق بوو، هیچ کامێك لەم دوولایەنە ئامادەنەبوون گەرێکی دیکەی پێکدادان سازبکەن، بەڵام لە هەمانکاتدا هەردوولا لە سەر بەدیهێنانی داخوازییەکانیان تا دوا پلە سووربوون، بۆیە پرسی تەراقیا لە قۆناغی یەکەمی کۆنگرەکەدا، بەهۆی دەستگرتنی هەردوولا بە داخوازییەکانیان یەکلایی نەکرایەوە.

١- بۆ سەیرکردنی دەقی راپۆرتەکە تەماشای:

- Curzon to Crowe, Laussane, 25-11-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No.222, P. 331; Harry. N.Howard, The Partition ..., PP. 284-285.

2- Curzon to Crowe , Lausanne, 25-11-1922, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.222, P. 331; Harry. N.Howard, The Partition..., PP. 284-285.

3- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 193.

شانبەشانی گفتوگۆی تەراقیا، چارەنووسی دوورگەکانی دەریای ئیجە کە (لیمنوس- ساموسریس ـ امبروس ـ وتنیدوس)[1] دەگرتەوە، لەسایە داواکاری و دژە داواکاری لە تورك و هاوپەیمانان، کریزن پێشنیازی کرد لیژنەیەکی لاوەکی پێبهێنرێت، کە بابەتی سەروەرێتی بەسەر تنیدوس و ساموسریس و دورگەکانی دیکە لەئەستۆ بگرێت، لەوکاتەی کە عیسمەت پاشا لەسەر پێکهێنانی لیژنەکە رازی بوو، بەڵام سوربوو لەسەر سەروەرێتی تورکی بەسەر ئەمبروس و تنیدوس، ئەمەی بە پرسێکی قابیل بە گفتوگۆ نەکردن لەقەڵەمدا، هەروەها بەناوی شاندی تورکی رەتیکردەوە بەبێ بەشداری شاندی رووسی بەشداری لە لیژنەکەدا بکات، چونکە پرسی دوورگەکان بە پرسی تەنگەبەرەکانەوە پەیوەستە، کارەکانی ئەو لیژنەیەی تا گەیشتنی شاندی رووسی دواخست، بەهۆی رەتکردنەوەی عیسمەت پاشا بۆ گفتوگۆ، ئەمەش بۆ ئەوەی رووسیا وەك کارتێکی فشار بۆ سەر بەریتانیا بەکاربهێنێت[2]. گەیشتنی شاندی رووسی بۆ لۆزان بە سەرۆکایەتی جیجرنی وەزیری دەرەوەی لە کانوونی یەکەم هاوکات بوو لەگەڵ گەیشتنی شاندە سۆڤێتیەکان ئۆکۆانیا و جۆرجیا[3]. بۆیە لیژنەی هەرێمایەتی و سەربازی دەستی بە ئامادەکاری بۆ کێشەکە کرد کە بۆ هەموو لایەك گرنگە، کە ئەوانیش پرسی تەنگەبەرەکان بوو، سێ پێشنیازی لەمبارەیەوە پێشکەشکرد ئەوانەن:

- پێشنیازی بەریتانی کە وای دەبینی کە دەبێت کەشتیوانی لەژێر سایەی کۆنترۆڵی نێودەوڵەتی تا ڕادەیەك زامن بکرێت، ئەمریکاش لەمەدا پاڵپشتی لیکرد[4].
- پێشنیازی رووسی، کە داوای پێویستی داخستنی تەنگەبەرەکانی لەلایەن تورکیاوە دەکرد لەبەرامبەر کەشتییە جەنگییەکان، بۆ ئەوەی زامنی سەروەری بکات و وابکات دەریای رەش بە دەریاچەیەکی رووسی بهێڵێتەوە[5].

---

١- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی بابەتی دوورگەکان سەیری:

Harry. N.Howard,Op.Cit., PP. 284-285.

2- Curzon to Crowe,Laussane,27-11-1922, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.228, P. 339; Curzon to Crowe, Laussane, 27-11-1922, DBFP, I.Sir,Vol.18, No. 241, P. 350 .

3- B.Ponomaryov and Others,Op.Cit., P. 193 .

٤- جريدة الوقائع العراقية، بغداد، ١٠-١٢-١٩٢٢، ل ١٥.

٥- جريدة الوقائع العراقية، بغداد، ١٠-١٢-١٩٢٢، ل ١٥“



- پێشنیازی تورکی، وادەبینی کە پێویستە تورکیا سەروەری هەبێت و لەپاڵ مافی وڵاتانی دیکە لە کەشتیوان[1].

عیسمەت پاشا لەو باوەڕەدابوو، پرسی تەنگەبەرەکان کارتێکی براوەیە بەدەست تورکیا لە لۆزان، بۆیە سوربوو لەسەر ئەوەی بە باشی بەکاری بهێنێت. لەمەوە خۆی لە ناکۆکی لەگەڵ بەریتانیا بەتایبەتی بوارد، چونکە باش دەیزانی ئاشتی رۆژهەڵاتی دوور ئەو ئاشتییەیە کە سیاسەتی بەریتانی بڕیاری لێدەدات، ئەگەر بتوانێ بە پرسی تەنگەبەرەکان رازی بکات، کە لە پرسە زۆر گرنگەکانە بۆ بەریتانیا، چونکە زۆرترین کەشتیگەلی دەریایی لە جیهان هەبوو، ئەمەش وەك برینی قۆناغێکی درێژ وابوو لە زامنکرد ئاشتییەك بۆ بەرژەوەندی تورکیا[2].

کریزن بواری بە عیسمەت پاشا نەدا بە ئارەزووی خۆی لەم پرسەدا گەمە بکات، لە هەمانکات هۆشداری بە عیسمەت پاشادا لەبارەی دەستگرتنی بە بیروبۆچوونی رووسی، هەوڵیشیدا کەلێنێك بخاتە پەیوەندییەکانی نێوان رووسیا و توکیاوە، ئەمەش بە هەست بریندارکردنی شاندی تورکی، کاتێ لە عیسمەت پاشای پرسی ئایا شاندی تورکی هەمان بیروڕای جیجرن هەڵدەگرن یاخود نا؟ لەو کاتەدا عیسمەت پاشا دەست بەجێ وەڵامی نەدایەوە، ئاماژەی بۆئەوەکرد کە هەڵوێستی جیجرن لەگەڵ بیروبۆچوونی تورکی دەگونجێ، بەڵام حەزدەکات پێشنیازی وڵاتانی دیکەش بزانێ، ئەو مافی خۆیەتی دوای ئەمە رای خۆی پێکبهێنێت[3].

کریزن هەڵوێستەکەی رووسیا بە نوێکردنەوەی سیاسەتی کۆنی رووسیای قەیسەری بۆ گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان لەقەڵەم دا، دەرکەوت کە پێشنیازەکانی رووسی بە ئامانجی سەپاندنی دروستکردنی قەڵەمڕەوییە بەسەر دەریای رەشدا[4]. لەگەڵ رەتکردنەوە توندەکانی کریزن بۆ پلانەکانی رووسیا، ئەوا عیسمەت پاشا پلانیکی ئەلتەرناتیڤی پێشکەشکرد کە

---

- B.Ponomaryov and Others,Op.Cit.,P. 193-.

١- عادل محمد خضر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٤“

- Harry. N.Howard, The Partition...,P. 285-.

2- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 339.

3- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 197.

4- Harry. N.Howard, The Partition...,P. 287; S. R. Sonyel, Op.Cit., PP. 197-198.

لەسەر پرەنسیپی ئازادی کەشتیوانی لە ناوچە تەنگەبەرەکان لە جەنگ و ئاشتی بەیەکەوە لەپاڵ پاراستنی ئاسایشی تورکی، هەروەها جێگیرکردنی ژمارەیەك تەنگەبەری لە چەك داماڵدراو لەسەر هەردوو کەناری ئەوروپی و ئاسیایی تەنگەبەری دەردەنیل و پسفۆر، دەستەیەکی نێودەوڵەتی کە لە نوێنەرانی هەریەکە لە وڵاتانی دەریای رەش (تورکیا، رووسیا، رۆمانیا و بولگاریا) پێکبهێنرێت، هەرەها لەو وڵاتانەش کە بەرژەوەندی تایبەتیان لە بازرگانی دەریای ناوەڕاست هەیە وەك (فەرەنسا، بەریتانیا، ژاپۆن، ئەمریکا، یۆنان و یۆگسلاڤیا) بەمەرجی ئەندامێتی تورکیا لەو دەستەیە هەمیشەیی بێت[1].

عیسمەت پاشا هەستی بەوەکرد کە رەتکردنەوەی پلانە نوێیەکەی بەریتانیا واتا سەرنەکەوتنی تەواوی کۆنگرەکە، بۆیە داوای کرد کاتێ پێبدرێت بۆ ئەوەی توێژینەوەی پلانەکە بکات. دواتر بڕیاری دا پلانە بەریتانییەکە بە شێوەیەك کە کەمترین زیان بەر بەرژەوەندییەکانی تورکیا بگەیەنێ، قبول بکات، بۆیە لە ٨ی کانوونی یەکەم لەبەردەم لیژنەکە بە پێشاندانی چەند سەنجیك لەبارەی ئاسایشی تەنگەبەرەکان و ئەستەمبۆڵ و سەرەوەرێتی بەسەر چەند دوورگەیەکەوە، رازی بوونی خۆی راگەیاند[2].

بەریتانیا ئاماجێکی گرنگی لە ئاماجە سیاسییەکانی لە زیان گەیاندن بە پەیوەندییەکانی رووسیا – تورکیا پێکا، ئەمەش هۆی دڵخۆشی کریزن بوو[3]، ئەوەی ئەمە **دڵنیا** دەکاتەوە ئەو سازشانەی بوو کە لە کۆبوونەوەی لیژنەکانی دواتر بۆ تورکیای کرد[4]. بەهەرحاڵ، سەرەرای ئەوەی کە لایەنەکان لەگەڵ ئەوەی لەبارەی کاروبارە سەرەکییەکانی پرسی تەنگەبەرەکان رێککەوتن، بەڵام نەگەیشتنە بڕیارێکی کۆتایی کە هەموو لایەك رازی بکات، بەڵام ئەو گفتوگۆیانەی لەبارەیەوە کران بە سەرکەوتن بۆ کریزن دادەنرێت، کە توانی

1- Curzon to Crowe, Lausanne, 6-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 260, P. 374.

2- Harry. N.Howard, The Partition...,PP. 288-289.

3- Curzon to Crowe, Laussane, 8-12-1922, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.26, P.381.

٤- ئەو سازشانە خۆی لە کەمکردنەوەی رووبەری ناوچە لە چەك داماڵدراوەکان و دەرکردنی یۆنان لە لیژنەی تەنگەبەرەکان و دیاریکردنی ئەو کەشتیە جەنگیانەی دێنە ناو دەریای رەش و ریگەدان بە بوونی هێزیکی سەربازی تورکی بۆ مانەوەی لە ناو ئەستەمبۆڵ دەبینیەوە، بۆ زانیاری زیاتر سەیری:

- Curzon to Crowe , Lausanne , 8-12-1922 , DBFP, I.Sir ,Vol.18, No.382, P.397.



تۆی ناکۆکی لەنێوان تورکیا و رووسیا لەلایەك و لەلایەکی دیکەوە سەرکەوتنیش بوو بۆ عیسمەت پاشا کە بەندێك لە بەندەکانی میساقی نیشتیمانی[1] بەدیهێنا و لە پشتبەستن بە یەکێتی سوڤیەتیش دوورکەوتەوە[2].

پرسەکانی کەمینە نەتەوەیی و ئاینیەکان، یەکێکی دیکە بوون لەو پرسانەی کە لیژنەی هەرێمایەتی و سەربازی تاوتوێی کردن، ئەو پرسەی کە لەو هۆکارانە بوون وایکرد خێرای کۆتایی بە دەوڵەتی عوسمانی بێت. لە کانوونی یەکەمی **١٩٢٢** بۆ یەکەمجار باسی ئەو پرسە کرا، کاتێ بە دەستپێشخەری دکتۆر فریدۆف نانسن Fridof Nansenی نوێنەری کۆمەڵەی نەتەوەکان لەرۆژهەلاتی دوور باسی پرسی دیلەکانی جەنگی کردو پرۆژەیەکی لەبارەی ئاڵوگۆڕکردنی هەردوو کەمینەی یۆنانی و تورکی بەیەکتری کرد پێشکەشکرد لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان. عیسمەت پاشا بە وروژاندنی ئەم پرسە سەرسام بوو، چونکە هێشتا خۆی بۆ گفتوگۆی ئەم بابەت ئامادە نەکردبوو، بۆیە لەسەر پێشنیازی کریزن بڕیاردا بۆ رۆژی دواتر گفتوگۆی بکات، لە کانوونی دووەمی **١٩٢٢** پرسەکە بە دوورودرێژی تاوتوێکرا، کریزن ویستی پرسی کەمینەکان وەك چەکێکی بانگەشە دژ بە تورکەکان بەکار بهێنێت، بەردەوام هەستی شاندنی تورکی بریندار دەکرد، بەهێزترین پێشنیازی لەمبارەیەوە، داخوازی دامەزراندنی نیشتیمانێك بۆ ئەرمەن لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان بوو. لەلایەن شاندەکان فەرەنسا و ئیتالیا و ئەمریکا و یۆنان و سەربیا بە توندی پاڵپشتی لێکرا[3]. عیسمەت پاشاش لەلای خۆیەوە هەر دەستتێوەردانێکی دەرەکی لەم پرسە رەتکردەوە. لەوکاتەدا کریزن هۆشداری پێدا و گوتی دەستگرتن بە هەڵوێستەی کارەسات دەنێتەوە و هەموو

١- میساقی نیشتیمانی تورکی شەش بەندی لەخۆ گرتووە، بەندی چوارەمی دەڵێت: " پاراستنی ئاسایشی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و بارەگای خەلافەت و حکومەت، هەروەها پاراستنی دەریای مەرمەرا لە دەستدرێژی دەرەکی، سەیری:

- حنا عزو بهنان، سەرچاوەی پێشو، ل ٥٩.

2- Harry N.Howard, The Partition…, P.302; Curzon to Crowe, Lausanne, 2-12-1922, DBFP, I.Sir,Vol.18, No. 247, P. 356.

3- Curzon to Crowe, Lausanne, 13-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18,No. 274, P. 387; S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 198-199.

ولاتانیش لەمەدا پاڵپشتی لێدەکەن، پەرەسەندنی زیاتری بابەتەکە وادەکات بەپێی ماددەی (١١) بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بگەڕێنرێتەوە[1].

هۆشداریەکەی کریزن لە ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی دەنگدانەوەی خۆی هەبوو، کە ئەو هەڕەشانەی ڕەتکردەوە، کریزن و هاوپەیمانانیان بە وەستان لە رووی ئاشتی رۆژهەڵات تۆمەتبارکرد، هەروەها ئەندامانی جەختیان لەسەر سووربوون ی تورکەکان لەسەر هەڵوێستی خۆیان کردەوە، رایانگەیاند کە ئەوان بەهیچ شێوەیەك بە دامەزراندنی نیشتیمانی ئەرمەن لەسەر خاکی تورکی رازی نین[2]. سەرباری هێرشی میدیای تورکی بۆ سەر کۆبوونی لۆزان و بە "کریستانی دەمارگیر" تۆمەتباریکردن[3]. کریزن، عیسمەت پاشای ئاگادارکردەو هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر تورکیا لەسەر ئەو هەڵوێستەی بمینیتەوە رای گشتی جیهان دژ بەخۆی وەردەگێڕێ. هەروەها ئەگەر تورکیا پرسی کەمینەکان پێشیل بکات، ئەوا دەنگێك نادۆزیتەوە لە هیچ شوێنێ بەرگری لێ بکات، هەروەها ئەوەشی زیاد کرد کە پێویستە تورکیا بڕیار بدات کە ئاخۆ وەلامی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەداتەوە یان نا؟[4]. پێ دەچێت کە هەڕەشەکەی کریزن کاریگەری لەسەر هەڵوێستی عیسمەت پاشا هەبووبێ، بەتایبەتی دوای ئەوەی بینی کە ئەمریکاش گرنگی بە بابەتەکە دەدات. بۆیە لە کۆبوونەوەی رۆژی ١٤ کانوونی یەکەم عیسمەت پاشا لەسەر پەیمانی پاراستنی کەمینەکان واژووی کرد و لێبووردنی گشتی دەرکرد و تورکیا بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەلام بەتەواوی بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنی لە تورکیای رەتکردەوە، یان پێکهێنانی لیژنەیەکی نێودەوڵەتی بۆ کەمینەکان کە بە پرسێکی نێوخۆیی لەقەڵەمدا[5].

1- S. R. Sonyel,Op.Cit.,PP. 199-200“

2- Henderson to Crowe ,Constantinople, 8-1-1923, DBFP,I.Sir,No. 313, minute. 3, P. 433.

3- Quoted in: S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 200

4- Curzon to Crowe, Lausanne, 13-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 375, P. 388; S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 200.

5- Curzon to Crowe, Laussane, 14-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 278, P. 391;Harry. N.Howard,The partition…, P. 302.



لێدوانەکەی عیسمەت پاشای کریزنی دڵخۆش کرد، بەتایبەتی ئەو لێدوانەی لەبارەی بوونە ئەندامی لە کۆمەڵەی نەتەوەکان دای[1]. لەوکاتەدا لیژنە لاوەکیەکەی کە مۆنتانای ئیتالی سەرۆکایەتی دەکرد لە ٩ کانوونی دووەمی **١٩٢٣** راپۆرتی خۆی پێشکەشکرد، بۆ عیسمەت پاشا لەبارەی ئەو پرسەوە بە سەرکەوتنێکی گەورە هەژمارکرا، کە مەرجی بۆ پاراستنی کەمینەکان دانا، لێبوردنی گشتی راگەیاند و دەستبەرداری بیرۆکەی دامەزراندنی دەستەیەکی نێودەوڵەتی لە ئەستەمبوڵ بۆ سەرپەرشتیکردنی کەمینەکان بوو، باسی پرسی دامەزراندنی نیشتیمانی نەتەوەیی بۆ ئەرمەن نەکرا، بەهۆی هەڵوێستی توندی تورکیا لەمبارەیەوە[2]، هەروەها عیسمەت پاشا ئەوەی رەتکردەوە کە کوردی ئەنادۆڵ بە کەمینە، هەتاکۆ ئاماژەیەکیش بۆ بەندەکانی سیڤەر بدرێت کە بۆ کورد تایبەتکرابوو، هەروەها تەنها لەسەر ئەوانەی نامسوڵمان بوون سووربوو بە کەمینە ناوببرێن[3]. گەیشتنە شێوازێك بۆ ئالوگۆڕکردنی هاوڵاتیانیان لە یۆنان و تورکەکان، لەمبارەیەوە لە سێی کانوونی دووەم، دوو رێککەوتن لە نێوان یۆنان و تورکیا مۆرکران، یەکەم: بە ئالوگۆڕی دانیشتوانی هەردوولا پەیوەست بوو، دووەم: بە گۆڕینەوەی بەندکراوە مەدەنییەکان و دیلەکانی جەنگ پەیوەست بوو[4]. بەمەش پرسی کەمینە نا ئەتنیەکان تاکە پرس بوو کە لە قۆناغی یەکەمی کۆنگرەکە چارەسەر کرا.

لەمیانەی گفتوگۆی کریزن بۆ ئەو پرسانەی کە خۆی سەرۆکایەتی دەکردن، لیژنەی پرسەکانی ئابووری و دارایی بە سەرۆکایەتی بارییە دەستی بەکارەکانی کردبوو. بەهۆی ئەوەی تورکەکان و ولاتانی هاوپەیمانان هەریەکە دەستی بەبیروبۆچوونی خۆیانەوە گرتبوو، نەگەیشتنە ریکەوتن، کە لە کۆتاییدا وایکرد هەڵپەسێردرێت[5]. لە دوای ئەوەیش ئەو لیژنەیەی کە کارزۆنی سەرۆکایەتی دەکرد، هات، ئەویش لیژنەی ئیمتیازات و مافەکانی بیانی بوو لە تورکیا، هەرچەندە لەسەر پرسە سەرەکییەکانی رێککەوتن کرا، بەلام ئەویش نەگەیشتە ئەنجامی کۆتایی، پرسی ئیمتیازاتە بەخشراوەکان بە قونسلییەکان کە لە ئەیلولی **١٩١٤** پوچەڵکرایەوە، ئەوەی کە دادگاییکردنی

1- Curzon to Crowe, Lausanne, 14-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 278, P. 391.

2- Curzon to Crowe,Lausanne , 9-1-1922 , DBFP , I.Sir, Vol.18, No.315, P.435.

3- Ismael Güldaş, Lozan Biz Türkler ve Kürtler, Istanbul, 1998, S.121.

4- Mehmet Gönlubol,A.G.E,S. 52-53.

5- DBFP, I.Sir,Vol.18, PP. 346-361.

بیانییەکان لەبەردەم دادگای تورکی، تووشی سەختییەکی زۆر بووە[1]. کریزن هەڕەشەی لە عیسمەت پاشا کرد کە ئەگەر لەمبارەیەوە سازش نەکات، ئەوا لە یارمەتییە بەریتانی و ئەمریکیەکان بێبەش دەکرێت، بەڵام ئەمە وای نەکرد عیسمەت پاشا لە هەڵوێستەکەی پاشگەزببێتەوە[2].

پرسی سنووری باشووری تورکیا(لەگەڵ سوریا و عێراق)، دواین پرس بوو کە خرایە بەردەم لیژنەی هەرێمایەتی و سەربازی[3]. بە گوێرەی پەیمانی ئەنقەرە ئاماژە بە دیاریکردنی سنوور لەگەڵ سوریا درا[4]. لەیەن فەرەنسا و تورکیاوە هیچ نارەزایەتییەك پێشان نەدرا، بەڵام ناکۆکی لەبارەی سنوورەکەی لەگەڵ عێراق هەر وەك خۆی مایەوە، ئەم ناکۆکییە بووە کۆسپی سەرەکی بەردەم کۆنگرەکە، هەروەك دواتر روون دەبێتەوە.

کریزن هەر لەسەرەتاوە ویستی باسی پرسی سنووری تورکیا لەگەڵ عێراق بکات، کە بە ویلایەتی موسڵەوە پەیوەستە، ئەمەش نەوەك لەبەر ئەوەی کە بە بەرژەوەندی بەریتانیاوە گرێدراوە، بەڵکو لە هەموو ناوچەکە بە گشتی[5]، سەرباری ئەوەی کە باوەڕی وا هەبوو کە داخوازی تورکەکان بۆ ویلایەتی موسڵ لەوانەیە بە "ئامۆژگاری" یەکێتی سۆڤیەتەوە بێت، کە

1- DBFP, I. I.Sir,Vol.18, PP.360-362.

2- Curzon to Crowe, Lausanne, 15-1-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 327, P. 448.

3- Lausanne Conference on Near Eastern Affairs 1922-1923,Records of Proceedings and Draft Terms of Peace,Printed and Published by Lausanne Conference London, 1923, PP. 337-339.

٤- احمد عبد الرحيم مصطفى، سەرچاوەی پێشو، ل ٣١١" فاضل حسين، مؤتمر لوزان وأثاره في البلاد العربية، بغداد، ١٩٦٧، ل ١٧٢.

٥- هەر زوو ژمارەیەك وەزارەتی بەریتانی لە دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ بەشداریان کرد، وەك دەرەوە و جەنگ و وەزارەتی هیند، بەرپرسانی وەزارەتی جەنگ و دەریاوانی جەختیان لەسەر لایەنی ستراتیژی کردەوە، بانگەوازی زاڵبوون بەسەر موسڵ کردەوە کە زنجیرە چیایەك لە تورکیای جیا دەکاتەوە....ئەمە نەوەك هەر زامنی هێشتنەوەی عێراق وەك دەوڵەتێك دەکات بەڵکو کار بۆ دابینکردنی سنوورێکی ئارامتر لە دژی تورکیا دەکات ئەوکات لەوە دەترسان کە تورکیا ببێتە دەوڵەتێکی ئیسلامی شەرانگیز، ویلایەتی موسڵ وەك دەروازەك بۆ هێرشکردنە سەر عێراق بەکاردێنێ، دواتر بۆسەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە کەنداو، سەیری:
- Peter J.Beck ,A Tedious and Perilous Controversy: Britain an The Settlement of Mosul Dispute,1918-1922,Middle Eastern Studies, London,17 April 1987,P. 257.



سۆڤیەت لەو باوەڕەدا بوو کە بەریتانیا دەستبەرداری ئەو ویلایەتە نابێت، بەمەش موسڵ و نەوتەکەی بەهۆی سووربوون ی بەریتانیا پێوەی، دەبێتە کۆسپی بەردەم دابینکردنی ئاشتی لە جیهان، بەریتانیاش بەرپرسیاریتی تەواوی ئەمەی لە ئەستۆیە[1]. بۆیە کریزن پلانی ئەوەی کێشا کە کێشەکە وەك کێشەی دیاریکردنی سنووری نێوان عێراق و تورکیا بچوێنێ[2]. لەلایەکی دیکەوە عیسمەت پاشاش نەیدەویست کێشەکە پەرەبسەنێ و ببێتە هۆی سەرنەکەوتنی کۆنگرەکە، بۆیە وای بەباش زانی بەتەنها لەگەڵ شاندی بەریتانی دانووستاندن بکات، بەڵام وای دەبینی کە کێشەکە لە سنوور کێشان گەورەترە، کێشەکە لە بنەڕەتەوە بە ویلایەتی موسڵەوە پەیوەستە، گەڕاندنەوەی ئەو ویلایەتە لە گەڕاندنەوەی تەراقیا و ئەستەمبوڵ یا هەر شاریکی دیکەی تورکی کە هێشتا لە ژێر داگیرکارییە کەمتر نیە[3]. واتە بەکورتی، عیسمەت پاشا هەوڵی دا بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە کە پرسەکە بە ئاسایشی نەتەوەیی تورکییەوە بەندە، زۆر لەوەی بەریتانیا دەیەوێت گەورەترە.

دەبوایە ئەو پرسە لە ٢٧ی تشرینی دووەم لە کۆنگرەکەدا گفتوگۆ بکرابوایە، بەڵام لە ئیوارەی رۆژی ٢٦ی تشرینی دووەم، عیسمەت پاشا داوای لە لۆرد کریزن کرد، کە گفتوگۆی ئاشکرا لەبارەی داخوازی تورکیا بۆ ویلایەتی موسڵ بۆ دوای ئەوەی کە هەردوولا بیروبۆچوونی لەبارەی ئالوگۆڕ دەکەن، دوابخات. کریزت ئەو داوایەی بەدیهێنا و پێشوازی لیکرد[4].

کێشەی موسڵ، ئەو کێشەیە بوو کە زۆرترین ناکۆکی لەبارەیەوە لە کۆنگرەکە لە نێوان تورکیا و بەریتانیا لێکەوتەوە، بەهۆی شێوازی گفتوگۆکانی بەریتانیا و تورکیا، ئەو کێشەیە رای گشتی لە زۆر وڵاتان بۆ خۆی راکێشا. ئەمەش وای لە توێژەریکی تورکی کرد بلێت کە "ئەمە گەرمترین تۆپانێی کۆنگرەکە بوو"[5]. ئەمەش لە چاوپێکەوتنەکانی عیسمەت پاشا و کریزن دەرکەوت. لەسەرەتادا بیروبۆچوونی زارەکی لە نێوان شاندی بەریتانی و تورکیا ئالوگۆڕ کرا، دواتر بۆ ئالۆگۆری یادداشتی نووسراو پەرەیسەند، کە دواتر لە نێوان ١٤ تا ٣١ ی کانوونی یەکەم بەسەر

1- Curzon to Crowe, Lausanne ,6-2-1922, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.257, P.371.

٢- هنري فوستر، نشأة العراق الحديث، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، ج١، بغداد، ١٩٨٠، ل ٢٣٢" البرت م. منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة هاشم صالح التكريتي، بغداد، ١٩٧، ل ٢٥٤.

3- Harry. N.Howard, The Partition..., P. 298.

4- Lausanne Conference ..., P. 339.

5- Ismael Güldaş,A.G.E,S.99 .

شاندی سەرەکی[1] وڵاتانی هاوپەیمان دابەشکرا[2]، ئەو یادداشتە پاساوەکانی هەردوولای بۆ داواکردنی هەردوولای بۆ ویلایەتی موسڵ لە خۆگرتبوو، هەروەها ئەو فاکتەرە رەگەزایەتی و سیاسی و جوگرافی و سەربازییەی کە دەبوو بە تورکیا یان عێراقەوە بلکێنرێت، لەخۆگرتبوو[3].

وەك عیسمەت پاشا روونیکردەوە کە داواکاری تورکیا بۆ ویلایەتی موسڵ پشتی بە کۆمەڵێ فاکتەری ئەتنی و سیاسی و مێژوویی و جوگرافی ئابووری بەستبوو، بەو پێیەی ئەو زەویانە بە میساقی نیشتیمانییەوە بەندەن، "کورد و تورك کە لەیەك سەرچاوەوە دێن، زۆرینەی دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ پێکدێنن، حەزدەکەن بۆ ئیدارەی تورکی بگەڕێنەوە[4]. هەروەها ئەو ویلایە لە رووی سیاسی و ئابووری جوگرافییەوە، بەشێکی جیانەکراوەی ئەنادۆڵە. ئەو پەیمانانەی کە بەریتانیا لەبارەی ئەو زەویانە مۆریکردوون، کە لەرووی یاساییەوە بەشێکی جیانەکراوەیە لە تورکیا، بە پۆچەڵ دانا، هەروەها داگیرکردنی بەریتانیا بۆ ئەو ویلایەتە هیچی لە داگیرکردنی بەشەکانی دیکەی تورکیای دوای شەر ڕگرتنەکە نیە. بۆیە دەبێت ئەو زەویانە بۆ تورکیا بگەڕێنرێتەوە[5].

---

١- ئەو چاوپێکەوتنانە لەو هوتیلەی کە کریزن تێیدا بوو، ئەنجام دەدرا، هەندێجار عیسمەت پاشا و رەزا نوری و هەندێ نێردەی دیکە بەشداری ئەو چاوپێکەوتنانەیان دەکرد، هەندێجاریش تەنها لە نێوان عسمەت پاشا و کریزن بوو، یان رەزا نوری و کریزن بوو، ئەو دانوستاندنانە بە شێوەیەکێ زارەکی بۆ ماوەیەك بەردەوام بوو، دواتر بە نووسراو بە شێوەی چەند خالێك پێشکەشکران. سەیری:

- Ismael Güldaş, A.G.E, SS. 100-101.

2- Lausanne Conference ..., P. 339 .

٣- م. ب. سعد، قضية الموصل في مؤتمر لوزان، بغداد، ١٣٤٣، ل ١١ وما بعدها"

- Lausanne Conference ..., PP. 363-393.

٤- عیسمەت پاشا لەم بانگەشەیەیدا پیشتی بە بڕگەیەکی هەڵە کە لە ئینیسکلۆپیدیای بەریتانی چاپکراوە بەستتووە، لە ماددەی (کوردستان) کە دانیشتووانی کوردستان (کورد)ی لە ریزی سۆمەرییەکان و ئاشوورییەکان وا پۆلین کردووە کە ئەوان تۆرانینن Turanians. لیرەوە بە هەڵە کوردیان بە تورك بەستەوە، سەیری:

- A.J.Toynbee, Op.Cit., P.342"

- فۆاد حمە خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٩.

5- Lausanne Conference..., PP.340-352; Harry.N.Howard, The Partition..., PP.298-299.



شانبەشانی ئەمە، بەر لەوەی کێشەکە پەرەبسەنێ و بە فەرمی بخرێتە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان، هەوڵەکانی تورکیا بۆ کاریگەری نواندن لەسەر هەڵوێستی بەریتانیا ئاقارێکی دیکەی وەرگرت، لە رووی پێشکەشکردنی سازش لە بواری سیاسی و ئابووری لەو ویلایەتەی کە گرنگییەکی زۆری بۆ بەریتانیا لە رووی ئابووری سیاسییەوە هەیە، رەزا نور لەمبارەیەوە گوتی: "لە رۆژانی یەکەمەوە هەوڵمانداوە ئەو کێشەیە بە رێگەی تایبەت چارەسەر بکەین"[1]. لەمەوە تورکەکان دەستی بە سازش کرد لەگەڵ بەریتانیا، عیسمەت پاشا، موختار بەگ(یەکێك لە ئەندامانی شاندەکەی)ی نارد بۆ ئەوەی لەبارەی پرسی نەوتی ویلایەتەکە قسە لەگەڵ هەرەیەکە لە ڤێرنون VERNON وکلارك CLARKE و فوربس ئادم FORBES ADAM ئەندامانی شاندی بەریتانی بکات. موختار بەگ داوایەکی لەبارەی بەشداری تورکیا لە کۆمپانیای نەتەوتی تورکی پێشکەشکرد[2]، ئەو بڕیارەی کە بەریتانیا لەم بارەیەوە دەریدەکات، لەوانەیە بە پرسی سنووری موسڵەوە پەیوەست بێت[3]. بەریتانیاش لەلای خۆیەوە نەیدەویست کێشەی موسڵ ببێتە هۆی گرفت لە کۆنگرەکەدا، دوای توێژینەوە لە پێشنیازی تورکی، بڕیاریدا رێژەیەك لە باج بە تورکیا ببەخشێت، کە ئەو باجەش کۆمپانیای تورکی بە حکومەتی عێراقی دەدات لەبری بەشداریکردنی لە

---

1- Ismael Güldaş,A.G.E,S.100.

٢- کۆمپانیای نەوتی تورکی: سەرەتاکانی دامەزراندنی بۆ ساڵی ١٩١١ دەگەڕێتەوە، کە ئەوکات بە ناوی (کۆمپانیای ئیمتیازاتی ئەفریقی و رۆژهەڵاتی سنووردار لە ئەستەمبۆڵ)کاریدەکرد، لە ساڵی ١٩١٢ ناوی بۆ کۆمپانیای نەوتی تورکی گۆردرا، لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی مافی گەران بەدوای نەوتی پێدرا، بە سەرمایەی پێنج هەزار پاوەن. پشکەکان لە نێوان ئەو لایەنانە دابەش دەبوو: بەریتانیا و تورکیا ٧٥٪ و ئەڵمانیا ٢٥٪، شەرعییەتی ئەو مافانە دوای جەنگەکە بووە مایەی ناکۆکی توند لە نێوان وڵاتانی براوەدا. سەیری:

- نوري عبد الحميد خليل، التاريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق ١٩٢٥-١٩٥٢، بغداد، ١٩٨٠، ل ل ٢٦-٣١.

3- Curzon to Crowe, Laussane, 1-12-1922, DBFP ,I.Sir,Vol.18, No.246, P.354.

رەزا نور، باسی ئەوە دەکات کە عیسمەت پاشا لە بارەی سازش بۆ بەریتانیا بەنیاز بوو سازش لەسەر تەواوی موسڵ بۆ بەریتانییەکان بکات، ئەمەش دوای ئەوەی گفتوگۆی دوولایەنەی زارەکی و نووسراوی نێوانیان سەرکەوتوو نەبوو، عیسمەت ئەو کات بە نوری گوت: "وەرە با موسڵ بدەین و رزگارمان بیت" نور وڵامی دایەوە کە "ئەستەمە، موسڵ گرنگترین ناوچەمانە و دڵمانە، هێرشکردنە سەر دڵ لەوێوە دەبێت". سەیری:

- Ismael Güldaş,A.G.E,S.101.

کۆمپانیاکە، دوای ڕەزامەندی جەعفەر پاشای سەرۆك وەزیرانی حکوومەتی عێراقی[1]. بەریتانییەکان وایان لە تورکەکان گەیاند کە ئەوان "یەکسەر دوای مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی، هەموو جۆرە پاڵپشتییەکی ئابووری پێشکەشی تورکیای نوێ دەکەن، بەڵام پێویستە بەر لە ئامادەکاری بۆ پەیمانی ئاشتی سازش لەسەر یارمەتیە نەوتییەکان یا یارمەتییە داراییەکان نەکات[2].

پێ دەچێت، تورکەکان بە پێشنیازەکەی بەریتانیا رازی نەبووبن[3]، بەڵام بێ هیواش نەبوو، لە هەوڵێکی نوێدا ڕەزا نور کە لە ٦ی کانوونی یەکەم لەگەڵ کریزن کۆبووەوە، داوای کرد موسڵ بە تورکیا بلکێنریت، لەبەرامبەر رازیکردنی بەریتانیا لە بواری نەوتدا، بەڵام کریزن بەتوندی ئەو داوایەی ڕەتکردەوە، بۆیە دووبارە تورکیا پەنای بۆ کارتی رووسی برد، کاتێ ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە پێویستە رووسیا لە دانووستاندنەکان بەشداری پی بکرێت، کریزن ئەمەش ڕەتکردەوە[4].

کریزن لەلای خۆیەوە زۆر بە ئارامی چاوەڕێی ئەو بیرۆکەی کە لە میشکی شاندی تورکی بوو، دەکرد. ئەو وشەیەی ئەو چاوەڕێی بوو (نەوت) بوو، کریزن ئەوەی بۆ تورکەکان دووپاتکردەوە کە پرسی موسڵ پەیوەندی بە نەوتەوە نییە، ناچێتە ژێر پسپۆڕێتی ئەوەوە، ئەمە لە پسپۆڕێتی بەشداربووانی کۆنگرەوە[5].

کریزن گەیشتە ئەو باوەڕەی کە عیسمەت پاشا دەستبەرداری ئەو تێزەی پێشتر کردبووی نابێت، لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کریزن کە لە ١٠ی کانوونی یەکەم سازکرا، گوتی: "کە هەرگیز بۆ ئەنقەرە ناگەڕێتەوە تا موسڵ وەرنەگریت"[6]، لەوکاتەدا کریزن ئامۆژگاری کرد کە واباشترە بۆ تورکەکان

---

١- حکوومەتی عێراقی هەر لە بنەماوە بۆ کۆنگرەکە بانگهیشت نەکرابوو، هەرچەندە هەوڵیشی دەدا، بەڵام سەرەرای ئەمەش جەعفەر عەسکەری وەزیری بەرگری و تەوفیق سویدی کارمەندی وەزارەتی دادی نارد تاکو لە بارەی کێشەی موسڵەوە هەواڵبدەن. سەیری:

- دراسة في الدبلوماسية العراقية ـ الإنكليزية ـ التركية وفي الرأي العام، ط٣، بغداد، ١٩٧٧، ل ٢٩.

2- T.C.Başbakanlik Devlet Arşivleri genel mudur Lugu Osmanli Arşivi daire Başbanligi Musul – Kerkuk ile iligili Arşiv Belgeleri 1525-1919, Ankara, 1993, S.43.

3- Curzon to Crowe, Lausanne, 1-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 246, P. 355.

4- MKIAB,S. 43.

5- Ismael Güldaş,A.G.E,S.100; Lausanne Conference ..., P. 360.

6- Ismael Güldaş,A.G.E,S.100



لەبارەی ئەو بابەتانەی کۆنگرە گفتوگۆیان دەکات توند نەبن[1]، بەڵام لەهەمانکاتدا دانووستاندن لەگەڵ حکوومەتەکەی لەبارەی بەخشینی سازش (پێدانی چەند زەویەك) بۆ تورکەکان ئەنجام دەدرا تاکو هەڵوێستیان نەرم بکات، پێشنیازێکی لەبارەی بەخشینی ئەو بەشە کوردییەی ویلایەتی موسڵ بە تورکەکان پێشکەش بە حکوومەتەکەی کرد، کە زنجیرە چیای کۆیە و ڕەواندز و سلێمانی دەگرتەوە، بەریتانیاش شاری موسڵ و هەولێر و کەرکوك بە دەشتە عەرەب نشینەکانیشەوە[2].

ئەو پێشنیازەی کریزن بنبڕ لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی بەریتانی ڕەتکرایەوە، دوای ئەوەی لە دانیشتنێك کە هەریەکە لە فەرماندەی گشتی هێزەکان ئیمپراتۆر و فەرماندەی هێزە ئاسمانیەکان و نوێنەری وەزارەتی موستەعمەرات ئامادەی، گفتوگۆ کرا، پاساوی ڕەتکردنەوەکەیان ئەمانەی خوارەوە بوو:- ئەمە هەڵوێستی بەریتانیا لەبەرامبەر تورکەکان لاواز دەکات، کە لەوانەیە ئەو سازشەش ڕەتبکەنەوە و داوای تەواوی ویلایەتەکە بکەن، لە بارێکدا ئەگەر قبوڵیشی بکەن، تەنها دەبێتە هەنگاوی یەکەم بە ئاراستەی فراوانخوازی تورکەکان، وەزیری موستەعمەرات گوتی:" لەدەستدانی موسڵ واتا لەدەستدانی بەغدا و عێراق، دواتریش سەرنەکەوتنی سیاسەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست "[3].

لەهەمان ڕێڕەودا، تورکەکان لە هەوڵێکی دیکەیان بۆ کاریگەر نواندن لەسەر هەڵوێستی بەریتانی، موختار بەگ و شەریف بەگ لە ئەندامانی شاندی تورکیا سەرلەنوێ بۆ لەندەن ناردەوە، بۆ ئەوەی پەیوەندی بە ببونارلۆوە بکەن کەوا لێی زانراوە دژی ئەوە بوو بەهۆی موسڵەوە دووبەرەکێ بکەوێتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی نێردەیەکی تورکی لەندەن بانگەشەی بۆ ئەم دووبەرەکێیە کرد و بڵاویکردەوە کە پرسی موسڵ کۆسپی بەردەم گەیشتن بە ڕێککەوتنی دەستبەجێیە لە لۆزان[4]، بەڵام ئەم دوو نێردەیەی تورکی نەیانتوانی پەیوەندی بگرن، جگە بە دوو

---

1- Curzon to Crowe, Laussane, 12-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 273, PP. 386-387.

2- Curzon to Crowe, Laussane, 6-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 257, P. 371.

3- Crowe to Curzon, Foreign Office 8-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 265, PP. 380-381 "

-م.س.لازاريف، المسألة الكوردية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ل٢٨٢-٢٨٣.

4- Curzon to Crowe, Lausanne, 13-12-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 325, P. 445; Lausanne Conference ..., P. 360.

ئەندام پەرلەمانی بەریتانی نەبێت. ئەو دووانەش بەرژەوەندی نەوتیان لە موسڵ هەبوو، ئەوانیش واتس فۆرد و میجەر بارنیت بوون[١].

کریزن بەتوندی دژی ئەو جۆرە چاوپێکەوتنانە وەستا، چونکە بە رای ئەو "کاریگەری لەسەر ڕیرەوی دانووستاندنەکانی لۆزان و بەهێزکردنی هەڵوێستی تورکی هەبوو"[٢]. تکای لە هاوڕێیانی کرد، بە سەرۆکی حکوومەتیشەوە "دەستیان لە پرسی موسڵ پاك رابگرن، کە دەستی هەمووی پیسکردووە"[٣]. هەروەها گوتی "هیچ زانیارییەکی لەبارەی ئەوانەی بۆ لەندن هاتوون نییە بۆ بەخشینی ئیمتیازاتی نەوت، کە بۆئەوان نییە بڕیار لە چارەنووسی بدەن"، بەبێ ئاگایی و زانیاری من ناتوانن هیچ شتێ بکەن[٤].

کریزن لە یادداشتی ٤ی کانوونی یەکەم تاوتویی پاساو بەڵگەکانی عیسمەت پاشای بۆ داواکردنی موسڵ کرد. لەبارەی میساقی نیشتیمانیەوە، دوای ئەوەی ماددەی یەکەمی خوێندەوە، "ئەمە دروستکراو درۆیەکی بەتاڵە کە دەوڵەتێکی دۆڕاو، مەرج لەسەر دەوڵەتی براوە دابنێ، لەبارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو زەویانەی کە لێیان وەرگیراوە"[٥]. سەبارەت بە هاوکاری کورد لەگەڵ تورکەکان و ناردنی نوێنەرانیان بۆ ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی، ئەمەی باسکردووە: "ئێمە دەزانین، کە ئاماژەی جێگیر لەبارەی باوەڕنەبوونی کوردان هەیە، بەهۆی ئەوەی لەماوەی چوار ساڵی دوایی لەژێر حوکمی تورکان بوونە، حکوومەتی بەریتانی لەلایەن

1- Curzon to Crowe, Lausanne, 13-12-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 325, PP. 445-446.

2- Ibid, PP. 445-446.

3- Quoted in: Curzon to Crowe,Lausanne,13-1-1923, DBFP,I.Sir, Vol.18, No. 325, P. 445.

٤- کریزن وا لێدوانی لە بارەی ئەو سەردانە داو گوتی: " لەو باوەڕەدام ئەو بەڕێزانە کاتێ گەیشتوونە لەندەن، گوتیان، ئێمە لە شوێنێکی دوورەوە بۆ بینینی دامەزراوە و کۆمەڵگا مەدەنییەکانی لەندەن، هاتووین، لەو باوەڕەشدا نیم زۆریان بینیبێ ....هیوادارم ئەگەر جارێکی دیکە هاتن، من ئاگادار بکەنەوە بۆ ئەوەی بۆ مۆزەخانەی بەریتانی هاوڕێیاتیان بکەم....". سەیری:

-Quoted in: Lausanne Conference ..., P. 360.

5- Ibid, PP. 370-371.



نوێنەرانی کوردی بێ هیوا عەریزە باران کراوە، کە تێیدا لەبارەی پرسی سەربەخۆیی کورد یان ئۆتۆنۆمی داوای دەستتێوەردان دەکەن، ئێمە هەستمان بە هاوسۆزی بەرامبەر ئەو نوێنەرانە کردووە.." هەروەها گوتی "هەموو زانیارییەکانی ئێمە ئەوە دەردەخەن کە کورد بە مێژووی سەربەخۆیان و داب نەریتیان و خەسڵەتیان دەبێت ببنە رەگەزێکی سەربەخۆی خۆیان". هەروەها بیرۆکەی ئامادەبوونی نوێنەرانی کوردی ویلایەتی موسڵ بۆ ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی رەتکردەوە. هەروەك هەموو پاساوەکانی دیکەی عیسمەت پاشای رەتکردەوە، چ مێژوویی یا جوگرافی یا ئابووری بێت...[١].

ئەو گفتوگۆ تایبەتیانەی کە لە ٢٦ ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ تا ٢٣ کانوونی دووەمی ١٩٢٣ خایاند، هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە[٢]. لەوکاتەدا کریزن زانی کە گفتوگۆی تایبەت و ئاڵوگۆڕی بیروڕای کەسیی لەگەڵ عیسمەت پاشا، بە چارەسەر ناگات. بۆیە هیچ ڕێگاچارەیەکی نەما تەنها ئەوە نەبێ کە "ڕێگاچارەی تورکی بەهەموو حاڵە لاوازەکانیەوە پێشکەشی لیژنەی هەرێمایەتی و سەربازی بکات"، کە خۆی لە ١٩٢٢/١/٢٣ سەرۆکایەتی دەکرد[٣]. دواتر قسەی بە عیسمەت پاشادا بۆ ئەوەی دیدگای تورك بەروو بخات، ئەو لەلای خۆیەوە لێدوانی دا و داخوازی وەرگرتنەوەی موسڵی دووبارەکردەوە. لە پاساو هێنانەوەی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە کورد و تورك زۆرینەی چوار لە پێنجی دانیشتووانی ویلایەتەکە پێکدێنن، (لە کۆی ٥٠٣,٠٠٠ کەسێ

1- Lausanne Conference ...,PP. 357-396"

- م.س.لازاریف، المسألة الکوردیة ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٤.

٢- بەر لەوەی کریزن کێشە کە بخاتە بەردەم لیژنەی هەرێمایەتی سەربازی لەو ئامرازانەی پەنای بۆ برد بۆ چارەسەرکردنی پرسەکە، هەڕەشەکردن بوو بە جەنگ، ئاشکرای کرد کە حکوومەتەکەی حەزدەکات ئاشتی ئەو شوێنانەی کە "بزووتنەوەی سەربازی لەبەرەی موسڵ لێ دەکەوێتەوە، کە لەوانەی پێکدادانی لێ رووبدات" ببەزێنێ. نوێنەرانی فەرەنسی و ئیتاڵی و ژاپۆنی بە توندی لاگیری کریزنیان کرد، بەڵام ئەو فشارە هیچی لێنەکەوتەوە، ئینجا کریزن ناچاربوو، دانبنێ و بڵێ: " دەتوانم بە هەمان سەرکەوتوویی قسە لەگەڵ ئەبا هەولی میسری و مۆمیای توت عنخ ئامونا بکەم. سەیری:

- Peter J.Beck ,Op.Cit.,P.259.

3- Curzon to Crowe, Lausanne, 23-1-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 334, P. 456; Ismael Güldaş,A.G.E,S.100.

ویلایەتەکە، ٤١٠، ٧٦٠ ی کورد و تورك بوون لە بەرامبەردا ٤٣،٢١٠ عـەرەب و ٣١,٠٠٠ لـە نامو‌سڵمان)[١] . هەروەها بەردەوام بوو و گوتی (گورد نەوەی ئاشوری و کاردۆخیین و ئـەوان لـە دێـر زەمانەوە لەو ناچەیە نیشتەجێ بوونە، بە پشت بەستن بە سەرچاوە مێژووییەکان ئەوان بـە رەگـەز تۆرانین، هەرچی سەبارەت بە عەرەبی نیشتەجێی ئەو ویلایەتەیە، ئەوا دەکرێت رێژەیان بە رێـژەی تورکەکانی بەغدا و شارە عەرەبییەکانی دیکە چاو لێبکرێت، ئایا دەکرێـت ئێمـە داوای لکانـدنی ئەو شوێنانە بە تورکیـاوە بکـەین)[٢] ، لـە پاسـاوی سیاسـیدا عیـسمەت پاشـا باسـی سیاسـەتی ئینتیدابی کرد و گوتی "تورکیا دانی بە پێویستی عێراق بۆ ئیتێداب نەناوە، ئەوەشـی نـەزانیووە کە ئینتیدابیکی وا بە بەریتانیا درا بێت؟، ئەو پەیمانانەی کە عێراق لەگەڵ بەریتانیای مۆرکردووە هیچ بەهایەکی نییە، عێراق لـە رووی یاسـاییەوە هێـشتا بەشـێکی ئیمپراتـۆری عوسمانییـە"[٣] . هەروەها گوتی "چارەنووسی موسڵ لە هەموو روویێکەوە لە چارەنووسی تەراقیا و قوسـتنتینە و ئەدەنە و عەینتاب دەچێ...[٤] . جەختی لەوە کردەوە کـە راپرسـی لـەو ویلایەتـەی کـە زۆرینـەی دانیشتووانەکەی کورد-تورکن[٥] ، ئەوان حەتمەن بڕیاری چوونە پاڵ تورکیـا دەدەن"[٦] . سـەبارەت بـە خواستەکانی گەلی کورد گوتی " ئەوە شەرەفە بۆ شاندی تورکی رایبگەیـەنێت کـە دانیـشتووانی کورد لەگەڵ تورك یەکگرتوون، لە هەموو بوارێکدا، بەتایبەتی لە پرسی نەتـەوە و ئـایین و داب و نەریت و......ئەو دوو گەلە بڕیاری ژیانیان بەیەکەوە داوە، ئەوان ئیـدارەی تورکیـان بـە ویـستی ئازادی خۆیان لە دێر زەمانـەوە هەڵبـژاردووە، لـە سـەدە دوور و درێژەکانـەوە چارەنووسـیان بـە تورکەکانەوە گرێداوە"[٧] . هەروەها عیسمەت پاشـا بـەردەوام بـوو گـوتی" سـەرجەم سـەرکردەی

---

١- لە بارەی ئامارەکانی عیسمەت پاشا سەیری:

- Lausanne Conference ..., PP. 372-373“

2- Ibid, PP. 373-374.

3- Curzon to Crowe, Lausanne, 23-1-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 340, PP. 464-465; Lausanne Conference ..., P. 347.

4- Lausanne Conference ..., P. 348.

5- Curzon to Crowe, Lausanne, 23-1-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 340, PP. 464-465.

6- MKIAB,S. 42.

٧- عیسمەت پاشا لێرەدا ئاماژە بۆ رێککەوتنی زارەکی نێوان میرە کوردییـەکان و سـوڵتان سـەلیمی یەکـەم (١٥١٢-١٥٢٠) دەکات، لە رێگەی کەسایەتی کوردی ئیدریس بەدلیسی (رێککەوتنی سەلیم – ئیدریس) کە



سوپای تورکی ئەوانەی بەشداری جەنگی گەورە و جەنگی سەربەخۆییان کردووە، سەرسـورمانی و ریزیان بۆ ئەو قوربانییانەی کە کورد لە پێناوی نیشتیمان داویانە پێـشانداوە، سـەرباری هـەموو ئەمانەش لە خەبات لە دژی سوڵتان و حکوومەتی ئەسـتەمبۆڵ، کـە بـۆ هەتاهـەتایی دۆڕا....، ناکرێت رۆڵیان لە بەرگریکردن لە ئەنادۆڵ و لەو هێرشەی دوایی کـە یونانیـەکانی تێـدا تێکـشکا پشتگوێ بخەین"[١] . بەرلەوەی عیسمەت پاشا ئەو بڕگەیە کۆتـایی پێبهێنێـت، باسـی لـە بابـەتی ئاشورییەکان(نەستوری) کرد، ئەوانەی کە کریزن لە کۆنگرەکەدا ویـستی بـەکاریان بهێنێـت، بـۆ ئەوەی فشاری زیاتر بخاتە سەر تورکەکان و دواتریش سازشی زیاتریان پی بکات[٢]، گوتی " ئەوانـە رۆڵی خیانەتیان بەرامبەر بەو بریانەی کە لەو زەویانـەی کـە چـەندین سـەدەیە لەسـەری دەژیـن، کردووە، کۆمەکی رووسیان کردووە و ئازارو ئەشکەنجەی کورد و تورکیان داوە، بۆیە ئەوان دەزانـن کە ناتوانن لەمەودوا لەگەڵیان بژین، پێیان باشتر بوو لەگەڵ روسەکان بڕۆن"[٣] .

لە بەرووخستنی پاساوە مێژووییەکانی، عیسمەت پاشا بەرووخستنیکی مێژوویی بۆ حوکمی تورکەکان هەر لە رۆژانی عەبباسییەکانەوە بۆ ئـەو ویلایەتـەکرد، وای بانگەشـەکرد کـە موسـڵ نەوەك هەر لە مـاوەی عوسمـانی بەشـێك بـووە لـە تورکیـا بـەڵکو ئەمـە بـۆ ١١ سـەدە زیـاتر دەگەڕێتەوە...[٤] . لەبارەی پاساوە جوگرافیەکانی، موسڵی بـە جـەزیرە لـە رووی کـەش و هـەواوە بەستەوە، کە چیای حەمرین و مەکحول و سـنجار لـە عێراقـی عـەرەبی جیـایی دەکاتـەوە...[٥] .

---

بەهۆیەوە هەریەکـە لـە سـوڵتانی عوسمـانی و حکوومـەت و میرنـشینە کوردییـەکان دانیـان بەیـەکترنا، کـە بەسەرەتای فراوانخوازی عوسمانی لە کوردستان و کەمبوونەوەی دەسەڵاتی سیاسی کوردی دادەنریت، سەیری:

- ابراهيم الداقوقي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٠.

١- إسماعيل بيشكجي، النظام في الأناضول الشرقية، ترجمة إسماعيل شكور، أربيل، ٢٠٠١، ج٢، ل ل٨٥-٨٦“

- Lausanne Conference ..., P. 375.

2- John Joseph, The Nestorians and Their Neighbors, Princeton, New Jersey, 1961, PP.168-170

٣- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ل٨٩-٩٠“

.Lausanne Conference ..., P. 376-

٤- للتفاصيل ينظر: إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ٩٣“

- Lausanne Conference ...,P. 373

5- Lausanne Conference ..., P. 377.

هەرچی لە رووی ئابوورییەوە بوو، عیسمەت پاشا ویستی وا دەربخاتن کە بازرگانی موسڵ ئەوەندەی بە دیاربەکرەوە گرێدراوە ئەوەندە بە بەغداوە گرێنەدراوە، چونکە نزیکترە لە دەریای ناوەڕاست نەوەك لە کەنداوی عەرەبی..[1]. پاساوی سەربازی عیسمەت پاشا لەسەر بنەمای زنجیرە چیای حەمرین — مەکحول — سنجار وەستابوو، دوور لە گرنگی پێدانی ئەتنی و کۆمەڵایەتی و سیاسی...، ئەو زنجیرە چیایە هێڵێکی سروشتی سنووری نێوان دوو ناوچە دەکێشێ. قسەکردن لەسەر ئەوەی بەغدا و ڕێگای گەیاندن دەکەویتە ژێر هەڕەشەوە، نا بێت بە هەند وەربگرێت، بەو پێیەی کە سنووری ئێرانی لە بەغدا نزیکترە لەوەی لەو هێڵە سنوورییەی پێشنیاز کراوە[2].

میساقی نیشتیمانی دوایین پاساو بوو کە عیسمەت پاشا پێشکەشی کۆنگرەی کرد، بەوەی پرسی گەڕانەوەی موسڵی بە پرسێکی ئەخلاقی بەرامبەر گەلانی ناعەرەبی لەقەڵەمدا و گوتی: "ئۆمەتی تورکی لەژێر هەر باریکدا بێت، بەهۆی بوونی کەمینەیەکی عەرەبی لە موسڵ هەرگیز رازی نابن ئەو ویلایەتەی کە زۆرینەی کورد و تورکن لە دەرەوەی تورکیا بێت"[3].

عسمەت پاشا لە کۆتایی یادداشتەکەی بە بیری ئامادەبووانی کۆنگرەی هێنایەوە، کە ئەو هۆکارە ئەتنی و سیاسی و ئابووری و جوگرافی و سەربازیانە بەسن بۆ ئەوەی بسەلمێت کە ویلایەتی موسڵ بەشێکی دانەبڕاوی تورکیایە، هەروەها ناکرێت زۆرینەی کورد و تورکی ویلایەتەکە لە ژێر داگیرکاری بیانی بهێڵدریتەوە، چونکە ئەمەش دەبێتە هۆی هەڕەشە بۆ پەیوەندییە دۆستایەتی و هاوسێیەتی لە داهاتوودا، هەروەها هەڕەشەش بۆ ئاشتی ناوچەکە........، ئەگەر شاری موسڵ لە دەرەوەی سنووری تورکیا بێت ناکرێت پێشبینی دەرەنجامەکانی بکرێت[4].

دوای ئەوەی کریزن بەباشی گوێی لە یادشتەکەی گرت، وای بەباش زانی خاڵ بەخاڵ گفتوگۆی دیدگای عیسمەت پاشا بکات، کە بە بڕوای کریزن نە بەریتانیا و نە ئامادەبووانی کۆنگرەکە باوەڕیان کرد، بۆ هەست بریندارکردنی شاندی تورکی رایگەیاند کە ئەو خۆشحاڵ دەبێت ئەگەر دیدگای تورکی و بەریتانی لەپاڵ یەکتری چاپبکرێت و بخرێتە بەردەم رای گشتی جیهانی[5].

---

1- Ibid, P. 378.

2- Ibid, PP. 378-379.

3- Ibid, P. 379.

4- Lausanne Conference ..., P. 380.

5- Ibid,PP.380-381 “



کریزن یادداشتێکی دژ بە یادداشتی[1] عیسمەت پاشا پێشکەشی لیژنەی سەربازی و هەرێمایەتی کرد، لە فاکتەرە ئەتنیەکانەوە دەستی پێکرد، یەکەمجار تانەی لەو ئامارانەی کە عیسمەت پاشا پێشکەشی کردبوو گرت، دیاریترین ئەو رەخنانەی کە لەو ئامارانە گرتی، ئەوە بوو کە هیچ بەروارێکیان(مێژوو) بەرەسەرەوە نییە، لەهەمان کاتیش بەرگری لە ئامار و نەخشە بەریتانییەکان کرد، کە لەبارەیانەوە گوتی: ئەوانە لە ساڵانی دوایی لەلایەن ئەفسەرانی بەریتانی پسپۆڕەوە بە وردی زۆرەوە دانراون[2]، لە کۆی ٧٨٥، ٤٦٨ لەوانەی لە ویلایەتەکە نیشتەجێن تەنها ٦٥، ٨٩٥ یان تورکمانن، کە تەنها ڕێژەی ١ بۆ ١٢ ی دانشتوانەکەی پێکدێنن، هەرچی تایبەتە بە کوردیش، ئەوا کریزن نکۆڵی لەوە کرد کە ریشەی کورد کە بە زمانی ئێرانی قسە دەکەن بۆ رەگەزی تۆرانی

---

- فاضل حسین، مشكلة ...، ل ٣١ “ فؤاد حمه خورشيد، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٥

١- بەر لەوەی کریزن گفتوگۆی وردەکاری پاسا و بەڵگە پێشکەشکراوەکانی عیسمەت پاشا بکات، سەبارەت بە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە تورکیاوە، گوتی: لەمیانەی جەنگەکەدا حکوومەتی بەریتانی پەیمانیکی شەرافەتمەند و ئاشکرای بە دانیشتووانی عەرەبی ئەو ناوچانە داوە تاکو لە دەسەڵاتی تورکی رزگاریان بکات و لە دامەزراندنی ئیدارەیەکی عەرەبی یارمەتیان بدات، لە سان ریمۆش بە راسپاردەی کۆمەڵەی نەتەوەکان ئینتیدابی بەسەر ئەو ناوچانە قبولکردووە، ئەو ئینتیدابەش بە گوێرەی برگەی ٢٢ ی میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکان بووە. سەبارەت بە کورد، ئەوا رەشنووسی ئنتیداب لەگەڵ عێراق دەڵێت" هیچ شتێك لەم ئینتیدابەدا نەهاتووە، کە ڕێگری لە دامەزراندنی سیستەمێکی ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچە کوردییەکان لە عێراق بکات، ئەگەر هاتوو گونجاو بێت"، هەروەها کریزن گوتی: " من لەو دەقەی کە شاندی تورکی پێشکەشی کردبوو، هیچ شتێکم نەبینی کە وام لێبکات باوەڕ بکەم کە حکوومەتی تورکی بیر لە سیتەمیکی زیاتر ئازادی خواز بۆ کورد دەکاتەوە، ئەوانەی هێشتا بەشێکن لە تورکیا". دواتر کریزن پشتی بە **پاڵپشتیەکی** یاسایی بەست و گوتی " حکوومەتی خاوەن شکۆ بەپێی ئەو پەیماننامەیەی کە لەگەڵ پادشای عێراق(مەلیك فەیسەڵ) مۆریکردووە، پابەندە بە بەندەکان، کە یەکێ لە بەندەکان دەڵێت (نابیت بەریتانیا سازش لەسەر هیچ ناوچەیەك بۆ هیچ هێزیکی بیانی بکات)". سەیری:

- Lausanne Conference ...,PP 380-381; Curzon to Crowe, Lausanne, 23-1-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 340, PP.371,465.

٢- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ل٩٤-٩٥“

- Lausanne Conference ..., P. 381.

بگەڕێنرێتەوە، کە دابی جیایان لە تورکەکان بـە تایبـەتی لـەبارەی مامەڵـەکردن لەگـەڵ ئـافرەت هەیە...، هەروەها جیاوازیەکی زۆر لە نێوان گوندی تورکی و کوردییدا هەیە، ئەوانـە (کوردەکـان) پێشنیازی تورکی ڕەتدەکەنەوە و بە رقەوە سەیری دەکەن.....[1]، هەروەها گـوتی کـە "مـن بـەڵێن دەدەم کە جیاوازی لە نێوان کوردیك و تورکێك لە هەر ڕۆژێکی هەفتـەدا بکـەم، مـن ئـەو دووانـە تێکەڵ ناکەم تەنها ئەگەر گوێر بم"[2]. بەمەش تاکە شتێك کە ویلایەتەکە بە تورکیـا دەبەسـتێتەوە ئەو تورکمانانە بوون کە ڕێژەیان لە ١ بۆ ١٢ کۆی دانیشتووانەکەی پێکدێنا[3].

لەمیانەی وەڵامدانەوەی بەرووخستنە سیاسییەکەی عیسمەت پاشا، کریزن جەختی کـردەوە کە لەو کاتەی کە کەمینەیەکی بچووکی تورکمانی ویلایەتەکە دەیانەویت بـچنە پـاڵ تورکیـا، ئەوا یەزیدیەکان و کریستانەکان هەڵوێستیان زانراوە کە چۆنە، پێویست بە روونکردنەوە ناکات، هەروەها ئەو عەرەبانەی کە بەکۆ دەنگیان بۆ فەیسەڵ دا و چـوونە پـاڵ حکوومـەتی عێراقـی. سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی خەڵکی سلێمانی بۆ بەشـداریکردن لـە هەڵبـژاردنی فەیـسەڵ، ئـەوا یادداشتەکەی پێشووی بەریتانیا وای پاساو بۆ هێنایەوە کە "ئەوان گەلێکی جیاوازن لـە ڕووی ئەتنی و پێویستە مامەڵەیەکی سەربەخۆیان لەگەڵ بکرێت"[4]. لـەبارەی ڕووداوەکـانی ڕەوانـدز گوتی[5]، شاندی تورکی لەمبارەیەوە دوو خاڵی گرنگـی تێپەڕانـدووە، یەکـەم: تورکیـا ئەوەنـدە دەسەڵاتێکی کاریگەری لە باشووری کوردسـتان نـەبووە، تـەنها زۆر بەکـەمی نـەبێت، دووەم: کوردی باشووری کوردستان لە جەنگی گەورە هیچ یارمەتیەکیان پێشکەشی تورکیا نـەکردووە، بەڵکو تورك بەردەوام کێشەیان لەگـەڵ کـوردا هـەبووە، بەتایبـەتی لـە دیرسـیم و ناوچـەکانی دیکە... لە ساڵی ١٩١٤ شورشیکی راستەقینەی کـوردی لـە بـەدلیس هـەبوو، بـە سـەختی دامرکێنـدرا"[6]. هـەروەها زۆرێـك لـە سـەرکردە کوردەکـان و خانـەوادەیان بـۆ ئەسـتەمبۆڵ

---

1- Lausanne Conference ..., PP. 382-383.

٢- کریزن لە سەردانەکەی بۆ ئێران ماوەیەك لە کوردستانی بەسەر برد و لەمیانەیدا لەگەڵ کورد ژیا. سەیری:
-هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٣٦" إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ٩٦.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٣٦.

4- Lausanne Conference ..., P. 383.

٥- سەیری تویژینەوەی دووەمی بەشی یەکەم بکە.

٦- ڕاپەڕینی ١٩١٤ (مەلا سەلیم): لەمیانەی جەنگی یەکـەم لـەولامی رەفتـارە تونـدەکانی تورکـە گەندەڵـەکانی کوردستان، مەلا سەلیم ئەفەندی خەزانی پێشەوایەتی ئەو ڕاپەڕینەی لە بەدلیس و دەروبەری کرد، بە خیرایی هەشت



ڕەوانەکراون، لەوکاتەی کە کوردان لە دەوری ئەو سەرکردانە کۆبوونەتـەوە و لـەدژی تورکـەکان ڕادەپەڕن[1]. هەروەها گوتی"هەموو ئـەو زانیارییانـەی کۆمانکردۆتـەوە، ئـەوە دەسـەلمێنن کـە دەبێت قەوارەیەکی نەتەوەیی سەربەخۆ بۆ کوردان بەدیبهێنرێت....لـە ئـاوا ڕەوشـێکدا بۆچـی گەلێکی وا ڕادەستی تورکەکان بکرێن و بۆ ڕاپرسی بپارێنـەوە؟ ئـەو ڕاپرسـییەش هـەر تـەنها ئەنقەرە داوای دەکات". هەرگیز لە هیچ کاتێك داوا لە کورد ناکات ڕاپرسی بکات. ئەو گەلـە داماوە هەتاکو مانای ڕاپرسیش نازانێ.....ئەوانەی داوای ڕاپرسی دەکەن کـورد نـین[2]. کریـزن ئەو بانگەشەی عیسمەت پاشای لەبارەی ئەوەی کە نوێنەرانی کوردی ئەنجوومـەنی نیـشتیمانی گەورەی تورکی داوا لە کوردان دەکەن کە پێویستە لەگەڵ تورکیا یەکگرتوو بن، ڕەتکردەوە"، و گوتی:" ئاشکرایە کە هەڵبژاردن بۆ ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی لە موسڵ نەکراوە، هەروەها کورد داخوازی نەتەوەیی هەیە، ئەوەی شاندی تورکی لەبارەیانەوە گوتی، تەنها ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەوان(کوردان) تورکن[3].

سەبارەت بە لایەنی مێژوویی، کە یادداشتەکەی عیسمەت پاشا پشتی پێـی بەسـتبوو، ئـەوا کریزنی بەیەکجاری ڕەتکردەوە و گوتی "شاری موسڵ بەدەستی عەرەبان بونیـاتنراوە، ئـەو شـارە عەربی بوو کاتێ تورکەکان بۆیەکەمجار داگیریان کرد، هەروەها کوردستانیش بەر لـەم مێـژووە بـە ماوەیەکی درێژ خاوەنی کوردستان بوون، یازدە سەدەی دەسەڵاتی تورکی وای نەکرد دانیـشتووانی ڕەسەنی عەرەب و کورد بۆ تورك بگۆڕیت و بە تورکەکان لە ڕووی ڕەگەز و زمان بچووێنێ"[4].

---

هەزار کەس لەدەوری کۆبووەوە، هەروەها ژمارەیەکێ زۆر لەو جەنگاوەرانەی سوپای عوسمانی چوونە پاڵ ڕاپەڕینەکـە، ڕاپەڕیوان ویستیان هەموو کوردستان بگرێتەوە، بۆیـە داوایـان لـە ئاشـورییەکان و ئەرمەنییـەکان کـرد بێنـە پـاڵ ڕاپەڕینەکە، ڕاپەڕینەکە ترسێکی زۆری لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی نایەوە، بۆیە هێزیکی گەورەیان بـۆ ئامـادەکرد، مەلا سەلیم و سەرانی ڕاپەڕینەکەیان ناچارکرمد پەنا بۆ قونسولگەری رووسـی بـەرن، بـەڵام تورکـان بـەخورتی لـە قونسولگەریەکە دەریان پەراندن و لە ڕۆژێکدا ١١ کەسیان لە سەرکردەی ڕاپەڕینەکە لە سێدارەدا، سەیری:
- کمال مظهر احمد، کردستان...، ل ل ١١-١١٢"وليد حمدي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٣٠٦-٣٠٩.

1- Lausanne Conference ..., P. 384.

٢- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ٩٧.

3- Lausanne Conference ..., P. 384 "

- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ٩٧.

4- Lausanne Conference ..., P. 385-386

هەروەها کریزن پاساوە ستراتیژیەکانی عیسمەت پاشای پوچەڵکردەوە، کاتێ لەسەر دابەشنەکردنی ویلایەتەکە سووبوو و سنووری حەمرین مەکحولی ڕەتکردەوە و گوتی: "ئەو زنجیرەیەك گردن هیچ گرنگییەکیان نییە"، بۆ ئەوەی ببنە سنووری جیاکەرەوەی نێوان تورکیا و عێراق[1].

سەبارەتە بە میساقی نیشتیمانی تورکی، کە عیسمەت پاشا پشتی پێی بەست و وای لێکدایەوە کە بەمانای گەڕانەوەی ویلایەتەکە دێت، کریزن گوتی: "پەرلەمانی تورکی کە ئەو میساقە و ئەو ماددەیەی داڕشتووە، مافی ئەوەی نییە چارەنووسی ویلایەتی موسڵ دیاری بکات، بوونی کەمینەی تورکمانی و زۆرینەی نا تورکی، بەمانای ئەوە نایەت کە ویلایەتی موسڵ لە براوەی جەنگەکە بسەندریت و بە دۆڕاوی جەنگەکە ببەخشرێت"[2].

کریزن کۆتایی یادداشتە بەریتانییەکەی بە جەختکردنەوە سەر سیستەمی ئینتیداب و دامەزراندنی سیستەمی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لەو ویلایەتەکە کۆتایی پێهێنا، بەم شێوەیە لە شێوازی دانووستاندنەکە لێدوانی دا و گوتی: "شاندی بەریتانی ناتوانێت لەگەڵ ئەو کێشەیە بەم شێوە ڕەفتارە هەڕەمەکییە روونە لەگەڵ تورکەکان مامەڵە بکات"[3]. کریزن وا ئاماۆژگاری تورکەکانی کرد کە گرنگی بەو ناوچانە بدەن کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی تورکن، عیسمەت پاشا وەڵامیدایەوە کە دوورخستنەوەی هەر کەسێك، لەگەڵ ئەو گیانە هاوچەرخییەی کە بەریتانیا بانگەشەی بۆ دەکات ناکۆکە، کریزن وەڵامی دایەوە کە ئەو گیانە، ئەوگیانە نەبوو کە شاندی تورکی لە چەند هەفتەی کەمی رابردوو ئەو دانووستاندنەی پێ بەرێوەبرد. لە کۆتایی یادداشتەکەی کریزن ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە "لەوکاتەوەی کە بەریتانیا دەستگرتن بە ویلایەتەکە دووپات دەکاتەوە، دان بەوەش دەنێ کە ئەو گفتوگۆیانە بی بەها دەبێت"[4]. کریزن پێشنیازی کرد کە پرسەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان رەوانە بکرێت، بۆ ئەوەی بڕیارێکی بێ لایەنی لەبارەیەوە بدت، ئەوەشی

1- Ibid, PP. 386-387 “

- فؤاد حمە خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ل١٠٧-١٠٨.

2- Lausanne Conference ..., P. 388-389.

3- Lausanne Conference ..., P.389.

4- Lausanne Conference ..., P. 389.



روونکردەوە کە حکوومەتەکەی ئەنجامەکەی هەرچییەك بێت قبولی دەکات. هەریەکە لە فەڕەنسا و ئیتاڵیا پاڵپشتیان لە پێشنیازەکە کرد و هانی تورکیایان دا کە پێی رازی بێت، بەڵام داوای کرد تا دوای نیوەڕۆ دوابخرێت[1].

لە کۆبوونەوەی دوای نیوەڕۆی رۆژی **٢٣** کانوونی دووەم عیسمەت پاشا وەڵامی یادداشتەکەی کریزنی دایەوە و دووبارە داوای گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵی کرد و داوای راپرسی گشتی لە ویلایەتەکە کرد، هەروەها عیسمەت پاشا پەنابردنە بەر نێوبژیوانی و رەوانە کردنی پرسەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکانی رەتکردەوە[2]. هەروەها سەرلەنوێ دانی بە ئینتیداب و پەیمانەکانی نێوان بەریتانیا و عێراق نەنا[3]. هەروەها سەرلەنوێ بەرگری لەو داتاو ئامارانەی سەبارەت بە دانیشتووانی ویلایەتەکە پێشکەشی کردبوون، کرد، کە بە " وردتر لەوەی بەریتانیا پێشکەشی کردووە، وەسفکرد، چونکە بە گوێرەی پرۆسەکانی سەربازگیری(تجنید) وەرگیراون". هەروەها گوتی: "ئەوانەی بۆ ئەنادۆڵ گەشت دەکەن دەزانن کە تورك و کورد تەنها لە زمان جیاوازن، هەردوو گەلەکە سەربە رەگەزی تۆرانین، ئەوەی پاڵپشتی لەو رایەمان دەکات ئەوەیە کە لە ماددەی کوردستان لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی هاتووە"[4]. سەبارەت بە پاشاوە سیاسییەکان، عیسمەت پاشا گوتی: "ئەوەی دەمەقاڵێ هەڵناگریت ئەوەیە کە کورد و تورك زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتووانی ویلایەتەکە پێکدینن، کورد چەندین سەدەیە لەژێر سایەی حوکمی تورکی هەموو مافیکیان هەیە، ئەوان(کورد) هەرگیز وەك حکوومەتێکی بیانی سەیری ئیدارەی تورکیایان نەکردووە، بەڵام ئەو رووداوانەی کە لە ١٩١٤ لە بەدلیس و دیرسیم روویاندا، رووداویکی تاکیی و خودان سروشتێکی لۆکاڵین، بە کاریگەری قونسولییە بیانییەکان بوونە"[5].

1- Curzon to Crowe, Lausanne, 23-1-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.340, P.465.

٢- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٣٢.

3- Lausanne Conference ..., P. 387 .

4- Lausanne Conference ..., P. 390 “

- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ٨٩.

5- Lausanne Conference ..., P. 391 “

- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ل٩١-٩٢.

دوای ئەوەی عیسمەت پاشا دەستی بە پاساوە مێژوویی و جوگرافی و ئابوورییەکانی ..... لە داواکردنی موسڵ گرت[1]. ئەوا پرسێکی گرنگی ورووژاند، کاتێ باسی لەوە کرد کە راستییەکان ئەوە دەردەخەن کە لە رابردوو حکوومەتی بەریتانی موسڵی بە بەشێك لە عێراق دانەناوە، عیسمەت پاشا لەمە پشتی بە یەکەم: رێککەوتنی ئینگلیزی– فەڕەنسی لە ١٩١٩ بەستبوو کە موسڵی لە تەواوی عێراق دابڕیبوو، لەناو ناوچەی فەڕەنسی دانا بوو. دووەم: لەو داخوازییەی کە لە ١٩١٩ پێشکەشکرا، کاتێ هێزی هاوپەیمانان هانی شەریف پاشایان دا، ئەوکات موسڵ ناوچەیەکی جیا بوو لە عێراق، لەمەشدا ئاماژەی بە یادداشتەکەی کرد لەبارەی مافەکانی کورد لە کۆنگرەی ئاشتی- وەك پێشتر باسکرا.

بەرلەوەی عیسمەت پاشا وەڵامدانەوەکەی تەواو بکات، بە بیر ئامادەبووانی کۆنگرەی هێنایەوە کە لەبەر گرنگی ستراتیژی و مێژوویی، میساقس نیشتیمانی تورکی کە ویلایەتی موسڵی کە زۆرینەی کورد و تورکمانن بە بەشێکی دانەبڕاوی تورکیا جێگیرکردووە، داگیرکردنی وەك تەواوی شوێنەکانی دیکەی تورکی دوای شەڕوەستانی مۆدرۆس بووە، وڵاتانی هاوپەیمان خاوەنی پرەنسیپی وەرگرتنی خواستی گەلان لە دیاریکردنی مافی چارەنووسیان، هەروەك لە ١٤ بەندەکانی ویلسندا هاتووە[2].

دووبارە کریزن قسەی کردەوە و جەختی لەسەر نەزۆکی و ترسناکی سازکردنی راپرسی(ریفراندۆم) کردەوە، بەریتانیا ئەزموونی لەگەڵ راپرسی هەبوو، لە وڵاتێك دانیشتووانەکەی " دەمارگیر و لە رووی پەرۆشی و بەرژەوەندییەوە یەکگرتوو نەبن، بە شێوەیەك لە شێوەکان نەخوێندەوارنو خودان داب و نەریتی ئەتنی و ئایینین...هەروەها خاوەن هۆزی دوژمندار و تۆڵەسێن بن"[3]، لە یادشتەکەیدا کریزن بەردەوام بوو "گومانی تێدا نییە کە کورد دەنگ بۆ بەرژەوەندی ئەو دەسەڵاتە دەدەن کە بۆ دامەزراندنی کوردستانیکی سەربەخۆ یارمەتیان دەدات[4] و

1- Lausanne Conference ..., PP. 391-392.

2- Lausanne Conference ..., PP. 392-393.

3- Quoted in: Curzon to Crowe, Lausanne,23-1-1923,DBFP,I.Sir, Vol.18, No. 340,P.465.

٤- يبدو ان هدف كرزن كان واضحاً، من ذكره الجملة المذكورة، إذ أنه يوجه بها رسالة غير مباشرة إلى الأتراك، بأن إقامة كوردستان ليست في صالح تركيا، ولا في صالح بريطانيا.



عەرەبەکانیش بۆ بەرژەوەندی حکوومەتی عەرەبی و تورکیش بۆ بەرژەوەندی شوێنکەوتەیی تورکی دەدەنگ دەدەن...."[1]. لە وەڵامی ئەوەی کە عیسمەت پاشا دانی بە ئینتیدابی بەریتانی بە سەر عێراقەوە نەناوە، باسی لەو چارەسەرەی تورکی — فەڕەنسی لەبارەی سنووری سوریە — تورکیا کرد[2]، کە ئەمەش دەستەواژەیەکی شاراوە بوو بۆ داننان بە پرسی ئینتیدابی فەڕەنسی بەسەر سوریاوە[3]. دواتر پرسیاری ئەوەی لە عیسمەت پاشا کرد، ئاخۆ لە ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی نوێنەرانی کورد هەن، چۆن هەڵبژێردراون؟ چەندیان هەڵبژێردراون؟....، هەروەها ئەوەشی زیادکرد کە ئەگەر عیسمەت پاشا ئەوە رەتدەکاتەوە دانیشتووانی عەرەبی ویلایەتەکە کە چواریەکی دانیشتووانی پێکدێنن، چارەنووسی ویلایەتەکە دیاری بکەن، ئەی چۆن داوا دەکات تورکمان کە رێژەی یەك بۆ دوانزەی ویلایەتەکە پێکدێنن، چارەنووسی ویلایەتەکە دیاری بکەن[4]؟. دووبارە داوای کردەوە کە پرسەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان رەوانە بکرێت، کە دەستەیەکە لە نوێنەرانی وڵاتانی بێ لایەنی سەربەخۆ و نا لایەنگر پێکیهاتووە، ئەگەر عیسمەت پاشا لەسەر ئەمە رازی بێت، ئەوا کۆمەڵەی نەتەوەکان بە گوێرەی ماددەی ١٧ی میساقی داوا لە تورکیا دەکات، بۆ ئەوەی ببێتە ئەندام لەماوەی سەیرکردنی کێشەکە. بە گوێرەی ماددەی چوار رێگە بە تورکیا دەدرێت بەشداری دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات، هەروەها بە گوێرەی ماددەی پێنج " بڕیاری ئەنجوومەن کە حکوومەتی تورکیش نوێنەرایەتی دەکات تێیدا، بڕیارێکی بەکۆمەڵ دەبێت و بەبێ تورکیا هیچ بڕیارێك دەرناکرێت"[5]. هەروەها ئەوەشی گوت ئەگەر شاندی تورکی پێشنیازەکەی رەتبکەنەوە، ئەوا هەنگاوی دیکە دەگرێتەبەر. ئەو لەو باوەڕەدابوو، کە ئەگەر ئەو پرسە بەو شێوازەی کە شاندی تورکی دەیەویت چارەسەر بکرێت،

1- Harold Niclson,Curzon: The last Phase 1919-1925, London, 1937, P.339“

-ألبرت م. منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٥٤.

٢- کریزن بەمە ئاماژە بۆ رێککەوتنی ئەنقەرەی ساڵی ١٩٢١ دەکات کە بەهۆیەوە پرسی سنووری لەگەڵ تورکیا یەکلایی کردەوە. سەیری: تویژینەوەی یەکەمی بەشی یەکەم بکە.

3- Lausanne Conference ..., P. 398.

4- Lausanne Conference ..., P. 400.

5- Curzon to Crowe,Lausanne,23-1-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.334, PP.465-466“

- فاضل حسين، مشكلة ....، ل ل٣٢-٣٣.

چارەسەر نەکریت، لەوانەیە هێرشێکی تورکی بۆ سەر سنووری سازبکرێت، تاکو کێشەکە بەرێگەی سەربازی چارەسەر بکات، لەوانەیە جەنگیش بەدوای خۆی بهێنێت، دووپاتیکردەوە کە ئەو بۆ مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی هاتۆتە لۆزان نەوەك بۆ بەرپاکردنی جەنگ، بۆیە ئەگەر هەردوو لاکە نەگەنە چارەسەرێك، ئەوا ناچارە بە گوێرەی ماددەی ١١ ی میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکان کار بکات، کە تایبەتە بە چارەسەرکردنی کێشەی جەنگ و هەڕەشەی بەرپاکردنی جەنگ. کریزن بەم ئەگەرە هۆشداری بە عیسمەت پاشا دا و رایگەیاند کە لەبارەی دەرەنجامەکانی لەبەردەم هەمموو جیهان بەرپرسیاری دەکات[1]. هەریەکە لە بۆمبارد و کارۆنی نوێنەرانی فەڕەنسا و ئیتاڵیا پاڵپشتیان لێکرد، هەروەها هیاشی نوێنەری یابانیش لە کۆنگرەکە پاڵپشتی لێکرد[2].

سەرلەنوێ عیسمەت پاشا قسەی کردەوە، بەرگری لە رەتکردنەوەی تورکیا بۆ ئینتیداب کردەوە، هەروەها پرسی هەڵبژاردنی نوێنەرانی کورد بۆ ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی و دەستگرتنی بە جاڕدانی راپرسی وەك چارەسەرێکی دادوەرانە رایگەیاند، هەروەها رایگەیاند کە ئەو و شاندی تورکی داوای ئاشتییەکی دادوەرانە و بێ خەوش دەکەن و ئامادەدەن لەپێناوی ئاشتی گشتی قوربانی بدەن، هیوای خواست کە بەشداربووانی کۆنگرەکە بە پاساوەکانی باوەڕیان هێنا بێت و لە کۆتایی قەسەکانی بانگەوازی بەریتانیای کرد کە بە پرەنسیپی گەڕاندنەوەی موسڵ بۆ تورکیا رازی بێت[3].

کریزن گەیشتە ئەو باوەڕەی کە دەمەقالێ لەگەڵ عیسمەت پاشا سوودی نا بێت، سەرباری ئەوەی کە شاندی تورکی رازی نەبوون، بەڵام بڕیاریدا پرسەکە رەوانەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات و بڕیاری خۆی گەیاندە سەر و لە **٢٥**ی کانوونی دووەم نامەیەکی ئاراستەی سکرتێری گشتی کۆمەڵە کرد، کە پشتی بە ماددەی ١١ ی میساقی کۆمەڵە بەستبوو. لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە لە **٣٠**ی کانوونی دووەم بەسترا، لۆرد بەلفۆری نوێنەری بەریتانیا لە کۆمەڵەی نەتەوەکان رایگەیاند کە کێشە لەبارەی موسڵ بۆ کۆمەڵە گرنگە، چونکە هەرچەندە عێراق لەژێر ئینتیدابی بەریتانییە، لەکۆتاییدا لەژێر سەرپەرشتی و ئیدارەی کۆمەڵە دایە،

---

1- Lausanne Conference ..., PP.402- 403 ; Curzon to Crowe, Laussane, 23-1-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 334, P. 465.

2- Curzon to Crowe, Lausanne, 23-1-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18,No. 340, P. 465.

3- Lausanne Conference ..., P. 404.



بەریتانیا لەری کۆمەڵە ئەو کارە دەکات. جەختی لە فاکتەرە ئاشتییەکان کردەوە کە بەریتانیای ناچارکردووە کە پرسەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان رەوانە بکات[1]. ئەمەش عیسمەت پاشای ناچارکرد کە لە ٤ی شوباتی **١٩٢٣** یادداشتێك بە شاندەکانی هەریەکە لە بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا بدات و داوایان لێ بکات کە کێشەی ویلایەتی موسڵ لە کفتوگۆکانی کۆنگرەکە هەڵاوێرن، لۆرد کریزن لەسەر ئەمە رازی بوو[2]. لەسەر ئەوەی بابەتەکە لەنێوان هەردوولا بەشێوەی یەکی تایبەت گفتوگۆ بکرێت. بەمەش رێگە خۆش بوو کە کێشەی موسڵ لە خشتەی کارەکانی دانووستاندن بهێنرێتە دەرەوە، بەمەش کریزن هەنگاوێکی گرنگی لە بەدەستهێنانی کێشەی موسڵ بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەی بڕی. سەرەتایەکی کردەوە بۆ ئەوەی ویلایەتەکە بەیەکجاری لە دەستی تورکەکان دەربهێنێت[3].

دەمارگیری تورکەکان لەبارەی داخوازیان و توندیان لە بە رووخستنی بیروبۆچوونەکانیان، ئەوەی لەلای سیاسەتمەدارانی بەریتانی بە کریزنیشەوە دروستکردبوو کە سەختە بتوانرێت لەمبارەیەوە بگەنە چارەسەرێك لەگەڵ تورکەکان، بۆیە کریزن لە **١٦**ی کانوونی یەکەمی **١٩٢٢** بڕیاریدا دەقی پەیمانێك دابڕێژێت و سەرەتا بیخاتە بەردەمی هاوپەیمانان، دواتر رادەستی تورکەکانی بکات، یان ئەوەتا پێی رازی دەبن یان ئەوەتا رەتیدەکەنەوە، چونکە بەرای ئەو گفتوگۆ هیچ سوودێکی لەگەڵ ئەوانە نابێت[4]. لەبەرامبەردا عیسمەت پاشا گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە لەوانەیە کارەکانی کۆنگرە بوەستێ، بۆیە بۆ ئەنقەرە بروسکەی لێداو، پێشنیازی کرد کە ئیدارە و سوپا بۆ جووڵانی سەربازی ئامادە بکرێن، ئەنجوومەنی نیشتیمانی داواکەی وەرگرت[5].

لە کۆتایی کانوونی یەکەمی **١٩٢٢** باری کۆنگرە تەواو تووشی تەنگژە هاتبوو، ئەمەش وای لە کریزن کرد بەدوای چەند رێوشوێنیك بۆ پەلەکردن لە داڕشتنی ئەو پەیمانە بگەڕێت[6].

---

1- Peter J.Beck,Op.Cit.,PP.260-261.

2- A.J.Toynbee,Op.Cit., P. 495.

3- Mim K.Oke,A Chronology of Mosul Question 1918-1926, Istanbul, 1991, P. 37.

4- Curzon to Crowe, Lausanne, 16-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 279,PP.322-393.

5- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 205.

6- Ibid, P. 205.

لەهەمان کاتیشدا ئامۆژکاری دەسەڵاتی سەربازی بەریتانی کرد کە هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست بۆ دانانی پلانی باری لەناکاو دابنێن[1].

شانبەشانی ئەمە، هەریەکە لە عیسمەت پاشا و کریزن، لێدوانیان و هەرشەی دژیان زیاتریان ئاڵۆگۆڕ دەکرد، کە ئەمەش وایکرد هەڵوێستەکە لە نێوان هەردوولا روو لە گرژی بکات، تا کار بەوە گەیشت هەردوولا هەڕەشەی بەرپاکردنی جەنگیان لەدژی یەکتری بەکار هێنا ئەگەر داخوازییەکانی جێبەجێنەکرین[2].

ڕەشنوسی ڕێککەوتن ئامادەکرا، کە پێنج بەش و ١٦٠ بەندی لەخۆ گرتبوو، کە تاوتوێی کێشەکانی سیاسی و دارای و ئابووری و گەیاندن و تەندروستی ....دەکرد[3]، لەسەر بنەمای پێشنیازەکانی ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ی[4] کریزن، کە لە ٤ی شوبات خرایە بەردەمی عیسمەت پاشا، کە کریزن بە زمانێکی توند هانیدا کە پەسەندی بکات و گوتی: "ئێمە بۆ ئەوە لێرە نین تاکو هەمووان لەگۆڕبنێین، بەڵکو بۆ ئەوەی چارەسەر و پەیمان مۆربکەین...."[5]. عیسمەت پاشا لەسەرەتادا بە توندی مۆرکردنی پەیمانەکەی ڕەتکردەوە، بەڵام دوای ئەوەی لە لایەن ئامادەبووانی گۆنگرەکەوە خرایە ژێر فشارەوە، لەسەر ئەوەی بیدات بە ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی رازی بوو، بەمەش لە ٥ی شوباتی ١٩٢٣ دانیشتنەکانی قۆناغی یەکەم کۆتایی هات[6]. بەهاتنی ٧ی شوبات، هەردوو شاندی

1- Henderson to Curzon , Constantinople , 25-12-1922 , DBFP , I.Sir, Vol.18, No. 292, PP. 413-414.

2- S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 204-205.

3- Harry. N.Howard,The Partition…, P. 307; Allied Draft Treaty 31-1-1923, DBFP, I.Sir,Vol.18, Apendix. 3, PP. 990-1005.

٤- بۆ بینینی پڕۆژەکە و ئەو گفتوگۆیانەی لە بارەیانەوە کرا، سەیری:

-Lozan Baris Konfransi,Tutanaklar Belgeler,Takim.I,Cilt.I,Kitab.2, Caviren Seha L.Meray,Ankara.1969,SS.31-52.

5- Curzon to Lindsay, Lausanne, 31-1-1923,DBFP,I.Sir,Vol.18,No. 357, PP.484-485; Evans,Op.Cit., P. 339.

6- Evans,Op.Cit., P. 399 “



تورکی و بەریتانی لۆزانیان بەجێهێشت، دوای هەوڵە شکستخواردووەکانی فەرەنسا بۆ دووبارەکردنەوەی پرۆسەی دانووستاندن کە بەریتانیا بە تێکشکێنەری یەکێتی هاوپەیمانانی دانان[1].

بەمەش کۆنگرەکە بەهۆی دەمارگیری سیاسەتی بەریتانی و تورکی لەبارەی پرسەکانی سیستەمی قەزایی و ئابووری کە شکستی هێنا، ئەو پرسانەش زیاتر بۆ فەرنسی و ئیتاڵییەکان وەك بەریتانییەکان گرنگ بوو، چونکە بەریتانییەکان بەسەرۆکایەتی کردنیان بۆ لیژنەی هەرێمایەتی و سەربازی بەرژوەندیەکانی خۆیان پاراستبوو، ئەمەش زیاتر گومانی لای تورکەکان لەبارەی سووربوون ی بەریتانیا لە ئاشتی و داخوازی بەپەلە مۆرکردنی بەندە ئابوورییەکان پەیدا کرد، ئەم گومانەش لە چاوپێکەوتنی عیسمەت پاشا بە برستیلی سەرۆکی بەشی ئەورووپی لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی بەدەرکەوت[2]. کاتێ کریزنی بە هۆکاری راستەقینەی ئەو شکستە تاوانبارکرد، کە بە نیاز و مامەڵەی خراپی بەرامبەر ئەورووپییەکان، نەتەوەیی تورکی پشتگۆێخست[3].

توندی گرنگترین خەسڵەتی گفتوگۆ فەرمی و نافەرمییەکانی نێوان عیسمەت پاشا و کریزن بوو لە لۆزان، کریزن زۆر ڕێگری لەبەردەم شاندی تورکی دروستکرد، بۆ ئەوەی بە خێرایی بیروڕای خۆی دەربڕێت و پرسیاری هەستبریندارکەری ئاڕاستە دەکردن، لەبارەی پەیوەندی تورکیا بە سۆڤیەتەوە، شایانی باسە دەزگای هەواڵگری بەریتانی بۆ ئەم کارە کارئاسانی دەکرد، کاتێ بە سەرکەوتوویی سیخوری بەسەر نامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان ئەنقەرە و شاندی تورکی دەکرد[4]. هەروەها لەبارەی کوردیش، بەڵام عیسمەت پاشا بەهەموو شێوەیەك هەوڵیدا نەکەوێتە ژێر فشارەکانی کریزنەوە، هەروەها عیسمەت پاشا وایکرد زۆربەی جار لە هێرشەکانی کریزن بەدوور بێت، کە کریزن گومانی لەوە دەکرد کە عیسمەت

- اضل حسین، مشکلة ...، ل ٣٦.

1- Memorandum by Crowe 6-2-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 374, PP. 511-512.

2- Henderson to Curzon,Constantinople,12-2-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No. 309, PP. 541-542

٣- سحر عباس خضیر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٦.

4- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 191.

پاشا تەنها گوێی لەو قسانە دەگرت کە حەزی دەکرد گوێی لێبێت[1]. سەرباری ئەوەش، بەهۆی باوەڕی عیسمەت پاشا بەوەی کە بەریتانیا گەشتیگەلی لە ئەستەمبۆڵ و هێزی لە موسڵ هەیە، گەورەترین هەڕەشە دروست دەکات، بۆیە زیاتر لە جارێك بیرۆکەی هاوپەیمانی خستە بەردەم کریزن، کاتێ ئاماژەی بۆئەوە کرد کە ئەو وڵاتەی کە تورکیا دەیەویت، دۆستایەتی بکات، ئەویش بەریتانیایە، بەڵام کریزن ئەمەی بەمشێوەیە رەتکردەوە من بۆئەوە لێرەم تاکو بگەینە ئاشتییەکی یەکگرتوو نەوەك ئاشتییەکی تاکلایەنە"[2]. هەروەها عیسمەت پاشا بەهەموو توانایەکیەوە هەوڵیدا ناکۆکییەکانی نێوان وڵاتانی هاوپەیمان بۆ خۆی بقۆزیتەوە، بەوەی جارێك پەنای بۆ ئەمریکا و جارێك پەنای بۆ فەرەنسا دەبرد، پێشنیازی بۆ دەکردن کە پەیمان لەگەڵ تورکیا ببەستن، بەڵام تا دانووستاندنەکە کۆتایی دێت، ئەو داوایەیان رەتدەکردەوە[3].

---

1- Peter J.Beck,Op.Cit.,P.258.

2- Curzon to Crowe,Lausanne ,5-2-1923, DBFP, I.Sir,Vol.18 , No.370, P.507.

3- Curzon to Crowe,Lausanne,16-12-1923,DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 279, PP. 322-323.

# بەریتانیا و تورکیا لە قۆناغی دووەمی کۆنگرەی لۆزان

**(٢٣ ی نیسان ـ ٢٤ تەمووزی ١٩٢٣)**

ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی تورکی لە کۆبوونەوەی شەشی ئادار رەشنووسی ڕێککەوتنەکەی رەتکردەوە، چونکە لەگەڵ ئەوەی لە میساقی نیشتیمانی تورکی لەسەری ڕێککەوتوون، ناکۆکە[1]، بەڵام دەمەقاڵێ لەبارەی دەستکردنەوە بە دانوستاندنەکان بەردەوام بوو، لەبەردەم ئەنجوومەن مستەفا پاشا بەرگری لە عیسمەت پاشا کرد، بەرپەرچی ئەوانەی دایەوە کە لەگەڵ دەستپێکردنەوەی دانوستاندنەکان نەبوون، لەکۆتاییدا هەرچەندە بالیۆزی رووسی لەگەڵ دەستپێکردنەوەی دانوستادنەکان بوو، هەر کار بە بیروبۆچوونی مستەفا کەمالەوە کرا[2]. یادداشت ئامادەکرا، تێیدا داوا لە تورکەکان کرا، هەموو پابەندیە بیانییەکان هەڵبوەشێنێتەوە و تاوتوێی پرسی موسڵ بەتەنها لەگەڵ بەریتانیا بکات و چاوخشاندن بە کێشە ئابوورییەکان دوابخات، پەلە لە قەرەبووە جەنگییەکان بۆ حکوومەتی تورکی لەلایەن یۆنانەوە بکرێت[3].

ئەم یادداشتە لە ٨س ئاداری ١٩٢٣ نووسرا، خواستی تورکیای بۆ دەستپێکردنەوەی دانووستاندنەکان لە ماوەی دوو هەفتە لە شارێکی ئەوروپی یان ئەستەمبوڵ بێت، لەخۆگرت، لە ٩ی ئاداری ١٩٢٣ ئەو یادداشتە و پرۆژە نوێیەکەی تورکی بە نوێنەرانی باڵای هاوپەیمانان درا[4].

١- فاضل حسين، مؤتمر لوزان....، ل ١٥.

2- Harry. N.Howard,The Partition…,P. 311 ; S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 211-212.

3- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 212.

4- Rumbold to Curzon, Constantinople,10-3-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No. 431, PP. 582-587;S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 213.



دوای ئەوەی کریزن رازی بوو دەست بە دانووستاندنەکان بکرێتەوە، بۆ ئەوەی ئاڕاستەی ئەو ڕێچکەیە بگیرێتەبەر کە لە دانووستاندنە نوێیەکەی تورکیا کاری پێدەکرێت، لە ١١ی ئادار کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ هاوپەیمانانی کرد، کە بڕیاری درێژەدان بە دانووستاندنەکان لەگەڵ تورکەکانی لێکەوتەوە[1].

لە ٣١ی ئازار تورکەکان وەڵامدانەوەی هاوپەیمانانیان لەبارەی یادداشتەکەیان وەرگرت، کە بەروونی تێیدا هاتبوو، بۆ ئەوەی بە خێرایی بگەینە ئاشتییەکی دادوەرانە و بەردەوام، ئەوا وڵاتانی هاوپەیمانان ئامادەن هەموو خاڵێکی ناو یادداشتە تورکییەکە و پێشنیازە بەرامبەرەکانیشی گفتوگۆ بکەن. دانیشتنەکانی دانوستادنەکان لە ٢٣ی نیسان لە لۆزان دەستپێدەکاتەوە، داوا لە ئەنقەرە کرا نوێنەرانی خۆی بۆ دەستپێکردنەوەی کۆنگرەکە بۆ لۆزان بنێرن، ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵی ئەنقەرە[2].

بەر لەوەی کۆنگرەکە دەست بەکارەکانی بکات، دوو پەرەسەندنی دیار کاریگەری گەورەی لەسەر قۆناغی دووەمی گۆنکرەکە هەبوو، هەردوو رووداوەکەش مستەفا کەمال لەدواوەی بوو، یەکەم: بڕیاری ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورەی تورکی لە یەکی نیسان لەبارەی سازکردنی هەڵبژاردنی نوێ لەماوەی دوو مانگدا، بەمەرجێ ئەنجوومەنی نوێ دەبێت لە حوزیران کۆببێتەوە[3]. ئەمەشی بۆ ئەوە بوو تاکو لە نەیارانی ناو ئەنجوومەن رزگاری بێت و هەڵوێستی مستەفا کەمال بەهێز بێت، کە هەوڵێکی زۆری دابوو تاکو سەرکردایەتییە سیاسییەکەی لەناو تورکیا لە میانەی ڕێکخستنی "پارتی گەل"[4] بەهێز بکات. بە کردەوە ئەو هەڵبژاردنە

1- Minutes of inter – Alled meting held at the foreign Office on March 21, 1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 451, PP. 602-612

2- Rumbold to Curzon,Constantinople,8-4-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No. 465,P. 675 ; S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 214.

3- S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 214-215.

٤- دوای ئەوەی کۆمەڵەی بەرگری لە مافەکان بڕیاری دا بۆ پارتێکی بگۆڕێت، لە ٩ی ئابی ١٩٢٣ کۆنگرەی دامەزراندنی پارتی گەل بەسترا، بە فەرمی لە ١٩ ئەیلولی ١٩٢٣ مۆڵەتی پێدرا، دوای ئەوەی لە ١١ی ئەیلول مستەفا کەمال بە سکرتێری گشتی و عیسمەت پاشاش بە جێگری هەڵبژێر دران. شایانی باسە پارتی گەل لە فەلسەفە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکەی بە بیروبۆچوونەکانی زیا کۆك ئەلب و بە تیۆرە مێژووییەکەی

لەمیانەی بەڕێوەچوونی کارەکانی کۆنگرە ئەنجامدرا، کۆمەڵەی بەرگریکردن لە ئەنادۆڵ و ڕۆملیّ کە دەستی بە پەیرەوی پارتی گەلەوە گرتبوو، زۆرینەی کورسییەکانی بردەوە و مستەفا کەمالیش وەك سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنە هەڵبژێردرا[١]، ئەمەش وایکرد ئەنجوومەنی نویّ زیاتر بەرامبەر داواکارییەکانی بەریتانیا و هاوپەیمانان لە کۆنگرەکە دەمارگیر بێت. بەریتانیایەکانیش ئاگایان لەمە هەبوو، لە پاکێتی ئەو هەڵبژاردنە گومانیان پەیداکرد، بەتایبەتی ئەو هەڵبژاردنانە زۆربەی ویلایەتەکان ڕۆژهەڵاتی نەگرتەوە[٢].

پەرەسەندنی دووەم، ئەوە بوو کە حکوومەتی ئیمتیازی جەستەری[٣] پەسندکرد، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ بەشداری پێکردنی ئەمریکا وەك لایەنێکی ململانێکەر و لەپێناوی دوو کەرتکردنی بەرەی وڵاتانی هاوپەیمان[٤]. حکوومەتی بەریتانی دژایەتی خۆی بۆ بەخشینی ئەو ئیمتیازە لە

بیرۆیاری فەرەنسی (جولەکە) لیۆن کاهان کاریگەر بوون، ئەوانە بیری نەتەوەیی تورکیان لە تورکان بەهێزکرد و لە کۆت و بەندە ئیسلامییەکانی عوسمانییەکانی رزگار کرد. دامەزراندنی پارتی گەل بواری زیاتری بە مستەفا کەمال بەخشی تاکو لە پرۆژە چاکسازییەکانی بەردەوام بێت و ئاراستەی سیاسەتی دەرەوەی وڵات بکات، مستەفا کەمال دوای دامەزراندنی پارتی گەل بووە حاکمێکی رەها، رازی نەدەبوو هیچ پێشنیاز و بیروبۆچونیکی دژ وەربگریت، سەیری:

- Desmond Stewart,Op,Cit.,P. 247“

- مصطفى الزين، سەرچاوەی پێشو، ل ٢١٦“ محمد عزة دروزة، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦٣.

1- Kemal Atatürk,A.G.E,SS.491-492“

2- Rumbold to Curzon, Constantinople, 12-6-1923, DBFP,I.Sir, Vol.18, No. 620, PP. 884-885.

٣- ئەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ جەستەر مۆرکرابوو، ڕێگەی پێدەدا، کە کۆمپانیا ئەمریکییەکە بەدوای نەوت لە دووری ٤٠ میل لە هەردوو بەری ریگای نێوان ئەنقەرە — سیواس — کربۆن — دیاربەکر- موسڵ — تا سنووری ئێرانی بگەڕێت، ئەمەش لەلای بەریتانیا وا لێکدرایەوە کە ئەمریکا لایەنگری خستنەپاڵی موسڵ بۆ تورکیا دەکات، سەیری:

- عبد الحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، الأصول التاريخية للنفط العراقي، مراجعة وتقديم، قاسم أحمد العباس، ج٢، بغداد، ١٩٧٥، ل ٧٨.

٤- سحر عباس خضير، سەرچاوەی پێشو، ل ل٢٦٧-٢٦٨.



ویلایەتی موسڵ دەربڕی، کە ئەو ناوچەیە لەژێر سەروەری تورکیادا نییە، هەروەها ئەمەی بە دەستتێوەردانی ئەمریکی لە دانووستاندنەکانی لۆزان دانا بۆ ئەوەی بگەنە ڕێککەوتنیکی وا کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بگونجیّ[١]، بۆیە کریزن وا بیریکردەوە کە شاندی ئەمریکی بۆ قۆناغی دووەمی کۆنگرەکە بانگهێشت نەکات، بە ئامۆژگاریەکانی رامبۆڵدی نوێنەری باڵای بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ و گیدسی بالیۆزی بەریتانی لە واشنتۆن وایان لێکرد کە لەو بیروڕایەی باشگەز ببێتەوە و بۆ کۆنگرەکە داوەتی بکات[٢].

کۆنگرەکە بۆ دووەمجار لە ٢٣ ی نیسانی ١٩٢٣[٣] بەسەرۆکایەتی رامبۆڵد دانیشتنەکانی دەستپێکرد، رامبۆڵد شوێنی کریزنی سەرۆکی شاندی بەریتانی گرتەوە[٤]، تورکیا بەهەمان شاندەوە بەشداری کرد، شاندی فەرەنسیش لەلایەن ژەنەراڵ بیڵی نوێنەری باڵای فەرەنسی لە ئەستەمبۆڵ سەرۆکایەتی دەکرا، مۆنتاش هەر سەرۆکایەتی شاندی ئیتاڵی دەکرد، هەرچی نێردەی ئەمریکی بوو، ئەوا لەلایەن کرۆ سەرۆکایەتی دەکرا، شاندی یۆنانی هەر بەسەرۆکایەتی فنزیلوس مایەوە. هەرچی رووسیا بوو ئەوا بەشدارییەکەی شێوەیی (شکلی) بوو، چونکە پرسی تەنگەبەرەکان لە قۆناغی یەکەمی کۆنگرەکە بەیەکجاری یەکلایی کرابووەوە[٥]. رامبۆڵد پێشنیازی کرد کە دووبارە لیژنەکان وەك قۆناغی یەکەم پێکبهێنرێنەوە، خۆی سەرۆکایەتی لیژنەی یەکەمی کرد کە مامەڵە لەگەڵ پرسە هەرێمایەتی و سەربازییە هەڵواسراوەکان دەکات، هەروها کێشەی بەخشینی ئیمتیازەکان بە بیانییەکان، بیڵی فەرەنسی سەرۆکایەتی لیژنەی

1- John A.DeNovo,Amercan Interests and Policies in the Middle East 1900-1939,U.S.A,1963,P.191 ff“

- اصغر جعفري ولداني، جشمداشت های ترکیه به شمال عراق، اطلاعات سیاسی اقتصادی (مجله)، ژمارە، ٩٥-٩٦، تهران، ، ل ٦٤.

2- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 215;Curzon to Henderson,foreign Office, 20-4-1923, DBFP, I.Sir,Vol.18, No. 670,PP. 686-687.

3- Kemal Atatürk,A.G.E,S.492.

٤- لقد عد ترأس رامبولد للوفد البريطاني، خلفاً لكرزن، بداية التغيير في السياسة البريطانية تجاه تركيا، باتجاه إبداء بعض المرونة.ينظر: داجوبرت فون ميكوش، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٥٦.

5- B.Ponomaryov and Others,Op. Cit., P. 196 “

-جاسم محمد شطب، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٠٢.

دووەمی کرد، کە تاوتوێی پرسە دارایی و تەندروستییەکان دەکات، هەرچی مۆنتانای ئیتاڵی بوو ئەوا سەرۆکایەتی لیژنەی سییەمی کرد کە بۆ پرسە ئابوورییەکان تەرخانکرابوو، تورکەکان لەبارەی ئەم دابەشکردنەی کار هیچ ناڕەزایەتییەکیان نەبوو[1]، بەمەش قۆناغی دووەمی کۆنگرەکە بەبێ هیچ ناڕەزایەتییەك بەڕێوەچوو.

پرسی تەراقیا، لە ٢٤ نیسان یەکەمین ئەو پرسە هەرێمایەتییە هەڵواسراوانە بوو کە لیژنەی رامبۆڵد تاوتوێی کرد، کە تورکەکان داوایان لە لیژنەکە کرد کە هێلی سالۆیك کە قووڵترین خاڵی دەریاوانی رووباری مارتیزایە، بکرێتە سنووری نێوان یۆنان و تورکیا، سەرباری داواکردنی هەردوو دوورگەی ئەداقەلا Adakale و کاستلوریز Castellorixo بۆ سەر تورکیا، بەهۆی ئەوەی دەکەونە ناو ئاوە هەرێمایەتییەکانییەوە، بەڵام رامبۆڵد ئەوەی وەك پاڵپشتییەك بۆ ئیتاڵیا رەتکردەوە، کە داوای هەردوو دوورگەکەی کردبوو[2]. بەهۆی ئەوەی هەردوو لایەنی تورکی و ئیتاڵی دەستیان بە داواکەیانەوە گرتبوو، لە ترسی ئەوەی کۆنگرەکە دووبەرەکیی نەکەوێتە ناوی، رامبۆڵد بۆ حکوومەتی خۆی پێشنیازی کرد، کە سازش لە بەرامبەر داخوازییەك بۆ ئەوەکەی دیکە بکات، بەهۆی ئەم سازشەوە تورکیا هێلی سالۆیك تا مارتیزا دەبات و لەبەرامبەردا دەستبەرداری هەردوو دوورگەکە دەبێت، حکوومەتەکەی ئەمەی پەسند کرد[3]. تورکیاش پێی رازی بوو، بەڵام دوای ئەوەی داخوازییەکی دیکەی پێوە لکاند، ئەویش دەستبەرداربوونی ئیتاڵیا بوو لەو دراوە یەدەگانەی کە لەلای دەوڵەتی عوسمانی بوو، دەبوو تورکیا بیداتەوە[4]. رێککەوتنی تایبەتی پرسی تەراقیا لە ٥ی حوزەیران نووسرایەوە و دەقە کۆتاییەکەی لە ٢٤ی[5] تەمووز لە پێنج ماددەدا مۆرکرا، کە بەهۆیەوە سنووری ئەورووپی بۆ تورکیا لە دەریای رەش تا دەریای ئیجە دیاریکرا[6].

---

1- S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 215-216 ; Rumbold to Curzon, Lausanne, 23-4-1923, DBFP, I.Sir,Vol.18, No. 477, PP. 688-690.

2- Rumbold to Curzon, Lausanne , 25-4-1923 , DBFP , I.Sir , Vol.18, No.478, P.690; S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 217

3- Rumbold to Curzon, Lausanne, 26-4-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 489, P. 694.

4- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 216.

5- Gündüz Okçün, Ahmet R. Okçun, Tűrk Antalaşmalar Rehberi, Ankara, 1974, PP. 1-2.

٦- لوزان صلح معاهدة نامه سی، مقاولات وسندات سائرة، ٢٤ تموز ١٣٣٩-١٩٢٣، مطبعه احمد احسان وشركاسی، استانبول، ١٣٤٠، ل ل٦-٧.



سەبارەت بە پرسی موسڵ، ئەوا هیچ رێگرییەکی لە کۆنگرەکە لە قۆناغی یەکەمدا بۆ دروستنەبوو، چونکە لە قۆناغی یەکەمی کۆنگرەکەدا لەسەر هێڵە سەرەکییەکانی رێککەوتبوون، ناکۆکییەکە لێرەدا تەنها بەو ماوەیەی کە لەسەری رێککدەکەون بۆ کێشانی سنووری نێوان عێراق و تورکیا دەخایەنێ بەند بوو، ئەگەر هەردوولا رێکنەکەوتن، ئەوا دەبێت بخرێتە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان[1]. لە ٤ی حوزەیران تاوتوێیان کرد، کاتێ رامبۆڵد داوای لە عیسمەت پاشا کرد کە ئەگەر دەتوانێ ماوەکە لە ساڵێك بۆ ٦ مانگ کورت بکاتەوە، عیسمەت پاشا وەڵامیدایەوە کە ناتوانێ وەڵامبداتەوە، بۆیە بابەتەکە بۆ کۆبوونەوەیەکی دیکە دواخرا[2].

لە راستیدا بەرژوەندی بەریتانیا لەوەدابوو ماوەکە کورتبکرێتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی شاندی بەریتانی توانی پرسەکە لە خشتەی کاری کۆنگرەکەی پێشوو دەربهێنێت[3]، چونکە سیاسەتمەدارانی بەریتانی دەیانزانی کە تورکیا هیچ سازشێك لەبارەی موسڵ پێشکەش ناکات. بۆیە بەریتانیا ویستی بە پەلە بخرێتە بەردەم ئەو دەستەیەی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە کاریگەری زۆری لەسەر هەیە[4]، ئەمەش وا دەکات کێشەکە بۆ بەرژوەندی خۆی بشکێنێتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی رەوشی سەربازی لە باشووری کوردستان زیاتر خراپ دەبوو[5]. بۆ رێخۆشکردن بۆ ئەمەش کریزن بۆ رامبۆڵدی نووسی: "بەریتانیا ئامادە نییە هیچ پەیمانێك مۆر بکات، کە مەرجەکانی هێڵە سەرەکیەکانمان نەهێنێتەدی، بەڵام ئەگەر چارەسەر نەبوو، ئەوا دەتوانین ماوەکە لە ٦ مانگەوە بۆ ٩ مانگ درێژ بکەینەوە"[6].

---

1- Peter J.Beck,Op.Cit.,PP.260-261.

2- Mim K.Oke,A Chronology..., PP. 43-44“

- فاضل حسین، مشکلة...، ل ٣٧.

3- Mim K.Oke,A Chronology..., P. 37.

4- Ismael Güldaş,A.G.E,S.101.

٥- سروه اسعد صابر، کوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤-١٩٢٦، اربيل، ٢٠٠١، ل ل ٢٤١-٢٥٢.

6- Qouted in: Curzon to Rumbold, foreign Office,13-6-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18 ,No. 606, P. 859 ; Peter J.beck,Op.Cit.,P. 261.

لە ٢٣ی حوزێران دوای ئەنجامی چەند گفتوگۆیەکی کورت، عیسمەت پاشا لەسەر کۆرتکردنەوەی ماوەکە لە ساڵێك بۆ ٩ مانگ رازی بوو[١]. بڕگەی دووەمی بەندی سێیەمی پەیمانی لۆزان چارەسەری ئەو پرسەی کرد[٢]. ئەو بڕگەیە دەڵێت کە پرسی سنووری نێوان عێراق و تورکیا بە رێگەی ئاشتی لە نێوان بەریتانیا و تورکیا لەماوەی ٩ مانگدا چارەسەر دەکرێت و لە ٥ی حوزێرانی ١٩٢٤ کۆتایی دیت، ئەوان(تورکیا+ بەریتانیا) ئەگەر لەسەر هیچ رێککنەکەوتن، ئەوا کێشەکە دەخرێتە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان[٣].

پرسی چۆڵکردنی هێزەکانی هاوپەیمانان لە ئەستەمبۆڵ و تەنگەبەرەکان لەو پرسانە بوون، کە بۆ بەریتانیا و تورکیا گرنگ بوون، بۆ تورکەکان پرسێکی چارەنووساز بوو، زۆرترین هەوڵیان لە کۆنگرەکەدا بۆ ئەوەی سەربکەون و هەر لەسەرەتاوە لەبارەیەوە نیگەران بوون، بەڵام بۆ بەریتانیا بە کارتێکی قازانجدار دانرا، تاکو بەهۆیەوە فشار بخەنە سەر تورکەکان بۆ ئەوەی باشترین سازشیان پێ بکەن، شانبەشانی ئەم سیاسەتە و لە وەڵامدانەوەی داخوازی شاندی تورکی، رامبۆڵد رازی نەبوو لە ٢٥ نیسان دەرگای گفتوگۆی ئەم پرسە بکاتەوە، بەڵام ئەوەی پێ راگەیاندن کە ئەوان دەست بە چۆڵکردن دەکەن، ئەگەر دانووستاندنەکان بە کۆتاییەکی سەرکەوتوو بگەن، بۆیە چ لەبەردەم عیسمەت پاشا نەمایەوە تەنها رازی نەبێت[٤].

مستەفا کەمال لەبارەی ئەو دواخستنە، ئاگای لە نیازی بەریتانیا و هاوپەیمانان هەبوو، بۆیە بروسکەی بۆ عیسمەت پاشا کرد و لە ٢٥ ئایار نامەیەکی بۆ نارد، تێیدا روونیکردەوە کە هاوپەیمانان بۆیە دەیانەوێت پرسی چۆڵکردن دوا بخەن تاکو پرسە ئابووری و داراییەکان بە گوێرەی بیروبۆچوونیان یەکلایی دەبێتەوە و پرسی موسڵ بە خواستی بەریتانییەکان چارەسەر دەبێت[٥]. بۆیە عیسمەت پاشا لە ٢٧ ی حوزێران دووبارە پرسی چۆلکردنی خستە بەردەم رامبۆڵدەوە، بەهۆی فاکتەرەکانی پەیوەست بە سیاسەتی ناوخۆییەوە لەسەری سووربوو. ویستی هەڵوێستی سادەی خۆی لەبەرامبەر پرسی قەرەبوکردنەوەی یۆنان بە گرنگیدانی بە پرسی

1- Mim K.Oke,A Chronology...,PP.43-44 ; Peter J.Beck,Op.Cit.,P. 261.

٢- لوزان صلح معاهده نامه سی...ل٧.

٣- لوزان صلح معاهده نامه سی...، ل ٧"عبد الحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠٦.

4- Rumbold to Curzon,Lausanne,26-4-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.481, P. 695.

5- S. R. Sonyel,Op.Cit., P.222.



چۆلکردن پاساوهێن بکات[١]، بەڵام رامبۆڵد سوربوو لەسەر ئەوەی کە پرسی چۆلکردنی ئەستەمبۆڵ و تەنگەبەرەکان ناخرێتە بەر گفتوگۆ تا بەشداربووانی لۆزان نەگەنە چارەسەری پرسەکانی دیکە بەتایبەتی پرسی قەرزەکان و ئیمتیازەکان و پرسی موسڵ[٢]. ئەو رەتکردنەوەیە دواتریش چەندبارە بووەوە، بەڵام رامبۆڵد، عیسمەت پاشای دڵنیاکردەوە کە چارەسەری ئەو پرسانە دەبێتە هۆی چارەسەری پرسی چۆلکردن کە لەگەڵ دیدی تورکی گونجاو بێت[٣]. ئەمەش عیسمەت پاشای ناچارکرد پێی رازیبێت. دوای ئەوەی گەیشتنە رێککەوتن لەبارەی پرسی موسڵ، بە سووربوونی عیسمەت پاشا هاوپەیمانان لە ٧ی تەمووزدا پرۆتۆکۆڵی چۆلکردنیان پێشکەشکرد[٤]. لە ١٧ ی تەمووز دوای ئەوەی خرایە بەر گفتوگۆوە و دوای ئەوەی چارەسەری قەرزەکانی عوسمانی کرا[٥]، گەیشتنە پرۆتۆکۆلی کۆتایی و ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی تورکی لە ٢٤ی تەمووز واژووی لەسەر کرد، کە بڕیاری چۆلکردن لەسەر پاشەکشەی سەرجەم هێزەکانی هاوپەیمانان لە ماوەی ٦ هەفتە لە پەسندکردنی رێککەوتنەکە درا[٦]. پرسی ئیمتیازە قەزاییەکان لە دەوڵەتی عوسمانی، خرایە ئەستۆی لیژنەی یەکەم، شاندی بەریتانی لەچارەسەرکردنی ئەو کێشەیە سەختی بینی، کە لە قۆناغی دووەمی کۆنگرەکە ئەو ئەرکە زیادکرا، لە ٤ی ئایار پرسەکە خرایە بەردەم لیژنەکە، عیسمەت پاشا رەقیەکی زۆری پیشاندا بەهیوای ئەوەی تا بکرێت سازش بە هاوپەیمانان بکات، بەڵام رووبەڕووی نارەزایەتی توندی هاوبەشی بەریتانی و فەرەنسی و ئیتاڵی بووەوە، بە شێوەیەك کە عیسمەت پاشای تورە کرد و ئەوانی تۆمەتبار کرد و گوتی: "وەك تەنها پاشکۆیەك مامەڵە لەگەڵ تورکیا دەکەن"، هەرچی رامبۆڵد بوو، ئەوا هۆشداری بە عیسمەت پاشا لەبارەی بەردەوامبوونی لە رەتکردنەوەی پێشنیازی هاوپەیمانان داو گوتی: "پێشنیازەکە لە کۆتاییدا وەك بەشێك لە پەیمانەکە و

1- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 222

2- Curzon to Rumbold, Foreign Office, 13-6-1922, DBFP, I.Sir,Vol.18, No. 606,P. 856.

3- Rumbold to Curzon, Lausanne, 23-6-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No. 632, P. 890.

4- Rumbold to Curzon, Lausanne, 7-7-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No. 660, P. 930

5- Rumbold to Curzon, Lausanne, 9-7-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No. 662, PP. 935-936.

٦- لوزان صلح معاهدة نامه سی...، ل ل١٤١-١٤٢.

پاشکۆکانی پێشکەشدەکرێن"[١]، هیچ لایەك لە هەڵوێستی خۆی دانەبەزی، بەڵام عیسمەت پاشا کە لە ئەنقەرەوە راسپێردرابوو هیچ سازشێك پێشکەش نەکات، دوای نیوەرۆی هەمان رۆژ سەردانی رامبۆڵدی کرد، بۆ ئەوەی گازاندەی لەبارەی ئەو هەڵوێستەی بەیانی لێبکات و گوتی: "سووربوون ی بەریتانیا لەسەر پرسێکی هەستیار لەسەر رای گشتی تورکی وادەکات رەوشەکە بشلەژێ و بۆ بەریتانیا زۆر سەخت بێت، هەروەها ئەوەشی زیادکرد کە تورکیا رێککەوتنی لەگەڵ رووسیادا هەیە، هەر لێدوانێکی شەرعی کە پارێزگاری بە هاوڵاتیانی وڵاتانی هاوپەیمان ببەخشێ، دەبێت بە هاوڵاتیانی رووسیش ببەخشرێت، بەریتانیاش حەز بەمە ناکات و سووربوون لەسەر پرسەکە بۆ رێگایەکی داخراو دەبات[٢].

پێ دەچێت قسەکانی عیسمەت پاشا تارادەیەك کاری لە رامبۆڵد کردبێ، کە بە کریزنی گوت کارەکە ئەوە ناهێنێ کۆنگرەکەی لەسەر تێکبدەین، بۆیە کریزن رازی بوو، بەڵام "بە مەرجێ دەستبەرداری هەڵوێستەکەی نابێت، ئەگەر وەك دوا چارە نەبێت"[٣]، دوای ئەوەی ئەو رازیبوونەی کریزن خرایە بەردەستی تورکەکان، کار بۆ ئامادەکردنی دەقی رێککەوتنامەی تایبەت بە ئیدارەی دادگەری کە لەگەڵ رێککەوتنەکانی دیکە لە ٢٤ی تەمووز مۆرکران، کرا[٤].

هەرچی پرسی قەرەبووەکان بوو، کە لە تایبەتمەندێتی لیژنەی سێیەمدا بوو، بەتایبەتی قەرەبووەکانی تورکیا — یۆنان، بووە رێگرێکی سەرەکی بەردەم گەیشتن بە ئاشتی، رامبۆڵد لەسەرەتادا بە سووك سەیری ئەو پرسەی دەکرد، بەڵام دواتر وەك پرسێکی سەرەکی "کە پێویستی بە چارەسەری کۆتایی و سازشی کۆتایی هەبێت، لە پرسە گەورەکان سەیری کرد"[٥]. بەهۆی سووربوون ی زۆری یۆنان بۆ بەپەلە کۆتایی هێنان بە پرسەکە و لە پەرۆشیان بۆ

1- Rumbold to Curzon, Lausanne, 4-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 496, PP. 714-716; S. R. Sonyel,Op.Cit., PP. 218-219 .

2- Rumbold to Curzon, Lausanne, 4-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 489,PP. 718-720.

3- Quoted in: Ibid, minute. 5, P.813 ; S. R. Sonyel,Op.Cit., P.219.

٤- لوزان معاهدة نامه سی ....، ل ١٢٥.

5- Rumbold to Curzon,Lausanne,12-5-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.512, P. 742.



سازکردنی ئاشتی لەگەڵ تورکیا تاکو سوپاکەیان پشوو بدات، کە ماوەیەکی درێژە لە چاوەڕوانی دان، بەتایبەتی لە تەراقیای رۆژهەڵات و سەرباری رەوشی ناوخۆیی دیکە[١]، دوای ئەوەی فنزیلوس دەسەڵاتی پێ بەخشرا، بۆ ئەوەی لەگەڵ تورکەکان بگەن بە رێککەوتن، داوای کرد بۆ چارەسەری کێشەکە عیسمەت پاشا بەخۆی ببینێ و داوای لە حکوومەتی بەریتانی و حکوومەتەکەی خۆی کرد، قاراجاق کە کریزن لە قۆناغی یەکەمدا هەوڵیدا بە یۆنان ببەخشرێت، بە تورکەکان بدرێت، سەرباری ئەوەش سێگۆشەیەکی بچووك لەو ناوچەیەی کە کەوتۆتە نێوان هەردوو رووباری مارتیزا، بە تورکیا بدرێت، فنزیلوس ویستی لەبەرامبەردا تورکەکان داوای قەرەبوو لە یۆنان نەکەنەوە[٢]. رامبۆڵدیش لەمەدا پاڵپشتی لێکرد[٣]. بەمشێوەیە بە پاڵپشتی بەریتانیا بۆ پێشنیازەکەی فنزیلوس و بە هاندانی حکوومەتی یۆنانی تاکۆ پێ رازیبێت، حکوومەتی یۆنان رازی بوو [٤]پێشنیازەکەی فنزیلۆس پەسند بکات[٥].

لەو سەروبەندەدا فەرەنسا و ئیتاڵیا پرسی قەرەبووەکانی وڵاتانی هاوپەیمانانیان بەسەر تورکەکان ورووژاند، ئەمەش وەك فاکتەریکی دیکە فشار بۆ سەر تورکەکان تاکو سازشی زیاتریان پی بکەن، بەڵام رامبۆڵد نیگەرانی خۆی لەمبارەیەوە دەربڕی، چونکە عیسمەت پاشا پێشتر بە کرۆی نوێنەری ئەمریکی راگەیاندبوو کە ئەگەر وڵاتانی هاوپەیمان سووربن لەسەر داواکردنی قەرەبوو لە تورکیا، ئەوا تەنها رویشتن لە لۆزان بۆ شاندی تورکی دەمێنێتەوە. بۆیە رامبۆڵد داوای لە کریزن کرد کە هەرچی لە توانای دایە بیکات بۆ ئەوەی وا لە فەرەنسا و ئیتاڵیا بکات، ئەو داوایەیان پووچەڵ بکەنەوە یان بەلای کەمەوە دوای بخەن[٦].

١- بو زانینی ئەو هۆکارانەی وای لە یۆنان کرد ئەو هەڵوێستە وەربگرن .سەیری: -

- S. R. Sonyel,Op.Cit., P.216-218 ; Rumbold to Curzon, Lausanne, 22-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 450, P. 778.

2- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 217.

3- Rumbold to Curzon, Lausanne, 14-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 513, P. 217.

4- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 217-.

5- Rumbold to Curzon, Laussane,18-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 527, P. 782.

6- Rumbold to Curzon, Lausanne, 2-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 491, PP. 759-761.

هەروەك چاوەڕێ دەكرا، عیسمەت پاشا ئەو داخوازییانەی رەتكردنەوە، سەرباری ئەوەی داوای قەرەبووی لە یۆنان كرد و گوتی بەبێ ئەو پارانە ناتوانێت بۆ ئەنقەرە بگەڕێتەوە، ئەوەشی بۆ رامبۆڵد لە چاوپێكەوتنی ١٧ی ئایار روونكردبووەوە[1]. لەبەرامبەر سووربوونی عیسمەت پاشا لەسەر داواكانی و هەڕەشەی یۆنان بە پاشەكشەكردن لە كۆنگرەكە، ئەگەر پرسی قەرەبووەكان چارە نەكریت، كە توركەكان داوایان دەكرد، بۆیە هیچ بۆ فەڕەنسییەكان و ئیتاڵییەكان نەمایە جگە لە دەستبەرداربوون نەبێت لە مافی داواكردنی قەرەبووەكان. ئەمەش وای لە عیسمەت پاشا كرد دەسەڵاتی خۆی ببەزێنێ و داوای قەرەبوو لە یۆنان بكات، بەمەرجێ یۆنان دان بە پابەندییە ئەخلاقییەكانی بە دانی قەرەبووەكان بنێ یان دەستبەرداری قەرەباغ بێت[2].

عیسمەت پاشا بە رازیبوونی یۆنان كاریگەربوو، چونكە ئۆپۆزسیۆنی ناوخۆی توركیا كە حسین رەئوف پاشای سەرۆكی ئەنجوومەنی نیشتیمانی توركی نوێنەرایەتی دەكرد، ئەمەی بە سازشێكی ناپەسند وەرگرت، بەڵام مستەفا پاشا لایەنگیری عیسمەت پاشای گرت، چونكە ئەو پاش پێویستی توركیا بۆ ئاشتی دەزانی[3].

بەریتانیا رۆڵێكی سەرەكی لە دۆزینەوەی چارەسەرێكی بۆ ئەو ململانێیەی كە بە قەرزەكانی عوسمانییەوە پەیوەست بوو، كە توركەكان سووربوون دەبێت سوودەكەی (فوائدها) بە فەڕەنكی فەڕەنسی بدرێت، بەڵام فەڕەنسا دەیویست بە جونەیهی ئیسترلینی بدرێت، بەمەش دەبوو توركەكان ٥ ملیۆن جونەیهی ئیسترلینی بدەن، ئەگەر بڕیار بدات بە فرەنكی فەڕەنسی بیدات، ئەوا دەكاتە ساڵانە نزیكەی ملیۆنێك و حەفسەد هەزار جونەیە[4]. بەمەش جیاوازی نێوان هەردوو لێكدانەوەكە گەورە بوو،، ئەمەش وایكرد پرسەكە مۆركێكی گرنگ لەلای توركەكان وەربگرێت، كە ئەو كات بۆ بونیادنانەوەی وڵاتەكەیان زۆر پێویستیان پێی هەبوو.

---

1- Rumbold to Curzon, Laussane,18-5-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 524, PP. 760-761.

2- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 217 .

3- Kemal Atatürk,A.G.E,SS.531-533.

4- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 217.



شانبەشانی سووربوونی عیسمەت پاشا بە داخوازییەكەی، توركەكان چەند جووڵانەوەیەك و ئامادەباشییەكی سەربازیان لە ئەنادۆڵ و ناوچەكانی دیكە كرد، پێشینەی ئەو جووڵانەوەشیان، دەستگرتینان بوو بەسەر جبەخانەی باندرما[1]. لەبەرامبەردا بەریتانیا ئامادەنەبوو رووبەڕووی توركەكان ببێتەوە نە ئەستەمبۆڵ و نە ئەنادۆڵ[2]. بۆیە رامبۆڵد داوای لە كریزن كرد كە یارمەتی بدات كە پرسەك بۆ بەرژەوەندی توركەكان چارەسەر بكات، كە ئەمەش وایان لێدەكات لەبارەی پرسی ئیمتیازە ئابوورییەكان ئاسان بن[3]، بەڵام رووداوەكان هەڵەبوونی ئەو مەزەندەیان بۆ هەڵوێستی توركەكان پێشاندا، دوای ئەوەی لە ٧ی تەمووزی ١٩٢٣ پرسی قەرزەكان كە لە بەشی دووەمی پەیمانی ئاشتی چارەسەر كرا[4]، بەرەو چارەسەركردنی كۆتایی پرسی ئیمتیازە ئابوورییەكان هەنگاویان نا، كە عیسمەت پاشا كەللەرەقی زیاتر لەوەی پێشتر پێشاندا.

پرسی ئیمتیازە ئابوورییە بەخشراوەكان بە بەریتانیا بەر لەجەنگەكە، كێشەیەكی دیكە بوو كە بەرۆكی بەرژەوەندییەكانی بەریتانیای لە كۆنگرەكە دەگرت، ئەو ئیمتیازانەش بە كۆمپانیای ڤیەكەر ئارمسترۆنگ درابوون، كە بە سەرمایەی بەریتانی كاری دەكرد، بەریتانیا داوای كرد قەرەبووی كۆمپانیاكە بۆ ماوەی ١٠ساڵ بكرێتەوە، یان دەسەڵاتی ئیمتیازی بۆ تازە بكرێتەوە[5]، بەڵام وەستانی ئەمریكا لەتەك توركیا و هەڕەشەكردنی بەریتانیا بەوەی كە بۆندێكی تاك لایەنە لەگەڵ توركیا دەبەستێ، ئەگەر بەریتانیا داخوازییەكانی بەدینەهێنێت، ئەمەش بەریتانیای ناچاركرد كە بۆ سیاسەتی(دەرگای كراوە)ی ئەمریكی چۆك بدات، لە ١٧ ی تەمووز سازشی كرد و لەسەر پرەنسیپی پێشبركێی یەكسان بۆ ماوەی ٥ ساڵانن بۆ قەرەبووی كۆمپانیای ڤیكەر ئارمسترۆنگ رازی بوو[6].

---

1- Rumbold to Curzon, Laussane,23-6-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.630, minute 2, P. 887.

2- S. R. Sonyel,Op.Cit., P. 219.

3- Rumbold to Curzon, Lausanne, 12-6-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 626, P. 885.

٤- لوزان صلح معاهدة نامه سی ...، ل ل١٨-٢٧ "

- Rumbold to Curzon, Laussane,17-7-1923,DBFP,I.Sir,Vol.18, No.672, PP. 960-966.

5- Harry. N.Howard, The Partition...,P. 312.

6- Ibid, P. 312.

عیسمەت پاشا لەسەر ئەمە نارەزایەتی پێشان نەدا، بەتایبەتی دوای ئەوەی فەرەنسا پاڵپشتی لە بەریتانیا کرد، سەرباری ئەوەش عیسمەت پاشا لەسەر بەندی دووەمی پرۆتۆکۆلەکەش رازی بوو کە جەختی لە قەرەبوو کردنەوەی خاوەن ئیمتیازەکانی دیکەی بە نەختینە و شمەك دەکردەوە، بەڵام ئەوەی بەریتانیا بۆ هیشتنەوەی "مافی شەرعی"ی کۆمپانیای نەوتی تورکی داوای کرد، عیسمەت پاشا بنبڕ رەتیکردەوە[١]، کە لەگەڵ ئیمتیازی جەستەر ناکۆك بوو[٢]. عیسمەت پاشا بەهۆی ئەو راسپاردانەی کە لە ئەنقەرەوە بەدەستی گەیشتبوون، هیچ سازشێکی پێشکەش نەکرد، ئەمەشی بەخۆی بۆ رامبۆڵد دووپاتکردبووە[٣]، رامبۆڵدیش لەلای خۆیەوە بەبێ پرسکردن بە حکوومەتەکەی ناوی کۆمپانیاکەی لە پەیمانەکە نەهێنا، بۆ ئەوەی بەریتانیا بە تیکدەری ئاشتی تۆمەتبار نەکرێت تاکو بەرژەوەندییەکانی بەدیبهێنرێت[٤]. بەمەش تورکیا سەرکەوتنێکی تازەی تۆمارکرد، سیاسەتی بەریتانی سەرکەوتوو نەبوو، هەتاکو نەیتوانی پارێزگاری بۆ کۆمپانیای نەوتی تورکیش بەدەستبهێنێت[٥]. کریزن دوای ئەوەی رەوش و هۆکاری رازیبوونی بە رێککەوتنەکە راڤەکرد، بۆ رامبۆڵدی نووسی[٦] "لەسەر روونکردنەوەکەت کۆکم و رازی بەوەی پرسکە وەك خۆی لێبگەرێی"[٧]. بەمەش هەموو پرسە هەڵواسراوەکان چارەسەرکرا و ئامادەبووانی لۆزان بۆ مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی ئامادەبوون.

---

١- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کۆمپانیای نەوتی تورکی سەیری:

- John A.DeNovo,Op.Cit.,PP.191-199.

2- Rumbold to Curzon,Lausanne, 17-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 677, PP. 955-960 ; Harry. N.Howard, The Partition...,P. 312.

3- Rumbold to Curzon, Lausanne, 19-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18,No. 980, P. 967.

4- Rumbold to Curzon, Lausanne, 17-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 667, PP. 959-960.

5- Erik J. Zuches,Op.Cit., P. 169.

6- Rumbold to Curzon, Lausanne, 19-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 680, minute, 8, PP. 967-969.

7- Rumbold to Curzon, Lausanne, 19-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 680, minute, 8, P. 969.



سێ لیژنەکە، لەماوەی ئەو کۆبوونەوەیەی کە لە نیوەڕۆی ١٧ ی تەمووز بەسترا، گەیشتنە رێککەوتن لەسەر هەموو پرسە هەڵواسراوەکان. جگە لە ئامادەکردنی دەقی سەرەکی پەیمانەکە و رێککەوتنە پاشکۆکانی بۆ واژوو کردنی، هیچی دیکە نەمایەوە[١]. لە رۆژی دوایی عیسمەت پاشا بروسکەیەکی وەرگرت کە دەسەڵاتی مۆرکردنی پەیمانەکەی پێدرابوو[٢]، بروسکەکە لە مستەفا کەمالەوە بوو، دەسەڵاتی پێ بەخشی و گوتی: "لەسەر دەسەڵاتدان بە مۆرکردنی پەیمانەکە رازیبووین، .....بەم سەرکەوتنەی بەدەستهێنا پیرۆزباییت لێدەکەین"[٣]. دوای ئامادەکردنی پەیمانەکە و دەسەڵات بەخشین، پەیمانەکە لەگەڵ ١٧ رێککەوتنی پاشکۆ لە دوای نیوەڕۆی ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٤ لە دانیشتنێك کە کارۆڵ شورەری سەرۆکی فیدرالیزمی سویسری، سەرۆکایەتی دەکرد، مۆرکرا[٤]. لە یەکی ئابدا لە ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی دەنگ بۆ پەیمانەکە درا، دوای گفتوگۆیەکی گەرم کە ژمارەیەك نوێنەر ژمارەیەك بەندی رێککەوتنەکەیان دژایەتی کرد، ٢١٣ ئەندام دەنگیان بۆ بەرژەوەندی رێککەوتنەکە داو ١٤ شیان رەتیانکردەوە[٥]. دواتریش عیسمەت پاشا لە ٢٤ی ئابدا بڕیارەکە بە هاوپەیمانان راگەیاند و بەریتانیا و هاوپەیمانان دەستیان بە چۆلکردنی خاکی تورکیا کرد و هێزەکانی تورکی چوونە شوێنیان[٦]. بە هاتنی ٢ی تشرینی یەکەم دوایین گەشتی گەلی بەریتانی ئەستمبۆلی بەجێهێشت. بەریتانیا لە پەسندکردنی پەیمانەکە دواکەوت، ئەمەش بەهۆی ئەو رەوشە ناوخۆیەی پێیدا گوزەری دەکرد[٧]، بۆیە تا ١٥ی نیسانی ١٩٢٤ پەیمانەکەی پەسند نەکرد، لە

---

1- Rumbold to Curzon, Lausanne, 19-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 980, P. 969.

2- Erik J. Zuches,Op.Cit., P. 169.

3- KEMAL Atatürk, A.G.E,S.533.

4- Rumbold to Curzon, Lausanne, 24-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 683, PP. 927-973.

5- Stanford J.and Ezel Kural Shaw, Op.Cit., P.368; S.R.Sonyel, Op.Cit., P. 225.

6- Rumbold to Curzon, Lausanne, 24-7-1923, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 683, minute. I,P.972.

٧- حکوومەتەکەی لوید جۆرج لەو ماوەیەدا توشی گرفتی ناوخۆیی گەورە ببووەوە، پرسی ئێرلەندا گەورە ببوو و شەر دەستیپێکردبووەوە، زۆربەی لایەکانی بەریتانیا مانگرتنی کرێکاری بەخۆیەوە بینی، رێوشوێنە ئابووریەکان دەرەنجامی پیچەوانەی لیکەوتەوە، دوای ئەوەی پەرلەمانی بەریتانی لە ١٩ تشرینی یەکەمی

٦ی ئابی ١٩٢٤ کاری پێکرا، کاتێ بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا و ژاپۆن لـە ١٥ی کـانوونی یەکەم رازیبوون پاشەکشەی دەریایی بکەن، بەمەش وادەکەیان ١٦ رۆژ پێشخـست، کـە بڕیـار بوو لە ٣١ی کانوونی یەکەم ئەو پاشەکشەیە بکەن[١]. بە مۆرکردنی پـەیمانی لـۆزان، تورکـەکان توانیـان زۆربـەی بەنـدەکانی میـساقی نیـشتیمانیان بـەدیبهینن،[٢] بەمـەش سیاسـەتەکەیان سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی بەسەر سیاسەتی دوژمنکارانەی بەریتانیا بەدەستهێنا، یـەکێك لـە دبلۆماسییە ئەمریکییەکان وای وەسفکرد کە "بەهێزترین گـورز بـوو بـۆ پێگـەی بـەریتانیای مەزن"[٣]، جۆزیف کرۆی چاودێری سیاسی ئەمریکی پەیمانەکـەی بـە "گـەورەترین سـەرکەوتنی دیپلۆماسی لە مێژوو" لەقەڵەمدا[٤]. فەیرۆز ئەحمەدی توێـژەری هینـدی پـسپۆڕ لـە کاروبـاری تورکی بە سەرکەوتن بۆ تورکەکان لەقەڵەمی دا "بەو پێیەی کە تاکـە گـەلن، دوای جەنگەکـە چوونە ناو دانووستاندنی تازەوە لەبارەی کۆمەڵێ پەیمانەوە...."[٥].

لە راستیدا پەیمانەکە زیانی گەورەی لەسەر بەرژەوەندییەکانی بـەریتانیا بەتایبـەتی و وڵاتـانی رۆژئاوایی بەگشتی هەبوو، ئەمەش لە لێدوانێکی کریزن هات کە گوتی: "ئەو رەوشەی ئێستا بـۆ بازرگانی و بازرگانانی بەریتانی... رەوشیکی پەسند نییە، هەروەها بەرژەوەندییـە بیانییـەکانیش بەهۆی ئەمەوە گرفتارە،..... دەبێت تورکەکان باجی کەللە رەقی و گەمژەییان بدەن..."[٦].

---

١٩٢٢ متمانەی لە حکوومەت سەندەوە، لوید جۆرج دەستی لەکارکێشایەوە، دوای ئەوەی پارتی پاریزگاران لە هەڵبژاردنەکان بردییەوە، بۆنارلۆ حکوومەتی پێکهێناو، دوای ماوەیـەك بـەهۆی تێکـچوونی تەندروسـتییەوە، دەستی کیشایەوە، ستانلی بالدۆین شوێنی گرتـەوە، ئـەویش زۆر لـە پۆسـتەکەی نەمایـەوە، پارتەکـەی لـەو هەڵبژاردنەی کە لە کۆتایی ١٩٢٣ کرا دۆڕا، رەمزی مەکدونالدی سەرۆکی پارتی کرێکاران بردییەوە. سەیری: محمد محمد صالح وآخرون، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٢١ — ١٢٢ .

1- Rumbold to Curzon, Lausanne,24-7-1923, DBFP, I.Sir, Vol.18, No.683, minute.I, P. 927“

- آلاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٠٩.

2- David McDowal,Op.Cit., P. 298.

٣- سحر عباس خضير، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٩.

4- H.B.Sharabi,Op.Cit., P. 37.

٥- محمد نور الدين، حجاب وحراب الکمالیة وازمات الهویة في ترکیا، بیروت، ٢٠٠١، ل ٣٢٣.

6- Introduction in: DBFP,I.Sir,Vol.18, P. 12.

# بابەتی کورد لە کۆنگرەی لۆزان

کێشەی کورد، وەك کێشەیەکی سەربەخۆ و دیاریکراو، پێگەیەکی لە خشتەی کاری لیژنە لاوەکییەکانی کۆنگرەی لۆزان وەرنەگرت، بەمەش کێشەی کورد هیچ شوێنێکی لە کۆنگرەی لۆزان نەبوو، هاوپەیمانان لەوەتەی ساڵی ١٩٢١ەوە "وازیان لە کورد هێنا بۆ چارەنووسی نادیار، بەکردەوە دەستبەرداری داخوازی مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەیی بوون بۆیان"[1].

دوای ئەوەی دانووستاندنەکانی لۆزان دەستیپێکرد، بەریتانیا وازی لە بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کە سنووری هەموو ناوچە کوردییەکانی لەخۆگرتبێ هێنا، بەڵکو تەنها ئەوەی بۆ گرنگ بوو کە ناوچە کوردییەکانی ویلایەتی موسڵ بە چوارچێوەی عێراق (دروستکراوی بەریتانیا) بلکێنێ، بەرژەوەندییەکانی ناچاریکرد کە پێکهێنانی "وڵاتی سەربەخۆی کوردان" لەو ناوچانە ئەستەم بێت[2]. بەر لەوەی تورك و بەریتانیا بچنە ناو دانووستاندن لەبارەی کێشەی موسڵەوە- کە بۆ یەکەمجار لە ٦ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ گفتوگۆکرا ـ هیچ شتیك بەناوی "کێشەی کورد" یان "دەوڵەتی کوردی" بۆ بەریتانیا نەما، کە بەرژەوەندییە تەکتیکییەکانی بەسەریدا سەپاندبووی کێشەی کورد لە سیڤەر وەربگرێت، سیڤەر بەکردەوە چارەنووسی نەتەوەی کوردی لە چوارچێوەی کوردستانی تورکیا دیاریکرد، هەروەها بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی بەسەریدا سەپاند کە پاڵپشتی لەو دەوڵەتە تازە دروستبووە -عێراق- بکات. دووەم، لە تورکەکان نزیك ببێتەوە و ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدیبهێنێت. زۆرێك لە یادداشتە ئاڵوگۆڕکراوەکان ئەو تەوەرە دەسەلمێنن، بەتایبەتی ئەو یادداشتەی کە هینری دوبسی نوێنەری باڵای بەریتانی لە بەغدا لە ١٩٢٢/١٠/٢ نووسیوویەتی و تێدا دەڵێت: "ئەگەر حکومەتەکەمان لێدوانێکی فەرمی بدات و رایبگەیەنێ کە بەریتانیا دەستبەرداری بەخشینی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بووە، ئەمە تورکەکان ئارام دەکاتەوە و دانووستاندنەکان لەبارەی پرسی سنوور ئاسان دەکات"[3].

---

١- م.س.لازاریف، المسألَة الكوردیة ١٩١٧-١٩٢٣، ل ل ٢٧٩-٢٨٠.

2- Colonial Office, Special Report … 1920-1931, P. 255.

3- Ismael Güldaş,A.G.E,S. 117.



بۆیە کاتێ پرسی دووبارە چاوخشاندنەوە بە بەندەکانی سیڤەر هاتە پێش، دەستبەرداربوونی بەریتانیا لە دروشمی "کوردستانی سەربەخۆ" یان "کوردستانی خاوەن ئۆتۆنۆمی" بەواتا بەکردەوە دەستبەرداربوونە لە پرەنسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس بۆ تەواوی نەتەوەی کورد[1]، بەریتانیا یەکەم وڵات بوو بیرۆکەی لکاندنی ویلایەتی موسڵی بە عێراقی عەرەبییەوە خستەڕوو، کە بە ویلایەتیکی کوردی دادەنرێت، کە ئالیەتەکانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر و زۆربەی شارۆچکەکەکانی موسڵ (دهۆك، زاخۆ، ئامێدی، سنجار،..... بەتەواوی کوردن[2].

بابەتی کورد و کێشەی کورد و کوردستان لە دوتوێی راپۆرتە تاك و سەربەخۆکاندا نەبوو، هەروەها لە دانیشتە سەربەخۆ و هەتاکو لە دانیشتنەکانی پەیوەست بە پاراستنی کەمینەکانیش وەك پرسێکی سەربەخۆ گفتوگۆ نەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەو بابەتانەی کە بۆ پرسی موسڵ خرانە روو لە چەند بڕگەیەك گفتوگۆی لەسەر کرا. گومانی تێدا نییە کە ئەو دانیشتنانە بۆ پرسی کورد تەرخانە نەکرابوون، بەڵام دەکرێت بگوترێت کە کێشەی کورد بووە بابەتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی وەك بەشێکی دانەبڕاو لە کێشەی ئاڵۆزی موسڵ باسکرا[3]. کێشەکانی کۆمەڵگەی کوردی و مافەکانی کورد گفتوگۆی لەسەر کرا، هەر لەسەرەتاوە ئەوە پێشاندرا کە کورد ئامرازیکی بەسوودی دەستی ئەوانەیە کە باش دەزانن بەکاریانبهێنن[4]. ئەو دانیشتنانەی کە بۆ گفتوگۆی پرسی موسڵ تایبەتکرابوو، وردەکاری گرنگی بۆ کورد لە خۆگرتووە[5]، توێژەرێکی تورك رەوشی ئەوسای کوردانی وەسفکرد و گوتی: "کوردان لەمیانەی گفتوگۆکانی لۆزان وەك (گۆڕاوێکی ناسەربەخۆ) بەهەموو مانایەکی ئەو وشەیە، مانەوە"[6]، واتا هەموو لایەك باسی کوردیان کرد، تەنها لەو دانیشتنانەی کە پرسی موسڵی تێدا گفتوگۆ کرا، جارێك باسی رەوشی کوردیان دەکرد و جارێکی دیکەش بەرگریان لە مافەکانیان دەکرد، ئەمەشیان بۆ پاڵپشتیکردن لە داخوازییەکانی خۆیان بوو نەوەك

---

١- م.س.لازاریف، المسألَة الكوردیة ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٠.

٢- جرجیس فتح الله المحامي، النفط قرر مصیر کوردستان السیاسي، مجلة الثقافة الکوردیة، العدد(٢)، لندن، ١٩٩٠، ل ١٧.

٣- م.س.لازاریف، المسألَة الكوردیة ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٠ .

4- Ismael Güldaş,A.G.E,S.97.

5- Lausanne Conference ..., PP. 340-402

6- Ismael Güldaş,A.G.E,S.102.

داخوازییەکانی کورد. کورد وەك گۆڕاو و ڕەگەزی گرنگ لەو گفتوگۆیانە مانەوە، کە جگە لە ئالۆزی ڕەوشەکە هیچی دیکەی بۆ کورد لێنەکەوتەوە.

ئەو دانیشتنە تەرخانکراوانەی پرسی موسڵ، چ زارەکی یان نووسراو بێت، ئەوانەی لە نێوان **٢٦** تشرینی دووەم تا **٢٦** کانوونی یەکەم سازکران، ئەو دانیشتنانە بوون کە کێشەی پەیوەندیدار بە کوردی تێدا گفتوگۆ کرا، عیسمەت پاشا[١] بیرۆبۆچونی تورکی لەبارەی پرسی موسڵ پێشکەشکرد، ئەو شانازی بەوەوە دەکرد کە زۆربەی دانیشتووانی ویلایەتەکە کوردن -و تورکن- هەروەك دواتر لەو داتایانەی پێشکەشی کردن روون دەبێتەوە[٢]. زیاتر لەمەش عیسمەت پاشا باسی لە ڕەگەزی کورد و ئایین و تایفە کوردییەکانیش بەبێ شەرمانە کرد[٣]، بۆنموونە رایگەیاند یەیزدیەکان کوردن، کە لەبارەیانەوە گوتی ئەوان جگە لەوەی پەیڕەوی لە گروپێکی جیابووەوە لە ئیسلام دەکەن، هیچیان لە کورد جیا نییە، هەورەوەها گوتی: هەردوو گەلی تورکی و کوردی دوو گەلی یەکگرتوون و بە داب و نەریت و پەیوەستی ئەتنی و بیروباوەڕ و ئارمانج بەیەکەوە گرێدراون. سەرباری ئەمانەش بەردەوام دەیگوت، حکوومەتی ئەنجوومەنی نەتەوەی تورکی بەقەد ئەوەی حکوومەتی کوردە حکوومەتی تورکیشە[٤]، هەروەها دەیگوت: "کورد لە کاتێ ئێستادا هەموو هەلێك دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی خواستی خۆیان بۆ وەستان لە پاڵ تورکیا دەرببڕن". هەروەها گوتی: "ئەو سەرکردانەی کە بەشداری

١- لەو شاندەی کە عیسمەت پاشا بۆ لۆزان سەرۆکایەتی کرد، دوو کوردی تیدا بوو، ئەوانیش بیرنجی زادە ی نوێنەری دیاربەکرد و زولفی بەگ ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی بوو، ئەوانە تەنها بۆ ئەوە هینرابوون تاکو بە بیری ئامادەبووان بهێننەوە کە " کورد و تورك بران" و "کورد نایانەویت، جودا ببنەوە......" ئامانجی عیسمەت پاشا لە هێنانی ئەمانە ئاشکرابوو، سەیری:

- زنار سلوبي، مسالَة كردستان، تنقيح وتقديم عزالدين مصطفى رسول، بيروت، **١٩٩٧**، ل **٧٢-٧٧** " عثمان علي، العامل الكردي في مسالَة الموصل، ل ٤. *www.alayislam.com*

- Ismael Güldaş,A.G.E,S.128.

٢- بۆ ئەو ئامارە تورکیانە سەیری:

- Lausanne Conference ..., P.340.

٣- دیفید ماکدوال، سەرچاوەی پێشووی، ل٤٠٠

4- Lausanne Conference ..., PP. 345-346.



جەنگی گەورە و جەنگی سەربەخۆییان کرد، سەرسورمانی و ڕێزیان بۆ ئەو خزمەت و قوربانیانە هەیە کە گەلی کورد بۆ پاراستنی سەلامەتی تورکیا و لە خەبات لەدژی سوڵتانی عوسمانی پێشکەشیان کردووە، هەیە"[١].

هەروەك ئەوە عیسمەت پاشا بە پاساوی کوردەوە داوای گەڕانەوەی موسڵی دەکرد، کریزنیش بەهەمان شێوە لەبارەی پرسەکە بەخۆشحاڵییەوە بە پاساوی کوردییەوە داواکەی عیسمەت پاشای رەتدەکردەوە، کریزن نزیکەی هەموو پاساو بەڵگەکانی عیسمەت پاشای لەبارەی کوردەوە بە نموونە و گەواهییەوە رەتدەکردەوە، تەنها شتێك کە لەگەڵ عیسمەت پاشا هاوڕابوو، ئەوەبوو کە کورد زۆرینەی ویلایەتەکە پێکدێنن[٢]. کریزن، عیسمەت پاشای ناچار کرد، ئەگەر بەرێژەیەکیش بێت کە واز لە بیرۆکەی تۆرانی بوونی کورد بهێنێت، ئەویش بە پێشکەشکردنی ئامارێکی بێ هاوتا لەبارەی کورد و تورکەوە. هەروەها کریزن لەبارەی ژمارە و ئەتنی کوردی ویلایەتەکە، کە عیسمەت پاشا پێشکەشی کردبوو رەتکردەوە و گوتی کورد لە ریشەی ئێرانی — میدین و لە تورکەکان جیاوازن[٣]، ئەوانە سەربەخۆ ژیاون و بەرگری دەستتێوەردانەکانی ئەستەمبۆڵیان کردووە، لەباشووری کوردستان هیچ کات دەسەڵاتێکی تورکی چالاك و کاریگەر نەبووە[٤]. هەروەها باسی لەوە کرد کە ئەگەر

1- Ibid,P.375.

٢- لە بارەی ئەو ئامارانەی هەردوولا پێشکەشیان کرد، سەیری:

- Lausanne Conference ..., P,P.341,355 "

- البرت م . منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٥٥

٣- کریزن بەتوندی تۆرانی بوونی کوردی رەتکردەوە و بەمشێوەیە لێدوانی لە بارەیەوە داو گوتی: "شاندی تورکی یەکەمین کەسن کە ئەوەیان بۆ مێژوو بەدیارخست کە ڕەگەزی کورد تۆرانی — تورکییە.....ئەو دۆزینەوەیە بەناوی ئەوانەوە تۆمار دەکریت.......". هەروەها گوتی: "من خۆم لە ناوچە کوردییەکانی بوومە و لەگەڵ کوردان ماومەتەوە، من وابەدیار ناخەم کە بوومەتە مەرجەع یان ژێدەر، بەڵام دەتوانم ئەوە وە ئەستۆ بگرم هەر رۆژیك لە رۆژان بیت، کورد لە تورك جیا بکەمکەوە، ئەوکاتەی کوێر بم ناتوانم جیاوازیان لە نێوان بکەم یان تێکەڵاویان بکەم". سەیری:

- Lausanne Conference ..., PP. 356-357-.

٤- دیفید ماکدوال، سەرچاوەی پێشووی، ل**٢٩٩**"

-Lausanne Conference ...,PP. 356-357.

کوردان یارمەتی هەر کەسێکیان دابێ ئەوە بۆ بەریتانیا بووە، هەروەها لەبارەی بوونی نوێنەری کوردی لە پەرلەمانی تورکی گوتی: "دەمەوێ بزانم چەند لەوانە خەڵکی باشووری کوردستانن؟ کەی هەڵبژێردراون؟ چۆن بووە؟[١]، هەروەها کریزن بەردەوام بوو و گوتی: "بەهەموو ئەو زانیاریانەی کە بەردەستدان، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کورد بە مێژوو و داب و کەسایەتی سەربەخۆیانەوە، دەبێت خودان ئۆتۆنۆمی بن[٢]. لەبارەی پێشنیازەکەی عیسمەت پاشا لەبارەی سازکردنی ریفراندۆم(راپرسی)، ئەوا کریزن بنبڕ رەتیکردەوە، چونکە کورد و تەواوی دانیشتووانەکەی داوایان نەکردووە، ئەمەش مافێکە، تەنها بۆ ئەوانە داوای بکەن[٣].

لە رۆژی دواتر پاساو و بەڵگەکانی هەردوو لا بۆ رازیکردنی بەشداربووانی کۆنگرەکە بە وەرگرتنی ویلایەتەکە، دووبارە بووەوە، خەسڵەتە دیارەکانی ئەو دانیشتنانە ئەوەبوو، کە پەیوەستبوون بە کۆمەڵگەی کوردییەوە، کە گفتوگۆکانی زۆربەی جار دەبوون بە گفتوگۆکردن لەبارەی پرسی کوردەوە[٤]، بەڵام خواستی هەردوو ئەوەبوو کە خۆیان لە کورد ببوێرن[٥]. ئەوە

1- Ibid,Op.Cit., P396.

2- Ibid,Op.Cit., P357.

٣- ئەوەی سەرنجڕاکێشە لێرەدا ئەوەیە کە تورك ترسێکی جیدیان لە ئەگەری راپرسیەکە نەبوو، کە لەوانەیە دامەزراندنی وڵاتیکی کوردی لێبکەوتابووایە، ئەمەش ئەگەرێکی ماقول بوو، لەوانەیە یەکێك لە هۆیەکانی ئەمەش بۆ ئەوە بگەرێتەوە کە تورکان باش لەوە گەیشتبوون کە نەتەوەخوازانی کورد نا یەکگرتوون و دەستەیەکی بچووکن لە شاری سلێمانی گیریانخواردووە، سەرکردە هۆزەکییەکانیش لەرووی ملکەچیەوە پەرت بوون. لەلایەکێ دیکەوە تورك خۆیان ئامارێکی زیادەرەویان لە بارەی ژمارەی تورکمانی ویلایەتەکە هەبوو، سەیری:

- عثمان علي، العامل...، ل ٨.

4-Lausanne Conference ...,P.117.

٥- عیسمەت پاشا پێشنیازی کرد کە بەر لەوەی پرسەکە بخرێتە بەردەم بەشداربووانی کۆنگرە، بە تەنها لەگەڵ کریزن دابنیشێت، کریزن پێشوازی لەمە کرد، چونکە هەردوولا نەیان دەیوست پرسەکە پەرەبسەنێ و خاڵی لاوازیان بەدەرکەویت، ئەمەش پاشەکشەی بە پرسی کورد کرد، تەنها لەبەر ئەوەبوو هەردوو لە پابەندییەکانیان لەبەرامبەر ئەو کێشە رابکەن. سەیری:

- Ismael Güldaş,A.G.E,S.129;Lausanne Conference ..., P.339.



تێبینی دەکرێت کە لەم دانیشتنانە زارەوەکانی وەك "کورد" و "کوردستان" و "نوێنەرانی کورد" و "گەلی کورد" و "ئۆتۆنۆمی کوردی" و ........, بە زۆری لەلایەن هەردوو شاندەکە بەکاردەهات، هەردوولای ململانێکە ویستی لایەنی سەرەکی کە گەلی کوردە وەرنەگرت[١]. هیچ یەکێك لەم دوو لایەنە نە باسیان لە مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەیی کورد کرد و نە باسیان لە بەخشینی ئەو مافانە کرد کە لە سیڤەر بەڵێنیان دابوو، لەکاتێکدا تورکیا هەر لە بنەڕەتەوە نکۆڵی لەو جۆرە کێشەیە دەکرد، هەڵوێستی بەریتانی بەرامبەر کورد و نوێنەرەکانیان تەنها لە "سۆزی ئەفلاتوون" کورتکرابووەوە[٢]. هیچ لایەك لەدەرەوەی کێشەی موسڵ باسیان لێوە نەکرد، سەبارەت بە بەریتانیا کە بەرگری لە کورد و مافەکانیان و پەرەدان بە زمانیان دەکرد و موزایەدەی بەسەر عیسمەت پاشاوە دەکرد، بەوەی کە بەریتانیا پاڵپشتی لە بەخشینی رەوشیکی تایبەت بە کوردان دەکات و مافی پێکهێنانی ئیدارەیەکی زاتی بۆ کورد لە ویلایەتی موسڵ دەکات، لە گفتوگۆی مافی کەمینەکان و پێویستی رێزگرتن لە تایبەتمەندیەکانی گەلی کوردی لە باکووری کوردستان هیچ باسی کوردی باکووری کوردستان نەکرا، کریزن ملکەچی داواکەی عیسمەت پاشا بوو لەبارەی ئەوەی کە کوردی باکوور نەخریتە ناو لیستی کەمینەکان، دوای ئەوەی مستەفا کەمال لێدوانی داو گوتی "رەتمانکردەوە ئەو پرسە بخرێتە خشتەی کاری کۆنگرەکەوە"[٣]. لەلای خۆیانە عیسمەت پاشا رایگەیاند کە کورد چارەنووسی نەتەوەییان بە ویستی خۆیان بە ئیدارەی تورکی لێگەڕاوە، تاکو بڕیاری لێبدات. سەرباری ئەوەی کوردی بە تۆرانی لە قەڵەمدا بەڵام نەوێرا نکۆڵی لە "بوونی کورد" بکات، بەڵکو جەختی لەوەکردەوە کە تورك و کورد مافەکانیان و ژیانی هاوبەشیان بە ویستی خۆیان پیادە دەکەن، بەڵگەی ئەمەش بوونی نوێنەرانی کوردە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی تورکی[٤].

لەو قۆناغەدا بەریتانیای دەوڵەتی مەزن، گەلی کوردی فەرامۆش کرد و کێشەی کوردی وەك کێشەی گەلێك کە پێویستی بە چارەسەرێکی سیاسی هەیە وەرنەگرت، تەنها رۆڵی سۆز

١- فؤاد ساكو، الاسس القانونية لحق الشعب الكوردي في تقرير المصير، ديترويت، ١٩٨٧، ل ١٤٧.

٢- م.س.لازاريف، المسالَة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٨.

٣- م.س.لازاريف، المسالَة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٨.

4- Ismael Güldaş,A.G.E,S.118.

پێشاندان بەرامبەر کوردی دەبینی[1]. بەریتانییەکان لە لۆزان بەتەواوی دەستبەرداری ئەو شێوازە بوون کە لە سیڤەر بەکاریهێنا، کە زاراوەکانی کورد و کوردستانی بە ئازادی بەکارهێنا، بەڵام بەبێ ئەوەی لەسەر دامەزراندنی ئیدارەیەکی کوردی سوربن، لە راستیدا لەو ماوەیەدا هیچ شتیك بەناوی "کێشەی کورد" نەمایەوە[2]. بەمشێوەیە مافی بڕیاردانی چارەنووس کە بەریتانیا دوای جەنگەکە دانی پیانابوو و بەرگری لێکردبوو، لەلایەن خودی بەریتانیاوە هەڵوەشاوە، کێشەی کورد لە چوارچێوە دەوڵەتیەکەی بۆ چوارچێوەی ناوخۆیی ئەو وڵاتانەی کە نەتەوەی کوردیان بەسەر دابەشکراوە، گواستراوە.

شانبەشانی ئەمەش بەریتانییەکان رێچکەیەکیان گرت، کە گومانی لای تورکەکان لەبارەی هەوڵەکانی بەریتانیا بۆ ئەنجامدانی شتێك بۆ نەتەوەی کورد نەدەهێشتەوە، ئەویش بە هەڵبژاردنی رێگاچارەی ستراتیژی تورکی بەسەر رێگاچارەی تەکتیکی کورد، بەمەش زامنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لەسەر حسابی بەدیهێنانی خواستەکانی گەلێك کرد کە لەژێر دەسەڵاتی تورکی دەیناڵاند[3]. بەریتانیا بەهیوا بوو پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ تورکیا بونیادبنێتەوە، ئەو تورکیایەی کە رۆژئاوای بۆ ئاراستەی داهاتووی خۆی هەڵبژارد، دەکرێت لەبارەی موسڵەوە بگەنە رێککەوتن ئەگەر کێشەکە بگاتە ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان وە باقی کێشە هەڵواسراوەکانی دیکە. لە کۆتایی ئاشتەوایی دێتە و دواتریش چارەسەری کێشەی موسڵ لەنێوان هەردوولا دەکرێت، کاتێ بڕیاردرا سنووری نێوان عێراق و تورکیا دیاری بکرێت، لە بەرواری جێبەجێکردنی پەیمانەکە بە رێگایەکی دۆستانە لە نێوان تورکیا و بەریتانیا، کاتێ نەگەیشتنە چارەسەر کێشەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزدەکرێتەوە[4].

١- م.س.لازاریف، المسالَة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٨" حامد محمود عیسی، القضیة الکوردیية في ترکیا، ل ١٨٠.

٢- لە بروسکەیەکدا کە کریزن لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ بۆ هەریەکە لە Pipes ی نوێنەری بەریتانیا لە پاریس و Grehem نوێنەری بەریتانی لە رۆما ناردی باسی لەوە کردبوو کە "ئیستا شتیك لە تورکیا نەمایە بەناوی دەوڵەتی کوردییەوە یان کوردستان خودان ئۆتۆنۆمی، هەروەك ئەوەی لە پەیمانی سیڤەر پێشنیاز کرابوو......" . گواستراوەتەوە لە:

- Ismael Güldaş,A.G.E,S.117.

3- Ismael Güldaş,A.G.E,S.118.

٤- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ل٣٦-٣٧.



لێرە بەدواوە، دووبارە کێشەی کورد کە کێشەیەك بوو لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیەوە دانی پیانرا بوو کۆمەڵەی نەتەوەکان پەسندی کردبوو، بۆ پرسێکی لۆکاڵی هەر وڵاتێك کە کوردستانی بەسەر دابەشکراوە گۆڕا، ئەو وڵاتانەش بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆیان وەك کێشەیەکی ناوخۆی تایبەت مامەڵەی لەگەڵ دەکەن[1].

پرسی موسڵ لەلایەك بە پەنهانی وردەکانی داهاتووی کوردی لەخۆگرتبوو[2]، لەلایەکی دیکەشەوە ئەوەی لە کۆنگرەی لۆزان لەبارەی کورد باسکرا، بۆ تەواوی پرسی کورد نەبوو، بەڵکو بۆ پرسی کوردی عێراقی خاوەن قەوارەی نوێ بوو[3].

عیسمەت پاشا بە توندی قسەکردن لەبارەی ئەنادۆڵ رەتکردەوە، هەرچی بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی بوو، هیچ نارازیبوونێکیان لەمبارەیەوە پێشاننەدا، دەبوو پرسی موسڵ لە چوارچێوەی پرسی کەمینەکان باسبکرێت، کە لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ وەك کەمترین رێوشوێن بۆیان، قەسەی لەبارەوە کرا. کریزن ویستی ئەو پرسە وەك فشاریك بۆسەر تورکەکان لە کۆنگرەکە بەکاربهێنێت، وتارێکی پێشکەشکرد و هاوسۆزی لەبارەی ئەو کەمینانەوە پێشاندا و هانیدان کە دەبێت ئەوانە "بوون و مانەوەی سروشتیان" زامن بکرێت[4]. هەورەها وڵاتانی ئەوروپی دیکە هەوڵیاندا دەست لە پرسەکە وەربدەن، بەڵام ئەوانیش سەرکەوتوو نەبوون[5]. عیسمەت پاشا لە وەڵامی کریزن وتارێکی هاوشێوەی پێشکەشکرد و ئەو دەستتێوەردانەی وڵاتانی ئەوروپی بە پاساوی پارێزگاری لە کەمینەکانی بە بەهێزترین فاکتەری خێرا لەناوبردنی دەوڵەتی عوسمانی لەقەڵەمدا[6].

لە راستیدا نە بەریتانیا و نە هاوپەیمانانی سورنەبوون لەسەر وەرگرتنی مافی کەمینە نەتەوەکان بە کوردیشەوە لە تورکەکان، بەڵام بۆ وەدەستهێنانی سازشی زیاتر لە تورکەکان هەر تەنها ئاماژەیان بەو مافانە دەکرد، بۆیە دوای ئەوەی عیسمەت پاشا توند بوو لەبارەی پرسەکە

١- م.س.لازاریف، المسالَة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٠.

2- Ismael Güldaş, A.G.E, S.103.

٣- م.س.لازاریف، المسالَة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٨.

٤- آلاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٧٧.

5- Curzonto Crowe, Lausanne, 13-12-1922, DBFP,I.Sir,Vol.18, No. 274, P. 387.

٦- آلاء حمزة الفتلاوي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٧٩.

بەشداربووانی کۆبوونەوەکە پرسی کوردیان فەرامۆش کرد[١]. هەروەها پرسی ئەرمەنیش پشتگوێخرا[٢]. عیسمەت پاشا رایگەیاند کە هەموو کەمینە موسڵمانەکان لە تورکیا لە ژێر پارێزگاری تورکەکان دەبن[٣]. رەزا نور نوێنەری تورکیا لە لیژنەی کەمینەکان سووربوو لەسەر ئەوەی دەبێت کورد لە ریزی ئەو گەلانە دەربهێنریت کە پێویستیان بە پارێزگاری هەیە[٤].

بەمشێوەیە لەبەردەم فشۆڵی بەریتانیا و هاوپەیمانان لە بەرووخستنی کێشەی کەمینەکان لە پەیمانی ئاشتی، تای تەرازووەکە بۆ لای تورکەکان قورس بوو، تاکە کەمینەیەکی نەتەوەیی کە لە لۆزان دانی پیانرا، کەمینەی یۆنانی بوو[٥]. ئەمەش بە ترسناکترین سازش دادەنرێت کە بەریتانیا بۆ تورکەکانی کردبێت.

لەبەرامبەر ئەو هەڕەشە و پەرەسەندنە گەورە و یەکلاکەرەوانەدا، لە تەواوی ماوەی بەستانی کۆنگرەکە و دوای مۆرکردنی پەیمانەکەش،گەلی کورد و سەرکردەکانی، ئەوەندە وەلامدەرەوە و کاریگەر نەبوون لەبارەی داهاتووی سیاسیان، بە پێچەوانەوە چاوەڕوانکراویش نەبوو،[٦] رۆژنامەی (رۆژی کورد)[٧] لە ژمارەی ٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٢ گومانی "لە نەبوونی نوێنەری کورد لە کۆنگرەکە دەربڕی.....بۆ زانین ویلایەتی موسڵ ویلایەتیکی کوردییە، بەلام سەیر ئەوەیە کە تورك و عەرەب و هەتاکو کەمینەی بچووکی وەك کریستانەکان لە لۆزان شەڕی لەسەر دەکەن...."[٨]. سەرکردەکانی کورد نەیانتوانی بە جیدی

١- م.س.لازاریف، المسألة الكوردية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٨٨.

2- Mim K.Oke,The Armenian Question: 1914-1923,Graet Britain, 1988, P.202 ff.

3- Ismael Güldaş,A.G.E,S.120.

٤- م.س.لازاریف، المسألة الكوردية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٩٠.

٥- المصدر نفسه، ل ٢٨٨.

6- Ismael Güldaş,A.G.E,S.120.

٧- رۆژی کورد: رۆژنامەیەکی سیاسی زمان حاڵی حکوومەتەکەی شێخ مەحمود بوو لە سلێمانی لە ماوەی نێوان (١٩٢٢- ١٩٢٣) دەرچووە، مامۆستا نوری بەرێوەی دەبرد و دەریدەکرد، سەیری:

- رژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحموود، ئامادەکردنی رەفیق ساڵح، لەسەر نووسینی سەدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٦.

٨- روژی کوردستان، جريدة، العدد ٦، السلیمانیة، ٩کانون الثاني، ١٩٢٣ لە رۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحموود....



رۆڵی خۆیان لە داواکردنی مافەکانی کورد بگێڕن، هەروەها نەیانتوانی گەلی کوردی کە هەر لەبنەماوە بە دواکەوتەیی بەهۆی داگیرکاری عوسمانییەوە ئەستۆی گران بوو، بۆ ئەو رەوشە ئامادە بکەن[١]. ئەوانە لەبەرامبەر بەرپرسیارێتییەکی گەورەدابوون لەبەرامبەر گەل و مێژووەکەیان، دەبوو چارەسەری کێشەی کورد بچەسپێنن، کە خۆی لە بنەماوە وەك رەوشیك بوونی هەبوو، توێژەرێکی تورکی لەمبارەیەوە دەڵێت: "نوێنەرانی کورد ئەوانەی کە ئەو کات کاریگەریان لەدەستدابوو، هیچ هەوڵێکیان بۆ سەردانی کۆنگرە نەکرد"[٢].

لە رێککەوتنەکە بە روونی هیچ باسی کورد، یان مافەکانیان نەکرا، هەروەها باسی چۆنیەتی زامنکردنی مافە سیاسی و یاسایی و کلتورییەکانیشیان نەکرا، هەتاکو لە بەندی پاراستنی کەمینەکان و هیچ بەڵگەنامەیەکی فەرمی دیکەی پەیمانکە ناویان نەهێنرا[٣].

ماددەی سێیەمی پەیمانەکە راستەخۆ کوردستانی دەگرتەوە، سنووری سوریای لەگەڵ تورکیای راستەخۆ دیاریکرد، ماوەی ٩ مانگی بۆ دیاریکردنی سنووری تورکی — عێراقی دیاریکرد[٤]، بەلام ئەو ماددەیە سنووری لەسەر بنەمای رەوشی ئێستا دیاریکرد، بەمشێوەیە پەیمانی لۆزان سەرلەنوێ کوردستانی بە شەرعی دابەشکردەوە[٥].

ماددەکانی (٣٧-٤٥) ی بەشی سێیەمی پەیمانی لۆزان، بۆ پاراستنی کەمینەکان[٦] تەرخانکرابوو، وەك دەردەکەوێت بەندو بڕگەکانی پەیوەست بە کەمینەکان زۆربوون، بەلام بە

١- فؤاد ساکو، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٢.

٢- ئەو توێژەرە باس لەوە دەکات کە ......هەتاکو ئەگەر ئەمەش روویبدابا، ئەوا ئەو سەردانەیان کارێکی زۆر سەخت دەبوو، چونکە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئامادەنەبوون دەنگی نەتەوەخوازانی کورد بگەیەنن، هەروەها کەس نەیدەویست خەبات بۆ کوردان بکات، بەریتانیا و هاوپەیمانانی لەم دوایەدا قسەکەری بۆ دانان، ئەو قسەکەرانەش (حکوومەتی ئەنقەرە)بوو، سەیری:

- Ismael Güldaş,A.G.E,S.122.

٣- زنار سلوبی، سەرچاوەی پێشو، ل ٧١ .

- محمد رەسول هاوار، کورد و باکووری کوردستان لە دوای شەری یەکەمی جیهانییەوە هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید پیران، سلێمانی، ٢٠٠٢، بەرگی ١، ل ل ٢٤٤-٢٤٥.

٤- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل٣٦-٣٧.

٥- محسن محمد المتولي، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٤" حامد محمود عيسى، القضية الكوردية في تركيا، ل ١٨١.

٦- لوزان صلح معاهده نامه سی...، ل ل١٥-١٦.

کوردەوە پەیوەست نەبوون، چونکە هەر لە بنەماوە تەنها بۆ کەمینە نامولسمانەکان دانرابوون، ئەمەش بە سروشتی کورد ناگرێتەوە، چونکە هەر لە بنەماوە بۆ پاراستنی کریستان و جووەکانی ناو تورکیا دانرابوون[1]. هەرچی لەبارەی کورد و کوردستان لە پەیمانی لۆزانەوە هاتبێت، ئەگەر بەروونیش ئەو دوو ناوەی نەهێنابێت، ئەوەیە کە لە بەندی تایبەت بە کەمینەکان لە ماددەی (٣٨) بەمشێوەیە هاتووە: "حکوومەتی تورکی بەڵێن دەدات، کە ئازادی خەڵکی تورکیا زامن بکات بەتەواوی، بەبێ لەبەرچاوگرتنی شوێنی لەدایکبوون و نەتەوەو زمان و رەگەز و ئایینیان". هەرچی ماددەی (٣٩) ی پەیمانەکە بوو بەمشێوەیە هات: "هیچ رێگریەك لەبەردەم هیچ یەکێك لە خەڵکی تورکیا دانانریت، لە گرتنی پەیوەندی یان بازرگانی یان ئایینی یان هەرجۆرە چاپەمەنی و بڵاوکراوەیەك یان کۆبوونەوە و چاوپێکەوتن و بەهەر زمانێك بێت، هەرچەندە زمانی فەرمی وڵات تورکییە، بەڵام دانیشتووانی تورکیا ئەوانەی بەزمانی تورکی قسە ناکەن، دەتوانن بە زمانی دایکیان لە دادگاکان قسەبکەن و ئاسانکاریان لەمبارەیەوە بۆ دەکرێت"[2].

بەمشێوەیە عیسمەت پاشا دوای دانوستانێکی درێژ بە زیرەکی و لێهاتوویی خۆی لە فرتو فێڵ نواندن سەرکەوتوو بوو لەوەی کە هیچ ئاماژەیەکی راستەوخۆ لەو رێککەوتنە نوێیەکەدا بۆ کورد یان هەر کەمینەیەکی دیکە بۆ مافەکانی بەشێوەیەکی روون و بەزمانێکی دیار نەکرێت[3].

بەمشێوەیە کێشەی کورد کە پێکهاتەیەکی پەسندکراوی کۆمەڵەی نەتەوەکان و داننانی نێودەوڵەتی بوو، دووبارە و سەرلەنوێ بوو بە کێشەیەکی ناوخۆیی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە[4].

---

١- فؤاد حمه خورشيد، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٢.

٢- لوزان صلح معاهده نامه سی....، ل ١٦

- عزيز شمزيني، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٤-٨٥

- إسماعيل بيشكجي، النظام...، ل ١٣٤

- ديفيد ماكدوال، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢٩٩.

٣- مجيد جعفر، كردستان تركيا دراسة اقتصادية اجتماعية سياسيية تحت التخلف الاستعماري، مطبعة اميرال، بيروت، د.ت، ل ٢٨٤

4- Ismael Güldaş,A.G.E,S.123.



بە گوێرەی دەقی رێککەوتنە نوێیەکە، ئەو زەویانەی کەوتوونەتە بەردەستی هێزەکانی تورکی وەك بەشێکی دەوڵەتی نوێی تورکی دانی پیانرا[1].

لەسەر ئاستی پەیوەندییە ئاڵۆگۆڕکراوەکانی نێوان تورکیا و رۆژئاوا، ئەوا کێشەی کورد بە شێوەیەکی فەرەمی بەلاوەنرا، پەردە لەسەر کێشەی کورد لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لابرا ـ بەکاتێ ـ ئەو کێشەیەی کە بووە هۆی ئازار و مەینەتی بۆ کورد، بەبێ ئەوەی یەك وشە لەبارەی چارەنووسی گەلی کورد بگوتریت، قۆناغیکی نوێ لە مەینەتییەکانی کورد دەستی پێکرد[2].

باسین نیکیتنی توێژەر پەیمانی لۆزانی بەشێوەیەکی بابەتی لە دیدەگای یاسای نێودەوڵەتی هەڵسەنگاند و بە "هەنگاوێك بۆ دواوە" و بە "رووداوێکی دوژمنکارانەی بۆ کورد"[3] لەقەڵەمدا، کە زیانێکی زۆری بەمافەکانی گەلی کورد گەیاند، بە داهێنانی بارێکی وا کە کوردستان یاسایی دووبارە دابەشبکرێتەوە، دوای ئەوەی هەڵوێستەکانی بەریتانیا و تورکیا میانەی پرسی موسڵەوە گرنگیان بە پرسی کورددا[4].

ئیسماعیل پێشکچی توێژەری تورکی پەیمانی لۆزانی بە "گرێبەستێکی ئیمپریالی بۆ دابەشکردنی کوردستان لەقەڵەمدا.....بۆیە ئەو پەیمانە بۆ کورد و تورك گرنگییەکی جیای هەیە، بۆ تورکەکان واتا دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی تورکی، ئەو پەیمانە بۆ ئەو دەوڵەتە چەندەها زەمانەتی دەستەبەرکرد، بەڵام بۆ کورد چەوساندنەوە و کۆیلایەتی و داگیرکاری بۆ کوردستان هێنا، کوردستانی ملکەچی رژێمی کۆنۆلیالی نێودەوڵەتی کرد"[5].

حەسرەتیانی توێژەری رووسی پەیمانەکەی بە گورزێکی کوشندە بۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی دایە قەڵەم، ئەو پەیمانە مافی ئەوەی بە تورکەکان دا کە خواستەکانی گەلی کورد فەرامۆش بکات و بزووتنەوە نەتەوەییەکەی لەپێناو سەربەخۆیی سەرکوت بکات[6].

---

١- مجيد جعفر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٤.

2- Ismael Güldaş,A.G.E,S.124.

٣- من: م.أ.حسرتيان، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٧.

4- Ismael Güldaş,A.G.E,S.126.

٥- كوردستان مستعمرة دولية، ترجمة زهير عبد الملك، ستوكهولم، ١٩٩٨، ل ٤٠.

٦- م. حسرتيان، القضايا القومية....، ل ٤٧.

تۆینبی بەمشێوەیە لێدوانی لەبارەی ڕێککەوتنەکەدا و گوتی: "لە کۆتاییدا بە گوێرەی ئەوەی لە میساقی نیشتیمانی تورکی بانگەشەی بۆکراوە، ئەو زەویانەی کە کورد تێدا نیشتەجێببوون بۆ تورکەکان وازی لێهێنرا"، بە کورتی ئەو پەیمانە هەموو داخوازییە نەتەوەییەکانی تورکەکانی بەدیهێنا بە ڕەزامەندی هاوپەیمانان[1].

کۆنگرەی لۆزان بۆ کورد کۆنگرەی نێودەوڵەتی تایبەت بە دابەشکردنی کوردستان بوو[2]، سەرباری ئەم دابەشکردنە، کۆنگرەکە بەندەکانی پەیمانی سیڤەری تایبەت بەکوردی ڕەشکردەوە. بەمەش نەخشەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەو دەوڵەتە کوردییەی کە بڕیاربوو لە تەك دەوڵەتی عەرەبی دابمەزرێ بەخۆیەوە نەبینی، کە بەریتانیا یارمەتی دامەزراندنی دەوڵەتی عەرەبی و تورکیدا، بەمەش چوارەم گروپی ئەتنی ناوچەکە لە رووی سیاسی و ئەتنی و جوگرافیەوە، دابەشکرا و هەر بەشە لەرووی جوگرافییەوە بەو وڵاتەی دراوسێی کوردستانەوە تێکەڵاوکرا، ئەم ڕەوشە نوێیە سیاسەتێکی تازەی بەرامبەر کورد هێنایە پێش، ئەویش سیاسەتی هاوکاری هەرێمایەتی و ستراتیژی نێوان ئەو وڵاتانەی کوردستان و کوردیان بەسەر دابەشکراوە، بەئامانجی ڕێگەگرتن لەهەر هەوڵێك بۆ زیندوکردنەوەی بیرۆکەی کوردستانی سەربەخۆ دەدریت[3].

بەمەش پەیمانی لۆزان چارەنووسی سیاسی کوردی دیاریکرد، دوای ئەوەی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیای مەزنی دیاریکرد، ئەو چارەنووسەش لەمیانەی پرسی موسڵەوە دیاریکرا، هەروەها وێنایەکی لەبارەی داهاتووی سیاسی کوردیش پێشاندا، بەوەی بۆ یەکەمین جار کورد سەربەو وڵاتانەن کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، کوردی عێراقی کوردی تورکیی.

بۆ بەریتانیا ئەوا بەرژەوەندییەکانی لەو قۆناغە لەمیانەی سیاسەتی قۆناغ بە قۆناغ بەرامبەر پرسی کوردی بەدیهێنا، ئەمە سەرباری ئەوەی ڕەوتی نەتەوەیی کوردی میانڕەوی بەلارێدا برد، ئەوا سەرلەنوێ پلانی بۆ بەکارهێنا نی پرسی کورد داڕشت تاکو ئەوەی ماوەتەوە لە بەرژەوەندییەکانی بەدیبهێنێت، ئەگەر قۆناغی سیڤەر تا لۆزان بەسەریدا سەپا بێت، واز لە پرسی کورد بێنێت، ئەوا قۆناغی داهاتوو بەسەریدا سەپاند کە لەلایەك ئامرازێکی چالاك بۆ ناچارکردنی تورکیا بدۆزیتەوە، بۆ ئەوەی بە کاروباری ناوخۆیەوە خەریکی بکات، لەلایەکی دیکەشەوە دەرگای دۆستایەتی و ئاساییکردنەوەی نێوان تورکیا و وڵاتانی ڕۆژئاوا بکرێتەوە.

---

1- A.J.Toynbee,Op.Cit., P.492.

٢- فؤاد حمە خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٣.

٣- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ل١٤-١٥ " فؤاد حمە خورشید، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٤.

# دانووستاندنەکانی بەریتانیا- تورکیا لە کۆنگرەی قوستەنتینییە

# (ئایاری ١٩٢٤ـ ئابی ١٩٢٤)

پەیمانی لۆزان پرسی موسڵی بەبێ چارەسەری هێشتەوە، بەڵام زامنی دانووستاندنی کرد بۆ هەردوولاکە تاکو بگەنە چارەسەرێکی کۆتایی بۆ پرسەکە، لە ڕێگەی دانووستاندنی دوو قـۆڵی. ئەگەر لەمەدا سەرنەکەون کێشەکە ڕەوانەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەکرێت[1]. بڕیـاری کۆمەڵـەی نەتەوەکان هەردوو لاکەی لە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکی سەربازی یان ناسەربازی بـۆ گـۆڕینی ڕەوشی ئێستا لەو خاکانەی ناکۆکیان لەسەرە، قەدەغە دەکرد[2].

لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ دوایین سەربازی هێزی هاوپەیمانان خاکی تورکی جێهێشت، هەمان ئەو ڕۆژە بوو کە حکوومەتی بەریتانی (نـەفل هیندرسـونی) هەڵـسوڕێنەری کاروبـاری بەریتانی لە تورکیای ڕاسپارد کە دەرگای دانووستاندنی ڕاستەخۆ لەگـەڵ تورکـەکان بکاتـەوە، لەم چوارچێوەیەدا نەفل یادداشتێکی بە حکوومەتی تورکی دا و ئاماژەی بۆ ماددەی سـێیەمی پەیمانی لۆزان کرد[3].

---

1- Report by His Majesty's Government on the Administration of Iraq for the Period April 1923-December 1925, Issued by Colonial Office, London, 1925, P.23.

٢- ریاض رشید ناجي الحیدري، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٠.

٣- مادەی سییەم پەیوەست بوو بە سنووری تورکیا لەگەڵ هەریەکە لە عێراق و سوریاوە، مادەکە کرا بوو بـە دوو بەشەوە بەشی یەکەم بۆ دیاریکردنی سنوور لەگەڵ سوریا، بەڵام بەشی دووەم پەیوەست بو بە سنوور لەگـەڵ عێراق، دانی بەوە نابوو کە هێڵی سنووری نێوان تورکیا و عێراق بە ڕێککـەوتنی دۆسـتانەی نێـوان تورکیـا و بەریتانیای مەزن لەماوەی ٩ مانگدا دیاری دەکرێت، لەبارێکدا ئەگەر دوو حکوومەتەکە لەماوەی دیاریکراودا نەگەیشتنە ڕێککەوتن، ئەوا کێشە کە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزدەکریتەوە. سەیری:

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 496;

- فاضل حسین، مشكلة ...، ل ٣١٨.



ئەو دانووستاندنە سەرەتاییانە لەنێوان هندرسن و عەدنان بەگی نوێنەری تورکی ماوەیەکی درێژی خایاند، هۆکاری ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە هەردوولا دەیانویـست ڕەوشـی بـاو بـۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن، جا چ ناوخۆیی بێت یان دەرەکی.

سەبارەت بە بەریتانیا کە ئیدارەکەی لە عێراق ڕووبەڕووی گرفتی گەورە ببـووەوە، بـەهۆی دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنی ناوخۆ بـۆ سیاسـەتەکانی و بەتایبـەتی پـەیمانی ١٩٢٢ کـە دەیویـست پەسندی بکات، بەریتانییەکان بە ئەنقەست دەیانویست دانووستاندنەکان درێژ بکەنـەوە، تـاکو لەگەڵ گفتوگۆکانی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراقی لەبارەی پەیمانی ناوبراو، هاوکـات بێـت، بەشێوەیەك کە دانووستاندنەکانیان لەگەڵ تورکەکان وەك ئامرازێکی فشار بـۆ سـەر عێراقییـە نەیار بە پەیمانەکە بـەکاربهێنن، ئەگـەر پەیمانەکـە پەسـند نەکـەن ئـەوا ویلایـەتی موسـڵیان لەدەست دەچێ[1]. لەپاڵ ئەمەش دەبوو حکوومەتی بەریتانی مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕەوشە نوێیـەی کە دووبارە سیاسەتی شێخ مەحموود سەپاندبووی بکات، لە بەشێکی کرنگی ویلایەتی موسـڵی جێناکۆك[2]. شێخ تازە لە تاراوگە بە فەرمانی حکوومەتی بەریتانی گەڕابووەوە[3].

---

1- Othman Ali, The Kurds and Lausanne Peace Negotiations, 1922-1923, Middle Eastern Studies, Vol.33, No. 3, London, July, 1997, P. 529.

2- Colonial Office, Special Report …1920-1931, PP.256-257;

- سي. جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٨.

٣- شێخ مەحموود دوای ژمارەیـەك پێکـدانان لەگـەڵ ئینگلیـز، لـە حـوزیرانی ١٩١٩ دەسـتگیرکراو بـۆ هیندستان دوورخرابووەوە، پێشتر دادگای بەریتانی حوکمی لە سێدارەدانی بـۆ دەکردبـوو، بـەڵام لەترسی دەرەنجامەکانی ئەو جۆرە بڕیارە، بڕیاریدا بۆ هیندستان دووری بخاتەوە، بەهۆی شڵەژانی ناوچـەکە لـەنێوان قەڵەمڕەوی تورکی و بەریتانی، دوای ئەوەی دەستتێوەردانی تورکان زۆربوو ڕەوشی کورد بەسـەر دەسـەڵاتی بەریتانی سەپاند کە شێخ بۆ سلێمانی بگەڕێننەوە، ئەمەش وەك ئاماژەیـەك بـۆ بـوونی ئـارامی و بـڕینی دەستی تورکان لەو ناوچەیە، سەیری:

- پیێ ڕەش، العراق دولة بالعنف، جنیف، ١٩٨٥، ل ل ١٩-٢٢.

شێخ مەحموود زۆری چاوەڕێ نەکرد، ڕەوشـەکەی بـۆ بـەدیهێنانی خواسـتەکانی قۆزتـەوە، لـە ١٥ی تـشرینی یەکەمی ١٩٢٢ مەرسومێکی دەرکرد و تییدا حکوومەتی کوردستانی ڕایگەیانـد. لـە ١٨ی نیـسانی ١٩٢٢ خۆی بە مەلیکی کوردستان و سلێمانی بە پادشـا نـشینی کوردسـتان ناسـاند. ئـەو ڕێوشـوێنانەی بـەریتانیا

بێ گومان گەڕاندنەوەی شێخ مەحموود لەلایەن بەریتانییەکان بۆ هێنانەدی خواستەکانی گەلی کورد نەبوو، بەڵکو بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی خۆی بوو لە دانووستاندنەکانی لەگەڵ تورکەکان، کە دەستیان بە بانگەشەیەکی فراوان لە نێوان کوردی ویلایەتە جێناکۆکەکە کردبوو، دوای ئەوەی شێخ ئەو پابەندیانەی کە بەریتانیا بۆ دانابوو بەزاند، ئاسایی بوو دوای ماوەیەکی کورد حکوومەتی بەریتانی بڕیار بدات، سنوورێك بۆ خواستە نیشتیمانیەکانی شێخ دابنێ[1].

هەریەکە لە بەریتانیا و تورکیا لە یەك کاتدا هەوڵیاندەدا کە هاوسۆزی و دۆستایەتی کوردی ویلایەتە[2] جێناکۆکە بەدەستبهێنن[3].

---

نیگەرانیەکێ زۆری لای دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراقی نایەوە، بەڵام ئەوانە لە رەوشێکی وانەبوون، بتوانن هێز لە دژی شێخ بەکاربهێنن، بۆیە پەنایان بۆ شێوازی باو برد لە بەڵێن و لێدوان دان لەبەرژەوەندی کورد، لە ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ نوێنەری باڵای بەریتانی و حکوومەتی عێراقی بەهاوبەشی بەیاننامەیەکیان دەرکرد و دانیان بە حکوومەتی سەربەخۆی کوردی نا. لە راستیدا کورد زۆری چاوەڕێ نەکرد بۆ ئەوەی دووبارە پاشگەزبوونەوەی هەردوو حکوومەتەکە لە بەڵێن و لێدوانەکانیان ببینن، دوای ئەوەی تورکان لە نیسانی ١٩٢٣ دەرکران و گەڕی دووەمی کۆنگرەی لۆزان نزیك بەستن بووەوە، بانگهێشتی شێخ بۆ بەغدا کراو لەهەمان کاتدا هێزیش بۆ چوونە ناو سلێمانی ئامادەکرا، بەکردەوە شێخ بەهەڕەشەی هێزی ئاسمانییەوە ناچارکرا دەستبەرداری سلێمانی بێت و هێزەکانی بەریتانی چوونە ناویەوە، وەزریکی تازە لە بزووتنەوەکانی شێخ دژ بە بەریتانییەکان دەستپێکرد، بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- ولید حمدي، سەرچاوەی پێشو، ل ١٩٤" سروە اسعد صابر، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٤١-٢٥٢.

١- ستيفن همسلي لونكريك، العراق ...، ل ٢٥١

- Colonial Office, Special Report …1920-1931, P. 257.

2- Othman Ali,Op.Cit.,P. 529

- ئەمەش لە راستیدا یەکێك بوو لە شێوازەکانی بەریتانیا بۆ ئارامکردنەوە و دلنەوایی کورد و عێراق بوو، ئەویش دەرکردنی لێدان بەبێ ئەوەی جێبەجێ بکات، بۆ نموونە سەیری لێدوانی عێراقی بەریتانی کە لە ١١ی تەمووزی ١٩٢٣ دەرچووە بکە لە بارەی (مافە سیاسی نەتەوەییەکانی ویلایەتەکە) بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- Colonial Office, Special Report …1920-1931,P. 257.

٣- بەریتانیا سەرباری بەکارهێنانی هێزی عێراقیەکان و هێزەکانی لیڤی ئاشوری فڕۆکەشی لە بۆردومانی شارو گوندە ئارامەکان بە توندی بەکارهێنا، سەیری:



لەلایەکی دیکەوە، سەبارەت بە تورکەکان، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە، بە ئەنقەست دانووستاندنەکانیان لەگەڵ بەریتانیا دواخست[1]. ئەوان حەزیان لە دانووستاندن نەبوو، تا ئەوکاتەی رەوشی ناوخۆی بەریتانیا ئارام دەبێتەوە، هیوایان بە دەستپێکردنەوەی دانووستاندنەکان بوو بەهەمان حکوومەت، بوونی وەزیری دەرەوەی پارتی کریکارانیان لە دانووستاندنەکان پێ باش بوو، لە ئەگەر سەلەنۆیێ گەڕانەوەی لوید جۆرج بۆ دەسەڵات دەترسان[2].

دانووستاندنەکانی بەریتانیا- تورکیا تا ١٩ی ئایاری ١٩٢٤ دەستی پێنەکرد، تا ٥ی حوزێرانی هەمان ساڵ بەردەوام بوو، دانووستاندنەکان لە تەلاریکی کۆنی هێزی دەریایی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ دەستی پێکرد[3]، ئەو چاوپێکەوتنانە بە کۆنگرەی قوستەنتینیە ناسران[4]. سێر پرسی کوکس نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق نوێنەرایەتی لایەنی بەریتانی دەکرد، هەریەکە لە کاپتن ئار. ئێف. گاردین پشکنەری ئیداری لە موسڵ و تەها هاشمی

---

- ستيفن همسلي لونكريك، العراق...، ل ٢٥١

1- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 496.

٢- فاضل حسين، مشكلة...، ل ٤٠.

ئەوکات رەوشی ناوخۆیی بەریتانیا بە قۆناغێکی هەستیاردا گوزەری دەکرد، لەماوەی کەمتر لە ساڵێك زیاتر لە پارتێك دەسەڵاتی زیاتر لە جارێك وەرگرت، بۆ نمونە ماکدۆناڵدی سەرۆکی پارتی کرێکاران لەسەرەتای ١٩٢٤ حکوومەتی پێکهێنا، تورکان هیوایان پێی هەبوو، لەبەرئەوەی سیاسەتی دەرەوەی لەسەر پێویست ی ئاشتەواییکردن لەگەڵ هەموو وڵاتان وەستا بوو، بە یەکێتی سۆڤێتیشەوە، بەڵام بەهاتنی مانگی ئەیلول گرفتەکانی ئەو حکوومەتە کەڵەکە بوو، ناچارکرا دەست لەکار بکشینیتەوە و هەڵبژاردنی نوێ ئەنجامبدریت، کە پارتی پاریزگاران ئەوجارە بە زۆرینە بردییەوە و حکوومەتی ستانلی بالدوین لە کۆتایی ١٩٢٤ پێکهات، سیاسەتی دەرەوەی پێچەوانەی سیاسەتی پارتی کرێکاران بوو، پەیوەندی لەگەڵ سۆڤێت پچڕی و بەرەو سیاسەتی گرێدانی پەیمان و گێڕانەوەی ئەڵمانیا بۆ ریزی وڵاتانی ئەورووپی چوو. سەیری:

- محمد محمد صالح وآخرون، سەرچاوەی پێشو، ل ل١٢٢-١٢٤.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 496

٤- لە هەندێ سەرچاوە بە گۆنگرەی کیشوەری زێڕین ناسراوە، ئەمەش بۆ بەناوبانگی ناوچەی کەناری ئەورووپی ئەستەمبوڵ بە کیشوەری زێڕ.

- Mim K.Oke,A Chronology …, P.47.

سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراقی وەك راوێژکار یاریدەدەری کوکس بوون[1]. هەرچی شاندی تورکی بوو، پێکهاتبوو لە فەتحی بەگ — سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورەی تورکی- سەرۆك و هەریەکە لە کازم پاشا ـ بەڕێوەبەری پێشووی جەنگی و فەوزی بەگ ـ نێردراوی دیابەرکر و فائیق بەگ ـ نێردراوی سوپا و نەسرەت بەگ ـ راوێژکاری یاسایی بۆ کاروباری دەرەوە و عەقید ئیسحاق ئەڤێنی[2].

لەیەکەم چاوپێکەوتنی نێوان دوو شاندەکە، فەتحی بەگ بیروبۆچوونی تورکی بۆ کێشەکە بەدیارخست، داخوازی تورکیای بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتەکە دووپاتکردەوە و پشتی بە پاساوی مێژوویی و رەگەزی و جوگرافی و سەربازی بەست، کە پێشتر عیسمەت پاشا لە کۆنگرەی لۆزان خستبوویە روو، جەختی لەسەر ئەنجامدانی راپرسی لەو ویلایەتەی کە کورد و تورك رێژەی سێ بۆ یەکی پێکدینن، کردەوە[3].

لەبری ئەوەی کوکس، گفتوگۆی بیروبۆچوونی فەتحی بەگ لەبارەی کێشەی موسڵ بکات، پرسی ئاشورییەکانی ورووژاند[4] و داوای سنوورێکی کرد کە بۆ باکووری ویلایەتی موسڵ درێژ

١- شاندی بەریتانی نوێنەرایەتی عێراقی لەو دانووستاندنانە دەکرد، چونکە بە گوێرەی ئینتیداب هێشتا لەژێر راسپاردەی بەریتانیا بوو، ئەو کات عێراق نەیدەتوانی کێشە کە بەشێوەیەکی راستەخۆ بخاتە روو، تەنها تەها هاشمی ناردە کۆنگرەکە، بەریتانیا لەلای خۆیەوە لە میانەی پەیمانی عێراقی — بەریتانی ١٩٢٢ بەڵێنی بە عێراقیەکان دابوو کە سنووری عێراق بە ویلایەتی موسڵ بپارێزێت. سەیری:

- Vladimer F.Minorsky, Müsül Sorünü,Istanbul,1998, S.35

- عبد الحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، سەرچاوەی پێشو، ل ٣١٣" مریم عزیز فتاح، تحليل العوامل التي رسمت الحدود العراقية التركية، رسالَة ماجستير مقدمة إلى كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٧٠، ل ل٨-٩.

2- Mehmet Gonlubol,A.G.E,S.74;T.C.Başbakanlik Devlet Arşivleri ğenel mudur luğu Osmanli Arşivi daire Başbanligi Musul-Kerkuk ile iliğili Arşiv Belğeleri 1525-1919, Ankara, 1993,S. 44.

3- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, S. 35 ; Mehmet Gonlubol, A.G.E, S. 74.

٤- لە سەرەتاکانی نیسانی ١٩٢٤، حکوومەتی بەریتانی بە حکوومەتی عێراقی راگەیاند کە سوورە لەسەر ئەوەی بەشێك لەو زەویانەی کە ئاشورییەکانی تیدا نیشتەجێن بە عێراقەوە بلکێنی، کە ئێستا لەناو سنووری تورکیا دان، ئەوەشی بۆ حکوومەتی عێراقی روونکردبوو کە ئەم لکاندنە "بوونی نەتەوەیەکی جەنگی لەسەر



بپێتەوە، بەشێوەیەك بەشێکی تورکیا لە خۆبگرێت[1]. لەمبارەیەوە پێشنیازی بەریتانی پێشکەش کرد کە بەم برگەیە دەستی پێکردبوو: "لەوەتەی دانووستاندنەکانی لۆزان پچڕاوە تاکە کێشەیەك لە دیدەی حکوومەتی خاوەن شکۆ گرنگی زۆربووە، ئەویش داهاتووی ئاشورییەکانە جگە لەوانەی هەر لە بنەماوە بە رەگەز فارسی بوونە، حکوومەتی خاوەن شکۆ بەڵێنی توندی داوە کە ئەو ئاشوریانە دووبارە بەگوێرەی خواست و ویستی نەتەوەییان نیشتەجێبکاتەوە، ئەوانە بە پەرۆشەوە داوایان کردووە، لەژێر پاراستنی بەریتانی بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنرێنەوە، حکوومەتی خاوەن شکۆ ناتوانێت لە وەڵامی داواکەیان کەمتەرخەم بێت...."[2]. هەروەها گوتی: "لە کاتێکدا حکوومەتەکەم ئامادده نییە هەموو خواستەکانی ئاشورییەکان بەدیبهێنێت، بەڵام بڕیاریداوە دانووستاندن بکات بۆ دەست کەوتنی سنوورێك کە ئاشورییەکان وەك قەوارەیەك کۆبکاتەوە، ئەو سنوورەش دەبێت لەژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵەی نەتەوەکان بێت و خرابێتە ژێر ئینتیدابی حکوومەتی خاوەنشکۆوە"[3]. هەروەها ئەوەشی زیاد کرد کە "بەریتانیا لەو باوەڕەدایە کە حکوومەتی تورکی ئاماددەیە ئەو پێشنیازە پەسند بکات، چونکە دەسەڵات و ئیدارەکردنی ئەو هەرێمە هەژارانەی ئاشورییەکان تێدا دەچین پێشتر بۆ حکوومەتی تورکی سەرچاوەی شەرم هێنان بوو، بەهۆی ئەوەی ئەو ناوچانە دوژمنداری دەسەڵاتی تورکیان کردووە، کە بۆتە هۆی ئەوەی زەمینەی پێکدادان بە وڵاتانی رۆژئاوای لەبار بکات...."[4]. کۆکس یادداشتە نوێیەکەی بە لکاندنی هەرێمی هەکاری بەعێراقەوە، کۆتایی پێهێنا و روونیکردەوە کە ئەمە جگە لە کەمترین ئاستی داخوازییەکانی

سنووری باکووری وڵات" دەستبەر دەکات. بەڵام مەرجی لەسەر حکوومەتی عێراق دانا کە دەبێت ئەوانە ئۆتۆنۆمی ناوچەییان پێ ببەخشێت، چونکە پێش جەنگە کە لەلایەن عوسمانییەکان ئەو ئۆتۆنۆمیەیان هەبووە، حکوومەتی عێراقیش وەڵامی ئەرێی بە پێشنیازەکەی بەریتانیا دایەوە. سەیری:

- League of Nations, Question of the Frontier Between Turkey and Iraq, Report Submitted to the Council by the Commission Instituted by the Resolution of September 30*th*,1924, P. 79

1- John Joseph, Op.Cit.,P. 171.

2- League of Nations, Questions…,P. 79.

3- Ibid,P 79 ; A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 496.

4- League of Nations, Questions…,P. 79.

بەریتانیا نەبێت هیچی دیکە ناگەگەیەنێ و هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر ڕێککەوتن لەسەر پێشنیازەکە نەکریت ئەوا: "بەریتانیا ئازادە لەوەی کار بۆ دابینکردنی ئەو سنوورە لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات"[1].

واپێدەچوو کە بەریتانیا لە داوا کردنی ئەو داخوازیانە سوربوو بێت، بەڵام لە راستیدا هەرگیز لە سەپاندنی داخوازییەکانی بەسەر تورکەکان جیدی نەبووە، بەرگریکردنی لە ئاشورییەکان و مافەکانیان و وروژاندنی پرسەکەیان لەم کاتەدا، جگە لە ڕێوشوێنێکی تەکیتیکی هیچی دیکە نەبووە، وەك کارتێکی زیادە بۆ دانانێکی خێرای تورکی بە ویلایەتی موسڵ. بەتایبەتی دوای ئەوەی بەرەبەرە کارتی کوردی لەو دانووستاندنانە دوورخستەوە، هەروەها دوای ئەوەی بڕیاریدا بەشێکی ان بە عێراقەوە تیکەڵاو بکات، بەکارهێنا نی کارتی ئاشورییەکان لەلایەن شاندی بەریتانییەوە، وە بەکارهێنا نی کارتی کوردی بوو لە کۆنگرەی سیڤەر، دواتریش بە پلەیەکی کەمتر لە لۆزان، ڕووداوەکانی دواتریش ئەمەی سەلماند.

فەتحی بەگ لە دانیشتنی دووەم کە لە ٢١ ئایاری ١٩٢٤ سازکرا، وەڵامی پێشنیازی بەریتانی دایەوە[2]. یادداشتەکەی بەمشێوەیە دەستپێکرد و گوتی: "دوای ئەوەی جەنابتان خواستی دەستپێکردنەوەی دانووستاندنەکانتان لەو شوێنەی کە کریزن جێیهێشت دەربڕی، ئێستا وای دەبینم کە ئیوە هەڵوێستێك جێدەهێڵن و پرسێکی نوێی دیکە دەورژێنن، ئەویش پرسی ئاشورییەکانە. هەروەها بۆ زامنکردنی داهاتوویان داواتان کردووە کە زەویەکی دیاریکراوو، کە ئاڵای کۆماری تورکی لەسەر دەشەکێتەوە بە دابڕین و بە زەویەکانی ژێر پاراستنی بەریتانی بلکێنن. ئەگەر بڵێم ئەو داوایەتان منی نەپەشۆکاند ئەوا من ڕاستی ناڵێم"[3]. بە گاڵتەجارییەوە گوتی: "سەرۆکی شاندی بەریتانی لە لۆزان باسی لە خواستی حکوومەتی خاوەن شکۆی لەبارەی بەخشینی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد کرد و ئێستاش جەنابتان داخوازی ئاشورییەکان دەخەنەروو..."[4].

1- J. Joseph,Op.Cit.,P. 172 “

- ریاض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٢.

2- MKIAB, A.G.E, S. 45.

3- League of Nations, Questions…, P. 79; J. Joseph,Op.Cit.,P. 172.

4- League of Nations, Questions…,P. 79.



فەتحی بەگ بەتوندی پێشنیازەکانی کۆکسی ڕەتکردەوە و گوتی: "بەم داوایەتان ئەوەتان لەیاد چووە کە ئاشورییەکان جگە لە کەمینییەکی زۆر بچووکی ویلایەتی موسڵە، کەچی زۆرینەی هەرە زۆری کورد و تورکی ویلایەتەکەتان فەرامۆشکردووە، شاندی تورکی وایدەبینی کە ناکرێت بە سەدان هەزار تورك و کورد لەبەرخاتری کەمینەیەکی زۆر کەم لە ئاشورییەکان هەڵبکەنرێن...."[1]. لە کۆتاییدا، خیانەتکاری ئەوانەی بۆ هاوسێ موسڵمانەکانی بەیاد بەریتانیا هینایەوە لە میانەی جەنگەکە و هەلسانیان بە "کردەوەی دڕندانە لە دژیان...."، هەروەها بە پشتبەستن بە قەسەو پاساوەکانی پێشووتری سەرلەنۆێ داخوازی حکوومەتەکەی بۆ خستنە پاڵ ویلایەتەکەی بوسەر تورکیا دوپاتکردەوە[2].

دانیشتنی ٢٤ی ئایار، وەڵامی کۆکس بۆ فەتحی بەگی بەخۆیەوە بینی، کۆکس بە پاساوەکانی کریزن لە لۆزان دەستی بەقسان کرد، بەقسەی کۆکس ئەو هەرگیز هەوڵی نەداوە باسی هێڵێکی سنووری دیاریکراو لە باکوور بکات، لەهەمان کاتدا سووربوو لەسەر هەڵوێستی لە ویلایەتی موسڵ ....، هەروەها گوتی، ئەو ئەرکە بۆ شارەزایانی هەردولا لێدەگەریت، بۆ ئەوەی بواری ئەوەیان هەبێت زانیاری تۆبۆگرافی زیاتر بەسەر بکەنەوە"[3]. هەروەها کوکس ئەوەشی گوت کە: "پرسەکە ئەوە نییە کە ئەو زەویانەی داواکراون بخرێنە سەر پاراستنی بەریتانی یان بەرژەوەندی زۆرینەی کورد بخریتە ژێر بەرژەوەندی کەمینەی کریستیانەکان لە ویلایەتەکە، گەلی کورد بەو ئۆتۆنۆمیەی پێی بەخشراوە تەواو رازی بووە، پرسی ئاشورییەکان بۆیە خراوەتە ڕوو چونکە پەیوەندی بە پاساوە تۆبۆگرافی و گشتیە پەسندکراوەکانەوە هەیە، ئەمەش بووە پاڵپشتییەك بۆ حکوومەتی بەریتانی بە هێلیك دوورترە لەو هێڵەی کە پێشتر پێشنیاز کرابوو...."، هەروەها گوتی: "یادەوەری ئاشورییەکان زۆر زیندووە و لە قسەکانی فەتحی بەگ لەبارەی ئەو مامەڵەیەی کە بەدەستی تورکەکان لە ڕابردوو چێشتوویان، زۆر جیایە"[4].

١- ریاض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٣.

٢- ق.ب.ماتيفيف بارمتي، الاشوريون والمسالة الاشورية في العصر الحديث، دمشق، ١٩٨٩، ل ل١٢٦-١٢٧.

3- League of Nations, Questions…,P. 80.

4- Ibid, P. 80.

له کۆتاییدا کۆکس دووباره داوای پێویستی دۆزینەوەی زێدێك بۆ ئاشورییەکان کرد، کە هەموویان وەك جەستەیەکی مرۆیی کۆبکاتەوە و ئەو نیشتیمانەش لە سنووری دەوڵەتی عێراقی بێت، ئەویش لە ڕێگەی دابڕینی ویلایەتی هەکاری و بەیتی شەباب و جولەمێرگ لە تورکیا و لکاندنی بە ڕەواندزەوە[1].

کۆکس ئاماژەی بە پێدانی چەند ئیمتیازێك بە تورکەکان کرد لەبەرامبەر دەستبەرداربوونیان لە داخوازی ویلایەتی موسڵ، ئەو ئیمتیازانەش بریتی بوون لە بەخشینی تورکیا لە بەشێك لە قەرزەکانی و پێدانی قەرزی تازە پێی، یارمەتیدان لە سووککردنی قەرزەکانی و یارمەتیدانی لەپرسەکانی سنووریی نێوان تورکیا و سوریا، یارمەتیدان لە چاککردنی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و بولگاریا. سەرباری ئامادەیی بەریتانیا بۆ گفتوگۆکردنی پرسی هێڵی ئاسنی بەغدا[2].

فەتحی بەگ پێشنیاز و خستنەرووی کۆکسی فەرامۆش کرد و سەر لەنوێ داوای ویلایەتە جێناکۆکەکەی کرد[3]. فەتحی بەگ وەك خۆی دەڵێت لەم داوایەی پشتی بە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی بەستبوو، کە سنووری باکووری عێراقی وەك یادداشتی تورکی دیاریکردبوو، هەروەها گوتی ویلایەتەکە بەشێکی تورکیا لە رووی یاساییەوە، تا ئەو کاتەی ڕێککەوتنی- چەسپاندنی سنوور- مۆر دەکرێت، مانەوەی کاتیی لەژێر ئینتیدابی بەریتانی هیچ لەو ڕاستیە ناگۆڕیت، یادداشتەکەی بەم قسەیە کۆتایی پێهێنا بوو "بانگەشەی داواکردنی زەوی ویلایەتی هەکاری، لەگەڵ دەق و گیانی پەیمانی لۆزان ناکۆکە"[4].

شێوازی هەڵسوکەوتی هەردوولا لە دانووستاندنەکان لەبارەی پرسی موسڵ، بوونی جیاوازیەکی گەورەی لە بیربۆچوونی هەردوولا پێشاندا و مەحاڵبوو لەیەکنزیك بکرێنەوە، بۆیە لە ٣ی حوزێران کۆکس بە فەتحی بەگی ڕاگەیاند کە ناکرێت دیدەگای تورکی پەسند بکرێت و گوتی: "ئەو بەشەی ویلایەتی هەکاری ناچێتە چواچێوەی ماددەی ٣ی پەیمانی لۆزانەوە"[5].

1- MKIAB, A.G.E, S.44

٢- أصغر جعفري ولداني، سەرچاوەی پێشو، ل٦٧.

3- MKIAB, A.G.E, S.44.

4- League of Nation, Question …,PP. 80-81.

5- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 497.



وەڵامی فەتحی بەگ لە ٥ی حوزێرانی ١٩٢٤ هات و گوتی "هەتاکو لە رووی پرەنسیپیشەوە ئەو پلانە نوێیە بەریتانییەی کە کۆکس خستییە روو پەسندی ناکات"[1].

له ٥ی حوزێران دەرکەوت کە دانووستاندنەکان بەهۆی دەستگرتنی هەردوولاکە بە بیروڕای خۆیانەوە گەیشتە بن بەست[2]. ئەوکات سێر کۆکس پێشنیازی کرد پرسەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزبکرێتەوە، بەڵام فەتحی بەگ ئەمەی ڕەتکردەوە، چونکە ئەوەی دەزانی کە بەرزکردنەوەی کێشەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەواتای چارەسەر بە بەرژەوەندی بەریتانیا دەهات، بۆیە ویستی بە نەبوونی دەسەڵات پاساو بۆ ڕەتکردنەوەی پێشنیازە بەریتانییەکە بهێنێتەوە[3]، بەڵام کۆکس وەڵامی دایەوە کە "بەهۆی ئەوەی پێشنیازەکەی ڕەتکرایەوە، بە گوێرەی ڕێنمایی حکوومەتەکەی، خۆی بە ناچار دەبینی کۆتایی بە دانووستاندنەکان بهێنی و بۆ لەندن بگەڕێتەوە"، فەتحی بەگ ئەمەی بە هەڕەشە بۆ وڵاتەکەی دایە قەلەم[4]. دوای مانگێك لەماوەی ئەو نۆ مانگەی کە پەیمانی لۆزان دیاریکردبوو، لە ٦ی ئابدا تاك لایەنە بەداوای حکوومەتی بەریتانی کێشەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزکرایەوە[5]. ئەمەش دانانی بوو، بە سەرنەکەوتنی کۆنگرەی قوستەنتینییە لەچارەسەری کێشەکە.

بەریتانیا لە کۆنگرەی قونستەنتینییە، وەك جاران پەنای بۆ شێوازە باوەکان لە دانووستاندنی لەگەڵ تورکەکان، برد. پرسی نوێی ورووژاند کە پێشتر لە کۆنگرەی لۆزان نەورژێنرا بوو، نە لە ناو بەندی سێ دابوو نەباسی کردبوو، ئەویش داواکردنی زەوی بۆ ئەوەی ئاشورییەکان تییدا نیشتەجی بن، ئەو ئاشوریانەی کە کەمینیەکی زۆر کەمی ویلایەتی موسڵ پێکدێنن[6]، بۆیە ئەمە لای تورکەکان پەسند نەبوو کە داخوازی زۆرینەی کوردی بۆ بەرژەوەندی

1- MKIAB, A.G.E, S.44.

2- Mehmet Gonlubol, A.G.E, S.75.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 497 ; MKIAB, A.G.E, S.44.

4- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, S. 35.

5- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 497.

٦- ویلسن ژمارەی ئاشورییەکان، ئەوانەی کە دەسەڵاتی ئنیتیدابی بەریتانی دوای ئەوەی لە ماوەی سالانی ١٩١٧-١٩٢٠ لەلایەن دەسەڵاتی تورکییەوە لە زێدی خۆیان لە ویلایەتی موسڵ دەرپەڕێنران، بە ٢٥ هەزار کەس مەزەندە کرد. سەیری:

کەمینەی ئاشوری پشتگوێ بخرێت، ئەو کەمینەیەی کە لە پڕ بووە مایەی گرنگی پێدانی حکومەتی بەریتانی. بۆیە سەیر نەبوو تورکەکان پرۆژەکانی بەریتانیا لەبارەی ئاشورییەکان رەتبکەنەوە، ئەمەش بە مەبەستی دوورخستنەوەی تورکەکان لەویلایەتەکە، کە بەرژەوەندی بەریتانی یتدایە[1]. رووبەڕووبوونەوەی دیپلۆماسی لە نێوان بەریتانییەکان و تورکەکان لە کۆنگرەی قوستەنتینیە لەو پەری توندی دابوو، پەرەسەندنی ترسناك لە سنوورەکانی ناوچەی جێناکۆك لە ئارادابوو، لە هەندێباردا دەگەیشتە پێکدانی سەربازی، دوای ئەوەی هەردوولا سەرکەوتوو نەبوون لەسەر ئاستی دیپلۆماسی، بۆیە هەرلایەو دەیویست پێشکەوتنی زیاتر لەسەر زەوی ئەنجام بدات، بە کورتی هەر لایەو دەیویست زۆرترین رووبەری زەوی لە ناوچەی جێناکۆك داگیر بکات[2]، دوای ئەوەی بەریتانیا لە کۆنگرەی لۆزان لەبارەی موسڵەوە دەست کەوتی بەدەستهێنا بەوەی دانرا بە کردەوە موسڵ لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادایە و ئەویش مافی پارێزگاری کردنی لێی هەیە، لەمەشدا پشتیان بە (مافی رزگاری) و (باری واقیعەکە) بەستبوو، ئەمەش ئیمتیازیك بوو نەوەك هەر تورکیای لێ مەحروم کرا، بەڵکو حەزی بەریتانیای بۆ

- سەیری نووسینەکەی بکە: A Clash…,P.37، هەروەها R.Stafford لە هەمان ماوەدا بە (٢٤,٥٧٩) کەس مەزەندەی کردن، بۆ وردەکاری زیارت سەیری:

- The Tragedy of the Assyrians, London,1935,P.37

١- ئەوەی زیاتر هانی تورکیای دا کە پلان و پرۆژەکانی بەریتانی رەتبکاتەوە، ئەوەبوو کە ئەڵمانیا لەپاڵ تورکیا وەستاوە و ئەو پرۆژانەی بە پرۆژەیەکێ داگیرکاری بینی بە ئامانجی لاوازکردنی تورکیا، سەیری:

- فريتز غروبا، رجال ومراكز قوى في بلاد الشرق، ترجمة فاروق الحريري، بغداد، ١٩٧٩، ل ١٢٠ " رياض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٤.

٢- لە ساتەوەختی مۆرکردنی پەیمانی لۆزان (٢٤ی تەموزی ١٩٢٣) رەوشی گشتی لەسەر زەوی بەمجۆرە بوو: بەریتانیا بەکردەوە ویلایەتی موسڵی داگیرکردبوو، کەچی تورکان لەبەشی باکووری ویلایەتەکە بوون، بەڵام بە هەبوونی دوو بار، یەکەم- بەشیك لە سەنجەقی سلێمانی بەدەستی شێخ مەحموودی سەرکردەی کوردەوە بوو لەو ماوەیەدا، دووەم- بەشیك لە ناوچەی هەکاری کە دەکەویتە باکووری ویلایەتی موسڵەوە بە دەستی ئاشورییەکانەوە بوو، شایانی باسە هەردوولاکە پێشتر لە کۆنگرەی لۆزان بەڵێنیان دابوو کە پارێزگاری لە باری ئیستادا بکەن . سەیری

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.499.



فراوانخوازی زیاتر زیادکرد، ئەمەش وای لە تورکەکان کرد هەنگاوی لە شێوەی هەنکاوەکانی بەریتانیا بنێن، ئەمەش وای لە لۆنکریك کرد بگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو سیاسەتە "هەستێکی دوژمنکارانەی سنوور بەزێنی دروستکرد"[1].

لەو گرنگیانەی پێشتر باسکران، دەسەڵاتی کەمالی دوای ئەوەی سەرکەوتوو نەبوو لەوەی بەریتانیا بۆ دانووستاندنی دوو قۆڵی لەبارەی موسڵ بگەڕێنێتەوە، بڕیاریدا جووڵانەوە سەربازییەکانی بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتی موسڵ دوو هێند بکاتەوە. لە حوزێرانی ١٩٢٤ تورکەکان ئامادەباشی خۆیان بۆ کۆکردنەوەی سەربازیی کرد و لە ١٧ ی حوزێران ٨ تۆپهاوێژیان بۆ هەریەکە لە جەعفەر تەیار و کازم پاشا ـ کە دوو گەورە کارگێری سەربازی تورك بوون ـ بۆ شارەدێی سلۆپی رەوانە کرد، لەگەڵ گەیشتنی سەربازی پیادە بۆ جەزیرە لە دیاربەکر[2]. جەعفەر تەیار داوای لە مستەفا کەمال کرد کە "تۆڵە لەو ئینگلیزانەی کە شەڕوەستانی مۆدرۆسیان پێشیلکرد و هیچ گرنگییەکان بەخەڵکی موسڵ نەدا، بسەندرێتەوە"، هەروەها دەڵێت، کە بۆ مستەفا کەمالی دووپاتکردۆتەوە کە "کارکردی سەرنەکەوتنی ئەرکەکەی دەخاتە ئەستۆ"[3]، پێدەچێت مستەفا کەمال بیرۆکەی جەعفەر تەیاری بە ئاشکرا رەتنەکردبێتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا هیچ پەرۆشییەکی وای بۆ ئەو جۆرە جووڵانەوەیە پێشان نەدا.

لەلایەکی دیکەوە بەریتانیا لە و پەرەسندنانە زۆر دوور نەبوو، بەڵکو بە ئاگاییەکی زۆرەوە چاودێری دەکرد، بۆیە هێزێکی بۆ فیشخاپۆر نارد تاکو دڵنەوایی ئەو خەڵکەی ئەوێ بکات کە بانگەشەی تورکی نیگەرانی کردبوون[4].

١- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە. Iraq…, P. 153.

٢- بروسکەی ژمارە ٣٥٩ لە ١٩ حوزیرانی ١٩٢٤ لە موتەسەریفی موسڵ بۆ وەزارەتی ناوخۆ ناردراوە، سەیری

- المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي، ملف الأخبار الخارجية عن الحدود، ش- بغداد — ٩كانون الأول ١٩٢٣ — ٣٠ كانون الثاني ١٩٢٤، ل ٩.

٣- بروسکەی ژمارە ٣٦٠ لە ١٩ حوزیرانی ١٩٢٤ لە موتەسەریفی موسڵ بۆ وەزارەتی ناوخۆ ناردراوە، سەیری

- المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي ـ الديوان، ملف الأخبار الخارجية عن الحدود، ش ـ بغداد، ٩ كانون الأول ١٩٢٣ ـ ٣٠ كانون الثاني ١٩٢٤، ل ٩.

٤- هەمان سەرچاوە، ل ٩.

لە سەرەتای مانگی ئابدا، تورکەکان بڕیاریاندا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر باشووری هەکاری توند بکەن[1]، وەك ئەوەی بەریتانیا دوای زنجیرەیەك چالاکی سەربازی، ئاسمان و وشکانی دەسەڵاتیان بەسەر سلێمانی لە دژی شێخ مەحموود توند کرد، کە ئەمەش لەلای تورکەکانەوە نارەزایەتی لێکەوتەوە[2]، بەڵام هەوڵەکانی تورکیا لەم ئاقارەدا لەسەر دەستی ئاشوورییەکان تووشی شکستی گەورە هات، ئەوانە توانیان نوێنەری تورکی (والی جولەمیرگ) لە هەکاری[3] دەستبەسەر بکەن، دوای ئەوەی ٤ لە یاوەرانیان کوشت و ٥ی دیکەیان بریندار کرد[4]، لە ٧ی ئابی ١٩٢٤ بە دیلی بۆ روحی مەلیك خۆشابەی سەرۆکی ئاشوریان لە لایەکی موسڵ برد[5].

دەرهاویشتەکانی رووداوەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بەریتانیا لە پشتییەوە بووە، چونکە تورکەکان لەو ماوەیەدا بەرەو ئەوە دەچوون ئاشوورییەکان رازیبکەن و هەندێ لە داواکارییەکانیان بەدیبهێنن، بۆ ئەوەی هەڵوێستیان لە ململانێیان لەبەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان بەهێز بێت، والی جولەمیرگ بەدوای ئاشوورییەکانی نارد بۆ ئەوەی پێیان رابگەیەنێت کە حکوومەتی تورکی ئامادەدیە لەناو تورکیا لە ناوچەکانی خۆیان وەریان بگرێت و وەکو پێشان مافیان پێ بدات و لەو کردەوانەی لەمیانەی جەنگی یەکەمدا کردیان لێیان خۆشببێ[6]. هەر پێشکەوتنێك بە ئاراستەی رێککەوتنی ئاشوری و تورکەکان بکرابووایە، واتا زیان گەیاندن بە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا، بۆیە بەریتانیا هەڵوێستەکەی قۆزتەوە ویستی تورکەکان شەرمەزار بکات، لەگەڵ یەکێك لە عەشیرەتە ئاشوورییەکان (تخوما) و ئەفسەرێکی هێزی لیڤی ئاشوری و بە سەرپەرشتی گەورە ئەفسەریکی ئینگلیز پیلانیکی بۆ هێرشکردنە سەر والی

١- سي. جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٨.

2- A.J. Toynbee,Op.Cit., PP. 499-500; Othman Ali, Op.Cit., PP. 528-531.

٣- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٨.

٤- هەندێك سەرچاوە لە بارەی ژمارەی کوژراوان ژمارەیەکی زۆر دەڵێت و بۆ ٣٠ کەس لە پاسەوانان و ئەفسەرێك بە پلەی گەورە و بەرزی دەکەنەوە، سەیری:

- رياض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٢٥-٢٢٦.

5- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 500.

٦- رياض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٥.



تورکی رێکخست و دەستگیریان کرد[1]. رووداوەکە هەستی تورکەکانی بەتوندی وروژاند[2]، لە ١٤ی ئابدا ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکی کۆبوونەوەیەکی گرێدا و جەعفەر تەیاری راسپارد کە ئاشورییەکان تەمبێ بکات و بەرەو موسڵ بچێت[3].

خەریك بوو رەوشەکە لە دەستی ئینگلیز دەربچێت، بۆیە ئاشوورییەکان دوای ئەوەی لەلایەن بەرپرسانی بەریتانییەوە رینماییان پێگەیشت والییە تورکییەکەیان ئازاد کرد و دواتر پشکنەری ئیداری بەریتانی لە موسڵ لە گوندی جال چاوی بە والیەکە کەوت. بەرپرسە بەریتانییەکە نارەزایەتی حکوومەتەکەی بە نوێنەری تورکی لەبارەی جووڵانەوەکانی ئەم دواییەی ئەنقەرە راگەیاند و داوای لێکرد کە بە حکوومەتەکەی رابگەیەنێت کە ئەو جووڵانەوانە دووبارە نەکاتەوە[4].

بەمشێوەیە بەریتانیا کارتی ئاشوورییەکان وەك بەشێك لە پلانێك بۆ ئیدارەی دانووستاندنەکانی لەگەڵ تورکەکان بەکارهێنا و پرسی ئاشوری جگە لە ئامرازیکی فشاری کاتێ هیچی دیکە نەبوو، بە کۆتایی هاتنی قۆناغی دانووستاندن و دوای بەدیهێنانی ئامانجەکە، کۆتایی پێهات.

بەریتانیا لە دەرهێنانی پرسەکە لە رەهەندە هەرێمایەتییەکەی بۆ گۆرەپانی نێودەوڵەتی سەرکەوتوو بوو، بەریتانیا هەرگیز لە دانووستاندنە دوو قۆڵییەکانی لەگەڵ تورکەکان جیدی نەبووە، چونکە باش توندی تورکەکان دەناسی، سەرباری ئەوەی بە نێودەوڵەتی کردنی پرسەکە بواری ئەوە دەرەخسینی زیاتر بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی بەکاری بهێنێت[5].

١- هەندێ سەرچاوە باس لە بوونی چەند کەسیکی دیکەی نەناسراو بە جلی سوپای بەریتانی دەکەن، کەبەشداریان لەم پیلانەدا کردووە، سەیری:

- Mim K.Oke,A Chronology…,Op.Cit.,PP.44-45.

2- S.H. Longrigge,Op.Cit.,P. 153.

3- Mim K.Oke,A Chronology…,P.45.

4- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 501.

5- Mim K.Oke,A Chronology…,P. 44

# بەریتانیا و تورکیا...دانووستاندنەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان و جووڵانەوە سنوور بڕەکان

## (ئابی ١٩٢٤ ـ تشرینی یەکەمی ١٩٢٤)

لە ٥ی حوزێران دانووستاندنە دوو قۆڵیەکانی نێوان تورکیا و بەریتانیا بەبێ گەیشتن بە چارەسەرێکی یەکلاییکەرەوە لەبارەی کێشەی موسڵ کۆتایی پیهات، بەریتانیا دوای مانگێك لە کۆتایی هاتنی دانووستاندنەکان لە ٦ی ئابی ١٩٢٤ کێشەکەی بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە بەرزکردەوە، دوای ئەوەی ماوەی ٩ مانگەکەی کە پەیمانی لۆزان وەك دوا کات بۆ گەیشتن بە رێککەوتن دیاریکرد، کۆتایی هات، تورکیا خوازیار بوو دانووستاندنە راستەخۆکانی لەگەڵ بەریتانیا دەستپیبکاتەوە، بەبێ بەشداری پێکردنی لایەنی سییەم، ئەم خواستەشی بە نوێنەری باڵای بەیتانی لە ئەستەمبۆڵ راگەیاند[1]. هەرچی بەریتانیا بوو وەك پێشتر باسمانکرد نەیدەویست زیاتر چاوپێکەوتنی دوو قۆڵی لەگەڵ تورکەکان ئەنجامبدات، کە هەر لەبنەماوە لە داخوازییەکانیان توند بوون، هەروەها تورکەکان بەردەوام دانووستاندنەکانیان درێژەپێدەدا بێ ئەوەی سازش بکەن یان هەڵوێستیان بگۆڕن، بەریتانیا وای دەبینی کە چارەسەر لە رێگەی کۆمەڵەی نەتەوەکان، چارەسەرێکی زامن و خێرایە، ئەو دەستەیەی کە بەریتانیا کاریگەرییەکی زۆری تێدا هەیە، بەو پێیەی کە ئەندامێکی دامەزرێنەر و چالاکە تێیدا[2]. لەهەمان کاتدا تورکیا لەو دەستە نێودەوڵەتیە دوور بوو، هەتاکو ئەندامیش نەبوو تییدا، تەنها لەماوەی دانووستاندنەکان ئەندامێتی پەسندکرا[3].

---

١- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٥٠.

٢- ماجد عبد الرضا، المسألَة الكوردية في العراق حتى عام ١٩٦١، بغداد،، ١٩٨٠، ل ٥٤.

٣- هێنری فۆستەر لە بارەی مەودای بەختی تورکیا لە ئەنجوومەنی کۆمەڵەدا لێدوانی داو گوتی: "لەبەر ئەوەی تورکیا وڵاتیکی هەژاری دۆڕاوە، لەلایەن وڵاتێکی گەورەی خاوەن هاوپەیمانی وڵاتانی مەسیحی



لەپاڵ ئەمەشەوە بەریتانیا بابەتی بەرزرکردنەوەی کێشەی موسڵ بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەشێوەیەکی وا بەکارهێنا کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی لە عێراق بکات، دوای ئەوەی رووبەڕووی تەگەرەی راستەقینە لەسەر ئاستی ناوخۆی عێراق بووەوە، هەروەك باسمانکرد، ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراقی رەتیکردەوە پەیمانی هاوپەیمانی ساڵی **١٩٢٢** پەسند بکات، بۆیە لەماوەی مانگی ئایار تا سەرەتای حوزێران زیاتر لە بەرپرسێکی بەریتانی لە عێراق بۆ زیاتر لە جارێك هەڕشەی دەرەنجامی خراپیان لەبارەی کێشەی موسڵەوە لەو نوێنەرانەی عێراق کرد کە دژی پەیمانەکە بوون[1]. بەکردەوە ئەو فشارەی بەریتانیا بەرهەمی خۆی دا، دوای دەمەقاڵێیەکی زۆر، لە ١٠ی حوزێران ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراقی پەیمانەکەی پەسند کرد، لە پەسندکردنەکەدا بەندێك هەبوو، کە بەهۆیەوە بەریتانیای پابەندی پارێزگاریکردن لە مافی عێراق بەسەر تەواوی ویلایەتی موسڵ دەکرد، پەیمانەکە پووچەڵ و بێ بەها دەبوو، ئەگەر بەریتانیا لەمەدا سەرکەوتوو نەبایە[2].

هەرچۆنێ بێت هەڕەشەکانی بەریتانیا بۆ عێراقییەکان بەوەی ویلایەتی موسڵ لەدەست دەدەن، تەنها بۆ ئەوەبوو کە نەیارانی عێراقی بۆ داواکانی خۆی ملکەچ بکات و بەرژەوەندییەکانی بەرەوپێش ببات، بەریتانیا هەرگیز ئامادەنەبوو، بەهیچ شێوەیەك

---

سەرکەوتووەوە **پاڵپشتی** لێدەکرێت، بانکی دادگا کراوە، لەهەمان کاتدا ئەو ناوچەیەی کە تورکیای تیکەوتووە، هیچ وڵاتیکی تیدا نیە کە لەپاڵ تورکیا جەنگا بێت، سەیری:

- ينظر مؤلفه: نشأة ...، ل ٢٤٨.

١- فیلب ویلارد آیرلاند، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٠٩-٣١٧.

٢- الحكومة العراقية، مجموعة مذاكرات المجلس التأسيسي العراقي لسنة١٩٢٤م-١٣٤٣هـ، ج١، بغداد ١٩٢٤، ل ٤١٢"عبد الرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، بيروت، ١٩٨٣، ج٢، ل ل١١٨-١١٩.

ئەوەی سەرنجراکێشە لێرەدا، ئەوەیە کە بەریتانیا لە رووبەڕووبوونەوەی نوێنەرانی دژ بە پەیمانەکە هانای وەبەر نوێنەرانی کوردی ئەنجوومەنی دامەزراندن هێناوە، لەم چوارچێوەیەدا، دوبیس داوای لە بیڵ کرد، کە یەکێك لە کارمەندانی بەریتانی ئەوانەی لە کوردستان کاردەکەن، بۆ کاریگەری نواندن لەسەری بەکاربهێنێت، بۆ ئەوەی **پاڵپشتی** لە پەیمانەکە بکات، بەکردەوەش هەر ١٨ نوێنەرە کوردەکەی ئەنجوومەن وەك یەك جەستە دەنگیان بۆ پەسندکردنی پەیمانەکە دا . سەیری:

- Othman Ali,Op.Cit.,PP.529-530.

دەستبەرداری ویلایەتە ستراتیژییەکە بێت، ئەمەشی بەهۆی ململانێیەکی دوورودرێژ لەگەڵ فەرەنسییەکان کە لە کۆنگرەی سان ریمۆ ١٩١٩ دەستیپێکرد و لەگەڵ تورکەکان لە سیڤەر و دواتریش لۆزان، ئەو بەرگریە تا سەر ئێسقانەی بەریتانیا لە موسڵ زۆر لە پرسی بەرگریکردن تەنها لە مافی عێراق لەو ویلایەتە گەورەتر بوو[١].

لە ٦ی ئابی ١٩٢٤ حکوومەتی بەریتانی یادداشتێکی بۆ سکرتێری گشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزکردەوە، کە تێیدا ئاماژەی بە بڕگەی ٣ی ماددەی ٣ی پەیمانی لۆزان و بڕگەی ٧ی پرۆتۆکۆڵی چۆڵکردن کردبوو، هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو کە پرسەکانی چۆڵکردن لە رۆژی ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ تەواو بووە، هەروەها ئاماژە بۆ کۆنگرەی قوستەنتینییە و سەرنەکەوتنی لە چارەسەرکردنی پرسەکە کردبوو، بۆیە پەیمانی لۆزان بەپێی ماددەی ١٤٣ی چۆتە واری جێبەجێکردنەوە، یادداشتەکە بە داواکارییەکی بەریتانی کۆتایی هاتبوو، کە داوای کردبوو کێشەی سنووری عێراق — تورکیا لە خشتەی کاری کۆبوونەوەکانی داهاتووی ئەنجوومەنی کۆمەڵە دابنرێت[٢].

هەروەها حکوومەتی بەریتانی یادداشتێکی لە ٩ی ئاب بە حکوومەتی تورکی دا، بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی ئەو یادداشتەی کە بە کۆمەڵەی نەتەوەکانی دابوو، بە حکوومەتی تورکی رابگەیەنێ، حکوومەتی تورکیش لەلای خۆیەوە لە ٢٥ ی ئابدا بروسکەی بۆ سکرتێری گشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد، کە ئەو ئاگای لەوە نییە کە پەیمانی لۆزان چۆتە واری جێبەجێکردنە، هەروەها لەبەر ئەوەی مافی لە ویلایەتی موسڵ هەیە و دەشتوانێ ئەمە بسەلمێنێ، ئەو لە بەرزکردنەوەی کێشەکە بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە سستی نانوێنێ ئەگەر ئەمە بە پێویست ببینێ[٣].

تورکیا بە رەوانەکردنی کێشەکە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان رازی بوو، خواستی مستەفا کەمال لە دەرخستنی تورکیا لەبەردەم وڵاتانی رۆژئاوایی وەك وڵاتێکی نوێ کە دەیەوێت

١- بەڵام ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە هەندێ نووسەری عەرەب ئینتیدابی بەریتانی بەسەر عێراقەوە بە ئیمتیاز بۆ عێراق لێکیدەدەنەوە، بەریتانیا خەباتی بۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقەوە کردووە، ئەمەش بەرای ئەوان بە فەزڵ بۆ بەریتانیا دەگەڕێتەوە، سەیری:

- جورج أنطونيوس، يقظة العرب، ترجمة ناصرالدين الأسد وإحسان عباس، ط ٦، بيروت- نيويورك، ١٩٨٠، ل ٨٦.

٢- أصغر جعفري ولداني، سەرچاوەی پێشو، ل٦٧ " فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٥٠.

٣- مريم عزيز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ل١٥-١٦.



ناکۆکییەکانی بە رێگای سەردەمیانە چارەسەر بکات، هەروەها مستەفا کەمال ئەمەی بە باشترین رێگە بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکی دەزانی، نوێنەری تورکیا متمانەی خۆی بە کۆمەڵە دەربڕیو گوتی: "تێڕوانینی داهاتووی تورکیا بۆ کۆمەڵە پشت بە بڕیاری ئەنجوومەنەکەی لە چارەسەری کێشەی سنووری تورکیا دەبەستێت"، بەڵام ئەوە بەتەنها لەپشت رازی بوونەکەی تورکیاوە نەبوو، دامەزراوە حکومیە ناوخۆییەکانی کەمالی رووبەڕووی سەختی گەورە بووەوە، کە خۆی لە دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنی ناوخۆ ـ کە خودان قورساییەکی سیاسی گەورە بوون، لە گەورە سەرانی جەنگی رزگاری پێکهاتبوون ـ دژ بە پرۆژە چاکسازی و نوێخوازییەکەی تورکیا، سەرباری رێگرییە دارایی و ئابوورییەکان، ئەوانە بە دەستکەوتنی ئەو قەرزانە چارەسەر دەکران، کە تورکیا پێش ئەوەی کێشەی موسڵ چارەسەر بکات، نەیدەتوانی دەستیان بکەوێت[١].

ئەنجوومەنی کۆمەڵە بە فەرمی بانگهێشتی تورکەکانی کرد، بۆ ئەوەی نوێنەرایەتیان لە جنێڤ بکات، تورکەکان رازی بوون بەشداری گفتوگۆکان لەبارەی کێشەکە بکەن، بەمەرجێ وەك بەریتانیا مامەڵە لەگەڵ تورکیا بکرێت، ئەوەیان بۆ چووە سەر، کاتێ گرەنتی و دڵنیاییان لە ئەنجوومەنی کۆمەڵە و بەریتانیای لایەنی دووەمی دانوستانکار پێگەیشت[٢].

سەرباری ئەوەی کە تورکیا بە پەرۆشەوە داوای ویلایەتی هەموو موسڵی دەکرد و ئەو گرنگییە سایکۆلۆژییەی کە کەمالییەکان بە میساقی نیشتیمانیان دەدا، ئەوا رازیبوونیان بە رۆیشتن بۆ جنێڤ بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە تورك بەرەو ئاشتەوایی و سازشن[٣].

لەوکاتەدا لەندەن بەڵگەنامەیەکی پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەناوی "یادداشت لەبارەی سنووری نێوان تورکیا و عێراق"[٤] کرد، لەگەڵ پێشکەشکردنی نەخشەیەك کە هێڵی سنووری پێشنیازکراوی حکوومەتی بەریتانی و نەخشەیەکی عێراقیش، یادداشتەکە دووبارە پاساوە پێشووەکانی بەریتانیا کە لە کۆنگرەی لۆزان و قوستەنتینیە خرابوونەروو،

1- Henderson to MacDonald , Constantinople , 16-9-1924 , Ingliz Belğelerile Turkey'de Kürt Sorünu(1924-1938),Hazirlayan B.N.Şimşir, Ankara,1991,No.685, SS. 11-12.

2- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 498.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٤٨.

٤- ب.ط. سعد، قضية الموصل في مؤتمر لوزان، بغداد، ١٣٤٣، ل ٤

لەخۆگرتبوو، هەروەها کورتەی ئەو هۆکارانەی کە وایکردووە ئەو هێڵە وەك ئاستێکی دادپەروەرانە و سروشتی نێوان هەردوو وڵاتەکە دابنریت، ئەو یادداشتە بەرواری ١٤ی ئابی ١٩٢٤ بەسەرەوە بوو[١]. ئەوەی کە لە یادداشتەکەی بەریتانیادا هاتووە، ئەوە روونکردنەوەی ئەوە بوو کە ئامانجی بەریتانیا لە خستنە رووی کێشەکە ئەوەیە کە پێشانی بدات کە پرسەکە پرسی کێشانی هێڵی سنوورە نەوەك بڕیاردان لەسەر چارەنووسی ویلایەتی موسڵ[٢]. ئەمەش دوای پێشاندانی زۆرێك لە دیپلۆماسی باڵا کە لە لۆزانەوە دەستی پێکردو تا بەدەستهێنانی ویلایەتەکە درێژەی کێشا.

تورکیاش لە ٥ ی ئەیلول هاوشێوەی بەریتانیا بەڵگەنامەیەکی پێشکەشکرد، ئەویش نەخشەیەکی لەگەڵدا هاوپێچکرد کە هێڵی سنووری بە گوێرەی تێڕوانینی خۆی کێشا بوو. جەختی لەوە کردبووەوە کە کێشەکە، کێشەی بڕیاردانە لە چارەنووسی ویلایەتی موسڵ، ئایا ویلایەتی موسڵ لە باکوور یان باشووری سنووری نێوان عێراق و تورکیا دەمێنێتەوە؟[٣]. یادداشتەکە، یادداشتەکەی بەریتانیا بە پێشێلکاری هەردوو کۆنووسی کۆبوونەوەی لۆزانی رۆژی ٢٣ ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ دادەنێت، کە روونیانکردبووەوە، کە هەردوولا لەسەر شێواز و ئامرازەکانی چارەسەری ناکۆکییە رێککنەوتوون. یادداشتەکە ئەوەشی گوتبوو کە حکوومەتی تورکی هێشتا ئەنجامدانی راپرسی بە دادوەرترین شێواز بۆ چارەسەری کێشەکە دەزانێ، یادداشتەکە بە هۆکارە باوەڕهێنەکان کۆتایی هاتبوو، کە مافی تورکیا لەو ویلایەتە پێویست دەکات[٤].

ئەنقەرە دووبارە فەتحی بەگی بۆ نوێنەرایەتیکردنی لە جنیڤ راسپاردەوە، لەگەڵ هەریەکە لە مونیر ئیسحاق و ئیسحاق ئەڤینی، لە ١٠ ئەیلول گەیشتنە بارەگای کۆمەڵەی نەتەوەکان[٥]. کەچی لەندەن، لۆرد بارموری راسپارد کە نوێنەرایەتی بەریتانیا لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات[٦].

١- مریم عزیز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦.

2- Mehmet Gonlubol, A.G.E, S. 76.

٣- مریم عزیز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦.

٤- فاضل حسین، مشكلة ...، ل ٥٢.

5- MKIAB, A.G.E, S. 44.

6- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P. 498.



لە ٢٠ی ئەیلول هەردوو شاندەکە لە بارەگای کۆمەڵەی نەتەوەکان چاویان بەیەکتری کەوت، لۆرد بارمۆر لەمیانەی چاوپێکەوتنی بە فەتحی بەگ ئارەزووی بەریتانیای بۆ چارەسەری ناکۆکییەکە بەرێگای ئاشتی دەربڕی، هەروەها باسی ئەوەی کرد کە هەردوولایان لەبەرامبەر ئەنجوومەنی کۆمەڵە یەکشانن. دواتر داوای لە ئەنجوومەن کرد کە بڕیار لە سنووری کێشە خراوە رووەکە بدات، ئایا هەر ئەوەی کە حکوومەتەکەی دیاریکردووە بڕیاری لێدەدات؟ یان پرسەکە ئەوەیە کە دەبێت هەموو ویلایەتەکە بۆ تورکیا بگەڕێنرێتەوە یان نەگەڕێنرێتەوە، تێڕوانینی حکوومەتەکەی[١] پشت بە زمانی پەیمانی لۆزان دەبەستێ، هەروەها گوتی: "داوا دەکەم ئەنجوومەنی کۆمەڵە بە گوێرەی پەیمانی لۆزان وەك ناوبژیوانێك کاربکات". لە کۆتایی قسەکانیدا لۆرد بارمۆر بیرۆکەی راپرسی رەتکردەوە و لە شوێنی بیرۆکەی پێکهێنانی لیژنەیەکی پێکهاتووی لە کەسانی "بێ لایەن و پاك" کرد، بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکە لە ئەنجوومەنی کۆمەڵە[٢].

رۆژی ٢٤ی ئەیلول، وەڵامی فەتحی بەگ بۆ قسەکانی بارمۆری بەخۆیەوە بینی، روونیکردەوە کە کێشەکە ئەوەیە کە ئایا پێویستە ویلایەتی موسڵ لە باکوور یان باشووری هێڵی سنووری نێوان تورکیا و عێراق بمێنێتەوە، نەوەك هەر تەنها رێککەوتن لەسەر کێشانی سنووری نێوان دوو دەوڵەت، سەرلەنوێ موڵکیەتی ویلایەتی جێناکۆکی بۆ تورکیا گەڕاندەوە، بەهۆی فاکتەرە جوگرافی و مێژوویی و ئەتنی و ئابووری و سەربازی و.....[٣]، هەروەها ئەوەشی زیاد کرد کە ئەو هێشتا باوەڕی بە پێویستبوونی سازکردنی راپرسییە، ئەو هەموو هێڵێکی سنووری کە لەسەر خواستی دانیشتووانەکەی بێت قبول دەکات[٤].

لەکاتێ سەیرکردنی شێوازی هەردوولا لە بەرووخستنی تێڕوانینیان لەبەردەم ئەنجوومەنی کۆمەڵە، "زاڵبوونی شاندی بەریتانی بەسەر ئیدارەی گفتوگۆکان و ئاڕاستەی دانیشتنەکان" بە روونی دیاربوو، لۆرد بارمۆر لە رەوشێکی ئارام کە پێگە و قورساییە گەورەکەی بەریتانیا پێی بەخشیبوو، قسەی لە ئەنجوومەنی کۆمەڵە دەکرد، بۆیە سەیر نەبوو کە رووی قسەی لە

١- فاضل حسین، مشكلة ...، ل ٥٢" مریم عزیز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ١٧.

٢- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ل٢٤٩-٢٥٠" فاضل حسین، مشكلة ...، ل ٢٥٠.

3- MKIAB, A.G.E, S.44.

4- A.E,SS. 44-45.

ئەندامانی ئەنجوومەن بکات و بڵێت "ئەی برادەران"[1]. لەهەمان کاتدا شاندی تورکی ئەو پێگەی نەبوو کە بەریتانیا هەیبوو، ئەندامیش نەبوو لە کۆمەڵە، ئەو بانگەشانەی بەریتانیا لەبارەی ئەوەی "ئێمە و تورکەکان پشت بە مەرجی یەکسان" لەبەرامبەر ئەنجوومەن[2] دەبەستین، ئەمانە لەراستیدا هەرگیز وانەبوو.

تێڕوانینەکانی بەریتانیا و تورکیا لەبارەی کێشەی موسڵ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی لەبەرامبەر کۆمەڵێ پرسیار دانا، هـ. برانتینک دوای ئەوەی وەك بڕیاردەری ناکۆکییەکان هەڵبژێردرا[3]، راسپێردرا کە ژمارەیەك پرسیار ئاراستەی هەردوولاکە لەبەردەم ئەنجوومەن بکات، بەمشێوەیە هات:

١- چۆن هەردوو شاندەکە کێشەکەیان بۆ ئەنجوومەن رەوانە کردووە، ئایا ئەمە شتێکە لە ماددەی **٣**ی پەیمانی لۆزان هاتووە؟ پێ دەچێت نوێنەری بەریتانی وادادەنێت کە حکوومەتەکەی پێشوەخت بە بڕیاری ئەنجوومەنەوە پابەند بێت، بەڵام شاندی تورکی بیروڕای خۆی لەبارەی ئەو حاڵەوە بەدەرنەخستووە، لەسەر ئەنجوومەن پێویستە ئەو رۆڵەی کە شاندەکە دەیگێڕێت، بەتەواوی بزانێت[4].

٢- مەبەست چییە لە "هێڵی سنووری نێوان عێراق و تورکیا"؟ بۆ حکوومەتی بەریتانی دەبێت ویلایەتی موسڵ بەشێك بێت لە دەوڵەتی عێراقی، ئەو کێشەیەی کە خراوەتە روو، ئەوەیە کە ئایا هێڵی سنووری باکووری عێراق بە شێوەیەکی نزیککراوەیی سنووری ئیداری ویلایەتی موسڵ دەبێت، لەگەڵ لەبەر چاوگرتنی چەند گۆڕانکارییەك بەهۆی فاکتەرەکانی ئەتنی یان ئابووری یان سەربازی کە وادەکەن هێڵی سنووری بە باکووری سنووری ئیداریدا بڕوات، لەهەمان کاتدا کێشەکە لە چاوی حکوومەتی تورکی ئەوەبوو کە ئایا دەبێت ویلایەتی موسڵ وەك بەشێك لە عێراق یان تورکیا دانی پیا دەنرێت[5].

---

١- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٤٩.

٢- المصدر نفسه، ل ٢٤٩.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 498.

4- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 498; Vladimer F.Minorsky, A.G.E, S.36;

- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل٥٢-٥٣.

5- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, S. 36.



٣- ئایا ئەنجوومەن بە ئازادیەکی تەواو کار بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەیەك دەکات کە بە دادوەرانە دەیبینێ، دوای ئەوەی توێژینەوەی کێشەکە بە جدی دەکات؟ یان ئایا هەردوولاکە لەسەر دیارینەکردنی ئەرکی ئەنجوومەن رێککدەکەون، ئەگەر یەکێك لەو دوو بیرۆکە دژەی هەڵبژارد. بۆ ئەنجوومەن هەیە، کە بەدوای هەر چارەسەرێکدا بگەڕێت کەی خۆی بە دادوەری دەزانی[1].

کۆمەڵەی نەتەوەکان بەهۆی ئەو خاڵانەوە چوارچێوە و پێگەی کێشەکەی دیاریکرد. ئەمەش پاڵی بە لۆرد بارمۆرەوە نا کە لە جیاتی حکوومەتەکەی رایبگەیەنێ کە ئەنجوومەن وەك ناوبژیوان دادەنیت، بۆیە دەبێت بڕیاری ئەنجوومەن بەروەختە لەلایەن هەردووکیانەوە قبوڵ بکرێت، حکوومەتەکەی خۆی بە پابەندی هەر بڕیارێکەوە دەبینی کە ئەنجوومەن دەریدەکات[2]، لەوەڵامی پرسیاری دووەمدا بارمۆر جەختی لەوە کردەوە کە بابەتی یاسایی پێویستە لێکۆڵینەوەی لێبکرێت و دیارییکرێت بەر لەوەی هەر رێوشوێنێك وەربگیرێت. پرسیاری سێیەمی بە پۆزەتیڤ وەرگرت، کاتێ گوتی حکوومەتەکەی پاڵپشتی لە ئازادی کارکردنی تەواو دەکات تاکۆ هێڵی سنووری ئێستا بەو رێگایەی کە ئەنجوومەن بە دادوەرانەی دەبینێ، راستبکاتەوە[3].

پێدەچێت فەتحی بەگ هەستی بەو تەنگژەیە کردبێت کە سیاسەتی لەندەن پێیگەیشتووە، بەڵام ئەو هەستکردنەی دواکەوت و دوای کار لە کارترازان هات، کاتێ روونیکردەوە کە حکوومەتەکەی دان بە دەسەڵاتی تەواوی ئەنجوومەنی کۆمەڵە کە بەهۆی ماددەی ١٥ ی میساقی کۆمەڵە پێی بەخشراوە، بەڵام ـ تورکیا ـ لە مافە سەروەریەکانی بەسەر ویلایەتی موسڵەوە بۆ هێچ دەوڵەتێك سازشی نەکرد، هەروەها گوتی بەریتانیای مەزن تاك لایەنە هەوڵی بەشدارییپێکردنی کۆمەڵەی نەتەوەکانی وەك لایەنێك لە کێشەکە داوە[4]. وەڵامەکەی فەتحی ئەو تەنگژەیەی دەربڕی کە حکوومەتی تورکی بەهۆی دبلۆماسیەتی زیرەکانەی بەریتانیا لە کاری سیاسی تێیکەوتبوو، بۆیە وەڵامەکەی بە پێچەوانەی تێڕوانینی بەریتانیا بۆ پرسەکە هات، ئەمەش مانای رێککنەکەوتنی هەردوولا بوو لەسەر ئەو رۆڵەی کە بە کۆمەڵەی نەتەوەکان دەیگێڕێت.

برانتنك قەناعەتی بە وەڵامەکەی فەتحی بەگ نەهات، کە دەیویست دەروازەیەك بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی لە میانەیەوە هەر پابەندیەك هەبێت رزگاری بێت، بۆیە راوێژی لەگەڵ هەردوولاکە کرد،

---

1- A.E,S. 36.

2- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 498.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit., P. 498

٤- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٥١.

توانی فەتحی بەگ والیبکات بڵێت کە "ناکۆکی لە نێوان حکوومەتەکەی و حکوومەتی بەریتانی نییە..." و ئەو (واتە فەتحی بەگ) باوەڕی وایە کە "ئەنجوومەنی کۆمەڵە بڕیاری خۆی لەسەر بنەمای خواستی دانیشتووان دادەنێت"، ئەمەش بەمانای ئەوە دەهات کە ئەو رازییە لەسەر ئەوەی کە ئەنجوومەن لەبارەی ئەو هێڵەوە کە بە گونجاوی دەزانێت، بڕیاری لێدەدات[١].

سەرباری لێدوانی کە فەتحی بەگ لەبارەی رازیبوونی بە پەسندکردنی رۆڵی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ناکۆکییەکەدا، بەڵام ئەوە بەمانای رێکبوونی تێڕوانینی لەگەڵ بەریتانیا نە دەهات، ناکۆکییەکە هەر وەك خۆی مایەوە، بەڵام ئەمە لە دەرکردنی شێوازی ئەو بڕیارەی کە لە ٣٠ ئەیلولی ١٩٢٤ پێی گەیشت، رێگرنەبوو، کە هەردوولای ناچارکرد پابەندی هەر بڕیارێك بن کە لەبارەی کێشە بەرزکراوەکە، ئەنجوومەنی کۆمەڵە بڕیاری لەبارەیەوە دەدات[٢]، لە بڕیارەکە راگەیەنرا کە لیژنەیەکی کۆمەڵەی نەتەوەکان شاندێك بۆ موسڵ رەوانە دەکات، بۆ ئەوەی بەدوای راستییەکاندا بگەڕێت و بڕیاری ئەو لیژنەیە ئەگەر لەلای ئەنجوومەنی کۆمەڵەوە پەسندکرا، لەلای هەردوولاکە پەسند دەکرێت[٣].

بەهاتنی ٣١ی تشرینی یەکەم هەریەکە لە کۆنت پۆل تلکی (مەجەری[٤]) و ئەی. ئێف. فرانس(سویدی[٥]) و ئای. پاولس (بەلجیکی[٦]) بۆ سەرۆکایەتی لیژنەی بەسەرکردنەوەی

---

1- A. J.Toynbee,Op.Cit.,P. 498.

2- Mehmet Gonlubol, A.G.E, S. 75.

٣- ستیفن همسلي لونکريك، العراق...، ل ٢٥٢.

٤- پۆل تلکی: زانایەکی جوگرفی ناسی مەجری بەناوبانگبوو، چەندین پۆستی سیاسی گرنگی وەرگرتووە، وەك وەزیری دەرەوە و دواتر سەرۆك وەزیران لە ١٩٢١، بەهۆی ئەوەوە ئەو بەشەی مەجەر کە لە جەنگ دۆڕاندبووی لە رۆمانیا و سلۆڤاکیای وەرگرتەوە، شارەزایی سیاسییەکەی و هەوڵەکانی، جەماوەرێتی زۆری بۆ پەیدا کردبوو، خۆی بۆ خوێندن و سەرۆکایەتی پەیمانگای جوگرافی مەجەری تەرخانکردبوو، زانیاری کرداری لە بارەی دارِشتنی پرسیاری راپرسی لەسەر ویلایەتی موسڵ هەبوو، بە گوێرەی وەسفی ڤێرسن نموونەی وردی و بابەتی بوون بووە، سەیری:

- اف.فيرسن، ذكريات من الحرب والسلم، ستوكهولم، ١٩٤٢، في: جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ل ٢٢٥-٢٢٨.

٥- ڤیرسن: وەزیری کۆن بووە لە دیپلۆماسەتی سویدی بوو، برادەرەکانی بۆ سەرۆکایەتی لێژنەکەیان هەڵبژارد، چونکە وڵاتەکەی بەشداری جەنگی نەکردبوو، بە ریگا چارەی تەوفیقی ناسرابوو، ـ سەیری:

- ينظر: سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٥ .

٦- پاولس: کۆلۆنێلێکی بەلجیکی بوو، لە جەنگی یەکەم لە سوپای بەلجیکی جەنگاوە، دوای ئەوەی لە سەرەتا لەگەڵ تورکان هاوسۆز، کەوتە ژێر کاریگەری بانگەشەی ئەرمەنەوە، ئەوەی لێ زانراوە کە زوو زوو رای خۆی دەگۆڕێت، سەیری:



راستییەکان هەڵبژێردران، کە بۆ ویلایەتی موسڵ دەچوون[١]، لەکاتێ گەیشتنیان کۆمەڵێ راوێژکاری بەریتانی و تورکی یارمەتیان دەدان.

بەڵام سەرباری رازیبوونی فەرمی بەریتانی و تورکی بۆ بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان، دوای ئەوەی لێژەنەکە کارەکانی تەواو دەکات، بەڵام هەردوو لاکەی کێشەدارەکە دەیانەویست بەسەر رووداوەکاندا پازبدەن و کات بۆ بەرژەوەندی خۆیان بقۆزنەوە، لەمیانەی جووڵانەوەی سەربازی سنوور بەزێن رەوشی تازە لەسەر زەوی جێگیر بکەن.

تورکەکان ویستیان بەهۆی جووڵانەوەی سەربازی سنوور بەزێن بەرەو عێراق پێش بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان بکەون، بۆ ئەوەی دەستکەوتی زیاتر لە ویلایەتە جێناکۆکە بەدەست بهێنن، تورکەکان بە فەرماندەیی جەعفەر تەیار، هێزێکی سەربازیان لە جەزیرە کۆکردەوە، هەوڵێکدا بۆ پەڕینەوە بەرەو ناوچەی رۆژئاوای ویلایەتی موسڵ، لە رووباری هێزل پەڕینەوە[٢]. لەسەرەتای مانگی ئەیلول بەکردەوە ئەو هێزە توانی چەند میلێك بەرەو پێش بچێت، بگەنە رەباتکێ (گوندێکە کەوتۆتە ٥ میل لە باکووری شاری زاخۆ)، بەهاتنی ١٤ ئەیلول هێزە تورکییەکە هاتە ناوچەکە، لە ٢٤ ی تەمووزی ١٩٢٣ بەکردەوە لەناوچەیەك بوون کە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی بەریتانییەکان[٣]. ئەو هێزە سوربوو لەسەر تۆڵەسەندنەوە بۆ والییە تورکییەکە کە لەلایەن ئاشورییەکانەوە بەدیل گیرابوو، بۆیە گوندە ئاشورییەکانیان سوتاند و وێرانکرد، بۆیە ژمارەیەکی زۆریان بەرەو عێراق رایانکرد[٤].

---

- ينظر: جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ل ٣٢٨-٣٢٩.

١- ئەو سێیانە لەلایەن سەرۆکی ئەنجوومەن و بڕیاردەری ناکۆکیەکان دیاریکران، کۆمەڵێ خاڵ و پێوەر لە دیاریکردنی لەبەرچاو گیران، یەکەمیان ئەو سێیانە سەربە وڵاتانی ئەوروپی بچوك بوون، دەبوو بێ لایەن بن، بەریز ڤیرسن کە وەك سەرۆکی لێژنەکە هەلبژێر درا، لە وڵاتیکی بێ لایەن بوو بەشداری جەنگەکەی نەکردبوو، دووەکەی دیکە وڵاتەکەیان بەشداری جەنگەکەی کردبوو، بەڵام بە دوو ئاراستەی پیچەوانە. دووەم، ئەم کەسانە لێهاتوو بوون، هەریەکەیان لەبواری خۆیان پیسپۆر بوون، یەکێکیان جوگرافی و دووەمیان سیاسی و سێیەمیان سەربازی بوون، سەیری:

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 498

٢- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٨. ينظر الملحق رقم ( ٩ ) .

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.501 ; Colonial Office ,Special Report…1920-1931, P42

٤- لێرەوە دوایین، پەیوەندی ئاشورییەکان بە زێدی رەسەنی خۆیان لە هەکاری پچڕا، بوونە پەنابەر لە لای دەسەڵاتی ئینتیدابی بەریتانی لە عێراق، ئەویش لەلای خۆیەوە دوای کۆمەڵێ رێوشوێن بۆ دۆزینەوەی

چالاکییە تورکییەکان لەو ئاستەدا نەوەستا، بەڵکو هێزەکانیان لە کشان بەرەو ناوچە جێناکۆکەکان بەردەوام بوو، بۆیە، بۆ ئەوەی بەریتانیا نەکەوێتە هەڵوێستێکی ناسکەوە، لە ١٢ی ئەیلولی ١٩٢٤ هۆشدارییەکی توندی لەبارەی چالاکییە سەربازییەکان بە تورکەکان دا، هۆشدارییەکە، هەڕەشەشی تێدا بوو، کە دەبێت لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا لە هەموو ئەوناوچانەی کە جێناکۆکین پاشەکشە بکات[1].

تورکەکان گوێیان بە هۆشدارییەکەی بەریتانیا نەدا، بۆیە هێزی ئاسمانی پادشایەتی بەریتانی لە ڕۆژانی ١٤ و ١٧ و ٢٠ ئەیلول بۆردومانی هێزەکانی تورکی لەو ناوچانەی ناو سنووری ویلایەتی موسڵی کرد[2].

شەپۆڵە بۆردومانەکانی هێزی ئاسمانی پادشایەتی بەریتانی نەبووە هۆی وەستانی بەرەوپێشچوونی تورکەکان بەتەواوەتی[3]، یارمەتی تازەیان پێگەیشت، بەمەش توانیان بەرەو پێش بچن و بگەنە گوندی جەلکێ لەسەر ڕووباری خاپور، خاڵە پۆلیسیەکانی عێراقیان

چارەسەری کێشە کەیان، زەوی باشووری کوردستانی بۆ تەرخانکردن، بۆ ئەوەی بیکەن بە زێدی جێگرەوەی ڕەسەنی خۆیان، ئەمەش وایکرد پێکدادان و ململانێ لەگەڵ خاوەن موڵکە شەرعیەکان لە کوردەکان پەیدا ببێت و ڕووبەڕووی بەگری توندی عەشیرەتە کوردییەکان ببنەوە، دەرەنجامی ئەم سیاسەتە دروستبوونی دووبەرەکییەکێ بەردەوام بوو لە نێوان هەردوو گەلەکە، بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی پرۆسەی نیشتەجێکردنی ئاشورییەکان و پیکدادانیان لەگەڵ کورد سەیری:

- Colonial Office ,Special Report …1920-1931,PP.272-275;

- ریاض رشید ناجي الحیدري، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٧.

1- Mehmet Gonlubol, A.G.E, S. 75.

2- Colonial Office, Special Report…1920-1931,P.42; A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.501.

٣ - ئۆلسن لەو باوەڕەدایە کە هێزی ئاسمانی پادشایەتی بەریتانی یارمەتی بەریتانیای دا کە دەست بە ویلایەتی موسڵەوە بگرێت، دوای زنجیرەیەك هێرشی توند دژ بە دەستیوەردانەکانی تورکیا و دژ بە شێخ مەحموود، شایانی باسە ئەو چەکە تورکانی تۆقاند و هانی دان لەبەریتانیا نزیك ببنەوە، بۆ ئەوەی ئەو چەکەیان دەستکەویت تاکو یەکێتی خاکیان پیێ بەهێز بکەن. سەیری:

- R.Olson,Op.Cit.,PP.161-162.



ناچارکرد پاشەکشە بکەن و بنکەی خۆیان تێدا دامەزراند[1]. دواتر ئەو هێزە کە ژمارەیان ١٠٠٠ سەرباز دەبوو ڕۆژئاوای گوندی ئاشوتیان بەزاند[2].

بەریتانییەکان بە پشتبەستن بە ئاشورییەکان ڕووبەڕووی بەرەوپێشچوونەکانی تورکەکان بوونەوە، کە ژمارەیەکیان بۆ ناوچەی بەرواری بران تاکو بەرگری لە ناوچەکە بکەن لە دژی هێرشەکانی تورکی، هەروەها ١١٠ کەسێ عەشیرەتی بالعتاد ئامادەکران و ئەوانیش بۆ بەرواری بردران، پێکدادانی جیا جیا لە نێوان ئاشورییەکان و هێزەکانی تورکی ڕوویاندا[3]. لەلایەکی دیکەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی تورکی لە ئاشوت و جەلکی، هێزی ئاشوری لە چیای زاویتە لەبەرامبەر گوندی ئاشوت کۆکرانەوە، کە بە ٣٠٠ پیاو مەزەندە دەکرا، پێ دەچێت ناسکی هەڵوێستی ئەو هێزانە بەهۆی کەمی ژمارە و جبەخانە وایکرد داوای یارمەتی لە دەسەڵاتی بەریتانیا بکەن، دەسەڵاتی بەریتانی هەریەکە لە مەلیك خۆشابە(سەرکردەیەکی ئاشوری لە گوندی لێزان) و مەلا ئیسماعیل و شەمسەدین لە بەرواری ڕاسپارد کە بەهانای ئەو هێزە بچن، ڕاپۆرتەکان ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە تەیاریی(عەشیرەتیکی گەورەی ئاشورییەکانە) پێویستیان بە جبەخانەی زیاتر هەبوو، ئەمەش دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە تورکەکان جگە لە ئاشوت لە تخوبە(تخوما) و جەلکێش کۆبوونەتەوە[4].

پێدەچوو ئەو چالاکیانەی تورکەکان ڕێکخراو نەبوو، هەروەها جەختی لەسەر ناوچەیەك یان بەرەیەك نەدەکردەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی زاڵبوونی بەریتانی یان کۆکردنەوەی هێز بۆی ئاسان

1- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 501.

٢- برقیة من متصرف الموصل إلی وزارة الداخلیة، بدون عدد، ١٩ أیلول ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي — الدیوان، ملف الأخبار الخارجیة عن الحدود، ش- بغداد، ٩ كانون الأول ١٩٢٣ ـ ٣٠ كانون الأول ١٩٢٤، ل ٩.

٣- برقیة من متصرف الموصل إلی وزارة الداخلیة، عدد ٦٧٥، ١٨ أیلول ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي — الدیوان، ملف الأخبار الخارجیة عن الحدود، ش- بغداد، ٩ كانون الأول ١٩٢٣ ـ ٣٠ كانون الأول ١٩٢٤، ل ٣.

٤- برقیة من متصرف الموصل إلی وزارة الداخلیة، بدون عدد، ١٩ أیلول ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي — الدیوان، ملف الأخبار الخارجیة عن الحدود، ش- بغداد، ٩ كانون الأول ١٩٢٣ ـ ٣٠كانون الأول ١٩٢٤، ل ٢.

نەبێت، جەعفەر پاشا بەیاوەری ژمارەیەك ئەفسەر و ٥ توپهاوێژ بەرەو گوندی سنووری (بـسـیـەیـن) چوون، دوای ئەوەی داگیریان کرد لە بەشی ناوچەی شاخاویی سـندی بنکـەیان لێـدا و دەسـەڵاتی بەریتانی هێزەکانی پۆلیسی ئاکرێ و دهۆکی راسپارد بەرەو ئامێدی بـچن، هـەروەها هـانی ئـەو ئاشوریانەی دهۆکی دا بەهانای ئاشورییەکانی ئامێدیـەوە بـچن، هـەروەها داوای لـە عـەشـیرەتی دۆسکی کرد یارمەتی پۆلیسی (جقله) و (بەرواری) بدەن، تابورێکی لیڤی لـە رەوانـدزەوە جوولـە پێکرا، شانبەشـانی ئەمـە دەسـەڵاتی بـەریتانی کارمەنـدانی ئیـداری ناوچـەکەی راسـپارد کـە دۆستایەتی سەرکردەو ئاغاکانی دەوروبەری ئـاکرێ و بەتایبـەتی بـارزان بەدەسـتبهێنن، راپۆرتـە عێراقییەکان ئەوەش زیاد دەکەن کە موتەسەریفی موسڵ بڕیاریـداوە بـەرەو ناوچـەکانی دهـۆك و زاخۆ بروات، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چاوی بە سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەوێ بکەوێت[1].

پێدەچێت ئەو رێوشوێنانەی ئەم دواییەی بـەریتانیا دژ بـە تورکـەکان دەسـتکەوتی خێـرای هەبێت، کە تورکەکانی ناچارکرد بەرەو گوندی جـای پاشەکـشە بکـەن، بـەڵام دەرەنجامـەکانی پێچەوانە بوون، دواتر هێزەکانی تورکی ٨ هەزار ئاشوریان بەرەو عێراق دەرپەڕاند[2].

لەبەرامبەر ئەم گرژییەی دوایی، گرژی دیپلۆماسی لە نێوان هەردوولاکەی بەخۆیەوە بینی، کاتێ فەتحی بـەگ یادداشـتی نـاڕەزایی کۆبوونـەوەی رۆژی ٢٠ ئـەیلولی ١٩٢٤ ئەنجوومـەنی کۆمەڵە بە حکومەتی بەریتانی دا، لە یادداشتەکەدا هـاتبوو، کـە بـەریتانیا بـەو چـالاکییە سەربازییە ئاسمانی و وشکانیەی ئەم دواییەی "باری ئێستای" پێشێلکردوە و ئەوەشی گوت کە دانەیەکی لە یادداشتەکە بە سکرتێری گشتی کۆمەڵە داوە[3].

وەڵامی بـەریتان بـۆ یادداشـتە تورکییەکـە لـە لـۆرد بـارمۆر لـە ٣٠ ئـەیلول لەمیانـەی کۆبوونـەوەی ئەنجوومـەنی کۆمەڵـە هـات، کـاتێ دوو یادداشـتی بـەناوی حکومەتەکـەی پێشکەشکرد، کە بەرپرسیارێتی "پەشێوەیە سنووریەکانی" خستە ئەستۆی تورکەکان، ئەوەشی باسکرد کە تورکەکان پابەندی ئەو بەڵێنە نەبوونە کە لەبارەی پاراستنی رەوشی ئێستا لەناوچـە

---

١- برقية من متصرف لواء الموصل إلى وزارة الداخلية، عدد ٦٩٤، ٢٠ أيلـول ١٩٢٤، المركز الـوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي — الـديوان، ملـف الأخبـار الخارجيـة عـن الحـدود، ش- بغـداد، ٩ كـانون الأول ١٩٢٣ ـ ٣٠ كانون الأول ١٩٢٤، ل ٨.

٢- سي.جي.أدمونز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٨.

٣- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٥٥.



سنووریەکان دابوویان، تا ئـەو کاتـەی کۆمەڵـەی نەتـەوەکان دەتـوانێ ناکۆکییەکـە یـەکلایی بکاتەوە. لە کۆتاییدا نکۆڵی لە هێرشەکانی ئەو دواییەی بۆسەر خاکی عێراقی کرد[1].

بانگەشەکانی بەریتانیا لەلای تورکەکان بە بانگەشـەی دژ وەڵامدرایـەوە، هـەمان شـتیش لەلای بەریتانییەکانەوە کرا[2]، رۆژنامە بەریتانییەکان مەترسی رەوشـی ئێـستا هۆشـداریان دا، ئاماژەیان بۆ ئەو مەترسیانە کرد کە بـەهۆی فراوانخـوازی تـورکی پەیـدا دەبێـت و هەڕەشـەی ئەوەیان کرد کە "حکوومەتی بەریتانی ناتوانێت بەرگـەی پێـشێلکاری تورکـەکان بـۆ پـەیمانی لۆزان بگرن، بەریتانیا بەرگری دەستدرێژی دەکات"[3].

نەبوونی کاریگەری هەر رێککەوتنێك یان تێگەیشتنێك بەروونی دیار بـوو، ترسـی ئـەوەی ئەو پەرەسەندانەی دوایی ناوچەکە بەرەو جەنگێك ببات کە دەرەنجامـەکانی بـۆ هەردوولاکـە و ناوچەکە نـەزانراو بێـت، ئەمـەش وای لـە هـەردوو حکوومەتەکـە کـرد سـەرلەنوێ پـەنا بـۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە ببەنەوە بۆ چارەسەری ناکۆکییەکانیان، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت.

لـە کۆبوونـەوەی نائاسـایی رۆژی ٢٧ی تـشرینی یەکـەمی ١٩٢٤ ئەنجوومـەن گـوێ لـە تێڕوانینی هەردوولاکە گرت، ئەنجوومەن ئەوەی بە بیرهێنانەوە کە ئەوان بەڵێنیان داوە بە هـەر بڕیارێك رازی دەبن کە لەبارەی چارەنووسی ویلایەتەکە دەدرێت، هـەروەها هانیـدان کـە هـیچ کردەیەکی سەربازی ئەنجام نەدەن کە رەوشی ئێستا بگۆڕێت، هەروەها بڕیاردرا کـە لیژنەیـەکی تایبەت بۆ لیکۆلینەوە لە شوێنەکە دیاری بکرێت، تاك راسـپاردە بـدات بـۆ ئـەوەی یارمـەتی ئەنجوومەن بدات تاکو بگاتە چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ کێشەکە[4].

لە هەمان کۆبوونەوەکەدا خاڵێکی دیکەی ناکۆکی ورژێنرا، کاتێ لۆرد بارمۆر رەوشی ئێـستای وا راڤە کرد کە واتـای وایـە ئـەو رەوشـەیە کـە لـە ٢٤ی تـەمووزی ١٩٢٣ەوە (لـە سـاتەوەختی

---

١- رياض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ل٢٢٨-٢٢٩.

- شێوازی یادداشتەکەی بەریتانی خۆی هەڵ’ بوو، لەگەڵ بڕیارەکانی لۆزان لە بارەی چارەنووسـی ویلایەتەکـە ناکۆك بوو، چونکە باشووری کوردستان تا ساڵی ١٩٢٦ بە فەرمی نەببووە بەشێك لە عێراق.

2- S.H. Longrigge,Op.Cit.,P. 153.

٣- رياض رشيد ناجي الحيدري، سەرچاوەی پێشو، ل ل٢٢٨-٢٢٩.

4- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, SS.37-38

- سي.جي.أدمونز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٨.

مۆرکردنی پەیمانی لۆزانەوە) هەیە، هێزەکانی تورکیای بەداگیرکردنی ئـەو ناوچـانەی کـە لـە ٢٤ی ئەیلول بۆی چووە، تۆمەتبارکرد و داوای لە ئەنجومەن کـرد روونکردنەوەیـەك بـدات و مانـای ئـەو بەڵێنانەی کە لە بڕگەی دووەمی ماددەی سێیەمی پەیمانی لـۆزان هـاتووە، دیـاری بکـات[1]. دواتـر نەخشەیەکی پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆمەڵە کرد، کە هێڵی شینی پچڕ پچڕ و هێڵی سوری پچڕپچڕ و هێڵی سوری نا پچڕپچڕی تێدا بوو، باسی لەوە کرد کە هێڵی شـینی پـچڕ پـچڕ ئـەو هێڵەیەکـە حکوومەتی بەریتانی داوای لە ئەنجوومەن کردووە ڕەزامەندی لەسەر بدات، هەرچی هێڵی سوری نـا پچڕ پچڕە ئەوە ئەوا هێڵی سنووری ئیداری عێراقە لەوەتەی تەمووزی ١٩٢٣ەوە، دووبارە داوایکرد کە حکوومەتی تورکی بۆ باکووری هێڵی سوری نا پچڕ پچڕ پاشەکشە بکات[2].

فەتحی بەگ بە کورتی هەر لە شەرەوستانی مۆدرۆسەوە وەڵامی دایەوە، ئاماژەی بە بڕگـەی دووەمی ماددەی ٢٧ی پەیمانی سیڤەر کرد، کە هێڵی ڕاستەقینەی سنووری باکووری ویلایـەتی موسڵ وەسف دەکات، بەریتانییەکانی بە پاڵنانی هێڵی سنووری سـیڤەر بـۆ بـاکوور لـە دوای ساڵی ١٩٢٠ەوە تۆمەتبارکرد، هەروەها ئەو تۆمەتانەی حکوومەتەکەی لـەبارەی پێـشێلکاری بەریتانی بۆ باری ئێستا دووپاتکردەوە، بەهۆی ئەو چالاکییە سەربازیانەی کـە لـە سـلێمانی و لەسەر سنووری ویلایەتی موسڵ ئەنجامیان دەدات[3].

ئەو کۆبوونەوەیە لەناکاوەی ئەنجوومەن کە لە ٢٩ی تشرینی یەکـەمی ١٩٢٤ لـە برۆکـسل ئەنجامدرا، تێیدا هەردوولاکە بەریتانی و تورکی گەیشتنە ڕێککـەوتنێك، بەهۆیـەوە هـەردوولا هێزەکانیان لە هەردوولای هێڵی سنووری کە نێوبژیوانی بەلجیکی میـسۆ برانتینـك پێـشنیازی کردبوو پاشەکشە پێ دەکەن[4]. ئەو هێڵە لەبری ئەوەی بەسەر زنجیرە چیایەکاندا بـڕوات لـەپاڵ

1- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, S. 38;

- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٣٤٨-٣٤٩" فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٥٦.

2- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, SS.37-38.

٣- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٥٧.

٤- لە ٢١ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤ سێر برانتینك لەگەڵ هەردوو یاریدەدەرەکەی کـە یـەکێکیان ئیـسپانی ئەوەی دیکەیان ئۆرگوایی بوو سەردانی ناوچە جێناکۆکەکانیان کرد، ڕاپۆرتیان نووسی و تێیدا تویژینەوەیان لـە بارەی جوگرافیای ناوچەکە کردبوو، گوتی: "ئامانجی گەشتەکەی ئەوەیـە ڕێوشـوێنێك بگریتەبـەر کـە ئاشـتی بەرقەرار بکات، سنووریك بۆ پێشیلکاری و پیکدادانە سەربازییەکان دابنێ، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێـت،



ڕێڕەوی ڕووبارەکان دەڕوات، خەریکە لـە سـنووری کـۆنی نێـوان هـەردوو ویلایـەتی موسـڵ و هەکاری نزیك دەبێتەوە[1] و بەجۆرێك بۆ باشووری ئەو هێڵەی کە پێـشتر حکوومـەتی بـەریتانی داوای دەکرد، درێژ دەبێتەوە، هەندێك لەو ناوچانەی هەڵاوێرد کـە پێـشتر ئاشـورییەکانی تێـدا نیشتەجێ ببوون[2]. ئەو هێڵە یارمەتی زۆری لە سـووککردنی بارگرژیـەکانی سـنووری دا، بـەبێ ئەوەی کار لە بڕیاری کۆتایی ئەنجوومەنی کۆمەڵە بکات[3].

یەکلاییکردنەوەی کاتیێ ڕووەوداوەکانی سنوور، یارمەتی سـووکردنی ڕەوشـی دوژمنـداری نێوان تورك و بەریتانیای دا، پێ دەچێت یەکلاییکردنەوەکە پاڵی بە حکوومەتی تورکییـەوە نابێت هەوڵێکی تازە بۆ کاریگەری نواند لەسەر هەڵوێستی بەریتانی بدات، کـاتێ زەکـائیی بەگی بە وەزیری دەسەڵاتی پێدراو لە شوێنی یوسف کـەمال دیـاریکرد، یوسـف کـەمال بـە مەیلی بەرامبەر سۆڤیەت ناسرابوو، شایانی باسە ئـەو وەزیـرە نوێیـە تورکییـە، پەیوەنـدی توندی بە لیژنەکانی ئابووری و بازرگانی کۆنگرەی لۆزانەوە هەبوو[4]، دامەزراندنی لە لەنـدەن وەك هەوڵێکی تورکیا بوو بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانی بـوو لەگـەڵ بـەریتانیا، هەروەها بۆ ئەوەی بیکات بە کارتێکی زیادەی دیکە بۆ فـشار خـستنە سـەر بـەریتانیا لـە گفتوگۆکانی لەبارەی موسڵ.

تا ئەوکاتـەی چارەسـەریك دەدۆزرێتـەوە". برانتینـك هێڵێکـی دانـا کـە دواتـر بـە هیلـی برۆکـسل ناسـرا، هەردوولاکەی ناچار کرد پێوەی پابەندبن و ڕێزی لێبگرن، بەکردەوەش پرۆژەکەی پەسـندکراو لەلایـەن هـەموو لایەنەکانەوە شتایشیش کرا، ئەویش ئەو سنوورەی ئیستای نێوان عێراق و تورکیایە، بەچـەند گۆرانکارییـەکی بچووکەوە. سەیری:

- Vladimer F.Minorsky, A.G.E, SS. 38-39

- سەیری پاشکۆی ژمارە (١٠) بکە.

١- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٩" أصغر جعفري ولداني، سەرچاوەی پێشو، ل٦٧.

2- S.H. Longrigge,Op.Cit.,P. 153.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٥٢.

4- Henderson to MacDonald, Constantinople, 16-9-1924, IBTK, No. 685, PP. 14-15.

# چارەسەری کێشەی موسڵ لە کۆمەڵەی نەتەوەکان

## (کانوونی یەکەمی ١٩٢٥)

بەر لەوەی لە شوباتی ١٩٢٥ لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان بۆ ویلایەتی موسڵ بچێت، ئیدارەی بەریتانی لە عێراق و حکوومەتی تورکی کۆمەڵێ رێوشوێنیان بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستیان لە نێوان دانیشتووان ویلایەتەکە گرتەبەر، بەتایبەتی لە نێو دانیشتووانە کوردییەکەی[1]. لە کانوونی دووەمی ١٩٢٥ عەبدولموحسین سەعدون وەزیری ناوخۆی عێراق گەڕانێکی بە هەرێمی باشووری کوردستان بەدیاریکراوی بۆ هەولێر کرد، لەمیانەی گەشتەکەیدا بەڵێنی دا کە مافە نیشتیمانییەکان کورد پارێزراو دەبێت و دواتر دانی پیادەنرێت، ئەگەر ئەوان بڕیاری تێکەڵاوبوون بە عێراقەوە بدەن[2]. لەهەمان چوارچێوەدا وەك بەشێك لە هەڵمەتی داڕێژراو بۆ پارێزگاریکردن لە ویلایەتەکە، لە شاری موسڵ کۆمەڵێ پارتی خودان مەیلی نەتەوەیی دروستبوون[3]. شانبەشانی ئەو چالاکیانە،

١- اندره نوسشي، الصراعات البترولية في الشرق الأوسط، دار الحقيقة، بيروت، ١٩٧١، ل ١٤٣.

٢- لەو سەردانەیدا بە گوێڕایەڵی دەسەڵاتی بەریتانی کۆنگرەیەکی لە هەولێر سازکرد و تییدا زۆر بەڵێنی بە کورد دا، ئەو بەڵێنانە خۆی لە قەرەبوو کردنەوەی زیان لێکەوتووانی هەڵمەتەکانی بەریتانیا بۆ سەر لایەنگرانی شێخ مەحموود و دلنیایکردنەوە کە حاکمی شارەکان لە کورد دەبن. هەروەها جەختی لەسەر وەرگرتنی رێوشوێنی بەپەلە کردەوە، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەولەکانی تورکیا کە بە ئامانجی نانەوە نا ئارامی لە کوردستان دەدات لەکاتی سەردانیکردنی لیژنە نێودەوڵەتیەکە. سەیری:

- عثمان علي، العامل ...، ل ٣٢ .

٣- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەو پارتانەی کە بۆ بەرگری لە موسڵ دروستبوون سەیری:

- فاروق صالح العمر، الأحزاب السياسية في العراق في عهد الانتداب، ١٩٢١-١٩٣٢، في: المفصل في تاريخ العراق، بغداد، ٢٠٠٢، ل ل ٣٠٧-٣١٢.



هەڵمەتێکی راگەیاندنیش کە لەلایەن رۆژنامە گرنگەکانی عێراق بە گشتی و موسڵ بەتایبەتی خرابووە گەڕ[1].

هەرچی حکوومەتی ئەنقەرە بوو، ئەوا هەڵوێستی بەگشتی لە ئیدارەی بەریتانی لە عێراق کەمتر عاقڵانە و واقعبین بوو، هێشتا وازی لە شێوازە کۆنەکەی نەهێنابوو لەبارەی نانەوەی نیگەرانی لەسەر سنوور و تۆقاندنی خەڵکی بەتایبەتی ئەوانەی لایەنگیری ئەویان نەدەکرد. یەکە سەربازییەکانی نزیك سنووری ویلایەتەکە لە تەنگپێهەڵچنینی دانیشتووانی گوندەکانی ئەوێ بەردەوام بوون، سەربازە تورکەکان راهاتبوون بە زۆر خواردن و ئاژەڵیان لە دانیشتووانی ئەو گوندانە دەسەند، بەتایبەتی لە عەشیرەتی گۆیان- عەشیرەتیکی گەورەی کوردییە، لە نێوان کوردستانی تورکیا و کوردستانی عێراق دابەشبووینە- ئەو رێوشوێن و هەڵسوکەوتانەی زیاتر دانیشتووانی لە تورکەکان تووڕەکرد[2].

پێدەچوو کە بەریتانیا پەیوەندی بە دانیشتووانی ویلایەتەکە ـ کە زۆربەی کوردن ـ زامن کردبێت، چونکە هەنگاوێکی زۆری تێکەڵاوکردنیان بە عێراقەوە بریبوو[3]. بە پێچەوانەوە،

لەراستیدا، دروستبوونی پارتەکان هەر لەشاری موسڵ نەبوو، بەڵکو لە ١٩ ی شوباتی ١٩٢٥ کۆمەڵەی بەرگری نیشتیمانی لە سلێمانی بەسەرۆکایەتی ئەحمد تۆفیق پێکهات، ئامانج لە دروستبوونی ئەم کۆمەڵەیە پوچەڵکردنەوەی بانگەشەکانی حکوومەتی تورکی و داخوازی وەرگرتنی ویلایەتەکە بوو، لە چالاکییەکانی و بیروڕا سیاسییەکانی دەردەکەوت کە حکوومەتی عێراقی و ئیدارەی بەریتانی لەپشت دروستکردنی ئەو کۆمەڵەیەوەن، سەیری:

- ژیانەوە، جریدە، السليمانية، ژمارە (١٦)، ١٩ شوبات ١٩٢٥ . لە ژیانەوە وشوێنی لە روژنامە نووسیی کوردیدا ١٩٢٤-١٩٢٦، عبدوللا زەنگەنە، پێشەکی و پێداچوونەوەی کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەولێر، ٢٠٠٠.

١- ئەو رۆژنامانە لە بلاوکراوەکانیان خراپەکارییەکانی تورکان و نایەکسانی و مامەڵەی خراپی کارمەندانی حوکمی عوسمانیان بە بیر خەڵکیان دەهێنایەوە، سەیری:

- عبد الأمير هادي العكام، الحركة الوطنية في العراق، ١٩٢١-١٩٣٢، بغداد، ١٩٧٥، ل ل ١٧٧-١٨١

- ژیانەوە، رۆژنامە، ژمارە ١٦ سلێمانی ١٩شوبات ١٩٢٥ و ژمارە ١٧ لە ٢٣شوبات ١٩٢٥ لە: ژیانەوەو شوێنی...

٢- مذكرة من متصرف لواء الموصل إلى وزير الداخلية، نموذج عام (١٢)، ١٩٢٤/١٢/٣٠، سري، المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي ـ الديوان، ملف الاخبار الخارجية عن الحدود، ش ـ بغداد، ٩ كانون الاول ١٩٢٣-٣٠ كانون الاول ١٩٢٤، ل ١٠.

٣- بەهاتنی ١٩٢٥، ئیدارەی بەریتانی لە عێراق توانی باوەڕ بە گورد بهێنێت کە بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لە باشووری کوردستان نوێنەری هۆیان هەڵببژێر ن، ئەمەش دوای ئەوەی پێشتر خەڵکی سلێمانی

ترسی تورکیا له مانەوەی کورد له دەرەوەی دەسەڵات، که دەتوانن کاریگەری لەسەر براکانیان ئەوانەی لەناو تورکیا ماونەتەوە دابنێن[1]. تۆینبی A.J.Toynbee هەڵوێستی تورکیای لەبارەی ویلایەتی موسڵ بەمشێوەیە دەربڕی و گوتی: "پاڵنەری گەورەی داواکردنی ویلایەتی موسڵ لای تورکەکان، نه ئابووریه و نه ستراتیژیه، بەڵکو سیاسییه و پەیوەسته به کوردەوە.....کەمالییەکان چاویان لەوەی بوو هەموو کوردستان له ژێر دەستی خۆیان یەکبخەن، ئەوان پارچەبوونی کوردستان به سەرچاوەی مەترسی بەردەوام بۆ تورکیا دەزانن"[2]. پێدەچوو ئەو ترسه له دوای شڵەژان و سەرلێشوانی تورکەکان بێت، بەرامبەر ویلایەتەکه.

ترسی تورکیا له له دەستدانی ویلایەتەکه، باوەڕی بەریتانی له پێویستبوونی هێشتنەوەی ویلایەتەکەی لەچاوچێوەی عێراق زیاتر کرد، بەهەر نرخێك بێت، چونکه له عێراق زاڵبوون بەسەر کێڵگه نەوتییەکان ئاسانتر دەبێت، وەك له تورکیا[3]. بێ ئەوەی که ئەمه له گرنگی ستراتیژی ویلایەتەکه بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا کەمبکاتەوە.

---

رەتیانکردەوە که بەشداریکردن له راپرسی بۆ دیاریکردنی مەلیك فەیسەڵ بەکەن. هەروەها خەلکی شاری کەرکوك له ١٩٢٢ له دژی ئەو دەنگیان دا، لەبەرامبەردا تورکیا رۆڵی کوردی کەمدەکردەوە، دوای ئەوەی مستەفا کەمال سیستەمەکەی لەسەر بنەمای نەتەوەیی — عەلمانی دامەزراند و کوردی له پۆسته حکومیەکان دوورخستەوە، هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت واتا نەمانی تاکه پەیوەندی نێوان کورد و تورك. سەیری:

Colonial Office ,Special Report …1921-1931,P.58; Report by His Majesty’s - Government on the Administration of Iraq for the period April 1923-December .1925, issued by Colonial Office, London, 1925,P.33

١- سر ريد بولارد، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٤" فيليب روبنس، تركيا و الشرق الأوسط، ترجمة ميخائيل نجم خوري، قبرص، ١٩٩٣، ل ٣٠.

٢- مقتبس من: لازاريف، المسالَة الكوردیية ١٩١٧-١٩٢٣، ل ٢٤٨.

٣- نوري عبدالحميد خليل، التاريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق١٩٢٥-١٩٥٢، بغداد، ١٩٨٠، ل ٥٩.

هەرچەنده سیاسەتمەدارانی بەریتانی بەردەوام بوونی پەیوەندی نێوان نەوت و کێشەی موسڵیاننکۆڵی دەکرد، بەڵام بەڵگەنامەکانی وەزارەتی موستەعمەرات ئەو بانگەشەیه رەت دەکردەوە، بەڵگەی زۆری له بارەی بوونی پەیوەندی تێئاڵاوی بەهێزی نێوان هەردوو پرسەکه دەدات بەدەستەوە، بۆ زانیاری زیاتر سەیری: -

- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٥٧" جرجيس فتح الله، النفط قرر مصير ...، ل ٢٤.



دوای ئەوەی به کێشانی هێڵی برۆکسل کاری ئاسان بوو، لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان به سێ ئەندامەکەیەوە له ١٣ تشرینی دووەمی ١٩٢٤ له جنیڤ کۆبووەوە[1]. دوای ئەوەی ڤێرسن لەلایەن برادەرەکانیەوە بۆ سەرۆکایەتی شاندەکه هەلبژێردرا، لیژنەکه توێژینەوەی کۆنووسی دانیشتنەکانی لۆزان و ئەنجوومەنی کۆمەڵه و یادداشتی هەردوو حکوومەتی بەریتانی و تورکی کرد. لیژنەکه وابینی که خۆی سەردانی ناوچەی جێناکۆك بکات و لیکۆلینەوەی خۆی بکات و ئەو زانیاریانەی به پێویستی دەزانیت کۆیان بکاتەوە[2]. وای بەباش زانی که دەبێت زانیاری له بەڵگەنامەکانی هەردوو حکوومەتەکه وەربگرێت، بۆیه لیژنەکه لیستیکی پرسیاری لەبارەی بابەتەکه بۆ هەردوو حکوومەتەکه نارد[3]. بەر لەوەی بۆ بەغدا بچێت، سەردانی لەندەن و ئەنقەرەی کرد، بۆ ئەوەی وردەکاری زیاتر لەبارەی کێشەکه وەربگرێت[4].

لیژنەکه له لەندەن گفتوگۆی دوو قۆڵی لەگەڵ هەریەکه له ئۆستن جمبرڵن (Austen Chamberlain 1836-1937)ی وەزیری دەرەوە و ئەمیری Amery وەزیری موستەعمەرات کرد، ئەم دووانه ویستیان له دانیشتنی رۆژی ٢٥ تشرینی دووەمی ١٩٢٥ ئەندامانی لیژنەکه به بیروبۆچوونی بەریتانی لەبارەی چارەسەری کێشەکه رازی بکەن، که شێوازی بەسەرکردنەوەی راستییەکانی پێ له سازکردنی راپرسی باشتر بوو[5].

چاوپێکەوتنەکانی لیژنەکه به بەرپرسانی بەریتانی و گفتوگۆکانیان لەبارەی شێوازی کارکردنی لیژنەکه، بەس بوو بۆ ئەوەی لیژنەکه بڵێت که "به دیاریکردنی شێوەیەکی دیاریکراوی کارکردن رازی نابێت، لیژنه توانای هەلبژاردنی ئەو رێگاچارانەی هەیه که به گونجاوی دەبینێ جا چ راپرسی بێت یان شتی دیکه بێت"[6]، بەڵام داوای له حکوومەتی

---

1- Peter J.Beck,Op.Cit.,P.263.

2- League of Nations, Questions…,P.1.

٣- عبد الأمير هادي العكام، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦٩.

4- League of Nations, Questions…,P.1.

٥- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٢٩.

٦- المصدر نفسه، ل ٣٢٩"

-League of Nations, Questions…,P.1.

بەریتانی کرد کە یاریدەدەریکی بنێرێت، تاکوە یاوەری لیژنەکە بۆ شـوێنی جینـاکۆك بکـات[1]. حکوومەتی لەندەن لەبارەی روونکردنەوەی لیژنەکە نارەزایەتی پێشان نەدا، چونکە نەیدەویست سەرلەنوێ شتەکان بشێوێنێ و کۆسپ لەبەردەم ئەو لیژنەیەی کە خۆی پلانـی دیـاریکردنی بـۆ دارشت تاکو ناکۆکییەکان یەلایی بکاتەوە لەو ویلایەتە، دابنێ.

ئەندامانی شاندەکە لە لەندەنەوە بەرەو ئەستەمبۆڵ چـوون، کـە هاوکـات بـوو لەگـەڵ جەژنی سەری سـاڵ، دوای ئـەوەی بوونـە میـوانی بالیۆزخانـەی واشـنتۆن، بەشـداریان لـە ئاهـەنگی جەژنەکـە لەگـەڵ دیبلۆماتکـارە ئەمریکیـەکان کـرد[2]. بـەهاتنی ٣ی کـانوونی دووەمی ١٩٢٥ ئەندامانی شاندەکە بـە شـەمەندەفەریکی خێـرا بـەرەو ئەنقـەرە چـوون و گفتوگۆکانیان لەگەڵ بەرپرسانی تورکی دەست پێکرد، وا وەسفکرا کـە وەك ئـەوەی لەگـەڵ حکوومەتی بەریتانی روویدا لەگەڵ ئەوانیش روویدا[3]. حکوومـەتی تورکی سـووربوو لەسـەر ئەوەی کە دەبێت بڕیاری کۆتایی لیژنەکە لەسەر ئەنجامدانی راپرسی گشتی بونیادنرا بێـت، کە لیژنەکە رەتیکردەوە پیوەی پابەند بێت و هەڕەشەی گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتوون، کرد، ئەگەر تورکەکان لەسەر داواکەیان سوربن، بەڵام تورکەکان لـە کۆتـایی پێـی رازیبوون، باوەڕیان بەوە هێنا کە دەستتیوەردان لە کاری لیژنەکە سوود ی نابێت، وەڵامـی داواکەی لیژنەکەیان دایەوە، بڕیاردرا کە جەواد پاشا پشکنەری گشتی سوپا لـە دیاربـەکر، نوێنەرایەتی تورکیا لە شاندەکە بکات و یارمەتیدەر و پاشـکۆی شـاندەکە بێـت و لەگـەڵ ژمارەیەك شارەزا یاوەریان لە ئەرکەکـەیان بکـات[4]. شـاندەکە بەسـەردانێکردنی مـستەفا کەمال لە قونیا کۆتایی بە سەردانەکەی بۆ تورکیا هێنا، کە بۆ دیمەشق و دواتر بـۆ بەغـدا چوون، کە رۆژی ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ گەیشتنە بەغدا[5].

شەشە لە ئەندامانی لیژنەکە لەماڵی هینری دوبـسی نوێنـەری بـاڵای بـەریتانی دابـەزین، ئەوانی دیکە لە هوتێلەکانی پایتەخت دابەزین، لە ١٧ کانوونی دووەم لیژنەکە سەردانی مەلیك

1- League of Nations, Questions…, P.1.

٢- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٣٠.

٣- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٣٠.

4- League of Nations, Questions…, P.1.

٥- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ل ٣٣١-٣٣٢.



فەیسەڵیان کرد، ئەویش ئاهەنگی پێشوازی بۆ سازکردن. شاندەکە لەلایەن حکوومەت و گـەلی عێراقییەوە شەرپەرشتی دەکران[1].

لیژنەکە لە بەغدا چەندین رۆژ مایەوە، لەو ماوەیەدا تویژنەوەی پەیوەندییە ئابوورییـەکانی نێوان ولایەتی بەغدا و موسڵ شێوازی بـەڕێوەبردنی کـرد، یادداشـتێکی لـە مـەلیك فەیـسەڵ وەرگرت، کە گرنگی ویلایەتی موسڵ بـۆ عێـراق روون دەکاتـەوە، جـەختی لـەوە کـردەوە کـە کێشەی موسڵ کێشەی هەموو عێراقە، هەروە موسڵ بۆ عێراق وەك "سەرە بۆ لەش"[2].

لە رۆژی ٢٦ کانوونی دووەمی ١٩٢٥ شاندەکە بەغدای بەرەو موسـڵ جێهێـشت، مـستەر جاردین و سەبیح نەشئەت وەك نوێنەر و پاشکۆی حکوومەتی عێراقی یـاوەری کـردن[3]. دواتـر ئەدمۆنز وەك ئەفسەری گرێدراو پەیوەندی پێیانەوە کرد[4].

شاندەکە لە موسڵ سەردانی چەند کەسانێکی شارەزا و زانا کـرد، بـۆ ئـەوەی بیرۆکەیـەکی لـەبارەی رەوشـەکە لا دروسـت بـبێ. هـەروەها چـاوی بـە دەسـەڵاتدارانی نـاوخۆیی کـەوت، لێکۆڵینەوەی لە دەوروبەری ویلایەتەکە دەستپێکرد[5]. دواتـر سـەردانی شـاری هـەولێری کـرد، چاوی بە دانیشتووانی کۆیە و رەواندز کەوت، لە سلێمانی و کەرکوك و دهۆك و زاخۆ و شێخان کارەکانی درێژەپێدا[6]. لەوێ ئەحواڵ و گـرفتی ئـابووری و بازرگـانی خـەڵکیان بەسـەرکردەوە،

١- عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط ٧، بغداد، ١٩٨٨، ج ١، ل ٢٦٥" عبدالرزاق محمد اسود، موسوعة العراق السياسية، بيروت، ١٩٨٦، ج ٢، ل ٦٠٣.

٢- عبدالفتاح علي البوتاني، مذكرة الملك فيصل إلى لجنة التحقيق الدولية حول مشكلة الموصل (رأي وتعقيب، كولان العربي)، مجلة، أربيل العدد ٤٩، ٣٠ حزيران، ٢٠٠٠، ل ل ٣٦-٤١.

٣- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات ...، ج١، ل ٢٢٦.

٤- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٥٦.

5- League of Nations, Questions…,P.3 f.

٦- لەسەردانی شاری سلێمانی، بۆی دەرکەوت کە ئەو شارە تەنها کوردی تێدا نیشتەجێیە، لـە راپۆرتەکـەیان هاتووە کە کوردی سلێمانی سەرباری ئەوەی عێراق لە تورکیا بە باشتر دەزانن، بەڵام داوای حوکمی زاتی فراوان بە **پاڵپشتی** ئینگلیز دەکەن، ئەو هەڵوێستە یەکگرتووەیان بـووە مایـەی پیـا هـەڵگوتن و رێـزی بەرپرسـانی بەریتانی و ئەندامانی لیژنەکە وەك یەك. سەیری:

- سي.جي.أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٨٦.

چاویان لە کێشە ئەتنی و جیۆلۆجیەکانی کرد و زیانیاریـان لـەبارەی هۆکارەکـانی کـشتوکاڵ و گەیاندن کۆکردەوە[1]. دواتر لیژنەکە پێشنیازی تورکیای لەبارەی پێویستی ئەنجامـدانی راپرسـی تاوتوێکرد، هەروەها لیژنەکە توێژینەوەی لەبارەی پاساوەکانی حکوومەتی بەریتانی بۆ سەختی ئەنجامدانی راپرسی کرد. شاندەکە ویستی راپرسیەکی ئەزموونی ئەنجامبدات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، چونکە رۆشنبیری زۆرینەی دانیشتووانی ویلایەتەکە سەرەتایی بوو[2]. شاندەکە لـە ئـازار کۆتایی بەکارەکانی هێنا، چەند رۆژێك بە رێکخستنی ئەو زانیارییانەی کۆیکردبوونـەوە، بـوو، دواتر بەرەو جنێڤ بەرێکەوت[3].

---

ڤیرسن لە بارەی ئەمە گوتی: "لەو ناوچەیە، - مەبەستی سلێمانیە- ئیمە شایەدی بینینی بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی کوردی بووین، کە چاوی لە سەربەخۆیی تەواو بوو، بەڵام بە سەرپەرشتی کلتور و شارستانیەتی ئەوروپی، سەیری:

- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٧٧.

هەرچی سەبارەت بە کەرکوك بوو، لەبەرئەوەی یەك رەنگ نەبوو، بۆیە بیروڕاشـیان هەمـەجۆر بـوو، جگـە لـە ٣٥٦٥٠ عەرەب، ٤٧٥٠٠ کورد و ٢٦١٠٠ تورکی و ٢٤٠٠ مەسـیحی لەگـەڵ عێـراق بـوون، تورکمانـەکان زۆربەیان لەگەڵ تورکیا بوون، هەرچی کورد و عەرەب بوو، ئەوا بیروڕایان جیاواز و ناتەبا بوو، سەیری:

- League of Nations,Questions… , P.77.

سەبارەت بە هەولێر کە زۆرینەی زۆری کوردە، مەیل بەلای تورکدا زاڵ بوو، سەیری:

- Ibid,P.77.

سەبارەت بە موسڵ ـ شار و قەزاکانی، بەهۆی چالاکی پارتە نەتەوەییە عەرەبیەکان، عەرەبەکان عێراقیان پێ باشتر بوو، هەرچی کوردی شارەکە بوو، کە هەستی نەتەوەیی و خواستی نەتەوەییان لە براکانیان لـە سـلێمانی کەمتر پەرەی سەندبوو، ئەوا شاندەکە نەیتوانی بیروڕایان بچەسپێنێ. هەرچی تورکمانی تەلەعفەر بوو، ئەوا بە پەرۆشەوە لەگەڵ تورکیا بوون. سەیری:

- Ibid,P.77.

- ينظر الملحق رقم ( ١١ )، والملحق رقم ( ١٢ ).

١- محمد عبدالحسن المياح، مشكلة الموصل وترسيم الحدود العراقية — التركية، في: مجموعة من المؤلفين العـراقيين في: المفصل في تاريخ العراق، بغداد، ٢٠٠٢، ل ٦٢٩.

٢- فاضل حسين، مؤتمر لوزان...، ل ٤٧" عبدالرزاق محمد اسود، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٠٤.

٣- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٦٨" عبدالرزاق محمد اسود، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٠٩.



لیژنەکە بە وردی توێژینەوەی ئەو زانیاری و ئامارانەی کە هەردوو حکوومەتی بـەریتانی و تورکی لە یادداشتەکەیاندا خستبوویانە روو،کرد، دوای ئـەوەی لەگـەڵ زانیـاری و ئامارەکـانی خۆی بەراوردی کردن، بۆی دەرکەوت کە هەر حکوومەتەو دەیەویت بسەلمێنێ کە خـۆی خـاوەن مافە و ئاماری حکوومەتەکەی دی ورد نییە. لە کۆتایی توێژینەوەکەدا لیژنەکە گەیشتە ئەوەی کە ئامارو نەخشەکانی هەردوو حکوومەتەکە ورد نینو بەهەمەجۆر شێواز زێدەڕەوی تێدایە[1].

لە ٢٠ی نیسانەوە، لیژنەکە بە نووسینەوەی راپۆرت خەریکبوو، لە ١٦ی تـەمووزی ١٩٢٥ بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە بەرزیکردەوە، لە ١١٣ لاپەرەی گەورە لەگەڵ نەخشەیەك پێکهـاتبوو[2]. ئـەو راپۆرتـە بـە پـشتبەستن بـە دەرهاویـشتە سـتراتیژی و جـوگرافی و ئـەتنی و سیاسـی و ئابوورییەکان، رایسپاردبوو کە ناوچە جێناکۆکەکە بە عێراقەوە بلکێنریت[3].

لەرووی ستراتیژییەوە، وای بینی کە هێڵی برۆکسل، هێڵێکی باشە بۆ ئەوەی بکرێتە هێڵـی سنووری نێوان عێـراق و تورکیـا[4]، لـەرووی ئەتنیـەوە وای بـینی کـە زۆرینـەی دانیـشتووانی ویلایەتەکە کورد، کە نە تورك و نە عەرەبن و بەزمانی "ئـاری" قـسە دەکـەن، بـەڵام لەگـەڵ عـەرەب گروپێکـی یـەکگرتوو پێکـدێنن و لـە رووبـەرێکی فـراوان نیـشتەجێن[5]. هـەروەها روونیکردەوە کە هەستی ئینتیما بۆ عێراق تـەنها لای هەنـدێ عـەرەب نـەبێت، بـوونی نیـە. هەستی کورد، هەستێکی کوردییە نەوەك عێراقی بوون[6]. کورد لە رووی ژمـارەوە لـە هـەموو پێکهاتەکانی دیکە زیاترن، سـەربەخۆبوونییان لـە هەردوولاکـە پێباشـترە[7]، هـەروەها گـوتی، ئەگەر پاساوی ئـەتنی بـە یەکلاکـەرەوە دابنرێـت، ئـەوا دەبێـت دەوڵـەتی کـوردی سـەربەخۆ پێکبهێنرێت، چونکە کورد پیـنج لـە هەشـتی دانیـشتووان پێکـدێنن، هـەروەها ئەگـەر ئـەو چارەسـەرە لەبەرچـاو بگیرێـت ئـەوا یەزیدیـەکان کـە لـەرووی ئەتنیـەوە بـە کـورد دەچـن و

---

١- محمد عبدالحسن المياح، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٢٨.

٢- عبدالرزاق محمد اسود، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٠٩.

3- League of Nations, Questions… ,P.86 .

4- Ibid ,P.86 .

5- Ibid,PP.86-87 .

٦- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٨٠.

٧- ف.ب. والترز، تاريخ عصبة الأمم، في: جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ٣٢١.

تورکەکانیش بە ئاسانی لەگەڵ کورد وەربگیرێن، ئەوا ئەوکات لە هەشت بەش حەوت بەشی دانیشتووان پێکدێنن[1]، هەرچەندە ئەوانە لەهەمان رەگەزی ئەو تورکەکانەی کە لە کۆماری تورکیادان[2]. لەپاڵ ئەمەش، لەنێوان سەرجەم ئەو رەگەزە موسڵمانانەی ویلایەتەکە، ئەوا کورد زیاتر لە هەموویان دۆستایەتی **مەسیحییەکان** دەکات[3]. دواتر لیژنەکە گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە لە دیاریکردنی سنووردا ناکرێت تەنهاو تەنها کێشەی رەگەزی لەبەر چاو بگیرێت[4].

لیژنەکە لە کۆتایی توێژینەوە مێژووییەکەیدا گەیشتە ئەوەی کە ویلایەتەکە پێشتر بۆماوەی چەندین سەدە لەژێر دەسەڵاتی تورکی بووە، بەڵام لە مێژە لەلایەن پاشاکانی بەغداوە ئیدارە دەکرا. هەروەها سەرنجی بۆئەوەش راکێشا بوو کە ماردین و جەزیرەی کوری عومەر و دیاربەکریش ئەوانیش لەلایەن والیەکانی بەغداوە حوکم دەکران، لەسەردەمی عوەسمانییەکان، بەڵام هەموویان بە دەوڵەتی نوێی تورکییەوە لکێنران[5].

سەبارەت بە پاساوە سیاسییەکان، لیژنەکە وابینی کە شاهێد حاڵێکی زۆر باسیان لە هۆکاری بە باشتر دانانی عێراقیان کردووە، کە رژێم و ئاسایش لە عێراق لە ساڵی **١٩٢٥** زۆر لەوەی سەردەمی حوکمی تورکی باشتر بووە، هەروەها پەروەردە و فێرکردنیش پێشکەوتووتر بووە. هەوروەها باسی لەوە کردووە کە عەرەبە نیشتەجێیەکانی کوردستان پێیان باشە بخرێنە سەر حکومەتی عێراقی، هەروەها یەزیدی و جووەکانیش هەمان خواستیان هەیە، جەختی لەوە کردەوە کە کورد حەز ناکەن لەگەڵ تورکەکان بژین، هەروەك بە شۆڕشەکانیان ئەمەیان سەلماندووە، هەروەها لەو راپرسیەی کە لە ساڵی **١٩١٩** و **١٩٢١** لە عێراق سازکرا، ئەمەیان چەسپاند[6].

بە گوێرەی دەرەنجامی لیژنەکە، فاکتەری یەکلاکەرەوە لە لکاندنی ویلایەتەکە بەعێراقەوە، پاساوی ئابووری بووە[7]، لیژنەکە وابینی کە باشترین چارەسەر ئەوەیە کە

1- League of Nations,Questions… ,P.57.

2- Ibid,P.86 .

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.479.

4- League of Nations, Questions… ,P.57.

5- League of Nations, Questions…,P.87.

6- Ibid,P.75 .

٧- جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ل ٣٧٦-٣٧٧.



ویلایەتەکە بە عێراقەوە بلکێنرێت، هەڵەیە ویلایەتێك لە خاکێك جیابکرێتەوە کە لە رووی ئابوورییەوە پێوەی گرێدراوە[1].

بەڵام ئەوەی لێرەدا ناکرێت فەرامۆش بکرێت، هەوڵە زۆرەکانی بەریتانیا بوو لەپێناو بەدەرخستنی فاکتەری ئابووری بەو پێیەی باشترین و بەهێزترین پاساوە بۆ پارێزگاریکردن لە موسڵ، ئەدمۆندزیش دانی بەمەدانا کاتێ گوتی: "شتێکی گێلانە و گاڵتەجاڕی بوو، هەوڵی ئەوە بدرێت کە بە راوەرگرتنی دانیشتووان پاڵپشتی لە کێشەکانمان بکەین...زۆری کات بەسەر نەچووبوو، تا بە هەڵکردنی ئاڵای بەریتانیا و بە سازکردنی هەڵبژاردن رازیمان کردوون، کە خەریکبوو، هاتنە پاڵ دەوڵەتی نوێ رەتبکەنەوە، بۆیە بریارماندا، فاکتەری ئابووری، دیاریترین فاکتەر و باشترین پاساومان بێت"[2].

هەرچەندە سیاسەتمەدارانی بەریتانی بوونی هەموو پەیوەندییەك لەنێوان نەوت و کێشەی موسڵیان رەتکردەوە، بەڵام یادداشتە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوانیان نکۆڵی لەم بانگەشەیان دەکات، دەرکەوت کە نەوت رۆڵێکی زۆر لە دەستگرتنی بەریتانیا بە ویلایەتەکە دەبینی و دواتریش بە تێکەڵاوکردنی بەعێراقەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی[3]. بروسکە بەرزکراوەکانی نوێنەری باڵای بەریتانی بۆ وەزارەتی موستەعمەرات ئەوە روونەکاتەوە کە پەیوەندی لە نێوان بەخشینی ئیمتیاز بۆکۆمپانیای نەوتی تورکی و چارەنووسی ویلایەتەکە لەلایەك و پەیوەندی بە لیژنەکە لەلایەکی دیکەوە هەیە، ئەو لیژنەیەی[4] کە لە هەڵوێست و

1- League of Nations, Question …, P.87

٢- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە: کورد....ل ٣٦٦.

٣- جرجيس فتح الله، النفط قرر... ص ص ٤-٤٢

- اندرة نوسشي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٤٢-١٤٣

٤- نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق لە بروسکەی رۆژی ١٧ شوباتی ١٩٢٥ کە بۆ وەزارەتی موستەعمەرات بەرزکراوەتەوە، باسی لەوە کردووە کە باولس(یەکێك لە ئەندامانی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستیەکان) بەر لە جێهێشتنی بەغدا بە وەزیری دارایی عێراقی راگەیاندووەکە ویلایەتی موسڵ دەدرێت بەو لایەنەی کە یەکەمجار ئیمتیازیات بە کۆمپانیای نەوتی تورکی دەدات. هەروەها دوبس ئاماژەی بۆئەوە کردووە کە تیلکی(ئەویش یەکێك لە ئەندامانی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستیەکانە) هانی وەزیرەکانی عێراقی داوە کە بەخشینی ئیمتیازات بە کۆمپانیای نەوتی تورکی مۆر بکەن....دوبس ئەمەی وا لیکدایەوە کە ئەگەر تورك و عێراق بەر

میانگری بۆ بەخشینی ئیمتیاز بە کۆمپانیای نەوتی توركی، بووە مایەی سەرسورمان هەتاكو بۆ هەندێ بەرپرسی بەریتانیش[1].

لەلایەكی دیكەوە لەماوەی مانەوەی لیژنەكە لە بەغدا، بەدیاریكراوی لە ٢١ كانوونی دووەمی ١٩٢٥ زەكائی بەگی بالیۆزی توركی لە لەندەن، گفتوگۆی لەگەڵ جمبرلنی وەزیری دەرەوەی بەریتانی كرد و لەبارەی بەخشینی هەندێ ئیمتیازی ئابووری بۆ بەرژەوەندی بەریتانیا لەبەرامبەر دەستبەرداربوونی بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ. پێدەچێت لایەنی بەریتانی ویستبێتی هەلی گونجاو بۆ پاڵپشتی بانگەشەكانی حكوومەتەكەی بۆ هێشتنەوەی موسڵ بەدەستبخات و بڵێت هێشتنەوەی موسڵ بۆ زامنكردنی بەرژەوەندی بەریتانیا و بوونی نەوت نییە بەتەنها، بەڵكو بۆ پاراستنی مافی عێراقیشە، بۆیە داوای لە زەكائی بەگ كرد كە گەرەنتی حكوومەتەكەی لەبارەی ئەو پێشنیازە پێشكەش بكات، بەكردەوە حكوومەتی توركی لە ئاداری ١٩٢٥ پرۆژەی رێككەوتنی ئامادە كرد، كە بەریتانیای لە بەخشینی ئیمتیاز بەهەر كۆمپانیایەكی نەوتی سەرپشك كردبوو، لە ویلایەتی موسڵ كە دەبێتە بەشێك لە توركیا، لەپاڵ مافی دروستكردن و بەرێوەبردنی هێڵی ئاسن و بەندەرەكان كە بۆ گواستنەوەی نەوت پێویستن[2]. هەروەها رایگەیاند كە زێی بچووك سنوور جیاكەرەوەی نێوان عێراق و توركیا دەبێت، ئەمەش وەك كەمترین ئاستی داواكاری توركی[3]. شانبەشانی ئەمەش رۆژنامەكانی بەریتانی قسەیان لەبارەی باشبوونی

---

لەوەی لێژنەكەراسپاردەكانی لە بارەی سنوور پێشكەشبكات بگەنە رێككەوتن لە بارەی بەخشینی ئیمتیاز بە كۆمپانیای نەوتی توركی لە هەردوو ویلایەتی بەغدا و موسڵ، ئەوا كێشە كە بەقەد ئەوەی بەعێراقەوە پەیوەست دەبێت بەهەمان برِیش بە توركیاوە پەیوەست دەبێت، ئەوكات دەتوانرێت رەخنە لە لێژنەكە بگیرێت، كاتێ سنوور دیاری دەكرێت بەرژەوەندی نەوتی بەهێز دەبێت كاری تێناكات. سەیری:

- نوري عبدالحميد خليل، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١١٠-١١٢.
- حسين جميل، العراق، شهادة سياسيية، لندن، ١٩٨٧، ل ل ١٦١-١٦٦.
- جرجيس فتح الله، النفط قرر مصير...، ل ل ٢١-٢٢.

١- جرجيس فتح الله، النفط قرر مصير...، ل ل ٢٢-٢٣.

٢- نوري عبدالحميد خليل، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٢.

٣- خسرو گوران، ستة وسبعون عاماً على تقرير مصير ولاية الموصل، **گولان** العربي، مجلة، اربيل، العدد ٦٨، ٣١ كانون الثاني ٢٠٠٢، ل ٤٢.



پەیوەندییەكانی نێوان بەریتانیا و توركیا دەكرد و هەمان ئەو رۆژنامانە هەواڵی وایان لەبارەی بەخشینی ئیمتیازی گەورەی توركەكان بە ئیمتیازی نەوتیشەوە بڵاودەكردەوە[1].

پەسندكردن و رەتكردنەوەی پێشنیازە توركییەكان لەلایەن حكوومەتی بەریتانییەوە، لە رۆژنامەكان راگەیەنرا، كە دوو ئامانجی سەرەكی بەدیدەهێنا: یەكەم، لاوازكردنی هەڵوێستی توركیا بوو لەبەرامبەر كۆمەڵەی نەتەوەكان و راكێشانی بەرەی بن پێیانی بوو، دووەم، فشارخستنە سەر عێراقییە توندڕەوەكان و نەیارەكان تاكو ئیمتیازەكە ببەخشن، بەكردەوە بەریتانیا هەردوو ئامانجەكەی بەیەكەوە پێكا.

حكوومەتی بەریتانیا هەموو تواناكانی بۆ پاراستنی تەواوی سنووری سروشتی ویلایەتی موسڵ خستەگەڕ، سیاسەتمەدارانی پەنایان بۆ هەموو رێگایەك برد تاكو لە رێگری لە دابەشبوونی ویلایەتەكە بكات، بەتایبەتی دوای ئەوەی راپۆرتەكان باسیان لە بوونی پێشنیاز و پڕۆژەی وادەكرد، كە بەرەو دابەشكردنی ویلایەتەكە دەچوو، گرنگترینیان ئەوەبوو كە بەهۆیەوە بەشی چەپی رووباری دیجلەی بە توركیا دەبەخشی[2].

گرێدانی پرسی موسڵ بە رێككەوتن لەسەر بەخشینی ئیمتیاز بە كۆمپانیا نەوتی توركی[3]، دەچێتە خانەی هەوڵەكانی بەریتانیا بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر پڕۆژەیەك كە هەوڵی پارچەپارچەكردنی

---

١- ابراهيم شريف، الشرق الاوسط، بغداد، ١٩٦٥، ل ١٦٣.

٢- ليندساى، باليۆزی بەریتانیا لە توركیا و گەورە دانووستكاری بەریتانی لە گفتوگۆكانی بەریتان — توركیا، لە ناوەراستی مانگی ئاداری ١٩٢٥ بۆ دوبسی نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراقی پێشنیاز كرد، كە پارچە زەویەكێ گەورە بە توركیا بدریت بۆ ئەوەی دانوستاندنەكان كۆتایی پێ بهێنرێت. ليندسى ئارەزووی دەكرد لە بارەی پرسی موسڵەوە لەگەڵ توركیا بگەنە رێككەوتن، بە پەرۆش بوو بەشیك لەو خاكەی داوای دەكات بە توركیا بدریت، چونكە لەو باوەرەدابوو ئەمە دەبێتە هۆی مۆركردنی پەیمان لەگەڵی. بەڵام دوای تەنها رۆژ لە پێشكەشكردنی پێشنیازەكەی، وڵامی دوبسی پێگەیشت كە سوری لەو نارەزایەتیە توندەی بۆ پێشنیازەكە هەیبوو، پێشاندا، هۆكاری ستراتیژی و تەكتیكی و سیاسی وای باسكرد كە وای دەكرد هیچیتر زەوی لە كوردستانی عێراقی پێنەدرێت، سەیری:

- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٨-١٩.

٣- ئەو رێككەوتنە لە نێوان حكوومەتی عێراقی و كۆمپانیای نەوتی توركی لە ١٤ ئاداری ١٩٢٥ مۆركرا، سەیری:

- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات...، ج١، ل ٣٨٦.

ویلایەتەکە لە نێوان عێراق و تورکیا دەدات. بەکارهێنانی فاکتەری نەوت شێوازێکی دیکە بوو بۆ وەستانەوە بەرووی هەر هەوڵێك یان پڕۆژەیەك کە ویلایەتەکە دابەشبکات[1].

شێوازی مامەڵەی بەرپرسانی بەریتانی ئەوەی روونەکردەوە کە تەنها نەوت لەدوای سووربوون ی بەریتانییەوە نییە، بۆ لکاندنی ویلایەتەکە بەعێراقەوە، ئەمەش بەروونی لە لێدوانەکانی دوبس بەدەردەکەوێت، کاتێ گوتی: "بەخشینی بەشێکی گەورە لە زەوی کوردی بە تورکیا، بەسە بۆ ئەوەی چینی دەسەڵاتداری عەرەبی سوننی لە عێراق تووڕە و بێزار بکات. چونکە ئەمە هاوسەنگی تەرازووی هێز لە پەرلەمانی عێراق بۆ بەرژەوەندی شیعەکان لاسەنگ دەکات. میانڕەوەکانی عەرەبی سوونە، وەك سەرۆك وەزیرانی ئێستا عەبدولموحسین سەعدون، پێیان باشە بەتەواوی بۆ تورکیا بگەڕێنەوە ئەگەر ئەمە کردەیی بێت"، هەروەها گوتی کە "کورد لەو خاکانەی کە تورکیا داوای دەکات، پاڵپشتییەکی توندی دەسەڵاتی بەریتانین لە عێراق. فەزڵی رازیبوونی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراقی لەسەر رێککەوتنامەی ئەنگلۆ-عێراقی لە حوزێرانی ١٩٢٤ بۆ کوتلەی کوردی لایەنگری بەریتانیا دەگەڕێتەوە. لەو کاتەوە بە نەپساوی بە دەنگدان پاڵپشتی لەسیاسەت و دەسەڵاتەکانی بەریتانیا دەکەن. دابڕینی زەوی کوردی و بەخشینی بە تورکیا ئێمە رووبەڕووی مەترسی لەدەستدانی متمانە و شڵەژان لە تەواوی عێراق دەکاتەوە، نەوەك هەرتەنها لە نیو کورد، بەڵکو لەنێوان عەرەبیش. ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی لە پێگەیەکی سەختداین و عێراق لاواز دەکات و زیاتر دەیخاتە بەردەم فشاری تورکی کە بەو سنوورەی ئێستا کێشراوە رازی نابێت"[2].

لێدوانەکانی دوبس کە کاریگەری زۆر هەبوو لەسەر سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر عێراق، دەرکەوت کە بەریتانیا سورە لەسەر زاڵکردنی دەسەتەیەکی سوننە بەسەر پەرلەمانی عێراقی لەژێر سایەی بەریتانی. پێویست بوو ئەو هاوسەنگیە بپارێزرێت، ئەگەر چی ئەمە بەمانای

---

١- دوبس پێشنیازی بڕگەیەکێ زیادی بۆ پرۆژەی رێککەوتنی بەخشینی ئیمتیاز بە کۆمپانیای نەوتی تورکی کرد، ئەویش ئەوەبو کە ئەو ئیمتیازە پوچەڵ دەبێتەوە لەبارێکدا ئەگەر هەموو ویلایەتەکە بە عێراق نەدریت، بەمەش ئەگەر رێککەوتنکە پەسند بکرابووایە، ئەوا بەرژەوەندی نەوتی لەگەڵ پرۆژەی دابەشکردن نەدەهاتەوە، ئەمەش لای کۆمپانیا نەوتییەکانەوە پەسند ناکریت، سەیری:

- نوري عبدالحميد خليل، سەرچاوەی پێشو، ل ١١٨.

٢- روبرت اولسن، المسالَة الكردية في العلاقات...، ل ١٩.



نزیکبوونەوە بوو لە تورکیا لە ماوەیەکی کورتدا[1]، یان لەسەر حسابی بەکارهێنا نی خواستە رەواکانی گەلی کورد بووە.

هەرچۆنێ بێت، راپۆرتی شاندەکەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ بەسەرکردنەوەی راستییەکان گەیشتە ئەوەی کە "ئەگەر بەرژەوەندی دانیشتووان بەهەند وەربگیرێت، ئەو لەو باوەڕەدایە کە باشترە ناوچە جێناکۆکەکە دابەشنەکرێت....."، هەروەها راپۆرتەکە ئەوەشی زیاد کرد کە پاساوە سەرەکیەکان ـ بەهەموو نارەزایەتییەکانەوە ـ بەلای ئەوە دەچێت کە ئەو زەویانەی کەتوونەتە باشووری هێڵی برۆکسلەوە بخرێنە سەر عێراق، بەمەرجێ رەچاوی ئەو دوو ئەگەرەی خوارەوە بکرێت:

١- دەبێت ناوچەکە بۆماوەی ٢٥ ساڵ لەژێر ئینتیدابی کۆمەڵەی نەتەوەکان بمێنێتەوە.

٢- دەبێت رەچاوی ئارەزووی کورد لە دامەزراندنی فەرمانبەرانی کورد بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان بکرێت، کاروباری دادوەری و فێرکردن لە قوتابخانەکان رێکبخرێتەوە و دەبێت زمانی کوردی زمانی فەرمی ئەو کاروبارانە بێت.

لیژنەکە وای دەبینێ کە لەبارێکدا ئەگەر دوای چوار ساڵ چاودێری کۆمەڵەی نەتەوەکان کۆتایی هات وەك ئەوەی لە پەیمانی بەریتانی — عێراقی هاتووە و کورد هیچ بەڵێنێکیان لەبارەی خۆبەڕێوەبردن پێنەدرا، ئەوا زۆربەی خەڵکی حوکمی تورکەکان لە حوکمی عەرەب بە باشتر دەزانن[2].

خوێندنەوەیەکی قوڵی راسپاردەکانی لیژنەکە ئەوە دەردەخات کە مەزەندەی بەریتانییەکان بۆ کێشەکە وردبووە و پلانەکەی سەرکەوتوو بووە، هەروەها دەریخست کە دپلۆماسیەت و سیاسەتەکەی کە پێشتر پلانی بۆ دارێژرابوو سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێناوە -جا چ لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بێت یان لە خودی ویلایەتەکە=. دەرئەنجامی رێوشوێنی سیاسەتەکانی بەریتانیا و شێوازەکەی، بەکەمێك بەرلەهاتنی لیژنەکە، کە لەلایەن ئیدارییەکانی بەریتانی زۆر بەوردی لە ویلایەتەکە جێبەجێکران، بەتایبەتی لە نێو زۆرینە کوردییەکەی، دەریخست کە بەریتانیا تا رادەیەکی زۆر متمانە و دۆستایەتی سەرۆکەکانی بەدەستهێناوە. بە پێچەوانەوە حکوومەتی ئەنقەرە دپلۆماسیەتی هەژارانە و بێ ئەزموون لە سیاسییەتی نێودەوڵەتی کە

---

١- هەمان سەرچاوە، ل ل ١٩-٢٠.

2- Ibid,PP.88-89.

بەریتان هەیبوو، نەیتوانی سیاسەتێکی ئامانجدار بەرامبەر خەڵکی ویلایەتەکە پەیرەو بکات، هەروەها دەستتێوەردانە سەربازییەکانی لەناوچەی جێناکۆك بەرهەمی نەبوو.

گرنگترین فاکتەر کە توێژەران پێیان وایە بە شێوەیەکی نێگەتیڤ تا رادەیەکی زۆر کاری لە خراپی هەڵوێستی تورکی لەبەرامبەر لیژنە نێودەوڵەتیەکە کرد، ئەوەبوو سیاسەتەمەدارانی عەلمانی ئەنقەرە رژێمی خەلافەتیان هەڵوەشاندەوە، لە ٣ی ئاداری ١٩٢٤ ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی بە ئاماژەی مستەفا کەمال لە دانیشتنێکی کە بۆ سەیرکردنی کێشەی خەلافەت و دامەزراوە ئایینیەکان لە تورکیا تەرخانکرابوو[1]، رایگەیاند کە خەلافەت هەڵوەشاوەتەوە، ئەم بڕیارەش بەکردەوە بە واتای هەڵوەشاندنەوەی "پەیوەستی کۆمەڵایەتی"[2] دەهات، کە مستەفا کەمال بەدرێژ ایی ماوەی جەنگەکە بانگەشەی بۆ دەکرد.

سەبارەت بە هەڵوێستی بەریتانیا لەم پەرەسەندنە[3]، ئەوا پێشتریش و ئێستاش لە ناکۆکیدایە لەگەڵ حکوومەتەکەی مستەفا کەمال، بەریتانیا کە حوکمی هیند و چەند وڵاتێکی عەرەبی دەکرد، ویستی ئەو رووداوە بۆ دۆستایەتی هاوڵاتیانی بقۆزیتەوە، ئەوانەی تورکەکان بەم بڕیارە وازیان لێ هێنان، رۆژنامەی دەیلی تەلەگراف لە ژمارەی رۆژی ٨ی ئاداری ١٩٢٤ بەرپرسیارێتی ئەو بڕیارەی خستە ئەستۆی حکوومەتی مستەفا کەمال و گوتی: "مستەفا

١- بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت، وەزارەتی شەرعییە و ئەوقاف و دامەزراوەکانی سەربەو دوو وەزارەتە هەڵوەشانەوە، کارەکانیان بە وەزارەتی مەعاریف راسپێردرا، بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- Stanford.J. and Ezel K. Shaw,Op.Cit.,PP. 368-369 ; Sydney Nettleton Fisher, The Middle East A History,London,1960 , P. 394

- مصطفى حلمي، الأسرار الخفية وراء الغاء الخلافة الإسلامية(دراسة حول كتاب: النكير على منكري النعمة من الدين والخلافة والنعمة لشيَخ الاسلام مصطفى صبري)، مصر، ١٩٨٥، ل ل١٧٧-١٩٢.

٢- رضا هلال، السيف والهلال تركيا من أتاتورك الى اربكان الصراع بين المؤسسة العسكرية والإسلام السياسي، القاهرة، ١٩٩٩، ل ٨٥.

٣- کاردانەوەی ئەم بڕیارەی تورکیا، لە وڵاتانی ئیسلامی هەمەچەشن بوو، بەتایبەتی لە هیند و مسر و عێراق، رای گشتی ئەم وڵاتانە بێزاری خۆیان لە بارەی ئەم بڕیارە دەربری، رۆژنامەکانی ئەو وڵاتانە بڕیارەکەیان مەحکومکرد. سەیری:

- کارل بروکلمان، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٩٦" قاسم خلف الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل٩٧-١٠٠.



کەمال بەتەنها لە دەرکردنی خەلیفە بەرپرسە،...... ئێستا تورکیا بە رووە راستەقینەکەی بەدەرکەوت کە تاقمێکی فێلباز حوکمی بەسەرەوە دەکەن"[1]. هەروەها یەکێك لە لۆردەکانی ئینگلیز لەبەردەم ئەنجوومەنی عمومی بەریتانی لە رۆژی ١٢ ئاداری ١٩٢٤ داوای لە حکوومەتی وڵاتەکەی کرد کە بۆ رێزگرتن لە هاوڵاتیانی موسولمان شوێنێك بۆ خەلیفەی لەکار لادراو عەبدولمەجید بدۆزرێتەوە تا پەنای بۆ بەرێت". سەرباری کاردانەوەی خێرای چەند ناوەندێکی بەریتانی لەبارەی ئەو رێوشوێنەی دوایی کەمالییەکان، بەڵام پێدەچوو حکوومەتی بەریتانی ئەوەندە پەرۆشی بۆی پێشان نەدا بێت، بە بەڵگەی ئەوەی هیچ رێوشوێمێکی فەرمی یان دپلۆماسی دژی حکوومەتی ئەنقەرە نەگرتەبەر، بەڵکو کاردانەوەی تەنها لە ئاستی رای گشتی بوو، بۆمەبەستی کاتێیش بوو. ئیمپراتۆری بەریتانی بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو دامەزراوە ـ خەلافەت ـ ی کە هێشتا لە دوژمنداریدایە لەگەڵی و هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی و رێگا و گەیاندنەکانی لە عێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی دەکات، سوود مەندبوو. هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت مانای هەڵوەشاندنەوەی کاریگەری مەعنەوی ئەو دامەزراوە بوو لەسەر بەشێکی گەورەی ئەو ئیمپراتۆرەی کە زۆربەیان موسڵمان نشینن، بەتایبەتی لە هیند و مسر، کە "چاوی گەلە بریندارەکانیان بەرەو ئەستانە بوو کە بارەگای خەلافەتی لێبوو"[2].

هەندێ توێژەر لەو باوەڕدابوون کە تێگەیشتنێکی پێشوەختە لە نێوان شاندی تورکی بەسەرۆکایەتی عیسمەت پاشاو شاندی بەریتانی بەسەرۆکایەتی کریزن لە لۆزان لەبارەی دامەزراوەی خەلافەت لە ئارادابوو، یەکێك لەو توێژەرانە باسی لە چوار مەرج کردووە کە کریزن بە عیسمەت پاشای داوە تاکو پاڵپشتی بەریتانیا بەدەست بهێنێت، ئەوانیش: ١- بەتەواوی خەڵافەت هەڵبوەشێنرێتەوە. ٢- دەرکردنی خەلیفە بۆ ئەو دیوی سنوور. ٣- دەستبەسەراگرتنی دارایی خەلیفە. ٤- عەلمانی بوونی دەوڵەت رابگەیەنرێت[3]. هەندێ لەو توێژەرانە بۆ ئەوە دەچن کە (حاییم ناحوم)ی حاخامی گەورەی جولەکە لە تورکیا هاتۆتە نێو دانووستاندنە درێژەکانی تورکیا — بەریتانیا بەهۆی نێوانی ئەوەوە گەیشتوونەتە ئەو مەرجانە[4].

١- قاسم خلف الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ١٠٠.

٢- سي. جي. أدموندز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤٢.

٣- احمد نوري النعيمي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٧١-٧٢"محمد طه الجاسر، تركية ميدان الصراع بين الشرق والغرب، دمشق، ٢٠٠٢، ل ٢٣٨.

٤- مصطفى حلمي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٦٥-٢٦٦.

نووسەری کتێبی (پیاوی بت کەمال ئەتاتورك- الرجل الصنم کمال اتاتورك) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئینگلیز بە ئارامییەوە چاوەڕوانی مستەفا کەمالیان کرد، بۆ هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت، لەسەر تورکەکان پێویست بوو بۆ داننان بە سەربەخۆییان، خەلافەت بکەنە قوربانی، "ئەگینا ئاشتییەکە نەدەکرا و بەریتانیای مەزن دووبارە یۆنانی بریندارى بۆ گەڕێکی دیکەی شەڕی تۆڵەسەندنەوە ئامادە دەکرد و خۆشی لە پشتییەوە بە سوپاکەیەوە دەوەستا"، ئەو نووسەرە هۆکاری سووربوون ی بەریتانی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دامەزراوە بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە ئەگەر سەرهەڵدانەوەی دەکرد و لەوێشەوە کاریگەری لەسەر ئەو موسڵمانانەی کە لە موستەعمەراتی ئینگلیزدا هەیە، دابنێ"[1].

لە راستیدا ئەو بانگەشەیە لە نێوەندە ئەکادیمی و پسپۆڕەکاندا هیچ پاڵپشتییەکی لێنەکرا، بە بەڵگەی ئەوەی هیچ ئاماژەیەکیان بۆ بوونی ئەو جۆرە بۆندە نەکردووە، هەروەها کۆنووسی کۆنگرەی لۆزانیش هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەو جۆرە بانگەشەیە ناکات، هەروەها بەڵگەنامە بەریتانی و یادداشتە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان دیپلۆماسیە بەریتانییەکان و کارمەندانی بواری تورکی ئەوسا، ئاماژە بۆ ئەوجۆرە رێککەوتنە ناکەن، پێدەچێت ئەو نووسەرانەی باسمان کردن، بابەتەکەیان لە دیدگای سۆزەوە چارەسەر کردبێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە بەریتانیا سوودی لە بڕیارەکە نە بینیبێ و لەبەری نەحەسابێتەوە، ئەگەرچی ئەمەی بەفەرمیش رانەگەیاندووە، ئەمەش بۆ پاراستنی ئارامی دانیشتووانی موستەعمەراتی لە جیهانی ئیسلامی هەر لە هیندەوە تا میسر و وڵاتانی عەرەبی. ئەوەی پاڵپشتی لەم رایە دەکات ئەوەیە کە سی. جی. ئەدمۆندز باسی کردووە، کە بە "یاسای سەوڕسوڕهێنەری ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی" وەسفیکرد، کە "باوەڕمان پێی نەکرد"، هەروەها لە لێدوانەکانی بەردەوام بوو و گوتی: "بانگەشەی تورکەکان کە کوردستانی لە بورکانی شۆڕشدا هێشتەوە، لە بنەماوە پشتی بە ڕێزگرتنی کورد لەبەرامبەر ئایینەکەیان بەستبوو، بێ گومان تورك بەم بڕیارەیان خۆیان خستە گێژاوێك کە زۆر لە هیواکانی ئێمە زیاتر..."[2].

پێدەچوو مستەفا کەمال بەو رێوشوێنەی ویستی نامەیەك ناراستەوخۆ ئاڕاستەی بەریتانیا و وڵاتانی ئەورووپی بکات، بیرۆکە و دڵنیاییەکی وا بدات کە ئاڕاستەی تازەی تورکیا بەرەو رۆژئاوایە[3]،

١- ضابط ترکي سابق، الرجل الصنم کمال أتاتورك، ط ٥، بیروت، ١٩٩٤، ل ل ٢٦٥-٢٦٦.

٢- سەیری کتێبەکەی: کورد....ل ٣٤٢ بکە.

3- K.Karpat,Op.Cit, PP. 44-45.



ئەمەش بە هیوای ئەوەی پاڵپشتی و یارمەتی وای دەستبکەوێت کە بونیاتنانەوە و ئاوەدانکردنەوەی تورکیای پێ بکات، بۆ ئەوەی بەریتانیا هەندێ نەرمی لەبارەی پرسی موسڵ پێشان بدات.

بەڵام دەرەنجامی رێوشوێنەکان بەپێچەوانەوە سەبارەت بە کێشەی موسڵ و رەوشی ناوخۆی تورکیا کەوتەوە، زۆربەی کوردی ویلایەتەکە و باکووری ویلایەتەکە -کوردستانی باکوور- بە چاوی رێز و ستایشەوە سەیری ئەو دامەزراوە ئاینییەیان دەکرد. بەم رێوشوێنەی ئەنقەرە هاوسۆزی زۆربەی کوردی ویلایەتەکەی لەدەستدا، "ئەوان بە سۆزێکی ئایینی بە خەلافەتی مەرکەزەوە بەسترابوونەتەوە و تاکە کۆکەرەوە و گرێدەریان بوو بە تورکەکانەوە"[1].

راپەڕینی کوردی شوبات و ئاداری ١٩٢٥ کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ناوزڕاندن و شێواندنی وێنەی تورکیا هەبوو، یەکێك لەو دروشمانەی کە سەرانی راپەڕینەکە بەرزی کردبووەوە، "گەڕانەوەی خەلافەت"بوو[2]، راپەڕینەکە لەمیانەی سەردانەکەی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان لە ویلایەتەکە بەرپابوو، کە بەخێرایی هەواڵی بەتوندی سەرکوتکردن و لە سێدارەدانی زۆری ئەوانەی بەشداریان تێدا کرد، پێگەیشت[3]. هەروەها بە سەدان لەو کوردانەی کە ئەو کات سنووریان بەرەو عێراق بڕیبوو، چیرۆکی ئابڕوچوونەکانی تورکەکان و مامەڵە وەحشیگەریەکانیان دەگێڕایەوە[4]. ئەمەش گورزێکی کوشندە بوو، بۆ ناوبانگی تورکیا لە نێوەندە کوردییەکانی ویلایەتەکە[5]. تۆینبی لەبارەی سەرکوتکردنی راپەڕینە کوردییەکە گوتی: "حکومەتی تورکی بە

1- Mim.K.Oke,A Chronology…,P.61;İsrafil KurtÇephe (University of Akdeniz), Mousul Conflict in Turkish Foreign Policy in Times of ATATÜRK, *www.STRADIGMA.com*.

٢- خلیل علي مراد، القضیة...، ل ل٢٧-٢٩.

٣- ژیانەوە، رۆژنامە، سلێمانی، ژمارە (١٩)، ٢ ئادار ١٩٢٥، هەروەها ژمارە (٢٠)، ٩ئاداري ١٩٢٥. ژمارە (٢١)، ١٩ ئاداری ١٩٢٥. لە: ژیانەوە وشوێنی ... .

4- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.510.

٥- لە راستیدا زۆربەی کورد لەپاڵ دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمدا بە پاڵنەری ئایینییەوە بەشداریان کرد، بە پێچەوانەی زۆربەی گەلە موسڵمانە ناتورکەکانی دیکە، ئەمەش هەر هەمان ئەو هۆیە بوو کە وای لێکردن بەشداری جەنگی سەربەخۆیی تورکی تا ساڵی ١٩٢٢ بکەن. سەیری:
- کمال مظهر احمد، کردستان... ص ١٥٢ وما بعدها

هێز و زیرەکییەوە شورشی کوردی دامرکاندەوە، بەڵام ئەو لێهاتووە سەربازییە لە شارەزایی سیاسییەوە نەهاتبوو، کاتێ بە سەرکەوتوویی سەرانی شۆڕشەکەی لە سێدارەدا، بەڵام ئەو ڕێوشوێنەی پاساو هێن نەبوو، گێلانە بوو، لە شارەزاییەوە نەهاتبوو. خودی شۆڕشەکە ئەوەی پێشاندا کە شتیکی هەڵە لە سیاسەتی حکوومەتدا هەیە..."[1].

میم کەمال ئۆکەی توێژەری تورکی سەرنجی ئەو خاڵەی دا کاتێ گوتی: "هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت زیانێکی زۆری بەهەڵوێستی تورکیا گەیاند،....حکوومەتی بەریتانی تا ئەو پەڕی سوود ی لە راپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران وەرگرت، لە دوو لایەوە: لەیەك تورکیا بەهۆی ئەو راپەڕینە تووشی شەڕی ناوخۆیی بووەوە، کە نەیهێشت هیچ جوولانەوەیەکی سەربازی لە باکووری ویلایەتە جێناکۆکەکە بکات، لەلایەکی دیکەوە خودی پێکدادانی تورکی — کوردی بەس بوو بۆ ئەوەی کاریگەری بانگەشەی برایەتی کوردی — تورکی پووچەڵببێتەوە...بەم شێوەیە تورکیات نەیتوانی لەسەر هەردوو ئاستی دیپلۆماسی و سەربازی هیچ جوولانەوەیەك بەرامبەر موسڵ بکات....."[2]. دەرەنجامەکان و راسپاردەکانی کە لیژنەکە پێگەیشتبوو، مەودای ئەو لاوازییەی کە شۆڕشی کوردی بە تێزی تورکی گەیاندووە، دەرخست.، لەبەرامبەر کرمەڵەی نەتەوەکان کەلەسەر بنەمای برایەتی تورکی کوردی وەستابوو، کە تورکیا لە داواکردنی ویلایەتەکە بۆ نیشتیمانی دایك لەسەر بنەمای خواستی دانیشتووانەکەی پشتی پێ دەبەست[3]. ئەو راسپاردانە پێگە و قورسایی کێشەی کوردی لە ململانێ لەسەر ویلایەتەکەی دیاریکرد[4].

رەتکردنەوەی تورکیا بۆ راپۆرتی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان، کە لە ١٦ تەمووزی ١٩٢٥ بە کۆمەڵەی نەتەوەکان درا، چاوەڕوانکراو بوو، بۆیە نەدەبوو وەڵامەکەی زۆر دوا بکەوتابایە، چوند ڕێوشوێنێکی وەرگرت کە بەهۆیەوە نارەزایەتی توندی بەرامبەر پێشنیاز و راسپاردەکانی لیژنەکە پێشاندا.

١- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە Survey...,P.510.

٢- کتێبەکەی خۆی: A Chronology... , PP.57-62.

3 - Israfil Kurtcphe, Op.Cit.,P.4.

٤- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی راپەڕینی کوردی ساڵی ١٩٢٥ سەیری بابەتی دووەمی بەشی پێنجەمی ئەم کتێبە بکە.



ئەو ڕێوشوێنانەش هەمەجۆر شێوەی وەرگرت، لە ئاستی دیپلۆماسی لە ٢٣ ی تەمووز راپۆرتێکی بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزکردەوە و بەرپرسانی عەرەبی ئیداری ویلایەتی موسڵی بە وەستانەوە لەدژی گەیشتنی لیژنەکە بە رایەکی گشتی راستەقینە تۆمەتبار کرد[1].

شانبەشانی جوولانەوەی دیپلۆماسی، جوولانەوەی سەربازی لە ناوچە سنووریە نزیك بە سنووری باکووری ویلایەتەکە دەستپێکرد[2]، زیاتر لە ٥٠,٠٠٠ سەربازی لە ویلایەتەکانی رۆژهەلات کۆکردەوە[3]. هەروەها رۆژنامەکان بانگەوازی حکوومەتیان بۆ دووبارە گێڕانەوەی سەربازە یەدەگەکان بۆ خزمەت، لە ویلایەتەکانی رۆژهەلات بلاوکردەوە[4].

پێدەچوو ئامانجی حکوومەتی تورکی لەم ڕێوشوێنانە، هەوڵێکی نەزۆك بووبێ بۆ کاریگەری نواند لەسەر پەرەسەندنەکانی ئەو دوایە کە کێشەکە پێیگەیشتبوو، ئەمەش وای لە بەرپرسانی بەریتانی لە تورکیا کرد، لەمیانەی راپۆرتە نهێنیەکان داوا لە حکوومەتەکەیان بکەن، بۆ ئەوەی داوای گەرەنتی بەهێز لە تورکیا بکەن، بۆ ئەوەی هێرش نەکاتە سەر ویلایەتی موسڵ[5].

بۆ ئەوەی هەڵوێستەکە زیاتر گرژ بێت، حکوومەتی تورکی لە ١٥ و ٢٦ و ٢٨ مانگی ئاب بە دوایەکدا، سکالای بۆ سکرتێری گشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەبارەی پێشێلکاریەکانی بەریتانیا لەسەر سنوور (سنووری برۆکسل) و فڕینی فڕۆکەکانی بەسەر باکووری هێڵی برۆکسل دەنارد، سەرباری چاودێریکردنی جوولانەوەی کەشتیگەلی بەریتانی لە کەناری دەریاری ئیجەی تورکی، هەروەها حکوومەتی بەریتانی تۆمەتبار کرد، بەوەی دەیەوێت لەپشت ئەم کارانەی کاریگەری لەسەر بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵە لەبارەی کێشەی موسڵ دابنێ[6].

1- Mim K.Oke,A Chronology...,P. 62.

2- Peter.J.Beck,Op.Cit.,P.268.

3- Hoare to Chamberlain, Therapia, 30 Jun 1925, IBTK, No. 19, P.65.

راپۆرتەکانی بەریتانیا ژمارەی ئەو هێزەیان بە ١٧٥٠ هەلگری شمشێر و ٤٩٠٠٠ هەلگری تفەنگ و ١٠٨ تۆپهاوێژ مەزەندە کرد، سەیری:

- Major Harenc to Hoare, Therapia, 25 Jun 1925, IBTK, Enclosure 1 in: No. 19,P.66.

4- Hoare to chamberlain, Therapia, 30 Jun 1925, IBTK, No.19, P.65.

5- Ibid,PP. 66-67.

٦- فاضل حسين، مشكلة...، ل ل ١٣٣ —١٣٤"

- Mim.K.Oke,A Chronology…, PP.62-63

لەندەنیش لەلای خۆیەوە لە ٢٧ ئابی ١٩٢٥ بە بەرزکردنەوەی سکالاَیەك بۆ سکرتێری گشتی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان دژ بە تورکیا دەستی بە هێرشێکی دیپلۆماسی کرد، وەلاَمی بانگەشەکانی تورکیای دایەوە، تورکیای بە دەرکردنی نەستوریەکان — ئاشورییەکان- لە باکووری هێلەکە بۆ باشووری هێلەکە تۆمەتبار کرد، هەروەها باسی لە راپەڕینی شێخ سەعید (راپەڕینی ١٩٢٥ ی کورد)، کە ئەمەش پرسگەلێکن تورکیا بریندار دەکات[1].

بەهاتنی ٣ی ئەیلولی ١٩٢٥، ئۆستن ئۆودن ـ سەرۆکی یەکێ لە لیژنەکانی چارەسەری کێشەی موسڵ ـ بانگی هەریەکە لە تۆفیق روشدی بەگ و مونیر بەگ ـ وەك نوێنەرانی تورکیا لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی کۆمەڵەـ ی بۆ گفتوگۆی کێشەی موسڵ و توێژینەوە لە سکالاَکانی هەردوولاکە[2]. لەمیانەی کۆبوونەوەکە بە ئامادەبوونی سەرجەم ئەندامانی ئەنجوومەنی کۆمەڵە، دوای ئەوەی ئۆستن رێگەی پێدان بیروڕایان ئاڵوگۆڕ بکەن، هەریەکە ئەمیری نوێنەری بەریتانی لە کۆمەڵە و تۆفیق روشدی بەهۆی راپۆرتەکانیانەوە یەکتریان تۆمەتبار کرد، ئەمیری تێڕوانینی حکوومەتەکەی لەبارەی کێشەی موسڵ روونکردەوە، سەرەتا ئەو بەڵێنەی کە هەردوو حکوومەتی لەندەن و ئەنقەرە لە ئەیلولی ١٩٢٤ دایان بە بیری ئەنجوومەن هێنایەوە، کە دەڵێت دەبێت ـ پێشوەختەـ بەو بڕیارەی ئەنجوومەنی کۆمەڵە لەبارەی داهاتووی ویلایەتی موسڵ رازی بن، حکوومەتەکەی بە وەفادارییەوە هەر بڕیارێك کە ئەنجوومەن دەریدەکات[3] پەسندی دەکات. روونیکردەوە کە راپۆرتی لیژنەی بەسەر کردنەوەی راستییەکان رای خۆی لەبارەی ناوچە جێناکۆکەکە تۆمارکردووە، بەو پێیەی لە رووی یاساییەوە ناوچەیەکی تورکییە، تا ئەو کاتەی تورکیا دەستبەرداری مافەکانی دەبێت تێیدا، بەلاَم ئەوەشی گوت کە حکوومەتی تورکی پێشوەختە لە ماددەی ٣ی پەیمانی لۆزان بە لێدوانێکی فەرمی نوێنەرەکەی لەبەردەم ئەنجوومەن رایگەیاندووە کە لەهەموو سەروەریەکی بەسەر ناوچەی باشووری ئەو هێڵەی کە ئەنجوومەن بڕیاری لێدەدات وەك سنووری دەستبەردار دەبێت. ئەمیری ئاماژەی بەو پاساوانە کرد کە وادەکات راپرسی لە ویلایەتەکە ئەستەم بێت، بۆئەمە بەڵگەی راپۆرتی لیژنەکەی(لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان) هێنایەوە. لە میانەی بە رووخستنی دەرەنجامەکانی راپۆرتی

1- Mim K.Oke,A Chronology…, PP.63-64.

٢- فاضل حسین، مشكلة ...، ل ل ١٤١-١٤٢.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.511.



لیژنەکە، ئەمیری روونکردنەوەی زۆری لەبارەی پرسی ئینتیداب و پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی عێراق پێشکەشکرد، سەبارەت بە مەرجی دووەم کە لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان لەبارەی بەهەند وەرگرتنی خواستی کورد بوو، گوتی: "حکوومەت جەخت لەوە دەکاتەوە کە رژێمی ئیداری ئێستا، کە راسپاردەکانی لیژنەکە جێبەجێ دەکات، بەردەوام دەبێت و پەرەدەسەنێ"[1]. لەلایەکی دیکەوە ئەمیری هەر هەوڵێکی ئیدانەکرد کە "هەڕەشە لە یەکێتی عێراق لەودیوی سنووری برۆکسلەوە دەکات"، هۆشداری ئەوەی دا کە "دەرەنجامی ئەو کارە خراپ و کارەساتبار دەبێت"[2]. ئەمیری بەم قسەیەی ئاماژەی بۆ پێشنیازە ئەلتەرناتیڤەکەی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان کرد، کە داوای کردبوو ناوچە جێناکۆکەکە بە درێژ ایی زێی خواروو دابەشبکرێت. ئەوەشی گوت ئەو دابەشکردنە بەتەواوی لەسەرووی تواناکانی عێراقەوەیە، بەشێوەیەك ئەگەر عێراق لاواز بێت ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات، کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەوە لە حکوومەتی بەریتانی یان باج دەرە بەریتانییەکان چاوەڕوان ناکات کە ئەم بەرپرسیارێتیە بگرنە ئەستۆ[3]. دواتر ئەمیری پاساوەکانی وڵاتەکەی لەبارەی داواکردنی زەویەکانی خوار هێڵی برۆکسل دووبارەکردەوە و داوایکرد بە گوێرەی گرنگی بابەتەکە توێژینەوەی لەبارەوە بکرێت و روونیکردەوە کە کێشەکە ئەوەیە کە "سنوورێك لە نێوان عێراق و تورکیا دیاری بکرێت" نەوەك دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ، هەروەك ئەوەی حکوومەتی تورکی رایگەیاند، هەروەها باسی لە بابەتی ئاشورییەکان کرد و بەرگری لە یاخیبوونەکانیان لە دژی حکوومەتی تورکی لە سالاَنی جەنگەکە کرد[4].

سەبارەت بە نوێنەری تورکی، تۆفیق روشدی بەگ، یەکسەر دوای ئەمیری دەستی بەقسان کرد و تێڕوانینی حکوومەتەکەی خستەڕوو، راپۆرتە ئامادەکراوەکەی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکانی کردە سێ بەشی سەرەکیەوە: ئەوانیش ئەو راستیانەی کە لیژنەکە تێبینی کردوون

1- A.J.Toynbee,Op.Cit.,PP. 511-512 .

- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل ١٤٢-١٤٣.

2- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.513.

3- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.513.

٤- ژیانەوە، جريدة، السليمانية، العدد(٤٠)، ١٧ أيلول ١٩٢٥. في: ژیانەوە و شوێنی . . .؛ فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل ١٤٢-١٤٣.

و ڕەوشی یاسایی ویلایەتەکە و دەرەنجامەکان، باسی لەوە کرد کە دەیەویت یەکە یەکە قسە لەسەر هەر بەشە بەجیا بکات[1].

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، ڕوشدی بەگ وای پێشاندا کە بابەتە جوگرافی و مێژوویی و سەربازی و ئابوورییەکان لە بەرژەوەندی تورکیادان، هەروەك ئەوەی لە ڕاپۆرتەکەدا هاتوون، ئەمانە ناکرێن لەو هۆکارە یەکلاییکەرەوانە بن کە چارەنووسی وڵاتێك دیارییبکات، بەپێچەوانەوە، بابەتی سیاسی و خواستی دانیشتووانەکەی و ڕەوشی یاسایی ویلایەتەکە و نائارامی سیاسەتی ناوخۆی عێراق دەبێت یەکلا کەرەوە بن لە دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتەکە، هەروەها وەك ڕاپۆرتەکە باسی کردووە، جیاوازی دابونەریت و بیروباوەڕی سیاسی و ئایینی نێوان کورد و تورك و عەرەبی سوننە و عەرەبی شیعە لە باشوور، ئەوانە بابەتی بە پلەی یەکەم گرنگن، هەروەها گوتی، سەباری ئەوەی لیژنەکە گرنگی بە بابەتی ئابووری داوە، ئەوا ئەو(لیژنەکە) پێشنیاز دەکات کە بۆ چارەسەرکردنی ڕەوشی ئابووری لە ئاییندەدا، ڕێککەوتنی هەرێمایەتی ببەسترێت. لەبارەی لایەنی سیاسی ڕاپۆرتەکە، ڕوشدی بەگ باسی ئەو ڕاستیانەی کرد کە لە ڕاپۆرتی لیژنەکەدا هاتوون، کە ئەوە دەردەخەن خواستی دانیشتووانی ویلایەتەکە ئەوە لەژێر سەروەری تورکی بمێننەوە، بۆ لایەنگری لە دەرەنجامەکەی، نموونەی بەچەند ڕووداوێك کە ڕاپۆرتەکە باسیکردوون هێناوەتەوە، وەك ڕووداوی ٢٧ کانوونی دووەمی ١٩٢٥ لە ویلایەتی موسڵ، کە خەڵکی گێڕاویەتەوە، کە باس لە خەڵکی لە جەواد پاشا کۆبوونەتەوە و دەستیان ماچ کردووە. هەروەها باسی لە پرسی دانانی ئەندامانی لیژنەکە لە ژێرچاودێری پۆلیسی موسڵ کردووە، هەروەها چەند کۆپلەیەکی ئەو ڕاپۆرتەی کە جەواد پاشای یاریدەدەری لیژنەکە ئامادەی کردبوو بەرووخست کە باس لە ڕووداوی هاوشێوەی ئەمە دەکات[2].

دواتر نوێنەرە تورکییەکە، چەند کۆپلەیەکی لە ڕاپۆرتەکە خستە ڕوو کە خواستی خەڵکی هەولێر و سلێمانی بەدەردەخات، هەروەها بیروڕای مەسیحی و جوەکان دەخاتە ڕوو، بانگەشەی ئەوەی کرد کە کورد تەنها لە تورکیا و ئێراندا هەیە، هیچیان لە عێراق نین، هەروەها زۆرینەی دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ سوننەن وەك دانیشتووانی تورکیا، زۆربەی دانیشتووانی عێراق

١- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ١٤٥.

٢- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ل ١٤٥-١٤٨" جرجیس فتح الله، یقظة ...، ل ل ٦٧٥-٦٧٦.



شیعەن وەك دانیشتووانی ئێران، بۆیە بەپێویستی دەزانێ ویلایەتەکە بۆ تورکیا بگەڕێنرێتەوە[1].
نوێنەری تورکی ئەوەی ڕەتکردەوە کە وڵاتەکەی پابەندی ئەو بەڵێنە بێت کە فەتحی بەگ لەبارەی "ڕازیبوونی پێشوەختەی وڵاتەکەی بەهەر بڕیارێك کە ئەنجوومەنی کۆمەڵە دەریدەکات"، هەڵوێستێکی دیکەی وەرگرت و تێیدا گوتی کە ئەنجوومەنی کۆمەڵە هێشتا شیاوی ئەوە نییە کە ویلایەتی موسڵ بخاتە سەر عێراقەوە، بەمەرجێ ماوەی ئینتیداب بۆ ساڵ درێژ بکاتەوە، چونکە تورکیا هەرگیز دانی بە ڕژێمی ئینتیداب نەناوە[2]. هەروەها گوتی "تورکیا بنبڕ بە ماددەکانی ٩٤ و ٩٩ ی پەیمانی سیڤەر لەبارەی ئینتیدابەوە ڕازی نەبووە....پەیمانی سیڤەر بەهیچ شێوەیەك باسی ئینتیدابی نەکردووە"[3].

سەبارەت بە خاڵی دووەم، لەبارەی ڕاسپاردەکانی ڕاپۆرتەکە، باسی لە بیرۆکەیەکی دیکە لەبارەی دەرەنجامەکانی لیژنەکە کرد، ئەویش ئەوەبوو کە تورکیا لە عێراق زیاتر ئارامە، ئەگەر هەر ئەو دوو وڵاتە سەرپشك دەکرێن، واباشترە ئەو زەوەییە جێناکۆکان بە تورکیا بدرێت، بەڵام ئەگەر لەسەر بنەمای ئەوەی کە بەریتانیا لە تورکیا پێشکەوتووترە، دەبێت زەویەکە بە بەریتانیا بدرێت، سەختە بتوانریت مەزەندەی ئەو هەڵەیە بکرێت کەلەم تیۆریەدا هەیە، ئەگەر بەسەر وڵاتانی بچووك یان گەورە دا جێبەجێبکرێت، جیهان زۆر بچووك دەبێتەوە سەبارەت بەو وڵاتە زۆر پێشکەوتووە، تورکیا لەسەر بنەمای پێشکەوتنەکەی داوای موسڵ ناکات، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەوەی بەشێك بووە لە وڵاتەکەی و دانیشتووانەکەی حەزدەکەن بۆ تورکیا بگەڕێتەوە[4].

ڕوشدی بەگ وای دەبینی کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بەم بارەی ئێستای جێی گومانەو بێ لایەن نییە و میانگریش نییە، ئەو وادەبینی کە پێویستە ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان توێژینەوەیەك بۆ کێشەکە "لەچوارچێوەی سنووری پەیمانەکانی ئێستا" ئامادەبکات[5]. ئەوەی لە قسەی نوێنەری

١- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ل ١٤٨-١٥٠.

٢- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٠.

- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.513.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٠.

٤- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ل ١٥١-١٥٢.

٥- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٠.

تورکی روون دەبێتەوە ئەوەیە کە ئەنجامی راپۆرتەکەی کە شاندی بەسەرکردنەوەی راستییەکان ئامادەیان کردبوو رەتکردەوە، بۆیە ئەو (روشدی بەگ) "هیچ بڕیارێکی دەرکراوی ئەنجوومەنی کۆمەڵە کە پشت بە ئەنجامی شاندی بەسەرکردنەوەی راستییەکان ببەستێ، رەتدەکاتەوە"[1].

نوێنەری تورکی بە داواکارییەك کۆتایی بە قسەکانی هێنا، کە داوای لە ئەنجوومەنی کۆمەڵە کرد توێژینەوەی لایەنی سیاسی و یاسایی بە جیا لە کێشەی ئینیتێداب بکات، هیوای خواست کە ئەنجوومەن پاڵپشتی لە رای لیژنەی یاسایی بکات و سەروەری تورکیا بەسەر ویلایەتی موسڵ درێژە پێبدات، ئەمەش بەڕای ئەو "تاکە چارەسەری دادوەرانە و پاکە"[2].

لە ٤ی ئەیلول، ئەمیری تاوتوێی وتارەکەی روشدی بەگی کرد و خاڵ بە خاڵ وەڵامی دایەوە، ئەویش نموونەی چەند کۆپلەیەکی لە راپۆرتی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان رەتکردنەوەی دەرەنجامەکانی روشدی بەگ، هێنایەوە. ئەمیری نوێنەری تورکی بە ئینتقائی[3] لە بەرووخستنی راستییەکان تۆمەتبارکرد، دواتر باسی لە بابەتە سیاسی و ئەتنی و ئابوورییەکان کردو گوتی هەموو داتا و زانیارییە تورکییەکان بەشێوەیەکی گشتی سەرەتاوە تا کۆتایی جەختی لەسەر ئەو گریمانەی کە دەڵێت مادام ژمارەیەکی زۆر کورد لە تورکیا هەن، بۆیە دەبێت کوردی عێراق کە دەیانەوێت بۆ تورکیا بگەڕێنەوە، هەروەها نوێنەرە بەریتانییەکە تکای لە ئەنجوومەن کرد کە مەزەندەی ئەوە بکات کە شوڕشی کوردی -مەبەستی راپەڕینی ١٩٢٥- لە تورکیا هانی کوردی دەرەوەی تورکیا دەدات کە بەخواستی خۆیان ملکەچی دەسەڵاتی تورکی بن، هەروەها هانیان دەدات کە هاوسۆزی لەگەڵ حکوومەتی تورکی لە دژی هاو رەگەزی خۆیان دەربڕن[4].

هەروەها ئەمیری سەرلەنوێ داوای ئەو هێڵە پێشنیازکراوەی کرد کە بەشێك لە ویلایەتی هەکاری تورکی دەگرێتە خۆی، هەروەها داوای لە نوێنەری تورکی کرد بۆ ئەنجوومەن دووپات بکاتەوە کە تورکیا مادده مادده پاڵپشتی لە هەر بڕیارێك بکات کە ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەبارەی کێشەی موسڵەوە، دەریدەکات[5].

---

١- روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢١٦.

٢- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ١٥٢.

٣- ئینتیقائی (الانتقائیه): واتە هەڵبژاردنی شتی باش لەناو خراپ، یان باشترین لە ناو باشدا. (وەرگێڕ).

٤- جرجیس فتح الله، یقظة ..." ص ٦٧٦" سروة اسعد صابر، سەرچاوەی پێشو، ل ٣١٣.

٥- ژیانەوە، جریدة، السلیمانیة، العدد(٤٠)، ١٧ أیلول ١٩٢٥. في: **ژیانەوە وشوێنی ...**؛ فاضل حسین، مشکلة...، ل ١٥٦.



بۆ زیاتر هەستبزێندارکردنی شاندی تورکی، ئەمیر پرسی ئینیتدابی بە مافەکانی کورد بەستاوە، کاتێ گوتی لیژنەکە راینەسپاردووە کە رژێمی ئینیتیداب بۆ عێراق بهێنرێت، هەر وەك ئەوەی نوێنەری تورکی باسیشی کرد، بەڵام پێشنیازی بەردەوامی پەیوەندی هاوپەیمانی نێوان عێراق و بەریتانیای کرد، لەپاڵ ئۆتۆنۆمی بۆ کورد. ئەوەی پرسی ئاخۆ تورکیا ئامادەیە هەمان ئەو ئیمتیاز و مافانە بە کوردی تورکیا و عێراق بدات، ئەگەر هاتنە پاڵیەوە[1].

ئەمیری کۆتایی قسەکانی بە یادخستنەوەی ئەنجوومەن هێنا، کاتێ گوتی کێشەی ئێستا کێشەی نەخشەکێشانی سنوورە نەوەك بڕیاردان لەسەر چارەنووسی ویلایەتەکە، تکای لە ئەنجوومەن کرد کە رێگە بە تورکیا نەدات خاکی عێراق پارچە پارچە بکات[2].

حکوومەتی تورکی هیچ گەرەنیتەکی لەبارەی ئەوەی ئایا پێشوەختە بە بڕیاری ئەنجوومەن رازی دەبێت یان نا، نەدا، لەبارەی کورد باسی لە پەیمان و بەڵێنی شارەوە کرد کە پێشتر پێیان دراوە و باسی لەوە کرد کە "کورد هەمان ئەو مافانەی هەیە کە تورك هەیەتی"[3].

روشدی بەگ لەبارەی شۆڕشی کوردی ١٩٢٥ گوتی: "لەو باوەڕەدام کە نوێنەری باڵای بەریتانی لەگەڵ هەڵوێستی شێخ سەعیدی پیران و شوێنکەوتووانی دژ بە رژێمی تورکی کە دەسەڵاتی لە گەل و ئازادی ویژدان وەرگرتووە،کۆك نیە. ئەو ناتوانێت لە مەبەستی دابەشکردنی کورد بگات، بە پاساوی پارێزگاریکردن لێیان. من دەپرسم ئایا بەریتانیا دەیەوێت بەشێك لە کوردی لە ژێر دەستی بمێنێتەوە، تاکو لە دژی تورکیا کە زۆرترین ژمارەی کوردی تێدایە بەکاریان بهێنێت"[4].

ئەوەی لە قسەی روشدی بەگ روون دەبێتەوە کە تورکیا ویلایەتی موسڵی بە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایش و یەکێتی خاکەکەی دەبینێ، داواکردنی ویلایەتەکە هەر تەنها لەسەر بنەمای گرنگییەکەی لە لایەنی ستراتیژی یان بوونی پترۆل نەهاتبوو، بەڵکو هەڵکەوتی ویلایەتەکە بە

---

١- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ١٥٦.

2- Peter.J.Beck,Op.Cit.,P.668;

- فاضل حسین، مشکلة...، ل ١٥٧.

٣- جرجیس فتح الله، یقظة ..." ص ٦٧٦" سروة اسعد صابر، سەرچاوەی پێشو، ل ٣١٣.

٤- جرجیس فتح الله، یقظة ..." ص ٦٧٦" سروة اسعد صابر، سەرچاوەی پێشو، ل ٣١٣.

کورده زۆرەکەیەوە کە نزیکەی زیاتر لە نیو ملیۆن کەس بوو[1]، لە جەرگەی ئەو ناوچانانەی کە کورد تێیدا دەژین. بەهۆی توانا نەوتی و کشتوکاڵی و بازرگانی و ئابوورییەکانەوە کە ئەو ناوچەیە هەیبوو، ئەوا لە داهاتوودا کوردانی دەوروبەری ویلایەتەکە بۆ خۆی کێشدەکات و لە یەکێتی ئابووری موسڵ یەکیان دەخات. تورکەکان جیاکردنەوەی ویلایەتەکە لە تورکیا بە هەڕەشە بۆ سەر یەکێتی خاکی تورکیا و ئارامییەکەی دەبینن[2].

هەر لەو سەروبەندەدا، نوێنەری تورکی سەرلەنوێ فرۆکەوانە ئینگلیزیەکانی بە پێشێلکاری **هێڵی** برۆکسل و ئاسمانی تورکی تۆمەتبارکرد. بەریتانییەکان لە وەڵامدا، سکاڵایان بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە لە ڕۆژانی ١٥ و ١٦ ی ئەیلول بەرزکردەوە، ئەوەیان تێدا ڕوونکردبووەوە کە هێزەکانی تورکی **مەسیحییە**کان و کوردی گۆیانیان[3] لە باکووری **هێڵی** برۆکسل بۆ باشووری ڕاگوێزاوە.

---

١- ئامارەکانی تورکیا لە لۆزان ژمارەی کوردی بە نزیکەی ٢٦٣٣٨٠ کەس مەزەندە کردووە، ئەفسەرە بەریتانییەکانیش لە ساڵی ١٩٢١ بە نزیکەی ٢٤٧٢٠ کەس مەزەندە کردووە، بەڵام مەزەندەکانی ئەو دواییەی کە دەسەڵاتی عێراقی لە ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٤ ئەنجامیداوە، بە نزیکەی ٤٩٤٠٠٧ کەس، بەڵام دەبێت بە ئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو ئامارانەی ئەو لایەنانە کە ئەو ژمارەیان پێشکەشکردووە بکرێت، تورکان لەسەر حسابی کورد و عەرەب ژمارەی تورکانیان لە ویلایەتەکە زیاد دەکرد، عێراقیەکان و بەریتانییەکان ویستیان ژمارەی عەرەب زیاد بکەن و ژمارەی کورد و تورك کەم بکەنەوە. هیچ ئامارێکی بێ لایەن لەو ماوەیەدا لەبەردەست دا نیە، سەیری:

- League of Nations, Questions…,,P.31 .

2- Memoranda Respecting the Iraq Frontier Dispute, Foreign Office, 23-10-1925, BDFP, No.534, AI.Sir,Vol. I,P.766;

- هنري فوستر سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٠.

٣- لەبەر زۆر هۆکار کوردی گۆیان، کە عشیرەتێکی گەورەی کوردین لە نێوان تورکیا و عێراق دابەشبوونە، بەدەستی تورکان ڕاگوێزران: گرنگترینیان ئەوەبوو هەندێکیان داوایان لە لیژنەی بەسەرکردنەوەی ڕاستیەکان کرد بخرێنە سەر قەڵەمڕەوی بەریتانی، ئەم داوایەیان وایکرد لەحوزیرانی ١٩٢٥ لەگەڵ هێزەکانی تورکی بکەونە شەڕەوە، بەهۆیەوە ژمارەیەکیان بۆ سوریا و سنووری ویلایەتی موسڵ و شارەکانی ماردین و دیاربەکر پەڕاگەندە بوون. سەیری:



لە ٢١ی ئەیلول ئەمیری لە نامەیەکدا تکای لە ئەنجوومەنی کۆمەڵە کرد، کە کۆبوونەوەیەکی بەپەلە بۆ سەیریکردنی کێشەی ڕاگوازتنی **مەسیحییە**کان سازبکات[1]. لەپێناوی دانانی سنوورێك بۆ ئەو ڕووداوانەی کە کار لە ڕێڕەوی دانوستاندنەکان دەکەن، ئەمیری بۆ سەرۆکی کۆمەڵەی ئۆندنی پێشنیازکرد، کە نوێنەریك یان چەند نوێنەریك بۆ **هێڵی** برۆکسل بنێرێت، سەرۆکی کۆمەڵە پێشنیازەکەی پەسند کرد و فەتحی بەگیش نارەزایەتی پێشان نەدا[2]. هەرچەندە تورکیا بە ناردنی شاندی تایبەت بۆ بەسەرکردنەوەی ڕاستی پێشێلکارییەکان نارازی نەبوو، بەڵام نوێنەری تورکی ڕێگەی بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لە باکووری **هێڵی** برۆکسل نەدا، یان چالاکی شاندەکە بۆ ئەوێ درێژبپێتەوە، بە بیانووی ئەوەی کە لەودیوی **هێڵی** برۆکسلەوە هیچ ناکۆکییە لە ئارادانییە، ئەوەشی گوت کە پرسی کەمینەکان کە لێکۆڵینەوەکە دەیگرێتەوە، زۆر لە کێشەی موسڵەوە دوورە[3]. ئەوەشی بە بیری ئەندامانی ئەنجوومەن هێنایەوە کە ڕەفتارەکانی نەستوریەکان —ئاشورییەکان- لە میانەی جەنگەکەدا دژ بە وڵاتەکەیان (تورکیا)خیانەت بووە[4].

ئەنجوومەن هەریەکە لە ئەستونی ژەنەراڵ ی خانەنشین و ف . لیدونری سەرۆکی ئەرکانی پێشووی ڕاسپارد کە ڕەوشەکە لە چوارچێوەی سنوورە کاتییەکە بپشکنن و ڕووداوەکانی ئەوێ بە ئەنجوومەن ڕابگەیەنن، لەم ئەرکەیاندا هەریەکە لە ڕۆدلف یالی بەلجیکی و ئۆرتیکا لە دیپلۆماسیەتی ئیسپانی و وای شاریری فەرەنسی نوێنەری سکرتێری ئەنجوومەنی کۆمەڵە

---

- جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ٣٠٧.

تۆینبی ڕاڤەیەکێ دیکە بۆ هۆکاری ئەو هەڵسوکەوتەی تورکیا دەکات، ئەویش ئەوە بوو، کە سەرکردەکانی گۆیان داوایەکی دەسەڵاتدارانی تورکیا ڕەتکردەوە کە داوایان کردبوو هاوڵاتیانی مەسیحی سەربڕن، بۆ تەمبێکردنیان دەسەڵاتی تورکی ئەوەی توانی کوشتی و ئەوەی دیکە ڕایانکرد بۆ عێراق و وەك پەنابەر وەرگیران. سەیری:

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.517.

١- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ١٣٨.

2- Mim K.Oke,A Chronology…,,PP. 65-66.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٧٣.

٤- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل ١٣٩-١٤٠.

یارمەتیان دەدەن[1]. لە رۆژی **٢٣** ئەیلولی **١٩٢٥** دامەزران و لە **٢٦**ی تشرینی یەکەم گەیشتنە بەغدا و دوای ئەوەی بەڵگەنامە و نامەی تایبەتیان لە نوێنەری باڵای بەریتانی وەرگرت، بەرەو ویلایەتی موسڵ چوون، بۆ ئەوەی پشکنینەکانیان دەستپێبکەن[2]. لەو ماوەیەدا بڕیاردەری ئەنجوومەنی کۆمەڵە وای بەباش بینی کە لیژنە لاوەکیە سێ قۆڵیەکە دووبارە لە نوێنەرانی ئیسپانیا و ئۆرگوای پێکبهێنرێتەوە[3]، لیژنەکە راسپێردرا، کە توێژینەوەی کێشەکە بکات و سەرجەم بەڵگەکان بپشکنێ، دەبێت هەردوولای کێشەکە یارمەتی لیژنەکە لەبارەی هەر زانیارییەك کە بە پێویستی دەزانێ بۆ ئەوەی بگەنە چارەسەرێکی ئاشتی و دادوەرانە[4]. هەریەکە لە بەریتانیا و تورکیا ئامادەیی خۆیان بۆ یارمەتیدانی لیژنەکە دەربڕی، بەڵام تورکیا مەرجی دانا، کە دەبێت راپۆرتی لیژنەکە هەندێ لەو راستیانەی کە لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان تێبینی کردبوو، بەڵام نەینووسیبوون، لەخۆ بگرێت، سەرۆکی ئەنجوومەنی کۆمەڵە پێشوازی لە داواکەی تورکی کرد[5].

دوای ئەوەی لیژنە سێ قۆڵیەکە توێژینەوەی کێشەکەی لە هەموو لایەنەکانی کرد، پێشنیازەکانی پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆمەڵە کرد، ئەنجوومەنیش بۆئەمە لە **١٩**ی ئەیلول کۆبوونەوەی سازکرد و بڕیاردەری لیژنەکە راپۆرتەکەی خوێندەوە و گوتی[6]: لیژنەی ئەنجوومەن دیراسەی هەندێ پرسی سەرەتایی کردووە، کە دووانیان گرنگن:

١- سیفەتی ئەو بڕیارە چی یە کە ئەنجوومەن بەپێی بڕگەی دووەمی ماددەی سێیەم لە پەیمانی لۆزان دەریدەکات؟ ئایا بڕیارێکی نێوبژیوانییە؟ یان راسپاردەیە؟ یان تەنها میانگیریی؟.

1- Mim K.Oke,A Chronology…,,P.65;

- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٤.

2- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.511.

٣- هەمان ئەو لیژنەیە بوو کە پێشتر لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٤ هیلی برۆکسلی کێشابوو، بەهەمان ئەندامانیەوە دامەزران. سەیری:

- جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ١٥٠

4- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.513.

5- Ibid,P.513

٦- جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ٦٧٦.



٢- ئایا دەبێت ئەو بڕیارەی ئەنجوومەنی کۆمەڵە دەریدەکات، بە کۆ بێت یان بە زۆرینە بێت؟ ئایا بۆ هەردوولاکە هەیە بەشداری دەنگدانەکە بکەن؟[1].

لەبەرئەوەی ئەو دوو پرسیارە یاسایی بوون، لیژنەکە وای بەباشزانی پێشنیاز بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە بکات بابەتەکە رەوانەی دادگای دادی نێودەوڵەتی لە لاهای بکات، بۆ ئەوەی رای راوێژکاری دەستبکەوێت. لەلای خۆیەوە ئەنجوومەنی کۆمەڵە بەپێی ماددەی چواری میساقەکەی، بە پێشنیازەکە رازی بوو، بابەتەکەی لەگەڵ راپۆرت و پەڕاو و بەڵگەنامەکان و وەڵامەکان بۆ دادگای دادی نێودەوڵەتی نارد[2].

ئەیمری داخی بۆ ئەو دواخستنە خوارد و گوتی: "ئەرکی ئەنجوومەنی کۆمەڵە ئەرکی دەرکردنی بڕیاری یەکلاکەرەوەیە کێشەکانی بەردەستیەتی،..."[3]، بەڵام لە دواییدا رازی بوو ئەم رێوشوێنە بگرێتەبەر[4]. هەرچی روشدی بەگ بوو گوتی: "تاکە رێوشوێنێك کە بمانگەیەنێتە چارەسەرێکی وا کە دوو لایەن پێی رازی بن، لە رێگەی دائیرەیەکی باشی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە دەبێت....نەوەك بە بڕیارێکی ئەنجوومەن کە دوو لایەنەکە پێی رازی نەبن". بۆ پاڵپشتی ئەو قسەیەی ئاماژەی بەو قسەیەی لۆرد کریزن کرد کە لە رۆژی **٢٣**ی تەمووزی **١٩٢٣** کردبووی و گوتی: "هیچ بوارێك بۆ دەرکردنی بڕیار بەبێ رازی بوونی تورکیا لە ئارادا نییە"[5]. هەروەها گوتی بیرۆکەی دادگا لە ژێر هەر رەوشێکدا بێت، کار لە مافەکانی تورکیا ناکات، کە بەهۆی پەیمانی لۆزانەوە پێی بەخشراوە[6]. روونیکردەوە کە تورکیا پرسەکە بە مۆرکێکی سیاسی نەوەك قەزایی دەبینێت، نابێت بخرێتە بەردەم دادگای لاهای[7]. ناڕەزایەتی

1- Mehmet Gonlubol,A.G.E,S.76; A.J.Toynbee, Op.Cit., P.514; Vladimer F.Minorsky, A.G.E, SS.48-49.

٢- جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ل ٦٧٦-٦٧٧.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٠.

4- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.514.

٥- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٧٠-٢٧١.

٦- أصغر جعفري ولداني، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٨ "

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.514.

7- Mehmet Gonlubol,A.G.E, S.76;

لەسەر بڕیارەکە پێشاندا و جنیڤی جێهێشت و بڕیاریدا تورکیا لە دانیشتنەکانی ئەو دادگایە ئامادە نەبێت[1].

لە دوایین، هەوڵی شاندی تورکی پێشنیازی ڕێککەوتنێکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ بەریتانیا کرد، لەدەرەوەی چوارچێوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئەویش ئەوەبوو کە تورکیا دەستبەرداری ناوچەی دیالە تا عێراق دەبێت، بەهۆی ئەوەی ئەو ناوچەیە لە چارەسەرکردنی ئاودێری ڕۆڵ دەبینێ و ترسی بەریتانیا لەبارەی ئاسایشی ستراتیژی عێراق دەرەوێنێتەوە، پێشنیازی کرد میساق یان پەیمانێکی چوار قۆڵی لە نێوان عێراق — تورکیا _ بەریتانیا _ ئێران ببەسترێت[2].

بەڵام ئاسایی بوو کە ئەو پێشنیازەی تورکی لەلای بەریتانیا ڕەتبکرێتەوە، بەریتانیا بەتوندی دژی هەر پێشنیازێك یان پرۆژەیەك دەوەستا کە ئامانجی بوو "خاکەکە بکات بەدوو لەتەوە"[3]. ئەیمری لەبری پەسندکردنی پێشنیازەکە هۆشداری بە شاندی تورکیدا کە "تا حکوومەتی تورکی بە ڕوونی و بە وردی پەیمان نوێ نەکاتەوە لەبارەی ڕازیبوونی پێشوەختەی بە بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵە، ئەوا بەڵێن و پەیمانەکانی لەگەڵ حکوومەتی بەریتانی کۆتایی دێت و هیچ کاریگەرییەکیان نامێنێت"[4].

هەرچۆنێك بێت، دادگای دادی نێودەوڵەتی لە لاهای تەلەگرافێکی لە ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٢٥ لە حکوومەتی تورکی پێگەشیتبوو، ئەوەی پێراگەیاندبوو کە حکوومەتی تورکی ئامادەی دانیشتنەکانی دادگا نابێت و بەشداری بڕیارەکانی ناکات[5]، بەڵام ئەوە ڕێگر نەبوو لەوەی کە بەڵگەنامە و ئەو یاسایانەی کە بە کۆنگرەی لۆزان و قوستەنتینیەوە پەیوەستن بۆ دادگاکە نە نێرێت، هەروەها کۆی ئەو بەڵگەنامانەی کە بە کێشەی موسڵەوە ناسراون، بۆ دادگاکە نارد"، هەروەها وەڵامی چەند پرسیارێکیشی دایەوە کە دادگای دادی

- البرت م. منتشا شفيلي، ل ٢٦٣.

1- Mim K.Oke,A Chronology...,P.67.

2- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.515.

٣- سي.جي.أدمونذز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٨٤.

٤- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ١٦١

5- Mehmet Gonlubol,A.G.E, S.76;

- أصغر جعفري ولداني، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٨.



نێودەوڵەتی کردبووی[1]. هەرچی بەریتانیا بوو ئەوا سێر دۆگلاس هاکی نارد تاکو لە دادگاکە نوێنەرایەتی بکات[2].

نە ناردنی نوێنەر، بۆ بەرگریکردن لە کێشەکەیان، بۆ بەردەم دادگای دادی نێودەوڵەتی، زیانی بە هەڵوێستی لاوازی تورکیا لەبەرامبەر وڵاتانی ئەوروپی ئەندام لە ئەنجوومەن و دادگاکە گەیاند، تورکیا هەلێکی دیکەیان لەکیس چوو کە دەکرا بیروڕای خۆیان تێدا بەرووخستبا و بەرگریان لە کێشەی خۆیان لەبەردەم کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بکردابووایە، ئەم هەنگاوەی تورکەکان نامەیەکی هەڵە بوو بۆ ئەندامانی ئەنجوومەن ناردیان، والێکدرایەوە کە تورکەکان وەڵامی ئەنجوومەنی کۆمەڵە نادەنەوە و دانی پیانانێن. لە هەمان کاتدا بەریتانیا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ هەڵوێستەکە زانایی بەکارهێنا، ئەویش بەناردنی کەسایەتییەکی گرنگ و پسپۆر لەبواری قەزایی بۆ دادگاکە، کە ئەویش داواکاری گشتی دەوڵەت بوو، ئەم نوێنەرایەتیکردنەی بەهەلزانی بۆ ئەوەی لایەنگری زیاتر لەناو ئەنجوومەن پەیدا بکات، بەو پێیەی وڵاتێکی بەهێزە و بە تورکیا بەراورد ناکرێت.

ئەوەی لە دادگای لاهای گرنگ بوو ئەوەبوو کە دادگاکە پێشنیازەکانی لەبارەی ئەو پرسیارانەی کە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ٢١ی تشرینی دووەم پێشکەشی کردبوون، دەرکرد، ئەمەی خوارەوەی تێدا هاتبوو:

١- ئەو بڕیارەی کە ئەنجوومەنی کۆمەڵە دەریدەکات دەبێت هەردوولاکە پێوەی پابەند بن، هەروەها دەبێتە دیاریکەری هێڵی سنووری نێوان تورکیا و عێراق و دەبێت ئەو بڕیارە بەکۆ بێت.

٢- بۆ نوێنەرانی هەردوولای ناکۆکییەکە هەیە، کە بەشداری دەنگدان لە ئەنجوومەنی کۆمەڵەدا بکەن، بەمەرجێ دەنگیان بەهەند وەرنەگیرێت، ئەگەر لەگەڵ ڕای ئەندامانی دیکەدا ناکۆك بوو[3].

لە ٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥، مونیر بەگ -نوێنەری تورکی- و ئەیمری گفتوگۆی بڕیارە ڕاوێژکاریەکەی دادگای لاهایان کرد، نوێنەری بەریتانی بڕیارەکەی بە پاڵپشتیکەری تێڕوانینی

١- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٢.

٢- اصغر جعفري، ولداني، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٨.

٣- سي.جي.أدمونذز، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٨٣"البرت م. منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٤"

جرجيس فتح الله، يقظة ...، ل ٦٧٧.

خۆی زانی کە پێشتر دەربڕیبوو، کاتێ گوتبووی کە پابەندی راستەقینە کە بەسەر هەردوولاکە سەپێنرا، بەهۆی ماددەی سێی پەیمانی لۆزانەوە[1] بووە، نەوەك بە لێدوانی دوولاکە، بەڵام مونیر بەگ گوتی هیچ راڤەیەك بۆ برگەی ٢ ی ماددەی ٣ی پەیمانی لۆزان لەوەی کە لەکاتێ پەسندکردنی بە ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی دراوە نییە[2]. هەروەها گوتی "ناکرێت چارەنووسی سەرجەم ناوچەی جێناکۆك بۆ رەحمەتی نێوبژیوانی لێبگەرێنرێت"[3]. دواتر مونیر بەگ داوای لە ئەنجوومەن کرد رۆلی مانگیری بگێرێت و ئەو هەڵوێستە بنوێنی کە پەیمانی لۆزان و میساقی کۆمەڵە پێیان بەخشیوە، هەروەها رایگەیاند بۆ ئەوەی دەنگدانەکە چالاك بێت، پێویستە دەنگدانەکە بە "کۆی دەنگ" بێت، بە هەردوو دەنگی تورکیا و بەریتانیاوە بێت، بەڵام بریاردەری ئەنجوومەن بریاریدا کە دەنگەکانی بەریتانیا و تورکیا نەخاتە دەنگدانەوە، مونیر بەگ بەتوندی دژی ئەو بریارە بوو[4].

لەمیانەی ئەو کۆبوونەوەیەی کە لە ١٠ی کانوونی یەکەم لە جنێڤی بارەگای ئەنجوومەنی کۆمەڵە سازکرا، کە تورکیا بەشداری تێدا نەکرد، ئەو نامەیەی کە روشدی بەگی وەزیری دەرەوەی تورکی بۆ بەشداربووانی کۆبوونەوەکە ناردبووی خرایە روو، تێیدا روشدی بەگ ئاماژەی بۆ ئەوەکردبوو کە "نوێنەری تورکی دەنگی لە دژی بریارە نوێیەکە داوە.... بەپێی میساقی کۆمەڵە پەسندکردنی رای دادگای راوێژکاری بە راکانی ئەندامانی دیکە، نابێت بە بریار"[5]. هەروەها لە نامەکەیدا سەرلەنوێ جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە "مافی سەروەرێتی وڵاتێك بەسەر هەرێمێك، تەنها بە رازی بوونی ئەو وڵاتە کۆتایی دێت، لەسەر ئەم بنەمایەش مافی سەروەریمان بەسەر تەواوی ویلایەتی موسڵ هەرماوەتەوە"[6].

١- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٦"

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 519.

2- Mehmet Gonlubol,A.G.E, S.76; A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 519.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٦.

4- Mehmet Gonlubol,A.G.E, S.76.

5- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.519.

٦- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٧.



سووربوون و دەستگرتنی تورکەکان بە موسڵەوە لە نامەکەی روشدی بەگ بەجوانی دەرکەوت، بەڵام پێدەچوو ئەو نامەیە، هەوڵێکی نەزۆکی تورکیا بێت، تاکو بەهۆیەوە پاڵ بە بەریتانیاوە بنێت، لە بەردەم ئەنجوومەنی کۆمەڵە لە هەڵوێستەکەی پاشگەز ببێتەوە.

لە هەمان رۆژ ١٠ی کانوونی یەکەم، ئەنجوومەنی کۆمەڵە گوێی لە راپۆرتەکەی ژەنەراڵ لیدۆنەر (کە لە هێڵی برۆکسل گەڕابووەوە) گرت، توێژەران ئەو دانیشتنەیان بە "کۆبوونەوەی یەکلاکەرەوە" وەسفکرد. چونکە کاریگەری لەسەر ئەنجوومەنی کۆمەڵە هەبوو بۆ دەرکردنی بریاری کۆتایی[1]. لەبەرئەوەی لە راپۆرتەکەدا رووداو و پێشنیازی زۆر هاتبوون[2]، ئەمەش وای لە تورکەکان کرد، کە واباوەڕ بکەن، کە بەریتانییەکان کاریان بۆ پێشکەشکردنی راپۆرتەکە کردووە. ئەمەش لەبەرئەوەی لە ورووژاندنی دەمارگیری ئاینی لە دژیان هەبوو[3].

چەندی ئەنجوومەن رێوشوێنیکی تازەی بگرتبووایەبەر، تورکەکان زیاتر رەق دەبوون، لەوکاتەی کە نوێنەرانیان بەشداریان لە دانیشتنەکانی دادگای دادی نێودەوڵەتی و گوێبیستن لە راپۆرتی ژەنەراڵ لیدۆنەر نەکرد، مستەفا کەمال رایگەیاند کە "موسڵ تورکییە و هیچ شتێك هەتاکو رمیش ناتوانێت ئەمە بگۆڕێت. ئێمە هەردوولاکەی ویلایەتی پێشووی موسڵمان دەوێت، جا چ لەژێر ئینتیداب بێت یان نا، ئەمە گرنگی نیە. ئێمە هەرگیز دەستبەرداری ئەو تێڕوانینە نابین....."[4]. شانبەشانی ئەو لێدوانە هەواڵی گەڕانەوەی سەربازەکان و جووڵانەوە و مۆڵگەبوونی هێزەکانی تورکی و بڵاوکردنەوەی مین لە بەندەرەکان، پەخشدەکرا[5]. راپۆرتەکانی

١- البرت م.ألبرت م. ألبرت م. منتشاشفيلي، العراق سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٤" هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٥.

- A.J.Toynbee,Op.Cit., 520; S.H. Longrigge,Op.Cit.,P.155 "

٢- راپۆرتەکەی لیدۆنەر دەریخست کە کە زۆربەی رووداوەکانی سنووربەزاند رووداوی ئاسایی و بە رێککەوتبووە، بەڵام رووداوەکانی باکوور هێڵ بەهۆی سەرپێچییە فراوانەکانی سەربازانی تورگیەوە بووە، کە وایکرد گوندنشین و مەسیحییەکان بۆ ناو سنووری عێراق دەربکات. سەیری:

- صورة كتاب قائمقام زاخو، رقم ٣٥٦٩، ١٤-١٠-١٩٢٥، الحكومة العراقية، وزارة الداخلية، شعبة الحدود، وثائق رسمية لعام ١٩٢٥.في مريم عزيز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١١٣-١٢٧.

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٧٥.

٤- ألبرت م. منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٥" هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨١.

٥- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨١.

دەزگای هەواڵگری بەریتانی بۆ مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥، کۆکردنەوەی هێزەی تورکی پێکهاتوو لە ١٣,٠٠٠ پیادە و ٥,٠٠٠ سوارچاك لە کوردستان لە نزیك سنووری باکووری ویلایەتی موسڵی (هێڵی برۆکسل) گواستەوە، هەروەها هێزەکە بەدرێژایی ناوچەکە تا نەسیبەییینی سەرسنووری تورکی سوری بڵاوببوونەوە[1].

پێدەچوو، حکوومەتی عێراق و بەریتانی هەڕەشەکانی تورکەکان و لێدوان و جووڵانەوە سەربازییەکانیان بە هەند وەرگرتبێت، مەلیك فەیسەڵ لە وتارێکی لە لەندەن لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ رایگەیاند کە "دابڕاندنی موسڵ گورزێکی گەورەیە لەوانەیە کوشندەش بێت....ئەمە دەبێتە خەرجی دیکە بۆ سەر ئامادەکاریە سەربازییەکان". دەستبەجێ دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا رایگەیاند کە ژمارەی تاکەکانی سوپای نیزامی عێراقی کە پلانی بۆ دادەنرێت، بۆ ١٢,٠٠٠ کەس زیاد دەکرێت[2].

ئەو پەرەسەندانە، نەبوونە رێگر لەبەردەم کارەکانی ئەنجوومەنی کۆمەڵە لەبارەی چارەسەری کێشەکە، بەرێز ئۆندن -بڕیاردەری ئەنجوومەن- رایگەیاند کە لیژنەی ئەنجوومەن گەیشتۆتە ئەوەی کە دوو رێگا چارە بۆ کێشەکە هەیە، ئەوانیش[3]:

١- لکاندنی سەرجەم ئەو ناوچەیەی کە کەوتۆتە باشووری هێڵی برۆکسلەوە بە عێراق.

٢- دابەشکردنی ناوچەی جێناکۆك، بەهێڵێك کە لەگەڵ ڕێڕەوی زێی بچووك درێژ دەبێتەوە.

بەهۆی ئاڵۆزی کێشەکە و بەرپرسیارێتی تایبەتی کۆمەڵەوە، ئەندامانی لیژنە راوێژی یەکتریان کرد، چارەسەری یەکەم بەباشتر دەزانن.

ڕۆژی ١٩ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ ڕۆژێکی یەکلاکەرەوە بوو لە دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ، لەو ڕۆژە سنوورێ بۆ ئەوەی پێی دەگوترێت کێشەی موسڵ دانرا، ئەنجوومەن لەمیانەی ئەو کۆبوونەوەیەی کە شاندی تورکی بەشداری تێدا نەکرد و نامەیەکی بۆ ئەنجوومەن نارد و مافی ئەنجوومەنی لەدەرکردنی بڕیاری یەکلاکەرەوە، شەرمەزارکرد، ئەنجوومەن ئەو بڕیارانەی دەرکرد:

---

1- Peter.J.Beck,Op.Cit.,P. 268.

٢- ألبرت م. منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٥" هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٨٠-٢٨١.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.520.



١- "هێڵی برۆکسل" هێڵی سنووری نێوان تورکیا و عێراق دەبێت.

٢- وەڵامی داواکەی بەریتانیا دەداتەوە، لەبارەی پێشکەشکردنی پەیمانێکی نوێ کە بۆماوەی ٢٥ ساڵ ئینتیداب بەسەر عێراقەوە زامن دەکات، کە بەهۆی پەیمانی هاوپەیمانی عێراقی بەریتانی دیاریکراوە.

٣- بەریتانیا وەك هێزی ئینتیدابکار، دەبێت ئەو رێوشوێنە ئیدارییانە لەبەردەم ئەنجوومەن دابنێت کە بۆ زامنکردنی مافی دانیشتووانی کورد دەیانگرێتەبەر، کە لە راپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوە باسی لێوەکراون.

٤- وەڵامی داواکەی بەریتانیا بۆ جێبەجێکردنی راسپاردەکانی لیژنەی تایبەت، دەداتەوە[1].

ئەنجوومەنی کۆمەڵە، رایگەیاند بۆ ئەوەی بڕیارەکە بە راستی جێبەجێبکرێت، ئەوا چارەسەری کۆتایی قەزایی، هێشتا ململانێیەکەی کۆتایی پێنەهێناوە، ئەگەر بەدوای بڕیاری ئەنجوومەن رێککەوتنێکی دۆستانەی نێوان هەردوو حکوومەتی بەریتانی و تورکی نەیەت[2].

بڕیاری دادگای دادی نێودەوڵەتی بە یەکلاییکردنەوەی کێشەی موسڵ بۆبەرژەوەندی بەریتانیا و عێراق، دەرەنجامی هەماهەنگیەکی بەرز و ماندووبوونیکی گەورەی دەزگا سیاسییەکانی بەریتانی بوو، جا ژ لای حکوومەتەکەی بێت لە لەندەن، یان لەلای دیپلۆماسیەکانیەوە بێت لە جنێڤ یان ئیدارییەکانی لە ویلایەتی موسڵەوە بەتایبەتی و عێراق بەگشتی بێت، بەریتانیا لەوەتەی لە تشرینی یەکەمی ١٩١٨ هەوڵ دەدات و پلان دادەنێت، بەڵام تورکەکان لە دائیرە سیاسییەکانیان زیاتر تووشی بێ هیوایی و بێ بەرنامەیی دەبوونەوە، نە شارەزاییەکەی عیسمەت پاشا لە لۆزان و توندیەکەی فەتحی بەگ لە کۆنگرەی قوستنتەنیە و دەرمارگیریەکەی تۆفیق روشدی بەگ و یاریدەدەرەکەی مونیر بەگ لە جنێڤ وایان لە بەریتانییەکان نەکرد تەنها هەنگاوێکیش پاشەکشە لەو هەڵوێستە بەهێزەیان بەرامبەر ویلایەتەکە بکەن، هەروەها هەڵمەتە سەربازی و دەستتێوەردانەکانیان و پەیوەندییەکانیان بە ناوەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ شکستپێهێنانی ئیدارە و پلانی بەریتانی تێیدا، سەرکەوتوو نەبوو. بەشێکی گەورەی شکستی تورکەکان لە شەڕی دەستکەوتنی ویلایەتەکە، بۆ مامەڵەی خراپی

---

1- A.J.Toynbee,Op.Cit., PP.520-521“

- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٧٧-٢٧٨. فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل ١٧٣- ١٧٤

2- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.521.

لەگەڵ هاوڵاتیانی کوردی تورکیا دوای راپەڕینی ١٩٢٥ دەگەڕێتەوە. بەمەش پاڵپشتی زۆرینەی دانیشتووانی ویلایەتەکەی کە هەر لەبنەماوە کورد بوون، لەدەستدا[1].

هەروەها ئەمیریش -نوێنەری بەیتانی- هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی گفتوگۆکان لەبارەی کێشەی موسڵ خاڵی لاوازی تورکیای زانی و توانی تا ئەوپەڕی سنوور بۆخۆی بیقۆزێتەوە، بەردەوام لەبارەی مافەکانی کورد لە تورکیا پرسیاری دەکرد، هەروەها لەبارەی چارەنووسی کوردی ویلایەتەکە ئەگەر خرایەوە سەر تورکیا. بەم پرسیارەی زیاتر لەجارێك تۆفیق بەگی خستە شەرمەزاریەوە، ئەویش خۆی لە وەڵامدانەوەی پرسیاری لەبارەی کورد دەبوارد[2].

بڕیارەکانی ئەم دواییەی ئەنجوومەنی کۆمەڵە پەردەی لەسەر گرنگترین لاپەڕەی کێشەی موسڵ لابرد، قۆناغێکی گرنگی لە پەیوەندییەکانی بەریتانی — تورکی کۆتایی پێهێنا، بەریتانیا لەلای خۆیەوە سەرلەنوێ هەوڵی نزیکبوونەوەی لە تورکیا دا،لەلایەك بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەی هاتوو لە رووسیای سۆڤێتی و لەلایەکی دیکەوە بۆ زامنکردن و سەلامەتی رێگا و بانی موستەعمەراتی و دابینکردنی ئاسایش و داهاتووی عێراق، ئەو ولاتەی کە تازە پێکیهێنابوو، بەتایبەتی بە لکاندنی موسڵ پێوەی مەبەستی خۆی پێکا. سیاسەتمەدارانی تورکی لەلای خۆیانەوە لە لەکیسچوونی ویلایەتەکە دڵنیابوون، کاتێ خۆتەرخانکردن بۆ پرۆژەی نوێخوازیە، ئەمەش پێویستی بە ئارامی لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ولاتانی رۆژئاوا بوو، بۆ ئەوەی پارە بۆ ئەو پرۆژە نوێخوازیەی دەستبکەوێت.

بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵە لە ١٦ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ لەبارەی دیاریکردنی هێڵی برۆکسل وە سنووری نێوان عێراق و تورکیا، تەنها بە تیۆری کۆتایی بە ململانێکە هێنا. چونکە تورکیا لایەنێکی ململانێکە بوو، بڕیارەکەی بە شێوەیەکی فەرمی و میللی رەتکردەوە، لەلایەن رۆژنامە تورکییەکانەوە بە توندی هێرشی کرایە سەر[3]، بەڵکو مستەفا کەمال بەخۆی

---

١- سەبارەت بە رەنگدانەوەی راپەڕینی کوردانی ١٩٢٥ لەسەر سیاسەتی تورکان بەرامبەر کێشەی موسڵ سەیری: بابەتی دووەمی بەشی دووەمی ئەم کتێبە بکە.

2- Peter .J. Beck. Op.Cit.,P.267.

٣- ئەو کات رۆژنامەی تورکی خەسڵەتێکی جەنگی پێوەبوو، رۆژنامەی (جمهوریەت) کە لە ئەستەمبۆڵ دەردەچوو، گوتی: " بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان، جارێکی دیکە سەلماندی کە کۆمەڵەی نەتەوەکان خزمەتی ولاتانی بەهێز دەکات، بەتایبەتی بەریتانیا....ئێمە رووبەڕووی ئەو جۆرە بڕیارە زاڵمانەیە نەبووینەوە مەگەر لە



لە دیاریکردنی ئەمەدا دوودڵی نەکرد، کاتێ ئەنجوومەنە جەنگیەکەی باسی لە بیرۆکەی هەڵگیرسانی جەنگی لە نێوان بەریتانیا و تورکیا کرد، کاتێ ئەو ئەنجوومەنە لەسەروبەندی کریسمس و دوای دەرچوونی بڕیارەکە کۆبووەوە[1].

زۆربەی توێژەران رێککەوتنی سۆڤێتی — تورکی کە لە پاریس لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ سازکرا، وەك کاردانەوەی خێرا و گرنگ کە تورکەکان لە بەرامبەر بڕیارەکە وەریانگرت، بەو پێیەی دوای تەنها رۆژێك لە دەرچوونی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵە لەبارەی کێشەی موسڵ[2].

لەراستیدا رووسیا تاکە ولاتێك بوو کە بە ئاشکرا پاڵپشتی بۆ تورکیا دەربڕی، لێدوانەکەی جیجرن ئەو پاڵپشتییەی بۆ تورکەکان، دەربڕی کاتێ گوتی:" تورکەکان لەو کاتەوەی کە جەنگیان ناوێت، ئەوا ئامادەن هەموو قوربانیەك بۆ کێشەی موسڵ بدەن، کۆمەڵەی نەتەوەکان لەبری ئەوەی کێشەکە چارەسەر بکات، تەنگژەیەکی نوێی دروستکرد...."[3].

---

سەدەکانی ناوەراستدا بێت، ......ئیمە دەزانین چۆن موسڵی تورکی بەدەستی خۆمان دەگێڕینەوە، کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بە بەریتانیای بەخشی، هەروەك ئەوەی کە ئەدەنە و بروسا و ئەزمیر و ئەستەمبۆڵمان رزگار کرد موسڵیش رزگار دەکەین، ...". سەیری:

- ألبرت م. ألبرت م. منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٦.

١- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨١”

- S.H. Longrigge,Op.Cit.,P. 156.

٢- تۆفیق روشدی بەگی وەزیری دەرەوەی تورکیا و گەورە دانوستانکار لە جنێڤ پەیمانەکەی مۆرکرد و لەلایەن سۆڤێتەوە جیجرنی وەزیری دەرەوە مۆریکرد، ناوی (پەیمانی دۆستایەتی و بێلایەنی) لێنرا، بە گرنگترین پەیمانی نێوان تورکیا و سۆڤێت دادەنرێت، بە سەرکەوتنیکی دیپلۆماسیش بۆ جیجرن دادەنرێت، لە گرنگترین بەندەکان: هەردوو لا بەڵێن دەدەن خۆیان لە جولانەوە لە دژی یەکتری دەپارێون، ئەگەر ولاتی سێیەم جولانەوەی سەربازی لە دژی یەکێکیان ئەنجام بدات، ئەوا لاکەی تر بێلایەن دەبێت، هیچ لایەکێان پەیمان یان هاوپەیمانی سیاسی لە دژی لاکەی تر نابەستێ...بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- صبحي ناظم توفيق، تركيا والتحالفات ...، ل ٣١”

- A.J.Toynbee, Op. Cit.,P. 520.

٣- مقتبس من: هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٢٨٢.

سەبارى ئەمانە مستەفا كەمال لاى روون بوو كە هانابردن بۆ سۆڤێت و داواى يارمەتى كردن لێ، پڕ مەترسييە، ئەو مەترسييەى لە وتارى ئەنجوومەنى عەسكەرى پێشاندا كە لە ٢٥ى كانوونى يەكەمى ١٩٢٥ كۆبووەوە، كاتێ ڕێگاكانى مامەڵەكردنى لەگەڵ كێشەى موسڵ و پەيوەندييەكانى توركيا و رووسياى تێدا خستەڕوو، ئەنجوومەنەكە تێڕوانينى مستەفا كەمالى وەرگرت، كە داواى كرد، داواى يارمەتى لە رووسيا نەكرێت، "چونكە ئەمە وادەكات سوپاى رووسى بێتە ناو خاكى توركيەوە، سەخت بتوانرێت قەرەبووى يارمەتيەكانى رووسيا بكرێتەوە"[1]، هەروەها ئەنجوومەنى نيشتيمانى گەورەى توركى بڕيارێكى وەرگت لەبارەى بەكارنەهێنانى هێز بۆ چارەسەركردنى كێشەى موسڵ[2]، پێدەچێت ئەمە پاڵپشتى لە راى تۆينبى كردبێ كاتێ گوتى: "ئەو پەيمانە نوێيە -پەيمانى دۆستايەتى و بێلايەنى- مستەفا كەمال و هاوڕێيانى لە رووبەڕووبوونەوەى بڕيارى كۆمەڵەى نەتەوەكان بە زەبرى چەك بەلارێدا نەبرد، بەر لە كۆتايى كانوونى يەكەمى ١٩٢٥ حكوومەتى توركى گفتوگۆى ئەگەرى بەكارهێنانى هێزى لە چارەسەرى كێشەى موسڵ كرد، بەڵام دواتر بە يەكجارى وازى لەم بيرۆكەيە هێنا بەهۆى مەترسييە زۆرەكانيەوە"[3].

سەبارەت بە بەريتانيا كەلايەنى براوەى ململانێكە بوو، ئاسايى بوو كە پێشوازى لە بڕيارەكە بكات و بە بڕيارێكى دادوەرانە و راستى كۆمەڵەى دابنێت، لەكاتێكدا چەمبەرلێنى وەزيرى دەرەوەى بەريتانيا سوپاسى سەرۆك و ئەنجوومەنى كۆمەڵەى كرد، بەناوى حكوومەتى بەريتانييەوە قسەى كردو گوتى: "حكوومەتەكەم هيچ ئارەزووى نييە، هەڵوێستێكى توند و ناهاوسەنگ بەرامبەر توركيا وەربكرێت... بەڵكو بەدڵخۆشيەوە ئامادەدەى گفتوگۆيە لەگەڵ توركيا و تاوتوێى هەر پێشنيازێك كە حكوومەتى توركى پێشكەشيدەكات، دەكات.... بۆ ئەوەى هەردووەلامان بەيەكەوە بەرى بڕيارەكانى ئەنجوومەن بخۆين، حكوومەتى بەريتانى سورە لەسەر راكێشانى توركيا بۆ رێككەوتن.."[4].

دوور لە لێدوانەكانى چەمبەرلێن لە جنێڤ كە داواى بەردەوامى گفتوگۆكانى لەگەڵ توركيا دەكرد، سەرجەم دائيرە سياسى و حكوومەتى بەريتانى و دەزگاكانى وەزارەتى دەرەوە چاودێرى

١- هنري فوستر، سەرچاوەى پێشو، ل ل ٢٨١-٢٨٢“ فاضل حسين، مشكلة...، ل ١٨٢.

٢- ألبرت م. منتشاشفيلي، سەرچاوەى پێشو، ل ٢٦٥.

٣- سەيرى كتێبەكەى خۆى بكە: Survey ..., P. 525.

4- A.J.Toynbee, Op. Cit.,PP.521-522.



هەڵوێست و كاردانەوەى حكوومەتى توركيان بە ئاگايى و خۆپارێزييەكى توندەوە دەكرد. بۆ نموونە ئەگەر كردەى سەربازى توركى و گەڕاندنەوەى موسڵ، بابەتى گفتوگۆ و توێژينەوەى كۆبوونەوەى ئەنجوومەنى بەرگرى مەلەكى بەريتانى بوو كە لە ناوەڕاستى تشرينى يەكەمى ١٩٢٥ سازكرا، لە كۆبوونەوەكە بيرۆكەى هێنانى هێز لە هيندستانەوە بۆ ويلايەتى موسڵ، بۆ رووبەڕووبوونەوەى هەر هێرشێكى توركى چاوەڕوانكراو كرايە پلانێك و وردەكارى چونيەتى ئامادەكردنى گفتوگۆ كرا[1]. هەرچەندە چەرچڵ و بەرپرسانى ديكەى بەريتانى لەگەڵ بيرۆكەى پێكدادان لەگەڵ توركەكان نەبوون، يان خۆيان زياتر پابەندى دارايى و سەربازى بۆ بەرگريكردن لە عێراق بكەن[2]، بەڵام هەر داواشى لە هێزى دەريايى بەريتانى كرد، "بۆ هەر رەوشێكى لەناكاو لە ئامادەباشيدا بن، ...ئەگەر هێزى ئاسمانى لە هەر شوێنێك شكستى هێنا، هێزى دەريايى ئەركى خۆى بكات"[3]. هەروەها داوا لە ليندساى باليۆزى بەريتانى لە ئەستەمۆل كرا، بەنهێنى زانيارى لەبارەى جووڵانەوە توركييەكان كۆبكاتەوە[4].

لە ٤ى كانوونى يەكەمى ١٩٢٥، لەميانەى چاوپێكەوتنى چەمبەرلێن بە ئەحمەد فەريد بەگ باليۆزى توركى لە لەندەن، چەمبەرلێن دڵتەنگى بەريتانياى بۆ ئەو دەمەقاڵێيەى كە رۆژنامەى توركى ئەنجاميدەدات، هەتاكو وتارەكانى چەند كەسايەتييەكى سياسى فەرمى توركيش"، چەمبەرلێن هۆشدارى لە هەر كۆكردنەوەيەكى سەربازى لەسەر سنوورى ويلايەتى

1- Mim K.Oke,A Chronology…,P. 68

٢- لەو ماوەيەدا دەنگى ناوەوەى بەريتانيا بەرز بووەوە كە داواى كەمكردنەوەى خەرجييە سەربازييەكانى موستەعمەرات و عێراق بە تايبەتى دەكرد، سەيرى:

-Peter. J. beck,Op.Cit.,P. 268.

٣- پلانى بەريتانى ئەوە بوو كە دووركە توركييەكانى ئيجە و دەردەنيل داگير بكريت بۆ ئەوەى ئەستەمبۆڵ گەمارۆ بدرێت، سەربارى بەكارهێنانى هێزى ئاسمانى مەلەكى، پێشنيازكرا دەست بە هێزەكانى هيندىشەوە بگرێت، لێژنەى بەرگرى لەوەزارەتى جەنگى بەرپتانى بەسەرۆكايەتى لۆرد بەلفۆر بۆ جێبەجێكردنى پلانەكە دەستى بەكار كرد. سەيرى:

- Mim K.Oke,A Chronology…,P. 68; Tyrrell to Mr. London (Geneva), Foreign Office, 11-12-1925, BDFP, IA. Sir, VOL. I, No. 546,PP. 788-789; Peter. J.Beck, Op.Cit., PP, 268-269 .

4- Mim K.Oke,A Chronology…,P.69 .

موسلْ بە بالیۆزە تورکییەکە دا و گوتی: "بەریتانیا لەو کاتەی کە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان هەڕەشە ڕەتدەکاتەوە...، ئەوا لەو باوەڕەدایە کە حکومەتی تورکی هەنگاوێکی واناهاوێژێت کە ببێتە پێشێلکارییەکی گەورەی ئەو ڕێککەوتنەی کە بە کۆمەڵەی نەتەوەکانی داوە، بەڵکو ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتی ئاشوب –مەبەستی تورکیایە- لەگەڵ کۆمەڵەی نەتەوەکان و هەموو ئەوانەی نوێنەرایەتی کۆمەڵە دەکەن، ڕاستەخۆ بکەوێتە ململانێوە"[1]. چمبرلن تێڕوانینی حکوومەتەکەی بۆ میوانەکەی ڕوون کردەوە و گوتی: "وڵاتەکەی خوازیارە گەڕانەوەی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ کۆماری تورکیا دەکات، کە پەیوەندییەکی کۆنە، ...خوێنی بەریتانیا بۆ بەرگری لە تورکیا ڕژاوە، ئەو تاکە جارەی کە کێشەمان لەنێوان دروست بوو ئەوکاتە بوو کە تورکیا چووە پاڵ دوژمنەکانمان لە جەنگی دواییدا بوو.[2]"

---

1- Chamberlain to Lindsay, Foreign Office, 4-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No. 544, PP.784-785.

2- Ibid, P. 784.

## ڕێگە بەرەو دانووستاندن (پاڵنەرەکانی هەردوولا)

سەرباری جووڵانەوە و پلانە سەربازییەکانی بەریتانیا و لێدوانی بەرپرسانیان لەبارەی هەڵوێستی تورکیا لە بڕیاری کۆمەڵە، بەڵام بەریتانیا دەیزانی کە شەڕفرۆشتن بە تورکیا خزمەتی پلان وبەرژەوەندییەکانی ناکات[1]. لەمەوە و بۆ جێبەجێکردنی لێدوانەکانی چمبرلن کە لە جنێڤ لە ١٦ی کانوونی یەکەم دای، بالدوینی[2] سەرۆك وەزیرانی بەریتانی لە ٢٢ کانوونی یەکەم، بانگهێشتی باڵیۆزی تورکی بۆ ئەنجوومەنی عمومی بەریتانی کرد بۆ کۆبوونەوە لەگەڵیدا، دیارترین ئەنجامەکانی ئەو کۆبوونەوەیە کە بەساردی کۆتایی هات، ئەوەبوو هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە باڵیۆزی بەریتانی لە تورکیا لەبارەگای خۆی لە ئەستەمبوڵ سەردانی ئەنقەرە بکات[3].

بەبێ ئەنجام کۆتاییهاتنی چاوپێکەوتنی تورکی -بەریتانی بەمانای ئەوە نەدەهات کە هەردوولاکە نایانەوێت بگەنە ڕێککەوتن و یەلاییکردنەوە، بەڵکو هەرلایە و دەیویست پەیوەندییەکان بە خێرایی لەگەڵ لاکەی دیکە دەستپێبکاتەوە، بەڵام هەریەکە و حساباتی خۆی

---

1- Peter. J.Beck,Op.Cit.,P.269.

٢- بالدوین، (Stanley Baldwin 1867-1947): سیاسەتمەداری بەریتانی بوو، لە ١٩٢١ وەزیری بازرگانی دەرەوەی بەریتانیا بوو، دواتر لە هەڵبژاردنی ١٩٢٢ سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە حکومەتێکی ئیئتلافی بووە سەرۆك وەزیران پارتی کرێکاران، زۆر لە پۆستەکەی نەمایەوە، پارتی پارێزگاران بەسەرۆکایەتی بۆنارلۆ لەو هەڵبژاردنەی کە دوای ماوەیەکی کورت سازکرا بردیانەوە، بۆنارلۆ زۆر لە دەسەڵات نەمایە، بۆیە بالدوین **پاڵپشتی** لە پارتی ئەحرار کردکە سەرۆکەکەی (رمزی مکدونالد) حکومەتەکە نوێیەکەی پێکهێنابوو، ئەویش زۆر لە دەسەڵات نەمایەوە تەنها ٩ مانگ نەبیت، بالدوین گرنگی بە لایەنی سەربازی و ئابووری دەدا و تەنها کەمێك گرنگی بە لایەنی سیاسەتی دەرەوە دەدا، لە ١٩٣١ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی لۆرداتی کردو خۆی بەسەریدا سەپاند، سەیری:

- Encyclopedia Britanica, London, Chicaco, Tornto,1957, Vol.2, PP.966-967.

3- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.520.



هەبوو، تورکیا خوازیاربوو بەرەو بەرنامە چاکسازیە عەلمانی و بە ئاراستەی ڕۆژئاوا بڕوات، بەریتانیاش ترسی لە ئەگەری ڕۆیشتنی تورکەکان بۆ باوەشی روس زیاتر دەبوو[1].

لە ڕاستیدا هەڵبژاردنەکانی مستەفا کەمال زۆر سنوورداربوون، بۆ ئەوەی کار لە بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان یان هەڵوێستی بەرتیانیا بکات[2]. مستەفا کەمال زۆر شتی لە هەڵوێستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی چاوەڕێ نەدەکرد، رووسیا تاکە لایەنگری تورکیا بوو، بەڵام لەلایەك ترسناکی پەیوەندی تورکیای بە رووس باش دەزانی، لەلایەکی دیکەوە تورکیا لە گۆشەگیریەکی نیمچە نێودەوڵەتی دابوو، نە فەڕەنسا و نە ئیتاڵیا و نە ئەڵمانیا ـ کە زلهێزی ئەوسا بوون- لەگەڵیدا کۆك نەبوون. سەرباری هەموو ئەمانەش ڕەوشی ناوخۆی تورکیاش یارمەتیدەر و هاندەر نەبوون بۆ مستەفا کەمال تاکو لە وازهێنان لە گفتوگۆ لەگەڵ بەریتانییەکان بەردەوام بێت، سەرەتای ساڵی ١٩٢٥ سەرەتای قۆناغێکی تازەبوو لە مێژووی کۆماری تورکی، گۆڕانکاری بەسەر شێوازی حکومەتی تورکی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ بزووتنەوە و هێزە ئۆپۆزسیۆنەکاندا هات، ماوەی پێش ساڵی ١٩٢٥ بە مەبەستی بەدەستخستنی کات و پێ قایمکردن، هەوڵی ئاشتکردنەوەی ئەو هێز و بزووتنەوانەی دەدا، کە ئەمەشی بۆ چووە سەر دەستی بە زنجیرەیەك چالاکی لەناوبردنی ڕێکخراو کرد بەدرێژایی و پانی تورکیا بەبێ هالاوێردن[3]، جا بەرامبەر پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان بێت یان کەسایەتی ناسراو بێت[4]، یان

---

1- Ibid, P. 525.

2- Memoranda Respecting the Iraq Frontier Dispute, Foreign Office, 23-10-1925, BDFP,IA.Sir,Vol.I,No.534.P.765; M.K.Oke,A Chrnology..., PP.65-69.

3- Kamal H.Karpat ,Op.Cit.,P.47 “

- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل١٢١- ١٢٢ .

٤- بەپێی یاسای پاراستنی نیزام (تقرير سكون) کە لە ئازاری ١٩٢٥ دەرچووە، پارتی تەرەقی کۆماری لە ٥ی حوزێرانی ١٩٢٥ هەڵوەشایەوە، تۆمەتی جۆراجۆر ڕووبەڕووی سەرکردەکانی کرایەوە. هەروەها یاسا نوێیەکە پارتی کۆمۆنستی تورکی ڕاگرت، هەروەها یاساکە دەستی بە ژمارەیەك ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەی ئۆپۆزسیۆنیش ڕاگەیشت، ژمارەیەك لە ڕۆژنامەنووسان حوکمدران، بۆ نموونە حوکمی بەندکردنی ٣ ساڵ بەسەر هەریەکە لە زەکەریا سوتل بەگ خاوەنی ڕۆژنامەی (ڕەکلی غەزەتە) و جەواد شاکر بەگ یەکێك لە نووسەرانی ڕۆژنامە درا، هەروەها حوسێن جاهید بەگی خاوەنی ڕۆژنامەی (تەنین) بۆ یەکێك لە گوندەکانی ئەنادۆڵ

بزووتنەوەی کوردی کە تازە لە دوای راپەڕینی ١٩٢٥ کوردان، هاتبوونە، گۆڕەپانەکەوە[1]. سەرباری هەموو ئەمانە تورکیا پێویستی بە قەرز و پارە هەبوو بۆ ئاوەدانکردنەوە و نوێخواز[2].

لەلایەکی دیکەوە بەریتانییەکان، خێرا نەگەیشتن بە رێککەوتن لەگەڵ تورکەکانیان وا لێکدایەوە کە مستەفا کەمال پێویستی بە سەرکەوتنێکی خێرا هەیە، دوای ئەوەی پێگەی کەسایەتییەکەی لە ناو تورکیا و دەرەوەی دابەزی و ناوبانگی بەهۆی لەدەستدانی ویلایەتی موسڵ لەکەدار بوو[3]، ئەوە وای لە هەندێ بەرپرسانی بەریتانی کرد، ئەو پێشنیازانە بە حکومەتی لەندەن بدەن، کە هەلێك بداتە مستەفا کەمال "تاکو شەرمەزارییەکەی بڕەوێنێتەوە و پردێکی پێ ببەخشریت تاکو بەهۆیەوە دۆڕانەکەی لەبەردەم پەرلەمان و رایگشتی تورکی، پاساو پێ بدات". نامەکەی باڵیۆزی تورکی لە لەندەن بۆ سەرۆك وەزیرانی بەریتانی لە ٥ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ رەنگدانەوەی ئارەزووی تورکیای بۆ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ بوو لەگەڵ بەریتانییەکان. تورکیا داوای کردبوو کە گفتوگۆی دوو قۆڵی لە ئەنقەرە بۆ باسکردنی

---

دوورخرایەوە و رۆژنامەکەی لە حوزیرانی ١٩٢٥ داخرا، هەرروەها ئەو رێوشوێنانە رۆژنامە لایەنگرەکانی پارتی کۆمۆنیستیشی گرتەوە، وەك رۆژنامەی (زیبیا) و (مونەل و مەترەقە) و ئەوانی دیکە. بۆ زانیاری زیاتر سەیری:

-سعاد حسن جواد، التطورات الاقتصادية والسياسية في تركيا في سنوات الازمة الاقتصادية، رسالَة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٩، ل ل ١٧- ٢١" قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل ١٦٣-١٨٢"

- Kamal H.Karpat ,Op.Cit.,PP 47-53 .

1- زۆرێك لە توێژەران فاکتەری کوردی بە فاکتەرێکی گرنگی پەلەکردنی تورکان بۆ رێککەوتن لەگەڵ بەریتانییەکان لەقەلەم دەدەن، سەیری:

- جەبار قادر، چەند بابەتێکی مێژووی کورد، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٥٩.

- N.Entessar,Kurdish Ethnonationalism, U.S.A, 1992, PP.84-85; İsrafil KurtÇephe, Op.Cit.,P.4.

2- Memoroanda Respecting the Iraq Frontier Dispute ,Foreign Office, 23-10-1925, BDFP, IA.Sir,Vol.I,No.534.P. 767.

3- Memoroanda Respecting the Iraq Frontier Dispute ,Foreign Office, 23-10-1925 ,BDFP,IA.Sir,Vol.I,No.534,P.766.



پرسی سنووری عێراق ببەسترێت[1], بەو پێیەی تاکە پرسە کە رێگرە لە گەڕانەوەی پەیوەندییەکانیان بۆ باری سروشتی جارانی.

لە راستیدا خواستی تورکەکان بۆ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆکان هانی بەریتانیای نەدا بەتایبەت لەو کاتەدا گفتوگۆ لەگەڵ تورکەکان دەستپێبکەنەوە، چونکە بەریتانیا لە بارێکی ئاوادا نەبوو بتوانێ سازش بۆ تورکەکان بکات، یان داخوازییەکانیان کەم بکاتەوە[2]. بەتایبەتی تورکەکان دەیانویست دانووستاندنەکان دووبارە بکرێتەوە، لەبارەی سازشی هاوبەش لەبارەی ویلایەتی موسڵ[3]. بەکورتی سەبارەت بە بەریتانیا هێشتا کاتێ ئەوە نەهاتبوو، باسی رێککەوتن لەگەڵ تورکیادا بکات.

بروسکەی بەریتانی بە مێژووی ٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ کە لە لەندەن ئاڕاستەی لندسی -باڵیۆزی بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ کرابوو- ناکۆکی لە هەڵوێست و تێڕوانینی بەریتانی بۆ بابەتەکە روون دەکردەوە، دوای ئەوەی چاوپێکەوتنی ٤ی کانوونی یەکەم کە لە نێوان جمبرلن و باڵیۆزی تورکی تێدا خرابووە روو، بەبێ ئەنجام کۆتایی هات، لە بەشێکی دیکەی بروسکەدا بەهۆی بەسوودی بابەتەکە، جەخت لەسەر پێویستی بەردەوامبوون لە ئاڵوگۆڕی بیروڕا لە نێوان هەردوولاکە دەکات[4].

رۆژی ٢٩ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ چاوپێکەوتنێکی چاوەڕوانکراوی نێوان لندسی و تۆفیق روشدی بەگی وەزیری دەرەوەی تورکی بەخۆیەوە بینی، دوای ئەوەی وەزیری دەرەوەی تورکی لە گەشتێك کە جنێڤ و پاریس و بەلگرادی گرتبووەوە، کە بێ سوود هەوڵی بۆ سووککردنی گۆشەگیری تورکیای لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەدا، دوای ئەوەی روشدی بەتاڵیەوە باسی لە شێوازی کۆمەڵە لەچارەسەرکردنی کێشەکەدا کرد، سەرلەنوێ رەتکردنەوەی بڕیارە تایبەتەکەی سەبارەت بە موڵکیەتی ویلایەتەکە، دووپاتکردەوە، هەروەها رەخنەی لەو وڵاتانەش گرت کە بەشداری دەنگدانەکەیان کردبوو، گوتی: "ئەو وڵاتانە تەنها لە گۆشە نیگای بەرژەوەندییەکانیان سەیری کێشەکەیان کردووە"، گازاندەی کرد و گوتی: "ئەگەر تورکیا لە کۆمەڵەدا دۆستێکی

---

1- M.K.Oke, A Chrnology...,P.73-.

2- Memorandum Respecting the Iraq Frontier, Dispute, Foreign Office, 23-10-1925,BDFP,IA.Sir, Vol.I,No.534,P. 770

3- M.K.Oke, A Chrnology...,P.73.

4- Tyrrell to Lindsay,(Constantinople), Foreign Office,22-9-1925, BDFP, Sir.IA, Vol.I,No.551,P.792.

هەبووایە، ئەو کۆدەنگیە نەدەبوو، بڕیاریش دەرنەدەچوو....."، هەروەها بیرۆکەی تێهەڵچوونەوە بە بڕیاری دادگای ڕەتکردەوە، چونکە ئەمە بە تێڕوانینی ئەو "پاساوی تورکیا لاواز دەکات و گومان دەخاتە هەڵوێستی تورکیاوە"، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی بە ڕێککەوتن کرد، کاتێ گوتی: "بە دابەشکردن لەسەر بنەمای ئەوەی **هێڵی** زێ خواروو بکرابووایە سنووری نێوان عێراق و تورکیا ڕێککدەکەوتین، لەگەڵ سازکردنی ڕێککەوتنێکی ئەمنی ـ ئابووری وا کە ناوچەکە بە ناوچەیەکی داماڵدراوو لە چەك دابنرابووایە، لەگەڵ پاراستنی یەکێتی ئابووری ویلایەتەکە، هەروەها بیرۆکەی گۆڕینەوەی دانیشتووان بە ئارەزووی خۆیانیشی خستە ڕوو، بە شێوەیەك **مەسیحییەکانی** لای تورکیا بۆ لای عێراق بگوازرێنەوە و تورکەکانی لای عێراق بۆ تورکیا بگوازرێنەوە، ئەوەشی زیادکرد کە لەمە کەمتر بۆ دانانان بە بڕیاری کۆمەڵە ڕازی نابێت[1].

هەرچی لیندسی بوو، دوای ئەوەی بە پارێزییەوە سەیری پێشنیازەکەی تورکیای کرد، بەگازاندەوە دەستی بەقسەکردن کرد "لەبەرژەوەندی تورکیادا نییە کە ڕای گشتی لە کێشەی موسڵەوە بگلێنێ...."، ئەوەشی زیادکرد کە "پێشتر لە بەهاری ڕابردوو لەبارەی دەرەنجامەکانی ئەم کارەیان هۆشداریم پێداون"، هەروەها گوتی "ڕۆژنامەی تورکی ڕای گشتی تورکیان دژ بە کۆمەڵە و بەریتانیا تەیارداو ئەمەش هەستی نەتەوەیی لەدژیان ورووژاند، ئەمەش شێوازیکی تەندروست نییە بۆ کێشەکە"[2].

لە پرسیارێکی لیندسی لەبارەی ئەگەری ئەنجامدانی گفتوگۆی هاوبەش لەشێوەی گفتوگۆکانی فەرید بەگ و باڵدوین، لە دوای دەرچوونی بڕیارەکە، ڕوشدی بەگ وەڵامی دایەوە و گوتی: "ناکرێت گفتوگۆ لەسەر بنەمای بڕگەکانی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەنجامبدرێت، هیچ چارەسەرێکی گونجاو و پەسند لە ئارادا نییە، تا سازش بۆ تورکیا لە ناوچەیەکی گەورەی ویلایەتی موسڵ نەکرێت"[3].

---

1- Lindsay to Chamberlain,Constantinople,29-9-1925,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 552, PP. 792-793.

2- Lindsay to Chamberlain ,Constantinople ,29-9-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No. 551, P. 794.

3- Quoted in: Lindsay to Chamberlain,Constantinople,29-9-1925, BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 551,P. 794.



سەرباری ئەو کەشە تۆمەتبارییەی کە باڵی بەسەر کۆبوونەوەکە کێشابوو، بەڵام زۆر ئاماژەی بەدەستەوە داوە، گرنگترینیان ئاڵوگۆڕکردنی ڕاستەوخۆی تێڕوانی هەردوو حکوومەتەکە و ڕێککەوتن لەسەر سەرلەنۆی دەستپێکردنەوەی گفتوگۆکان بوو، کە وای لە لیندسی کرد لەبارەی کەشی کۆبوونەوەکە بڵێت: "کۆبوونەوەکە لە ڕەوشێکی دۆستانە بەڕێوەچوو..."[1]. لەلایەکی دیکەوە کۆبوونەوەکە ئەو سروشتەی لای بەرپرسانی بەریتانی جێهێشت کە هێشتا تورکەکان توندن و دەستبەرداری هەڵوێستەکانیان نابن، بەڵام دەبێت بۆ چارەسەرێك رابکێشرێن کە بەهۆیەوە تورکیا دان بە بڕیاری کۆمەڵە بنێت، دوای ئەوەی پەیمانی لەگەڵدا مۆردەکرێت.

کۆمەڵێ پاڵنەر لەدوای ئارەزووی بەریتانیاوە بوون بۆ دۆزینەوەی پەیمانێك لەگەڵ تورکیا بەتایبەت لەو ماوەیەدا، زانراوە کە یەکلاییکردنەوەی کێشەی سنوور بە بەرژەوەندی بەریتانیا،بە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقەوە، وایکرد بەرژەوەندییەکانی چ ئابووری بێت یان نەوتی یان ستراتیژی بەدیبێن، بەڵام زامنی ئەو بەرژەوەندیانەی نەکرد، ئەمەش تەواوی عێراقی دەگرتەوە، زامنکردنی سنووری نوێی عێراق لەگەڵ هاوسێیەکی کێشەدار کە تورکیایە، دابین نابێت، تا ئەو هاوسێیە ڕازی نەکرێت، عێراقیش بانەیەك بوو لە زنجیرە بازنەکانی گەیاندنە ستراتیژیەکانی ئیمپراتۆر[2]. توێژەرێك لەو باوەڕەدایە کە "لیندسی و سەرۆکەکانی هەرتەنها بە دامەزراندنی **هێڵی** سنوور نەدەوەستان، بەڵکو کاریان بۆ پتەوکردنی پێگەی بەریتانیا لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا دەکرد، بۆ ئەوەی زامنی دەسەڵاتی بەریتانی بەسەر دەریای ئیجە تا سنووری هیند بکەن. ئەو توێژەرە جەختی لەوە کردەوە کە بەریتانیا هیواخوازە کە ئەو جووڵانەوانەی بەشی شێر لە میراتی وڵاتانی سەربەخۆی ئاسیایی لە حاڵی ڕووخانیان، بۆ زامن بکات"[3].

بەریتانیا نەیدەتوانی پێگەی تورکیا فەرامۆش بکات، لە جەرگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەسەر ڕێگەی گەیاندن بۆ هیند، زاڵ بەسەر دەریای ڕەش و تەنگەبەرەکان و دەریای ناوەڕاست، ئەو تەنگەبەرانە خاڵی ستراتیژی گرنگ بوون بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا. لێرەوە پێویستی بۆ هاوکاری تورکی ـ بەریتانی بەدەردکەوت، بەتایبەتی ناوچەکە هێشتا لەباری نالەباری

---

1- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 29-9-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No. 551,P.794.

٢- كاظم نعمة، الملك فيصل الاول والانكليز والاستقلال، بيروت، ١٩٨٨، ل ١٦٢.

٣- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٢٦٩.

و پەشێویدا بەسەری دەبرد، لەلای باکووری سنووره تازەکەوە، کوردستانی باکوور لە حاڵەتی جەنگدابوو لە نێوان کورد و تورك، تا کۆتایی ساڵانی سی بەردەوام بوو، هەروەك کوردستانی باشووریش، کە چارەنووسەکەی بە لکاندنی بەعێراقەوە کۆتایی هات، لەبارێکی چاوەڕوانی و نائومێدی توند دەژیا، دانیشتووانە کوردەکەی هێشتا یادەوەری نزیکی حکوومەتی شێخ مەحموود و شۆڕشەکانیان لە بیر نەچووە، دەستە نیشتیمانپەروەرەکانی کورد بە نیگەرانیەوە سەیری چارەنووسی ئەو بەڵێنانەیان دەکرد کە بەر لە یەکلاییکردنەوەی کێشەی موسڵ پێیان درابوو.

ترس لە فراوانخوازی کۆمۆنستی لە پاڵنەرە بەهێزەکان بوو کە وای لە بەریتانیا کرد، پەلە لە بەستنی پەیمان لەگەڵ تورکیا بکات، بەتایبەت کە بەرپرسانی بەریتانی ئەگەری ئەوەیان دانابوو کە مستەفا کەمال هێشتا لە هەڵبژاردن لەنێوان رووسیا و رۆژئاوا دوودڵە[1]. نووسەرێك شێوازی مامەڵەکردنی بەریتانیا بۆ کێشەی موسڵ و کێشەی مانەوەی هێزەکانی لە عێراق لە چوارچێوەی "سنووری پەیوەندییەکانی بە رووسیای سۆڤێتی" دانا و لەو باوەڕەدایە کە "بەمانەوەی بەریتانیا لە عێراق، دەتوانن رێگری لە سنووربەزێنی بانگەشەی سۆڤێتی بەرەو هیند بگرن"[2]. لەلایەکی دیکەوە بەریتانییەکان لەو باوەڕەدابوون کە راپەڕینی کوردی **١٩٢٥** و ئەوەی لەو دەرەنجام و کاریگەریانەی لێی کەوتووە، شەڕی ناوخۆی دەنێتەوە و داهاتووی حکوومەتی ئەنقەرە دەخاتە مەترسییەوە و لاوازی دەکات، لەژێر سایەی رێکنەکەوتنی بەریتانیا ـ تورکیا، بێگومان یەکێتی سۆڤێت ئەو پەرەسەندنانە بۆ بەرژەوەندی خۆی دەقۆزێتەوە[3]. بەمشێوەیە نزیکبوونەوەی بەریتانی ـ تورکی لەو کاتەدا بۆ هیچ کامیان رێگایەکی سەرپشك نەبووە، بەقەد ئەوەی پێویستی زۆری دوولایەنەکە بووە.

لەم پاڵنەرانەوە، دەزگا بەریتانییە پەیوەندیدارەکان چالاك بوون، لە جووڵاندن و پلاندانان بۆ راکێشانی تورکیا بۆ رێککەوتن یان پەیمان بەستن، بە کەمترین سازش، بەڵام ئەوەی زیاتر وای بلەریتانییەکان کرد لەمەدا پەلەی بکەن، بروسکەکانی لیندسی بوون، کە هانی حکوومەتەکەی دەدا چارەسەرێك بدۆزیتەوە، لە رێککەوتنیك وای لە تورکیا بکات دان بە

1- Memorandum by Lindsay to Chamberlain, Constantinople,8-2-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.570, P.818“

- عثمان علي، العامل...، ل ٢.

٢- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ٢٧٠.

3- Mim.K.Oke, A Chrnology..., P.77.



بڕیاری کۆمەڵە لەبارەی کێشەی موسڵەوە بنێت، چونکە پشتگوێخستنی ئەم بابەتە وایکردووە هەستی نەتەوەیی لە تورکیا بورژێت"[1] و دوژمنداریکردن بۆ بەریتانییەکان زیاد بێت.

بۆیە هەوڵەکانی بەرپرسانی بەریتانی لەسەر ئەوە چڕ کرایەوە کە وا لە تورکیا بکرێت، هەستبکات گۆشەگیری نێودەوڵەتی کراوە، فەرەنسا هەر لەسەرەتاوە لەپاڵ هاوپەیمانە کلاسیکیەکەی (بەریتانیا) لەمبارەیەوە وەستا، لە چاوپێکەوتنی رۆژی **٧** کانوونی یەکەمی **١٩٢٥** نێوان کرۆی باڵیۆزی بەریتانی لە فەرەنسا و بیرتلۆی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا، بیرتلۆ لەبارەی ناکۆکی تورکی بەریتانی گوتی: "فەرەنسا هیچ لە وەستانی لە پاڵ بەریتانیا دوودڵ نییە،...چونکە تورکیا جگە لە تاکە شتێك کە کوشتارگەیە، بۆ هیچ شتێکی دیکە ئامادە نییە"[2]. هەروەها گوتی: "هەر هاندانێك لەبارەی موسڵەوە وایان لێدەکات لە بابەتی دیکەدا کەللە رەق بن"[3]. توێژەرێکی تورك لەبارەی ئەو هەڵوێستەی فەرەنسا لێدوانی داو گوتی: "جگە لەم هەڵوێستە پاریس هیچ شتێکی دیکەی نەبوو بە تورکیای بدات"[4]. روشدی بەگ لەمیانەی سەردانی سەربیا وەڵامی دایەوە و بێزاری و توڕەیی خۆی لەبارەی ئەو هەڵوێستەی فەرەنسا دەربڕی و گوتی: "بەم هەڵوێستەی، خۆی بە کاروانی دوژمنانی تورکیاوە لکاند"[5]. لە راستیدا لێدوانەکەی روشدی بەگ لەبارەی هەڵوێستی فەرەنسی بە لەدەستدانی مکوڕبوونی تەواوی دادەنرێت[6].

سەبارەت بە هەڵوێستی بەریتانیا، ئەوا سەردانەکەی جمبرلن بۆ ئەو وڵاتە لە کۆتایی کانوونی یەکەمی **١٩٢٥** و چاوپێکەوتنی بە مۆسۆلینی و گۆڕینەوەی تیڕوانیەکانیان[7]، ئامانجەکەی روون بوو، بەتایبەت لەگەڵ جووڵانەوە بەریتانییەکە، رۆژنامەکانی بەریتانیش بانگەشەی ئەوەیان

1- Mim.K.Oke, A Chrnology..., P.73.

٢- لە بارەی هەڵوێستی فەرەنسی و ئەوروپییەکان لە بارەی کوشتارگەی مەسیحییەکان، سەیری روبەرت ئۆلسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢١٦ بکە.

3- Quoted in: Crewe to Chamberlain Paris,7-10-1925,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 545, PP. 787-788.

4- A Chronology …,P.72 .

5- Lindsay to Chamberlain Constantinople, 30-12-1925, BDFP, IA.Sir , Vol.I, No.553, PP. 795-796.

6- Crewe to Chamberlain,Paris,7-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.545, P.788.

٧- فاضل حسین، مشکلة ...، ل ١٨٢.

بڵاودەکردەوە کە "ئەگەر پێشێلکاری لە نێوان تورکیا و بەریتانیا رووبدات، ئەوا ئیتاڵیا و یۆنان و هەندێ وڵاتی بەلقانی و هەتاکو بولگاریاش بێ دەستتێوەردان نامێننەوە، بەڵکو بە هەلێکی بەسوودی دەبینن بۆ بەدیهێنانی پرۆژە داگیرکارییەکەیان لە ئاسیای بچووک[1]، هەروەها ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کە دەستتێوەردانی تورکی لە عێراق ـ ویلایەتی موسڵ ـ وەك ئاماژەیەك وایە بۆ ئیتاڵیا تاکو کەنارەکانی ئەنادۆڵ داگیر بکات"[2]. بەڵکو بەکردەوە "ئیتاڵیا خەریکە دەستتێوەردانی سەربازی لە کلیکیای تورکی ئەنجام بدات"[3]. مۆسۆلینی لە زنجیرەیەك گوتاریدا، باسی لە پێویستی فراوانخوازی ئیتاڵیا بۆ ئەودیوی دەریاکان کرد، لەمیانەی سەردانێکی بۆ تەرابلوس ـ لیبیا ـ لە نیسانی ١٩٢٦: "بەڵێنی دەستگرتن بەسەر ئەنادۆڵی دابوو"[4]. لە راستیدا فاکتەری ئیتاڵی تا رادەیەکی زۆر تورکەکانی بۆ پەنابردنە بەر سازش لەبارەی موسڵەوە ناچارکرد. چونکە بەرپرسانی تورکی هەرەشەکانی ئیتاڵیایان بەهەند وەرگرت و رژێمی ئیتاڵیان بە هەڕەشە بۆ سەر سەلامەتی و یەکێتی خاکی تورکیا دەبینی[5].

یۆنانیش چاوی بڕیبووە تورکیا، وابڵاوبووەوە کە "دەیەویت تەراقیا و ئەزمیر لە کاتێ سەرلەنوێ دابەشکردنی تورکیا داگیر بکات"[6]. ئەو راپۆرتەی بەریتانییەی کە لە ٢٣ ی ئاداری ١٩٢٣ لە ئەسینا بۆ لەندەن ئاڕاستە کرابوو، باسی لەوە کردبوو کە هەریەکە لە یۆگسلاڤیا و

١- سعاد حسن جواد، تركيا في سنوات الحرب العالمية الثانية ١٩٣٩-١٩٤٥، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٩٧، ل ٣٧.

2- A.J.Toynbee,Op.Cit., P. 526.

3- İsrafil KURTÇEPHE,Op.Cit., P.4.

٤- لەراستیدا ئەو هەڵوێستەی ئیتاڵیا ترسی لای تورکان دروست کرد، ئەوانیش ئەو هەڕەشانەیان بە هەند وەرگرت، چونکە گرنگیدانی ئیتاڵیا بە ئەنادۆل هەر لە ساتەوەختی ئێستادا دروستنەببوو، بەڵکو ریشەکەی بۆ پێش یەکەم جەنگی جیهانی دەگەڕایەوە. بەپێی رێککەوتنامەی سان دی مۆرین (بەنهێنی) کە لە نێوان ئیتاڵیا لەلایەك و فەڕەنسا و بەریتانیا لەلاکەی تر لە ١٨ی ئابی ١٩١٧ مۆرکرا، ئیتاڵیا باشووری رۆژاوای ئەنادۆلی بە سمنیرناشەوە بەرکەوت، ئەو بەشەی ئیتاڵیا لە رێککەوتنامەی ئینگلیزی ـ ئیتاڵی ـ فەڕەنسی کە لە ئابی ١٩٢٠ مۆرکرا، زیاد بوو، ناوچەی باکووری رۆژاوای تورکیاشی گرتەوە. سەیری:

- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P.526.

5- İsrafil KURTÇEPHE, Op.Cit.,P.4.

٦- البرت م .منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦٦.



یۆنان رێککەوتوون لەسەر بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیان لە ناوچەکە، یۆنان بە یارمەتی یۆکسلاڤیا تەراقیا داگیر بکات و یۆگسلاڤیاش بەیارمەتی یۆنان ئەلبانیا داگیر بکات[1]. سەبارەت بە ئەمریکا کە دوورترین دەوڵەت بوو بتوانێ لە دژی بەریتانیا یارمەتی تورکیا بدات[2]. بەتایبەتی کە ئەمریکا هێشتا پرەنسیپی دەستتێوەرنەدان لە کاروباری نا ئەمریکیەکان پەیڕەو دەکرد.

هەرچی ئەڵمانیا بوو، ئەوا هەڵوێستەکەیان تەواو بۆ تورکەکان سەرسوڕهێنەر بوو، لە چاوپێکەوتنێك لە ٦ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ کە باڵیۆزی ئەڵمانی بە هاوتا تورکییەکەی تۆفیق روشدی بەگ گەیاند، باڵیۆزی ئەڵمانی ویستی هاوتا تورکییەکەی تێبگەیەنێ کە "لە بەرژەوەندی تورکیادا نییە کە بەدوای رووسیا بکەوێت، چونکە ئەمە مانای وەستانەوەیە لە دژی کۆمەڵەی نەتەوەکان"، کاردانەوەی روشدی بەگ توندبوو، ئەو بیرۆکەیەی کە تورکیا بە رووسیا گرێدەدات رەتکردەوە، بەڵام گوتی: "تورکیا پشت بەخۆی دەبەستێ و لەهەمان کاتێشدا لە هیچ گروپێك یان تاقمێکدا نییە کە دوژمنداری رووسیا بکات"[3]. باڵیۆزی ئەڵمانی هەوڵیدا تورکەکان بە هاتنە ناو کۆمەڵەی نەتەوەکان باوەڕیان پێ بکات، بۆ ئەوەی هەڵوێستە توندەکەی نەرمبکاتەوە لەبەرامبەر موسڵ و بەریتانیا.

سەبارەت بە تاکە وڵاتەکەی کە تورکیا لە گەمە سیاسییەکانی لەگەڵ رۆژئاوا پشتی پێ دەبەست، یەکێتی سۆڤێت بوو، کە بە پەیمانی (دۆستایەتی و دەستدرێژی نەکردن ـ ١٧ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥) بەیەکەوە گرێدرابوون. بەریتانیا هەوڵیدا لە گرنگی پەیوەندی مۆسکۆ بە ئەنقەرە کەمبکاتەوە، رۆژنامە بەریتانییەکان وردەکاری چاوپێکەوتنی باڵیۆزی رووسی لە پاریس بە هاوتا بەریتانییەکەی بڵاوکردەوە، باڵیوزی رووسی روونیکردەوە کە "حکوومەتەکەی بە پەیمانێکی دوو قۆڵی وا بە تورکیاوە گرێنەدراوە، کە پابەندی بکات ئەگەر تووشی جەنگ بوو یان دەستدرێژی کرایە سەر سنوورەکانی یارمەتی بدات...چونکە سۆڤێت زۆر بە کێشە ناوخۆییەکانیەوە سەرقاڵە و دەرفەتی ئەوەی نییە بە کێشمەکشەکانی دەرەوە خەریك بێت"[4].

1- İsrafil KURTÇEPHE , Op.Cit.,P.4 “

- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٣.

٢- اصغر جعفري ولداني، مصدر بيشين، ل ٦٩.

3- BDFP, IA.Sir,Vol.I, P.796.

4- Tyrrell to Lindsay ,Constantinople,foreign Office,19-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.549,P. 791.

سەبارەت بە پەیمانی رووسی ـ تورکی، ئەوا نێوەندە بەریتانییەکان بە "کاردانەوەی دەروونی سروشتی تورکیا دایانا کە رۆژنامە زۆر گرنگیان پێدا....". هەروەها باسی ئەوەیان کرد کە پەیمانەکە "کەمێك پڕوپوچە". لەبارەی هەڵسەنگاندیان بۆ رۆژنامەی تورکی گوتیان: "وەك ئەو کەسە وان کە بە تاریکە شەو بەجەنگەڵدا دەروات، بۆ ئەوەی ورە بەبەرخۆیدا بکات، بەدەنگی بەرز گۆرانی دەڵێت"[1].

بۆ تەواوکردنی پلانەکانی بەریتانیا بۆ یەکلاییکردنەوەی کۆتایی کێشەی موسڵ، ئیدارەی بەریتانی دەستی بە جێبەجێکردنی مەرجێك لە مەرجەکانی کۆمەڵەی تایبەت بە لکاندنی موسڵ بە عێراقەوە کرد، کە دەڵێت پێویستە بەریتانیا و عێراق دانووستاندن بۆ بەستنی پەیمانێك بکەن، کە ماوەی ئنتیێداب بەسەر عێراقەوە بە **٢٥** ساڵ دیاریبکات، پەرلەمانی عێراق لە ١٨ی شوبات پەیمانەکەی پەسند کرد[2]. بەهاتنی **٢**ی ئاداری **١٩٢٦** بەریتانیا راپۆرتی لەبارەی وردەکاری پەیمانەکە بە سکرتێری گشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان دا، لەگەڵ ئەو راپۆرتە راپۆرتێکی تایبەت بە کوردی هاوپێچکردبوو، کە باسی ئەو رێنماییانەی کە بە سەرجەم وەزیرە عێراقییەکان دراوە لەبارەی پەلەکردن لە جێبەجێکردنی ناوچەی کوردی جیاواز لە ناوچەی عەرەبی، ئەمەش بە دامەزراندنی کارمەندانی کورد لە وەزارەتە عێراقییەکان و فێرکردن و پەرەپێدان بە زمانی کوردی دەگرێتەوە، هەروەها لە راپۆرتەکە نموونەی گوتاری کەسایەتی ئیدارەی بەریتانی و عێراقی لەبارەی پێویستی رێزگرتن و هاندانی ناسنامەی کوردی تێدا بوو[3]. لەوەڵامی یادداشتەکەی بەریتانیا، ئەنجوومەنی کۆمەڵە رایگەیاند کە بڕیاری رۆژی ١٦ی کانوونی یەکەمی **١٩٢٥** ئێستا بۆتە، بڕیارێکی کۆتایی[4].

---

1- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 30-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No. 553,P. 795.

٢- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی پەیمانی عێراقی بەریتانی سەیری: -

- S.H. Longrigge, Op.Cit., P. 156"

- عبدا لرزاق الحسني، العراق في ظل المعاهدات، ط ٤، بغداد، ١٩٨٠، ل ل١١١-١٣٣.

"3 - S.H. Longrigge,Op.Cit.,P.156

-ماجد عبدالرضا، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٥٧-٥٨" فاضل حسين، مشكلة ...، ل ل ١٧٨-١٨٠.

4 - فاضل حسين، مشكلة ...، ل ١٨٠" هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٤.



شانبەشانی ئەمەش لەندەن دەستیکرد بەجووڵانەوە لە جۆرێکی دیکە بەرەو ئەنقەرە، کاتێ بە لایەنی دارایی و ئابووری دەمچەوری کرد، بەرپرسانی بەریتانی پێشنیازیان کرد، یارمەتی دارایی لەسەر شێوەی قەرزی بانکی بە تورکیا بدرێت، بۆئەمەش وایان بەباش زانی بانگی شارەزایانی بواری دارایی تورکی بۆ لەندەن بکرێت بۆ باسکردنی بابەتەکە[1]. بەرپرسانی بەریتانی لە پڕۆژەکەدا هەلێکیان بینی بۆ ئەوەی بزانن تورکیا بە رووداوەکانی ئێستا کاریگەر بووە و ئامادەیی گفتوگۆی ماوەو لە هەڵوێستە توندەکانی سازش دەکات، بەتایبەتی دوای ئەوەی تورکەکان باش لەوەگەیشتن کە ناتوانن بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان بگۆڕن.

هەرچی کارتی گرنگی دیکە کە بەریتانیا هەر لە زوێکەوە ویستی بەکاریبهێنێت، کە تایبەتە بە رەوشی ناوخۆیی و هەرێمایەتی تورکیا، ئەویش کێشەی کوردی بوو، یەکێك لە بەرپرسانی بەریتانی پێشنیازی کرد کە هاوپەیمانێتیەك لەگەڵ کوردان بۆ ماوەی ١٠ ساڵ ببەسترێت و توانی نوێکردنەوەشی هەبێت، ئەگەر هەردووکیان پێی رازیبوون. چونکە هاوپەیمانێتیەکی وا، وادەکات لەخۆباییبوونی تورکەکان نەرمبکاتەوە و زۆر پشتبەستنیان بە رووسیا کەمبکاتەوە[2].

پێدەچوو مەزەندەکانی بەریتانییەکان لەبارەی هەڵوێستی تورکیا لەشوێنی خۆی بووبێت، لە ٦ی کانوونی دووەمی **١٩٢٦** بەریتانییەکان یادداشتێکیان لە باڵیۆزی تورکی پێگەیشت، کە خواستی تورکیا بۆ سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆی دوو قۆڵی لەگەڵ بەریتانیا لەبارەی ویلایەتی موسڵ پێشانداوە. ئەوەی ئەو یادداشتە تورکییە لەوانەی بەرخۆی و لێدوانەکانی بەرپرسانی تورکی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە لەبارەی ئاسایش و سەلامەتی تورکیا بە پلەی یەکەم قسەی کردووە، دەڵێت: "حکوومەتی تورکی گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە کێشمەکش لەبارەی ویلایەتی موسڵ هەر تەنها پرسی سەروەری بەسەر خاکەوە نییە، بەڵکو پرسی سەلامەتی و ئاسایشە. چەسپاندنی سنوورێکی ئارام بۆ تورکیا لە هەموو شتێکی دیکە گرنگترە[3].

---

1- Tyrrell to Lindsay, Constantinople, 30-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.554, P.797.

2- Tyrrell to Lindsay, Constantinople, 30-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.554, PP. 797-798.

3- Tyrrell to Lindsay, Constantinople, 5-1-1926 , BDFP ,IA.Sir, Vol.I, No.555, P.799.

راپۆرتە بەریتانییەکان ئەو هەڵوێستە نوێیەی تورکیایان بە نەرمتر لەوانەی پێشوو بینی و هۆکاری ئەمەشیان بۆ ژمارەیەك فاکتەری ناوخۆیی و نێودەوڵەتی گێڕایەوە. گرنگترینیان بەرکەوتنی تورکەکان بوو بە هەڵوێستی جێگیر و سیاسەتی داڕێژراوی بەریتانییەکان بەرامبەر کێشەی موسڵ[1]. هەروەها توندی بەرەی ئەنگۆ ـ فەرەنسی و بێتوانایی تورکەکان لە قۆزتنەوەی ناکۆکی و دژایەتیەکانی نێوانیان لە ساڵی ١٩٢١، هەروەها تێگەیشتن کە نزیکبوونەوە و هاوپەیمانی سێ قۆڵی ئینگلیزی ـ فەرەنسی ـ ئیتاڵی راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، هەروەها لەلایەك لەلایەن رووسیاوە هان نەدران لە حاڵێکدا ئەگەر جەنگیان بەرپاکرد، لەلایەکی دیکەوە لاوازی مستەفا کەمال کەناچاری کرد بەدوای هێڵێکی سیاسی جێگرەوەی دیکەدا بگەڕێت کە زیاتر مامەڵەی لەگەڵ بەریتانییەکان نەرمتر بێت[2]. هەروەها سەرقاڵ بوونی حکوومەتەکەی بەتەواوی بە کێشەی کوردەوە، هەروەها راپۆرتەکەی بەریتانیا هەوڵیدا لە تورکەکان بگەیەنێ کە "بەریتانیا نایەوێت هیچ شێوەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردی نزیك سنوور پەرەپێبدات....هەرچیەك کە بەریتانیا کردوویەتی ئەوەیە کە رێگەی بە کوردی عێراق داوە زمانی کوردی بەکاربهێنن و وەك بەرپرسی لۆکاڵی ناوچەکانیان دایمەزراندوون،..."[3]. توێژەرێکی تورکی بۆ ئەوە دەچێت کە: "پرسی کوردی یەکێك بووە لەو فاکتەرانەی کە تورکیای ناچارکرد بۆ ئەوەی سازش لەبارەی موسڵ بۆ بەریتانییەکان بکات"[4].

وەك رێگە خۆشکردن بۆ دەسپێکردنی دانووستاندنی راستەخۆی نێوان ئەنقەرە و لەندەن، لیندسی لە ١٢ی کانوونی دووەم کۆمەڵێ بیرۆکە و پێشنیازی لە شێوەی یادداشتێك لەبارەی

1- Memorandum by Tyrrell to Lindsay, Constantinople, Foreign Office, 30-1-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.566,P. 811.

2- Memorandum by Tyrrell to Lindsay, Constantinople, Foreign Office, 30-1-1926, BDFP, IA.Sir,Vol.I, No.566, P. 811 "

- اصغر جعفري ولداني، مصدر بيشين، ل ٦٩.

3- Tyrrell to Lindsay (Constantinople) ,Foreign Office, 30-12-1925, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.554,PP. 797-798

٤- سەیری کتێبەکەی خۆی بکە.

- Mousul Conflict...,PP.3-4.



دانووستاندنەکانی هەردوولاکە پێشکەشی حکوومەتەکەی کردبوو، ئەوەی لە یادداشتەکەی لیندسی دەردەکەوێت کە لیندسی دوای ژمارەیەك چاوپێکەوتنی بە لایەنی تورکی گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە بەڕاستی ئەوەی تورکەکانی نیگەران کردووە ئاسایشە، کە لە ویلایەتی موسڵ زیاتر بۆ تورکەکان گرنگە، لیندسی لە کۆبوونەوەی لەگەڵ عیسمەت پاشا، عیسمەت پاشا پێی گوتبوو: "ئەگەر سنوورمان دابین بکەن، ئێمەش سنوورتان دابیندەکەین". ئەوەی لیندسی لە قسەی عیسمەت پاشای وەرگرتبێ ئەوەیە کە: "تورکەکان بەرەو ئاشتی دێن...بەڵکو ئەوان دۆستایەتی ئێمەیان دەوێت...."[1].

ئەوەی لە یادداشتەکەی بەریتانیا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە پێشنیازی (میساقی زامنکردنی) کرد کە سەرباری تورکیا و بەریتانیا، هەریەکە لە فەرەنسا و ئیتاڵیاشی لەخۆگرت، یادشتەکە پاساوی بۆئەمەش ئەوەیە کە ئەنقەرە: "چاوەڕێ دەکات کێشەی کوردی وڵاتەکەی روو لەسەر بکات، چونکە کوردی تورکیا بەهیوای ئەوەن یارمەتی لە کوردی باشوورەوە پێ بگات، بەڵام ئەگەر تورکیامان **دڵنیا**کردەوە کە ئەمە روونادات، بە مۆرکردنی پەیمانی زامنکردن، تورکەکان پێی رازی دەبن"[2].

پێدەچوو بیرۆکەی " پەیمانی زامنکردن" دوای ئەوەی گفتوگۆکرا، کرداری نەبێت، بەهۆی رەوشی نێودەوڵەتی ئەوسا، بیرۆکەکە زۆر هەمووارکردنی بەسەردا هات، بەڵام پێشنیازەکانی سەبارەت بە کورد لەلایەن ئیدارەی بەریتانی بۆ ماوەیەکی دوور بەهەند وەرگیرا. لەراستیدا بیرۆکەی میساقەکە بەر هەڵوێستی ئیتاڵیای هاوپەیمانی بەریتانیا کەوت، هەروەها بەر هەڵوێستی رووسیای سۆڤێتیش کەوت، هەرچۆنێێك بێت ئەوا یادداشتە بەریتانییەکە، گەیشتە ئەوەی کە: "بوونی تورکیایەکی بەهێز، گرتنەبەری هەر رێوشێنێك کە بەریتانیا بە گونجاوی دەبینێ بۆ بەرژەوەندییەکانی ئاسان دەکات.....بە پێچەوانەوە سەرقاڵبوونی تورکیا بە کێشە و کێشمەکێشی ناوخۆیی زیاتر لەوەی ئێستا هەیە لاوازی دەکات، کە ئەمەش وایلێدەکات پارۆێکی چەور بێت بۆ هاوسێیە نزیك و دوورەکانی"[3].

1- Lindsay to Tyrrell, Constantinople, 12-1-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.557, PP.801-802.

2- Ibid,P.802.

3- Lindsay to Tyrrell, Constantinople , 12-1-1926,BDFP,IA.Sir , Vol.I , No.557, P.803

## ـ دانووستاندنەكانی توركیا- بەریتانیا لەبارەی پەیماننامەی كێشانی سنوور

رۆژی ٢٩ی كانوونی دووەمی ١٩٢٦ چاوپێكەوتنێكی چاوەڕوانكراوی نێوان لیندسی نوێنەری بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ لەلایەك و لەلاكەی دیكەوە لەگەڵ هەریەكە لە سەرۆك وەزیرانی توركی و وەزیری دەرەوەی بەخۆیەوە بینی[1]. دانانی سنوورێك بۆ ناكۆكییەكانی نێوانیان بۆ هەردوولاكە چاوەڕوان كرابوو، بەتایبەتی كێشەی موسڵ تاكە ڕێگری گەڕانەوەی پەیوەندییەكانیان بوو بۆ سەردەمی جارانی، كە پەرەسەندوو بوو[2]. گرنگی گۆڕانی هەڵوێستی توركی لە گۆڕان لە هەڵوێستی توركییەوە لەبارەی بڕیاری ئەنجوومەنی كۆمەڵەوە تایبەت بە چارەسەری كێشمەكش لەبارەی ویلایەتی موسڵەوە هات.

چاوپێكەوتنی لیندسی بە سەرۆك وەزیرانی توركی سەخت بوو، چونكە سەرۆك وەزیرانی توركی سەرلەنوێ پرسی موڵكداری توركیای بۆ ویلایەتەكە وروژاند، هەوروەها ئاماژەی بۆئەوە كرد كە "پرسی كورد بە كێشەی موسڵەوە گرێدراوە"، سەرلەنوێ پێشنیازەكەی وەزیری دەرەوەی لەبارەی دابەشكردنی ویلایەتەكەی وروژاند، باسی ئەوەی كرد كە پێشنیازی بەریتانیای ڕەتكردۆتەوە، كە وایكردووە، "هەموو كەسێكی ڕۆژهەڵاتی توركیا و ڕۆژئاوای ئێران باوەڕ بكات كە بەریتانیا دەیەویت سنوور بۆ ناوچەی وان Van ببات"، هەروەها گوتی: "ئەو نیگەرانیەی كە لەمەوە سەرچاوەی گرتووە، ناكرێت بەرگەی بگرین"، دواتر گوتی: "ئەو بە راشكاوی حەز دەكات گفتوگۆ لەبارەی موسڵ بەتەنیا لەگەڵ وەزیری دەرەوە باس بكات، نامەوێت لەگەڵ منی باس بكەیت، ـ واتە لیندسی ـ"[3].

---

1- Lindsay to Terrell, Constantinople, 12-1-1926, BDFP,IA.Sir, Vol.I, No.567, P.803.

2- Lindsay to Chamberlain ,Constantinople,29-1-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 561, P.806.

٣- هنری فوستر، سەرچاوەی پێشوول ٢٨٣.



بەپێچەوانەی چاوپێكەوتنەكەی بەسەرۆك وەزیران، چاوپێكەوتنی لیندسی بە وەزیری دەرەوە دۆستانە بوو، دواتر لیندسی ڕایگەیاند كە "تێڕوانینی حكوومەتەكەی بۆ بڕیارەكانی جنێڤ تەواو لە تێڕوانینی توركیا جیاوازە". وەزیری توركی لەلای خۆیەوە "ئامادەیی حكوومەتەكەی بۆ بەردەوامبوون لە گفتوگۆكان دەربڕی، كە هەرلایەو بە رای تایبەتی خۆی دەوڵەمەندی دەكات"[1]. دواتر پرسی كوردی وروژاند[2] و گوتی: "توركیا دوژمنداری لەگەڵ عێراق نییە، نایەوێت زەویە دەستبەسەراگیراوەكانی داگیربكاتەوە..."، هەروەها داوایكرد سنوور بە ئاراستەی باشوور پاڵێپوەبنرێت، بۆ ئەوەی ترسی ئەمنی توركیا بڕەوێتەوە[3].

خاڵی گرنگی دیكە كە لە چاوپێكەوتنەكەدا باسكرا، پێشنیازەكەی ڕوشدی بەگ بوو لەبارەی بەستنی پەیمانی زامنكردنی سنووری هاوبەش لە نێوان لایەنەكان بوو، پێشنیازی كرد كە (توركیا- بەریتانیا- ئێران- عێراق) لە پەیمانەكە بەشداری بكەن، هەروەها باسی لەوەكرد كە دوای ئەمە دەبێت پەیمانێكی هاوشێوە لەگەڵ ڕووسیاش ببەسترێت، ئەگەر ئەمە بێتەدی، ئەوا خواستی كۆتایی توركیا بەدیهاتووە، كە بێ لایەنیەتی[4].

بیرۆكە و راكانی وەزیرە توركییەكە، یەكەمین دەستپێشخەری داننانی توركیا بوو بە واقعە نوێیەكە، وەزیرە توركییەكە ئەوەی ئاشكرا كرد كە بەرپرسانی توركی بەر لەوەی بە ئاشكرا قەسەی لەبارەوە بكەن، زۆر ئەودەست ئەودەستیان پێ دەكرد، ئەویش ئەوەبوو كە ئاسایش و سەلامەتی لە پێشەوەیە، نەوەك زەوی یان نەوت، زۆر لەمانەوەی كورد لە دەرەوەی دەسەڵاتیان دەترسان، بەڵام لە كۆتاییدا هەستیان بەوە كرد كە "دۆستایەتی بەریتانیا لە ٤٠٠,٠٠٠ كورد بەنرخترە"[5]، بەتایبەتی ئێستا لە توانیاندا هەیە كە بەریتانیا بەوە رازی بكەن كە مافی زیاتر بە كورد نەبەخشێ و ئاسایشی سنووری باكووری عێراق زامن بكات. ئەوەی بەریتانییەكان لە رای وەزیرە توركییەكە تێگەیشتن ئەوەبوو كە توركیا دەیەویت سنووری باشووری بپارێزێت، هەروەك

---

1- Lindsay to Chamberlain ,Constantinople,29-1-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 561,P.806.

٢- سەیری ل ل، لەم تێزە بكە.

3- Lindsay to Chamberlain,Constantinople,29-1-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I,No. 561, P.806.

4- Ibid,P. 807.

٥- فاضل حسین، مشكلة ...، ل ٢٧٣.

ئـەوەی پێـشتر لەگـەڵ رووسـیا لـە بـاکوور کـردی[1]. لیندسـی لـە سـەروبەندی کۆتاییهـاتنی چاوپێکەوتنەکە لێـدوانی داو گـوتی: "ئـەوەی لـە چـاوپێکەوتنەکان دەرکـەوتن ئـەوەبوو کـە بەرپرسانی تورکی بڕیاریانداوە واز لە داواکردنی موسڵ بهێـنن، بـەڵام لەهـەمان کاتـدا سـورن لەسەر ئەوەی کـە ناوچـەی دوورتـر ـ مەبەسـتی زەوی کوردسـتانی باشـوورە ـ بـە ئاڕاسـتەی رۆژهەڵات بەدەستبهێنن، هەروەها چەندی بکرێت سازش لە بەریتانیا وەربگـرن..."، ئەوەشـی گوتی کە: "رەوشەکە لە ئەنقەرە هێمنە، هیچ قسەیەك لەبارەی جەنگ لەئارادا نییە....."[2].

پێدەچوو کە زۆرێك لەوانەی کە لیندسی بۆی چـووە، لـە شـوێنی خـۆی بووبێـت، رەوشـی ناوخۆیی مستەفا کـەمال سـەخت بـوو، چاکـسازیی و یاسـا نوێیـەکانی لـەناوخۆ رووبـەڕووی بەرپەرچدانەوەیەکی بـەهێز دەبـووەوە، بۆیـە ناچـار بـوو لـە کفتوگۆکانـدا بـەلای دۆزینـەوەی چارەسەرێکدا لەگەڵ بەریتانییەکان بچێت، بەو شێوەیەی کە شتێك بە تورکیا ببەخـشێت، کـە بتوانێ شانازی پێوەبکات و کەمێك لە ناوبانگ بۆ مستەفا کەمال بگەڕێنێتەوە[3].

لەگەڵ ئەوەشدا رێگا چارەکانی مستەفا کەمال ئەوەندە زۆر نەبوو، بتوانێـت فـشاری زۆر لەسەربەریتانییەکان دروستبکات تاکو سازشی پێویـستیان لـێ وەربگرێـت، بـەڵام ئەوەنـدە توانایەشی نەبوو هـەموویان بـەکاربهێنێت، لەوکاتـەوەی کـە بەریتانییـەکان بـە گفتوگـۆی هەنگاوە پێویستەکان، لەبارەی گەیشتن بە پـەیمان بەسـتن لەگـەڵ تورکـەکان، خـەریکبوون[4]،

1- Mim.K.Oke, A Chrnology...,P.74.

2- Lindsay to Chamberlain, Constantinople , 29-1-1926,BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 561,P.807.

3- Lindsay to Chamberlain ,Constantinople, 29-1-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 562,P.808.

٤- لە یادداشتێکی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی بۆ لیندسی لـە ئەسـتەمبۆڵ، بـاس لـە شـێوەی ئـەو پەیمانـە چاوەڕوانکراوە لەگەڵ تورکیا کرا، جمبرلن لە یادداشتەکەدا پێی باش بـووە پەیمانەکـە لەسـەر شـێوەی پـەیمانی رووسی — تورکی ١٧ ئاداری ١٩٢٥ ببەسترێت، واتە پەیمان لەدژی دەستدرێژییەکان، بۆ ریخۆشکردن بۆئەمەش پێشنیازی کرد چەند هەموارکردنیکی سوك بەسەر سـنووری شـاخاوی بـۆ بەرژەوەنـدی تورکیـا بکریـت، وەك دەستبەرداربوون لە شاری ئامێدی و کردنەوەی بالیۆزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە وەك دەستپێـشخەریەکی نیـاز پاکی، هەروەها یادداشتەکە پێویستی سازکردنی راوێژ لەگەڵ هەریەکە لە ئیتاڵیا و فەڕەنـسا کـرد لـە بـارەی پەیمانەکە، سەیری:



مستەفا کەمال کۆمپانیا بیانییەکان بەگشتی و بەریتانییەکان بەتایبەتی بە دەرکردنی یاسای نوێ شۆکاند، ئەو یاسایانە بە: "راپەڕینێك بوو لـەدژی کۆمپانیـا بیانییـەکانی بەگـشتی و بەریتانییـەکان بەتایبـەتی"، توێـژەرێکی تـورکی باسـی لـەوە کـرد کـە: "لـە کۆتاییـدا پەرەسەندنەکانی کێشەی موسڵ کاریگەری لەسەر پەیوەندییە ئابوورییـەکانی تورکیـا دانـاو وایکرد کۆمپانیا بەریتانییەکان دابخرێن"[1]. سەرۆکی یەکێك لە کۆمپانیا بەریتانییـەکان بـە لیندسی راگەیاند کە:" ئەگەر یاساکە پەسند بکرێت ئەوا ناچار دەبێت سەرجەم کارەکانی لە تورکیا دابخات...."[2].

لەراستیدا لە تێڕوانینی بەریتانیاوە یاسا و رێساکانی تورکیا کتوپڕ و تۆڵەسێن بوون، هـەر سەیرکردنێك لەو یاسایانە مەودای سەمەرەبوون و توندیەکـەیان لەسـەر کۆمپانیـا بیانییـەکان دەبینی، بۆنموونە وەزرارەتی بازرگانی تورکی مەرجی دانان بوو لەسەر کۆمپانیاکان کـە دەبێـت لە ئەنجوومەنـەکانی کۆمپانیـا بیانییـەکان فەرمانبـەرانی دارایـی تـورکی دابمـەزرێنن و ئـەو موچەکانەیان پێ بدات کە وەزارەتی بارزگـانی بۆیـان دیاریـدەکات. ئـەم دامەزراندنـەش واتـا

- Oliphant to Lindsay (Constantinople),Foreign Office,1-2-1926,BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 566,PP. 810-811"

- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو, ص ١٨.

لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٥ لیندسی پێشنیازیکی پێشکەشکرد، کە وادەکات ئەو ناوچەیەی کە کەوتۆتە نێوان ئامێدی و رەواندوز بە ئێرانەوە بلکێنرێت، چونکە ئەمە کێـشە کـە کۆتـایی پـێ دێنێـت، بـەو پێیـەی سیاسەتی رەزا خان لەگەڵ سیاسەتی مستەفا کەمال گونجـاوە، هـەروەها هـەردوو وڵاتەکـە لـە بـارەی پرسـی کوردەوە کۆکن، بەڵام دوبز پێشنیازەکەی رەتکردەوە و سوربوو لەسەر لکاندنی هەموو ویلایەتەکە بە عێراقـەوە (کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی شیعەن و لەلایەن مەلیکێکەوە حوکمرانی دەکریت کە لە کەمینـەی سـوننەیە)، هەروەها دائیرە سیاسییەکانی دیکەی بەریتانیاش پێشنیازەکەیان رەتکردەوە، چونکە "ئێرانی لەسـەر حـسابی عێراق و تورکیا بەهێز دەکرد". سەیری:

- R.Olson, Op.Cit.,PP.141-142.

1- A Chronology …,P.73.

2- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 8-2-1926,BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.569, P.815.

لەناوبردنی نهێنی کە بۆ کۆمپانیاکان پێویستە، چالاکییەکانی پەك دەخات و دەستگرتنی حکوومەتی تورکی بەسەر کۆمپانیاکان ئاسان دەکات، هەروەها مەرجی دانابوو دەبێت ڕێژەی ٥١٪ی سەرمایەی کۆمپانیا نوێیەکان بۆ تورکەکان بێت، مەبەست لەمەش ناچارکردنی کۆمپانیاکان بوو کە لەکاتیَ تۆمارکردن بەناوی کۆمپانیای تورکییەوە تۆمار بکرێن[1]. هەروەها حکوومەتی تورکی بانکە بیانییەکانی ناچارکرد کە دەبێت لە ٧٥٪ی فەرمانبەرانی لە موسڵمانان بێت و دەبێت نووسراو و تۆمارەکانی بەزمانی تورکی بێت. ئەمە هەر کۆمپانیا بیانی و بەریتانییەکانی نەگرتەوە، بەڵکو دوکانە بچووکەکانی ناموسڵمانانیشی گرتەوە[2].

لیندسی ئەو ڕێوشوێنانەی ئەم دوایەی تورکیای بە "بەشێك لە هەڵمەتی بارگرانکردنی ژیانی بیانییەکانی تورکیا ..." ڕاڤەکرد، هەروەها گوتی: "کۆمار پەنای بۆ خۆ دەورەدان بە شورا لە شێوەی شورای چین بردووە، لە ڕێگەی تایبەتکردنی مافەکان بۆخۆی، ولاَتێك شوێنێکی بۆ کارکردنی بیانی تێدا نەبێت چ تاك بێت یان بازرگان بێت، ناتوانێت وڵات بونیادبنێتەوە"[3]. هەرچەندە لێدوانەکەی لەبارەی ڕێوشوێنە تورکییەکان وە بەشێك لەسیاسەتی ئابووری ئەنقەرە وەرگیرا، بەڵام ئەم پەرەسەندنانە کاری لە بەڕێوەچوونی دانووستاندنەکان لەبارەی کێشانەوەی سنوور نەکرد.

لەڕاستیدا ئەم ڕێوشوێنانەی ئەم دواییەی مستەفا کەمال ڕەنگدانەوەی کەللە ڕەقی و خوێندنەوەی باشی هەڵوێستەکە بێت، ئەمەش بە زیرەکی بۆ مستەفا کەمال دادەنرێت کە دوو ئامانجی لەدواوە پێکا، ئەکەم ناوخۆیی بوو، ئەوەبوو سەرنجی هاوڵاتیان لەسەر دۆڕانەکەی لەبەرامبەر بەریتانیا لە کۆمەڵەی نەتەوەکان لابەرێت، ئەو ڕێوشوێنانە لای دانیشتووانی تورکیا پێشوازیکرا، دووەم دەرەکی بوو، بۆ فشار خستنە سەر بەریتانیا بۆ ئەوەی چەندی بکرێت سازشی پێبکات، دوای ئەوەی لە ئەگەری دەستبەرداربوونی بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ بێ هیوا بوو.

بەریتانییەکان ویستیان ڕێوشوێنەکانی مستەفا کەمال لەدژی کۆمپانیاکان بە کێشەی موسڵ و دانووستاندنەکانی نێوانیان گرێ نەدەن. لەندەن ڕینمایی لەمبارەیەوە بە لیندسی دا،

1- Ibid,P. 815.

2- Ibid,P.816.

3- Lindsay to Chamberlain , Constantinople , 8-2-1926 , BDFP ,IA.Sir, Vol.I, No.569,PP. 816-817.



هەر لەهەمان چوارچێوەدا لیندسی پێشنیازی کرد نارەزایەتیکی توند لە دژی نەسرەت بەگی وەزیری دادی تورکی لەبارەی یاساکانی ئەم دواییە پێشکەش بکرێت، بەڵام پێشنیازەکە لەلایەن جمبرلَنەوە ڕەتکرایەوە، لەبری ئەوە پێشنیازیکرد پرسی کەمینەکان سەرلەنوێ بوروژێنرێت و ڕێوشوێنەکانی دوایی بە دژایەتی مافی کەمینەکان لەقەلەم بدرێت، بەوپێیەی زۆربەی ڕێوشوێنەکان ڕاستەخۆ ئەرمەن و جووەکانی تورکیای گرتۆتەوە، بەڵام لیندسی ئامۆژگاری جمبرلَنی کرد کە "ئەمە لەوانەیە هەموو ئەو هەوڵانە و دەستپێشخەریانەی کە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی دۆستانەی سنوور دراون، تێکبشکێنیَ"[1]. ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوەی کە سیاسەتی بەریتانیا بە چاوی تورکیا بە قۆناغی ئەزموونندا دەڕوات، بەریتانیا هەوڵی ئارامکردنەوە و دڵنەوایی ترسی تورکیا لەبارەی پرسی کەمینەکان لەمیانەی دانووستاندنەکان داوە.

لەڕاستیدا بەریتانییەکان لەو باوەڕەدابوون کە وروژاندنی هەر تەنگژەیەکی تازە لەگەڵ تورکەکان، بەهۆی کێشەی کۆمپانیاکانەوە، خزمەتی بەرژەوەندییە سیاسەکانی ناکات کە ئامانجیەتی چارەسەر و تێگەیشتنێکی خێرا بۆ پرسی سنوور بدۆزیتەوە، بۆیە پێیان باش بوو لەمبارەیەوە گفتوگۆ نەکەن، بەڵکو باڵیۆزی بەریتانی لە ئەستەمبوڵ لە یادداشتێکدا کە لە ٨ی شوبات پێشکەشی حکوومەتەکەی کردبوو بەرگری لە فیکر و سیاسەتی هەریەکە لە مستەفا کەمال و عیسمەت پاشا کردبوو، بە: "دوو کەسی خاوەن بیر و ئامانجی ڕوون" وەسفیکردبوون. سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەی ئێستای تورکیا گوتی: "تەکتیکە دیپلۆماسیەکانیان لە بواری سیاسەتی دەرەوە هەرچیەك بێت، ئەوا دەیانەویت هاوسەنگیەکی ئەمنی بۆ تورکیا لە نێوان ڕووسیا لە باکوور و بەریتانیا لە باشوور دروستبکەن"[2]، ڕاپۆرتەکەی ڕوونیکردبووە کە هێشتا تورکیا نەکەوتۆتە باوەشی ڕووسیا..بەبەڵگەی ئەوەی تورکیا ڕەتیکردۆتەوە کە پەیمانی ئێستایان لەگەڵ ببەستیَ... هەروەها لە چەوساندنەوەی کۆمۆنیستەکان درێخی نەکردووە"[3]. لەهەمان یادداشتدا لیندسی بەرگری لەوە کرد کە:

1- BDFP, IA.Sir, Vol.I,P.827.

2- Memorandum by Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 8-2-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 570,P.818.

٣- پارتی کۆمۆنیستی تورکی دوای دەرچوونی یاسای " تقریر سکون " ی ساڵی ١٩٢٥، دانی پیانەنرا، حکوومەت زۆر بەتوندی ڕووبەڕووی چالاکییەکانی بووەوە، ئەمەش وایلێکرد نەتوانیَ هیچ چالاکییەك ئەنجام

"مستەفا کەمال ئەنجامی دەدات، لە ملکەچپێکردنی هەستی نەتەوەیی تورکی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی لە لاوازکردنی فاکتەری ئاینی، هەتاکو ئەم کارەی دەبێتە هۆی زۆرداری یان ستەم لەوانەی کە نا تورکن و لەسەر خاکی تورکیان" وەك ئاماژەیەك بۆ کورد، کە راپۆرتەکە بە: "مەترسی بۆ سەر بیروڕا و پلانەکانی حکوومەتی تورکی ..."[١] وەسفیکردوون. لیندسی راپۆرتەکەی کورتکردەوە و گوتی: "کاروباریکی زۆری هاوبەش لە نێوان ئامانجەکانی تورکیای نوێ و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیای مەزن هەیە"، چونکە "زمانیان هیچ وشەی لەخۆبایی و سەرکێشی تێدا نییە، بۆیە چاوەڕوان ناکرێت داخوازی گرانبەها و زیادەڕەو پێشکەش بکەن، لەوانەیە ئەوان بۆ لەدەستدانی موسڵ ئامادەبن"[٢].

لیندسی بەلای ئەوەدا دەچوو کە تورکەکان بەرەو "ئارامکردنەوەی سنوورەکانی" دەچن، تورکیا هەوڵەکانی لە داهاتوودا بۆ چارەسەری رەوشی ناوخۆ و بونیادنانەوەی ئابووری وڵات چڕدەکاتەوە، بەڵام "ئەو هەوڵێنەی رووبەڕووی پەرۆشی ئایینی و هەستی نەتەوەیی دەبێتەوە، هەوڵەکانی لەپێناوی عەلمانیەت و نوێخوازی ترسی لای هۆزەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دروستکرد"، لەمەوە لیندسی داوای لە حکوومەتەکەی کرد نەرمی زیاتر لەمامەڵەی لەگەڵ تورکیا بنوێنێ، چونکە ئەمە خزمەتی بەرژەوەندی بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات[٣]. لیندسی پێی باش بوو کە بەم خاڵانەی خوارەوە ئەمە بکرێت:

١- رازیکردنی هۆزەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (مەبەستی کوردە) کە پرسی سنوور هەتاهەتا چەسپا و کۆتایی هات.

---

بدات، رۆژنامەکانی تورکی بەردەوام لێدوانەکانی بەرپرسانی تورکیایان بڵاودەکردەوە کە تێیدا جەختیان لەوە دەکردەوە کە ئەو پەیمانەی کە بە مۆسکۆیان دەبەستیتەوە، تەنها سیاسییە، حکوومەتی تورکی بەهیچ شێوەیەك ئەو ریسا و رینمایانەی کە حکوومەتی مۆسکۆ بڵاویان دەکاتەوە، قبوڵی ناکات، چونکە کۆمۆنیست لە تورکیا بەهیچ شێوەیەك جیگای نابیتەوە..سەیری:

- قاسم خلف عاصی الجمیلی، تگورات واتجاهات...ل ص، ١٧٧-١٧٨.

1- Memorandum by Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 8-2-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 570,P.819.

2- Memorandum by Lindsay to Chamberlain,Constantinople, 8-2-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 570,P. 820.

3- Mim.K.Oke, A Chrnology...,P.71.



٢- دڵنیاکردنەوەی تورکەکان لەبارەی ئەو سیستەمەی کە لە کوردستانی باشوور جێبەجێ دەکرێت.

٣- بۆ بەدیهێنانی پەیوەندی باش لەنێوان عێراق و تورکیا، دەبێت رەواندز بە تورکیاوە بلکێنریت ـ بەمەرجێ شاری موسڵ لەناو عێراق بمێنێتەوە[١]، لەوانەیە ئەمە هانی تورکیا بدات کە پەیمانەکە مۆربکات، ئەمەش گرنگییەکی زۆری دەبێت[٢].

٤- پەیمانەکە زامنی سنووری تورکیا لە هەر دەستدرێژیەك بکات، بەشێوەیەك فەرەنساو ئیتاڵیاش بگرێتەوە، بەڵکو زیاتریش لەمە بروات کێشەی کوردیش بگرێتەوە، چونکە لەبەرژەوەندی حکوومەتی خاوەن شکۆیە کە "تورکیا لە پێشیلکار بپارێزێت و سەروەریەکەی پارێزگاری بکات"[٣]. جووڵانەوەکانی لیندسی لەمیانەی مانگی ئاداردا بۆ پەلەکردن لە مۆرکردنی رێککەوتن لەگەڵ تورکەکان، چڕبووەوە، بەتایبەتی کە لە ٥ی ئازاردا یادداشتێکی لە چمبرلن بەدەست گەیشت کە "پاڵپشتی لە جوڵانەوەکانی دەکرد و هەنگاوەکانی پیرۆز دەکرد"[٤]. هەروەها رەوشی نێودەوڵەتیش زیاتر لە پێشتر گونجاوتر بوو، لەلایەك ئەنجوومەنی کۆمەڵە لە ئاداری ١٩٢٦ پەیمانی عێراقی- بەریتانی پەسند کرد[٥]، لەلایەکی دیکەوە تورکیا

---

١- هەردوو وەزارەتی دەرەوە و فڕۆکەوانی ویستیان هێلی سنووری نێوان تورکیا و عێراق راستەوخۆ بە باکووری رەواندوز دا بروات، بۆ ئەوەی هانی تورکیا بدرێت تاکو پەیمانەکە بەخیرایی مۆر بکات، بەڵام هینری دوبس کە شوێنی کۆکسی لە ئیدارەی عێراق گرتەوە، هەر بەو رایاەی خۆی کە دەلیت: " کورد گرنگترین رەگەزن بۆ زاڵبوونی خەلکی سوونە بەسەر حکوومەتی عێراقەوە، " رازی نەبوو لە هیچ پارچەیەکی کوردستانی باشوور بۆ هیچ لایەنیکی دەستبەردار بیت، سیاسەتمەدارانی بەریتانی لە رازیکردنی دوبس سەرکەوتوو نەبوو.سەیری:

- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشول ١٨-١٩.

2- Memorandum by Lindsay to Chamberlain ,Constantinople,8-2-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I,No. 570,P.820

3- Memorandum by Lindsay to Chamberlain,Constantinople,8-2-1926, BDFP,IA.Sir, Vol.I,No. 570,PP. 821-822.

4-Chamberlain to Lindsay to Chamberlain, Constantinople, foreigh Office, 5-3-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I,No.575,PP.827-828.

٥- بۆندی لکاندنی کوردستانی باشوور (ویلایەتی موسڵ) بە عێراقەوە، بە مۆرکردنی پەیمانە نوێیەکە لە ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ لەلایەن عێراقەوە گرێدرا، ئەوکات عەبدولموحسین سەعدون (سەرۆك وەزیرانی عێراق)

هەرەشەی یۆنانی و ئیتاڵییەکان زیاتر لە جاران بەهەند وەردەگرێت، دوای ئەوەی لەمیانەی سەردانەکەی مۆسۆلینی بۆ تەرابلوس ئەوە بلاوبووەوە کە بەڵێنی داگیرکردنی ئەنادۆڵی داوە، ئەگەر تورکیا پەشیوی لەبارەی کێشەی موسڵەوە بوروژێنێ[1].

مانگی نیسان سەرەتای کرداری دانووستاندنەکانی پەیمانی سنووری لەگەڵ تورکەکان بەخۆیەوە بینی، لەو مانگەدا هێلە سەرەتاییەکانی پرۆژەی پەمانەکە ریکخرابوو، لیندسی لە لەندەن گەڕابووەوە، ئەوەی پێی دەگوتریت (رەشنووسی رێککەوتن)ی لەگەڵ خۆی هێنابوو، کە لە ئەنجامی راپۆرتەکانی لیندسی بۆ بەرپرسانی بەریتانی و گفتوگۆیان لەگەڵیدا گەڵاڵە ببوو.

لیندسی چەندی تەوەری بۆ تاوتوێکردن لەگەڵ بەرپرسانی تورکی دیاریکردبوو، بابەتی گەیشتن بە رێککەوتن لەگەڵ تورکیا لەژێر رۆشنایی ئەو سنوورەی کە لە نێوان تورکیا و عێراق زانراوە، ئامانجی چاوپێکەوتنەکانی لیندسی بوو بە بەرپرسانی تورکی. لە پێناوی بەدیهێنانی ئەمە، لیندسی دەسەڵاتی پێدرا کە بتوانێ سازش لە هەندێ ناوچە بۆ تورکیا بکات، بەمەرجێ ئەو ناوچانە: "نەبێتە راگواستنی دانیشتووان، چونکە ئەمە سەختی دارایی و سەربازی بۆ حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی لە عێراق دروست دەکات، هەروەها دەبێتە، پێچەوانەی مەرجەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان"[2]. دیاریکردنی شێوەی گشتی پەیمانەکە و بواری دەسەڵاتەکانی حکوومەتی عێراقی و ئایا حکوومەتی عێراقی بەتەنها بەشداری گفتوگۆکان دەکات یان لەگەڵ بەریتانیا، ئاماژەدان بە کێشانی سنوور و توانای سازکردنی روپێوێکی تەواو و ورد بۆ هێڵی برۆکسل بەتەواوی[3]، کە لایەنیکی دیکە بوو، داوا لە لیندسی کرا کە لەگەڵ تورکەکانی باسبکات.

---

پاساوی مۆرکردنی پەیمانەکەی بە "لەدەستدانی موسڵ" بەستەوە. پەیمانەکە ماوەی ئینتیدابی بەریتانی بە ٢٥ساڵ دیاریکرد. سەیری:

- غانم الحفو وعبدالفتاح علي يحيى، الاكراد والاحداث الوطنية في العراق خلال العهد الملكي ١٩٢١-١٩٥٨، بحث غير منشور بحوزة الباحثين، ل ١٥.

١- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٣

2- Lindsay to Chamberlain Constantinople, 5-3-1926 BDFP, IA.Sir, Vol.I,No.576, PP.828-829.

3- Ibid,PP. 829-830



بەڵام ئەوەی سەرنجڕاکێشە لێرەدا ئەو داوایەی چەمبرلنە لە لیندسی کە پرسی "ئاسایش و کێشمەکێشەکانی سەرسنوور لەگەڵ بەرپرسانی تورك بوروژێنێ"، پێشنیازی کرد پەیمانەکە بڕگەی پەیوەست بە دانانی "لیژنەی سەرپەرشتی" لەخۆبگرێت، کە ئەرکی گفتوگۆی کێشەکانی راگواستن و جەردەیی و رێگری بێت، سەرباری ئەگەری گەیشتن بە پەیمانی "ئاڵوگۆڕکردنی تاوانباران"، هەروەها چەمبرلن داوای لە لیندسی کرد کە بە تورکەکان بڵێت، کە پەیمانەکە روونکردنەوەیەك بۆ بڕیاری"ئەنجوومەنی قەرزەکانی عوسمانی"[1] لەخۆبگرێت، کە بڕیاردەدات ئەو بڕە پارەیەی کە دەکەوێتە ئەستۆی عێراق لەبری ویلایەتی موسڵ یان دەکەوێتە ئەستۆی تورکیا دوای کێشانی سنوور[2].

لە راستیدا بەرپرسانی دەرەوەی بەریتانی بەم سێ تێبینییەی دوایی ویستیان جۆرێك لە هاوسەنگی لەنێوان بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیان، لە پاراستنی ویلایەتەکە و پارێزگاری لە ئاسایشی رێگاوبانەکان و سەلامەتی عێراق، کە لەبەشی یەکەمی یادداشتەکەی چەمبرلن بۆ لیندسی هاتووە، لەلایەکی دیکەوە هەوڵیان دەدا هانی تورکیا بدەن بۆ بەستنی پەیمانەکە رابیکێشن. بەریتانییەکان لەباوەڕی تەواودابوون کە ترسی تورکەکان پرسی ئاسایشی سنوور و ترسی لەدەستدانی بەشی زیاتر لە خاکی کوردستان، دووخاڵی کۆتایی بە ناراستەخۆ ئاماژە بۆ پرسی کوردی و پرسی هاتوچۆی هۆزە کوردییەکانی سەرسنوور دەکرد، یان هاتوچۆی سەرکردە و چالاکوانانی بزووتنەوەی کوردی دەکرد، لەمەوە ویستی گەرەنتی بە تورکیا بدات، کە لە

---

١- ئیدارەی قەرزی عوسمانی بە پێی مەرسومێك کە لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ٨ی کانوونی یەکەمی ١٨٨١ دەرچووە، دامەزراوە، بۆ ئەوەی زامنی دانەوەی پارەی ئەوانە بکات کە هەڵگری کۆمپیاڵەی قەرزن، ئەنجوومەنی ئیدارەکەی لە ٧ کەس لەوانەی هەڵگری کۆمپیاڵەی قەرزی عوسمانین پێکهاتبوو، کە بەریتانیا و فەرەنسا و هۆڵەندا و نەمسا- مەجر و ئیتاڵیا بوون، بەشی تورکیا لە قەرزی عوسمانی نزیکەی بە (٨٤,٥٩٧,٤٩٥) لیرەی زێڕی تورکی و پشکی ساڵێنەی (٥,٨٠٩,٣١٢) مەزەندە دەکرا. سەیری:

- خليل علي مراد، تغلغل الراسمال الاجنبي في الدولة العثمانية ١٨٥٤-١٩١٤، مجلة دراسات تركية، مركز الدراسات التركية – جامعة الموصل، العدد (٢) السنة الاولى، كانون الاول ١٩٩١، ل ١٤٤" سعاد حسن جواد، تركيا...، ل ٣٨.

2- Lindsay to Chamberlain,Constantinople, 5-3-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No.576, PP.380-381.

پەیمانەکەدا دەچەسپێ بەوەی بەریتانیا تورکیا **دڵنیا** دەکاتەوە، کە وەك چۆن یەکێتی خاکی عێراق و ئاسایشەکەی دەپارێزیت ئاواش تورکیا دەپارێزیت، خاڵی کۆتایی کە بە قەرزەکانەوە پەیوەست بوو، ئەوا وەك دەستپێشخەریەکی نیاز باشی بەریتانیی بوو بۆ تورکەکان.

بۆ ئەوەی پەیمانەکە بچێتە بواری جێبەجێکردنەوە[1]، لیندسی سەردانی ئەنقەرەی کرد و چاوی بە وەزیری دەرەوە کەوت و لە **٧**ی نیسان چاوی بە سەرۆك وەزیرانی تورکی کەوت، لیندسی لەمیانەی چاوپێکەوتنی بە سەرۆك وەزیرانی تورکی گوتی: "سەرۆك وەزیران زۆر گرنگی بە پرسی ئاسایش دا و زۆر قسەی لەبارەیەوە کرد، هەروەها "کێشە و ناخۆشیەکانی تورکیا لە رۆژهەلاتی تورکیا بۆ چالاکییەکانی بەکرێگیراوانی بەریتانی لە عێراق گەڕاندەوە"، لیندسی لەم قسانە ئەوەی بۆ دەرکەوت کە "رەفتاری سەرۆك وەزیران زیاتر لە رەفتاری کەسێکی نیگەران و غەمبارە نەوەك رەفتاریکی تورە"[2]. رۆژی دووەمی چاوپێکەوتنی بە وەزیری تورکی زیاتر هەڵوێستی تورکی روونبووەوە، وەزیرە تورکییەکە لەسەرەتای چاوپێکەوتنەکەدا گوتی: "ئەوەی تورکیا چاوی لێیە هەرگیز پارچە زەویەك نەبووە، بەڵکو ئاسایشە، کە دەکرێت بەدەستکەوتنی پارچە زەویەکی گەورە بێتەدی، یان بەهەر جێگرەوەیەکی دیکە....." سێ ئەلتەرناتیڤەکەی کە وەزیری تورکی وەك پێشنیاز پێشکەشی کرد، ئەوانە بوون،:

١- پەیمانی بێ لایەنی هاوبەش لەسەر شێوەی پەیمانی تورکی -رووسی و تورکی- فەڕەنسی.

٢- تورکیا بەفەرمی دەستبەرداری سەرجەم ئەو زەویانەی کەوتوونەتە باشووری **هێڵی** برۆکسلەوە بۆ عێراق، بەڵام دوای ئەوەی عێراق پەیوەندی بە بەریتانیاوە دەپچڕێنێ (واتە پەیوەندی تایبەتی عێراق بە بەریتانیاوە)، عێراقببێتە خاوەن سەروەری خۆی بە شێوەیەك وەك وڵاتێك خۆی خۆی حوکم بکات.

٣-بەشداری پێکردنی تورکیا لە نەوتی عێراق، ئەویش لەرێگەی دەستکەوتنی پشك، پاساویشی بۆئەمە ئەوە بوو کە کاتێ تورکیا پشکی لەنەوتی عێراق دەبێت، خەمیش لە ئاسایشی عێراق و ناوچەکە دەخوات[3].

1- Lidnsay to Chamberlain,Angora,18-4-1926,BDFP,IA.Sir,Vol.I, No.577, P.831.

2- Lindsay to Chamberlain, Angora, 21-4-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.578, PP.832-834.

3- Lindsay to Chamberlain, Angora, 21-4-1926, BDFP,IA. Sir, Vol.I, No. 578, PP.832-834.



دانوستکاری ئینگلیزی پێشنیازی یەکەمی رەتکردەوە، گوتی رێککەوتنی بێ لایەنی هاوبەش تەنها بۆ مەبەستی بانگەشەیە، هەروەها ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکیش رەتی دەکاتەوە، سەرباری ئەوەی ئەم بیرۆکەیە لە بەریتانیاش ئامادەکاری بۆ نەکرابوو. چارەنووسی پێشنیازی دووەمیش وەکو یەکەم بوو، بەڵام لیندسی پێشنیازی سێیەمی رەتنەکردووە، بەڵکو بەڵێنی بە تورکەکان بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی، بەرزی بکاتەوە[1].

پێشنیازی تورکەکان لەبارەی پرسی نەوت، بووە تەوەری چاوپێکەوتن و گفتوگۆکانی دواتر بوون کە هەردوولاکەی بەیەك دەگەیاند، لە کۆبوونەوەیەکی لیندسی بە وەزیری دەرەوەی تورکی لە ٢١ ی نیسان، دوای ئەوەی لایەنی تورکی سەرلەنوێ پێشنیازەکەی ورووژاند، ئامۆژگاری حکوومەتی خۆی کرد کە: "وەڵامی هیوای تورکی لەبارەی نەوت بداتەوە". پاساوی بۆئەمەش ئەوەبوو، کە وادەکات بگەنە رێککەوتن بەو "مەرجانەی کە لای حکوومەتی تورکی پەسندن" هەروەها عێراقیش لە "هەموو گرفتێکی پەیوەست بە ئاسایشەوە رزگاری دەبێت"[2]. لیندسی لاوازی دارایی ئێستا و ترسی زۆر تورکەکان لە هێرشی ئیتاڵی بە هەلێکی گونجاو بینی بۆ ئەوەی هەرچیەکی بتوانریت بکرێت دەستکەوتی سیاسی لە تورکەکان بسەندرێت[3].لەوکاتەی کە گفتوگۆکان لەگەڵ تورکەکان بەردەوام بوو، لیندسی لە تورکیا لە **٢٣**ی نیسان چاوی بە سۆرتیزی باڵیۆزی رووسی کەوت، تەوەری گفتوگۆکانیان لە بارەی دانووستاندنەکانی لەبارەی سنووری عێراقی ـ تورکی بوو، دوای ئەوەی لیندسی بە باڵیۆزڤی رووسی گوت: "هەڵوێستی تورکەکان پێ دەچێت بۆ یەکەمجار ئەوە بێت، کە بەراستی دەیانەوێت بگەنە رێککەوتن"، باڵیۆزی رووسی گوتی: "خۆم قسەم لەگەڵ وەزیرە تورکەکان کردووە و بەتوندی هانمداون کە پێویستە بگەنە چارەسەر...."[4].

دوور لە ئەنقەرە، لەپێناو ئەوەی گوڕوتینێکی گەورە بە دانووستاندنەکان بدرێت، جمبرلن لە ٢٣ نیسان لە لەندەن چاوی بە باڵیۆزی تورکی کەوت، دوای ئەوەی لەبارەی چۆنیەتی

1- Ibid,PP. 833-834

2- Lidnsay to Chamberlain ,Angora, 22-4-1926, BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 579, PP.834-835.

3- BDFP,IA. Sir,Vol.I.P. 834.

4- Lidnsay to Chamberlain, Angora, 23-4-1926, BDFP,IA.Sir, Vol.I, No.581, PP.836-837.

بەریوەچونی دانووستاندنەکان قسەیان کـرد، ئەمـەش وەك هـەولێك بـۆ وروژانـدنی نیگەرانیـە ئەمنیەکانی تورکیا، چەمبرلێن لەبارەی نیازەکانی ئیتاڵیا گـوتی: "دانـیێ هاوپـەیمانی یۆنـانی — ئیتالّی بوونی هەیە"، ئینجا گوتی: "من لەو باوەڕەدام کە مۆسـۆلینی دەخوازێـت ئاشـتی بـە دەستپێکردنی سیاسییەتی سەرکێشی بشکێنێ"، ئەوەش گوت کە: "گومانم نییـە کـە ئەگـەر ئاشتی بشکێنێ، ئەوا هەولّی بەدیهێنانی خواستەکانی دەدات، بۆ ئەوەی ژمارەی دانیـشتوانی ئیتالّیا زیاد بکات، کە پێویستی پێیەتی". دواتر باسی لەوە کرد کە: "باشترین ئاسـایش دژی هەر دەستدرێژییەك لە هەر هێزێکەوە بێت، ئەوەیە کـە پەیوەنـدی بـاش لەگـەڵ دراوسـێیەکان ئێـستا لـە عێـراق و سـوریا دروسـتبکرێت، ئەمـە هـەموو پاسـاوێك ناهێڵێـت کـە هـانی دەستتێوەردانی بیانی لە هەر وڵاتێکەوە بێت دەدات"[١].

بە سروشتی بارەکە و وەڵامی یادداشتەکانی پێشووی لیندسی، دەزگـای سیاسـییەتی دەرەوەی بەریتانی بە تاوتوێکردنی پێشنیازی تورکەکان لەبارەی رێککەوتن و پەیمان بەسـتن و پرسـی نـەوت خەریکببوون. چەمبرلێن لەبارەیەوە گوتی: "ئیمـە بـە پێکهێنـانی چوارچـێوەی پلانیکـی کـردار کـە خواستەکانی تورکیا بهێنێتە دی خەریکین"، بەڵام باسی لەوەەش کرد کە هەر پێشنیاز بە ئاڕاستەی دووبارە دابەشکردنەوەی پشکەکان بدرێت، بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و فەرەنساش دەگرێتەوە، کە ئەمەش گفتوگۆکان سەخت و درێژ دەکات، لەوانەیە ئەم دوو وڵاتە بەمە رازی نەبن"[٢].

بەدوایەکداهاتنی چاوپێکەوتنەکان، گفتوگۆکانی تورکیا و بەریتانیای زیـاتر دۆسـتانەکرد، لەو چاوپێکەوتنەی کە لیندسی لە ٢٦ی نیسان لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکی سـازیکرد، دوای ئەوەی باس لە چاوپێکەوتنی باڵیۆزی تورکی و چەمبرلێن کرا، وەزیری دەرەوەی تـورکی ئـارەزووی وەزارەتی بازرگانی تورکی لە دەستپێکردنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ بـەریتانیا دەربـڕی. دوای دەرچوونی لیندسی لە کۆبوونەوەکە، رایگەیاند کە:" لە کۆبوونەوەکە هیچ باسێك لەبارەی هیچ سازشێك یان گەڕاندنەوەی ناوچەکان نەکرا"[٣].

---

1- Chamberlain to Lindsay, Foreign Office,24-4-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.582,P.838.

2- Ibid,P. 838.

3- Lindsay to Chamberlain ,Angora, 27-4-1926,BDFP, Sir.IA, Vol.I, No.583, PP.839-840.

## پەیمانی عێراقی ـ بەریتانی ـ تورکی (٥ حوزێرانی ١٩٢٦):

دانووستاندنەکان بەریتانی ـ تورکی بەهاتنی سەرەتای مانگی ئایاری ١٩٢٦، چووە قۆناغیکی یەکلاکەرەوە، وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی گلۆپی سەوزی بۆ لیندسی پێکرد، تاکو دانووستاندن لەسەر بنەمای رازی بوون بە داخوازییەکانی تورکیا لە بەشە نەوت، بکات. جمبرلن بروسکەی بۆ لیندسی کرد و تێیدا گوتی: "هەموو هەولەکان بۆ سازشکردن بۆ تورکیا دەخرێتەگەڕ، تاکو رێژەیەکی دیاریکراو لە قازانجی بەشی حکوومەتی عێراقی لە کۆمپانیای نەتەوتی تورکی، بە تورکیا بدرێت"، هەروەها ئەوەشی بە لیندسی راگەیاند کە: "دەسەڵاتی ئەوەی پێدراوە دانووستاندن لەسەر رێژەی ١٠٪ تا ١٥٪ پێدراوە، ئەگەر رەوشەکە وای پێویست بوو، بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ"[١]. دوای دوو رۆژ لەمە، لیندسی لەگەڵ روشدی بەگ لەبارەی بەشە نەوت قسەیان کرد، لیندسی توانی روشدی بەگ باوەڕ پێبکات، کە دەستبەرداری داواکردنی بەشە پشکی کۆمپانیای نەوتی تورکی بێت، پاساوی بۆئەوەش ئەوەبوو کە خەرجی و ماوەی دەرهێنانی نەوت کاتێ دەویت، واباشترە بۆ تورکیا تەنها لە داهات بەشدار بێت[٢].

---

1- Chamberlain to Lindsay, Foreign Office, 4-5-1926, BDFP, Sir.IA, Vol.I, No.584, PP.839-840.

دەسەڵاتدارانی عێراقی پلانێکی جێگرەوەیان پێشکەشی بەریتانیا لە بارەی سازش بۆ تورکیایان کرد، ئەویش دامەزراندنی هێڵی ئاسن بوو لە نێوان نەسیبەینی تورکی و موسڵ، بەمەرجی ریژەیەکی چەسپاو لە داهاتی نەوت لە بەشی عێراقی بۆ تەرخانبکرێت، ئەو پێشنیازەی عێراق لەلایەن بەریتانییەکانەوە پێشوازی لینەکرا، ئەوان وایان دەبینی کە تورکان ئەمە بە هەولیکی بەریتانی بۆ دەستتیوەردان لە ناوچەی تورکی دەبینن"، سەیری:

- Ibid,P.840.

2- Lidnsay to Chamberlain , Angora , 7-5-1926 , BDFP , IA.Sir , Vol.I, No.586, PP.841-842.



لیندسی لە گفتوگۆیەکانی لەگەڵ بەرپرسە تورکییەکە و بەپێی بەسەرکردنەوەی لە نزیکی رەوشی سەختی ناوخۆی تورکیا، بەتایبەتی رەوشی دارایی و ترس لە ئیتاڵیا، تێبینی ئەوەی کردبوو کە تورك بە پەرۆشەوە بەرەو رێککەوتن لەگەڵ بەریتانیا دێن، چارەسەر بە ٣٠٠,٠٠٠ تا ٥٠٠,٠٠٠ پاوەند دەکرێت[١].

لە راستیدا جمبرلن پێشبینی ئەوەی کرد کە "مەزەندەی لیندسی لە شوێنی خۆی بێت"، بۆیە وای دەبینی کە "بۆندەکە گونجاوە"، بە لیندسی راگەیاند کە دەسەڵاتی ئەوەی پێدراوە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکی لەمبارەیەوە گفتوگۆ بکات، چونکە "پێشنیازەکەی ئێستا جێگرەوەیە(بدیل)و ناکرێت بخرێتە سەر سازش لە زەویدا"[٢].

تورکەکان ئەوەندە پەرۆشیان بۆ پێشنیازەکەی ئەم دواییەی لیندسی پێشان نەدا[٣]، چونکە هەڵوێستی دارایی تورکی ئەوەندە خراپ نەبوو، هەروەك لیندسی باسی کرد، پێدەچوو حکوومەتی تورکی ئەوەندە لە وەرگرتنی ئەو پارەیەی کە پەیماننەکە بۆیان دێنێت بەپەلە نەبن"[٤]. روشدی بەگ بە لیندسی راگەیاند کە بری ٥٠٠,٠٠٠ پاوەند بەس نیە[٥].

خەمساری حکوومەتی تورکی بۆ پێشنیازەکەی لیندسی بەهۆی پارە و بەشە نەوت نەبوو، بەقەد ئەوەی بەهۆی پرسی ئاسایشەوە بوو. نەوت تاکە فاکتەری تورکەکان نەبوو، جمبرلن لەبەردەم پەرلەمانی بەریتانی لە ١٨ی شوبات ئاشکرای کرد کە حکوومەتی تورکی بە تایبەت بەوی راگەیاندووە کە "ئەگەر بەریتان لە هەڵوێستی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراق دەستبەردار بێت، ئەوا بەریتانیا و کۆمپانیاکانیان دەتوانن مافی گەڕان بەدوای نەوت ببن و ئیمتیازی راکێشانی بۆڕی نەوت بۆ نیوەی بەندەرە تورکیای پێ دەبەخشرێت، هەروەها بەخشینی نزیکەی ٣٠٠٠ کلیۆمەتر لە هێڵی ئاسنی پێدەدرێت"، بەڵام جمبرلن باسی لەوەکرد کە ئەو بەروخستنەی تورکیای رەتکردۆتەوە "چونکە عێراق بە حکوومەتی خاوەن شکۆوە

---

1- BDFP,IA.Sir,Vol.I,P.842.

2- Chamberlain to Lindsay,Foreign Office 17-5-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 587,PP.842-843.

3- Lidnsay to Chamberlain ,Angora, 21-5-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I, No.588,P.843.

4- BDFP,IA.Sir,Vol.I,P.843.

5- Ibid,P. 844.

راسپێردراوە، عێراق موڵکی حکوومەتی خاوەن شکۆ نییە، بەڵکۆ بەریتانیا وڵاتی ئینتیدابکراوە بەسەر عێراق، بەریتانیا وەك وڵاتێکی ئینتیدابکار ناتوانێت سازش لەسەر ماف و بەرژەوەندییەکانی گەلی عێراق لەبەرامبەر ئیمتیازاتی خاوەن سەرمایەی بەریتانی بکات"[1].

لە راستیدا ئەو وەختەی کە جمبرلن ئەو پێشنیازەی راگەیاند، هەروەها ئەو شێوازەی کە وەڵامی تورکەکانی پێدایەوە، زۆر دەلالەت لەخۆ دەگریت، لەلایەك ویستی ئابروی لایەنی تورکی ببات و هەڵوێستی لەبەردەم ئەنجوومەنی کۆمەڵە لاواز بکات، بەوەی کە تورکیا لە دەرەوەی شەرعییەتی ئەنجوومەنی کۆمەڵە بەدوای چارەسەر دەگەرێت و هیچ حسابێك بۆ بەرژەوەندی و خواستەکانی دانیشتووانی ویلایەتەکە ناکات، لەبەرامبەر وەڵامەکەی زۆر دیپلۆماسی بوو،، لەلایەکی دیکەوە پابەندی بەریتانیای -وەك وڵاتێکی بەهێز- بە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی کۆمەڵە پێشاندا، لەلایەکی دیکەشەوە، وڵاتەکەی وەك بەرگریکار لە بەرژەوەندی و ئاسایش و خاکیان بۆ عێراقییەکان پێشاندا.

هەرچەندە، حکوومەتی تورکی گەیشتە ئەو باوەڕەی کە دەستگرتنی بە هەڵوێستەکەی و درێژکردنەوەی دانووستاندنەکان، وای لێناکات سازشی زیاتری لەبارەی پرسی موسڵەوە پێ بکات، بۆیە لە ٢٨ ی ئایار رەشنووسی رێککەوتنی هاوشێوەی رەشنووسە بەریتانییەکە بە لیندسی دا، بەڵام ئەوەی سەرنجراکێش بوو لە رەشنووسەکە ئەوەبوو کە لە ماددەی یەکەمیدا دەیگوت: "**هێڵی** سنووری نێوان تورکیا و عێراق، ئەوەیە کە ئەنجوومەنی کۆمەڵە لە ٢٧ی ئەیلولی ١٩٢٥ پەسندی کردووە"[2]، لە دوای ئەوەش لە ١٩٢٦/٥/٣٠ وەزیری دەرەوەی تورکی بە زارەکی بە لیندسی راگەیاند کە "حکوومەتی تورکیا بە رێژەی ١٠٪ و بۆماوەی ٢٥ساڵ لە بەشی عێراق لە داهاتی نەوت رازییە"[3].

شەوی ٣-٤ حوزێران دواین چاوپێکەوتن، لەو زنجیرە چاوپێکەوتنە زۆر دورودرێژانەی کە لیندسی لەگەڵ روشدی بەگ گەیاندووە، بەخۆیەوە بینی. کە تێیدا لەسەر زۆربەی خاڵە

---

1- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 529.

٢- کە لێرەدا مەبەستی هێڵی برۆکسلە کە لەلایەن کۆمەڵەوە وەك هێڵی کۆتایی سنوور لەنێوان عێراق و تورکیا لە ١٦ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ پەسندکرا. سەیری

- Lindsay to Chamberlain ,Angora, 28-4-1926,BDFP,IA.Sir, Vol.I,No. 589, P.844.

3- Lindsay to Chamberlain , Angora , 30-5-1926, BDFP , IA . Sir, Vol.I, No.590, PP.844-845; Mim.K.Oke, A Chrnology...,P.75.



بنەڕەتییەکان رێککەوتن، بۆیە لیندسی بروسکەی بۆ حکوومەتەکەی کرد لە لەندەن، کە "بەیانی پەیمانەکە لەگەڵ تورکەکان مۆر دەکات"[1].

لەسەر ئەم بنەمایە و دوای ئەنجامدانی چەند گۆڕانکارییەکی بچووك لەبارەی سنوور[2]، لە ٥ی حوزێرانی ١٩٢٦ هەریەکە لە بەریتانییەکان و عێراقییەکان لەلایەك و تورکەکان لەلایەکی دیکەوە مۆرکردنی پەیمانە سێ قۆڵیەکەیان لە ئەنقەرە رایانگەیاند[3]، سێ لایەنەکە لە پێشەکی پەیمانەکە رایانگەیاند کە ئەو پەیمانە "بەپێی ئەو پەیمانەی کە لە لۆزان لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ مۆرکراوە، بەستراوە، کە تایبەتە بە سنووری نێوان عێراق و تورکیا,....."[4]، بەمەش کێشەی موسڵ بەکردەوە کۆتایی دێت و چارەسەر دەبێت.

لە کۆی ١٨ ماددە کە لە پەیمانەکە دا هاتووبوون، ١٦ ماددەیان بە پرسی سنوور و بەهێزکردنی پەیوەندی دۆستایەتی و هاوسێیەتی تایبەت بوون، کە بەشاراوەیی ئاماژەی بۆ کورد دەکرد. ماددەکانی دیکە باسی لە دیاریکردنی **هێڵی** سنوور و دیاریکردنی رەگەزی دانیشتووانی ئەو خاکانە کە دەکەونە ناو عێراقەوە، هەروەها پێدانی بڕی ٥٠٠,٠٠٠ باوەند بۆ رێژەی ١٠٪ی داهاتی نەوت لە بەشی حکوومەتی عێراق بۆ تورکیا بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ"[5].

---

1- Lindsay to Chamberlain,Angora,4-6-1926,BDFP,Sir.IA,Vol.I, P.845.

٢- کە رێگەی (ئاشوت ـ ئالامون) لە ناوخاکی تورکیای لێی لابرا، کە رووبەرەکەی چەند میلێکی تێنەدەپەڕاند، کە گرنگی زۆری نەبوو، بەڵام تورکان ئەمەیان بە سازش دانا . سەیری:

-Mim.K.Oke, A Chrnology...,P.74.

٣- نوری سەعید و وەکیلی وەزیری بەرگری نیشتیمانی لەلایەن عێراق و لیندسی بالیۆزی بەریتانیا لە تورکیا لەلایەن بەریتانیا و تۆفیق روشدی بەگی وەزیری دەرەوەی تورکیا لەلایەن تورکیاوە ئامادەی مۆرکردنی پەیمانەکە بوون. سەیری:

- المعاهدة العراقية ـ الإنكليزية ـ التركية المنعقدة في انقرة ٥ في حزيران سنة ١٩٢٦، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٤١، ل ٢.

- سەیری پاشکۆی ژمارە ( ١٣ ) .

٤- المعاهده العراقيه- الإنكليزيه- التركيه ...ل ١" روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشول ١٠٨.

٥- المعاهده العراقيه- الانكليزيه- التركيه ...ل ص ٢-٨

- Mim.K.Oke, A Chrnology...,P,71.

به سەیرکردنی بەندەکانی پەیمانەکە، ئەوە بەجوانی دەردەکەوێت کە تورکەکان نەیانتوانی هیچ گۆڕانکارییە کی ئەوتۆ لە هێڵی بڕۆکسلدا بکەن، چونکە ئەوان هەوڵەکانیان بە ئاراستەی بەدیهێنانی ئاسایش و ئارامی تورکیا بەپلەی یەکەم برد، نەوەك زەوی، کە لەسەرەتا جەختیان لەسەر زەوی (ویلایەتی موسڵ) دەکردەوە بۆ ئەوەی ئەو ئاسایش و ئارامییەی کە خۆیان دەیانەویست بەدیبێت، بەڵام دوای ئەوەی بەریتانیا لەرێگەی پەیمانە نوێیەکەوە، ئاسایش و ئارامی بۆ دابینکردن، بەناچاری دەستبەرداری داواکردنی ویلایەتەکە بوون. بەریتانییەکان ئەوەندە خۆیان بە پێشکەشکردنی گەرەنتی بۆ تورکەکان ماندوو نەکرد، لەبارەی ئاسایش و سنوورەکەی، بەریتانییەکان ئامادە بوون "بە نەوت تورکیا بکڕن"[1]، ئەو دوو پرسە بەدرێژایی ماوەی دانووستاندنەکان مایەی دەمەقاڵ و گفتوگۆی نێوان جەمبرلن و لیندسی بوو، ئۆلسن پاڵپشتی لەو رایە دەکات کە دەڵێت، تورکیا توانای ئەوەی نییە رێگری لە شۆڕشەکانی کورد بکات، ئەمەش فاکتەرێك بوو، کە بەریتانیا بەهۆیەوە وەك ئامرازێك لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ سەپاندنی سیاسەتەکانی بەسەر تورکیا بەکاریهێنا، هەروەها لە پیادەکردنی سیاسەتە داگیرکارییەکەی لە تەواوی ناوچەکە بەکاریهێنا[2].

گفتوگۆکانی پارتی گەل لەسەر پەیمانەکە بۆ ماوەی ٥ کاتژمێر بەر لەوەی واژۆی بکات، بەڵگەی ئەوەبوو کە پەیمانکە جەماوەری نییە، ئەندامانی پارتەکە چەندین جار قسەیان بە روشدی بەگ بڕی، لەسەروبەندی مۆرکردنی پەیمانکە ئەندامێکیان لێدوانی بۆ رژنامەی (جمهوریەت)دا گوتی: "برینی موسڵ بۆماوەیەکی دوورو درێژ بە سارێژنەکراوی لە دڵی تورکەکان دەمێنێتەوە"، هەروەها گوتی: "دەمەقاڵێکە لە بازنەی ئەوەدا خولی دەخوارد کە ئایا کامەیان باشتر بوو جاڕدانی جەنگ یان جاڕنەدانی"[3]، لە ٦ی حوزێران سەرلەنوێ پەیمانەکە لەبەردەم پارتی گەلی تورکی گفتوگۆکرایەوە، ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورەی تورکی لە ٧ی حوزێران پەیمانەکەی بە زۆرینەی ١٤٣ دەنگ لە دژی ٢ دەنگ پەسند کرد[4]، ئەمەش بەڵگەی ئەوەبوو کە ئۆپۆزسیۆنەکەی تورکیا کارتۆنی بووە، چونکە تۆفیق روشدی بەگ بە ئاماژە و رازی بوونی ئەتاتورك پەیمانەکەی مۆرکرد.

1- R.Olson,Op.Cit.,P.149.

2- The Emergence …, PP.150-151

٣- فاضل حسين، مشكلة، ل ٢٨١.

4- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 528



رۆژنامەی تورکی ئەوەی بەدەرخست کە پەیمانەکە لەلایەن زۆرینەی وڵاتەوە پەسند نەبووە، زۆرینەی وتارەکان پەیمانەکەیان بە "تەنها چارەسەرێك کە هێزی رەوشەکە سەپاندوویەتی" وەسفکرد، رۆژنامەیەك گوتبووی: "ئەستەمە تورکەکان پێشوازی لە پەیمانەکە بکەن، بەپێچەوانەوە، هەموومانی هیوا بڕاو و غەمبارکرد...مادام تورکەکان لەو باوەڕەدان کە موسڵ تورکییە، ئەوا درێژە بەو باوەڕەیان دەدەن و وای دادەنێت بە شێوەیەکی کاتیی لە وڵاتەکەی دابڕاوە"[1].

سەرباری کاردانەوەی توڕەیی رای گشتی تورکی، بەڵام روشدی بەگ لە سەروبەندی مۆرکردنی پەیمانەکە لەبەردەم ئامادەبووان، لێدوانی دا و گوتی: "تورکیا لەپێناوی برایەتی لەگەڵ بەریتانیا و بەرقەراربوونی ئاشتی لە عێراق قوربانی داوە"[2].

تورکیا بۆ بەدیهێنانی ئاسایش و ئاشتی گەرەنتی تەواوی بەدەستهێنا، سەرباری ئەمەش دەستکەوتی دارای گرنگیشی بەدەستکەوت.

لە رۆژی ٧ی حوزێران جەمبرلنی وەزیری دەرەوەی بەریتانی بەخۆی پەیمانەکەی بەفەرمی پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆمەڵە کرد. بە هاتنی ١٨ی حوزێرانی ١٩٢٦ پەیمانەکە چووە بواری جێبەجێکردنەوە، دوای ئەوەی پەرلەمانی عێراقی لە ١٤ هەمان مانگدا پەسندیکرد، پەیمانە نوێیەکە کۆتایی بەو دەمەقاڵێیە هێنا کە لە ٣٠ی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ دەستی پێکرد، ئەو دەمەقاڵێیەی کە هەڕەشەی بۆ ئاشتی بۆ ماوەی زیاتر لە ٧ ساڵ دروستکرد[3].

لە راستیدا یەکلاییکردنەوەی کێشەکە بەو شێوەیەی کە باسکرا، بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ دیپلۆماسیەتی بەریتانی دادەنرا، هەتاکو هەندێ ناوەندی فراوانی رای گشتی بەریتانیش سەرسوڕمانی خۆیان لە جاڕدانی دەقی پەیمانەکە نەشاردەوە، نەوەك لەبەر ئەوەی بە یەکجاری کۆتایی بە کێشەی سنووری نێوان عێراق و تورکیا هێنا، بەڵکو لەبەرئەوەی لە پێشەکیەکەیەوە نووسراوە کە "پەیمانەکە بە گوێرەی پەیمانی لۆزانی ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ بەستراوە.....سەبارەت بە سنووری نێوان عێراق و تورکیا"، بەڵکو لە ماددەی ٥ دا بەڵێنی دا بوو کە هیچ هەوڵێك بۆ گۆڕینی ئەو سنوورە نادات[4].

١- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٢٨٢،

2- Mim.K.Oke.Op. Cit,P.75.

3- A.J.Toynbee,Op.Cit.,P. 528.

4- Ibid,P. 527.

رۆژنامەکانی بەریتانی بە گوێرەی ئاراستە سیاسییەکانیان گفتوگۆی پەیمانەکەیان کرد، لە کاتێکدا کە رۆژنامەی (دەیلی ئێکسپرێس) وای دانا کە "عێراقییەکان لەسەر حسابی بەریتانییەکان سوود مەندبوون"، رۆژنامەی (فۆرتنایتلی رفیۆ) هۆکاری رازی بوونی تورکەکانی بۆ "بی ٚ پارەیی و ترسی لە هەرەشەی ئیتالی" گەڕاندەوە، رۆژنامەی (ئیکۆنۆمیست) گوتی: "نیگەرانیەکی گەورە لەبەریتانیا دا هەبوو، نەوەك رەتکردنەوەی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵە ببێتە هۆی جەنگێکی ئاشکرا لەو ناوچەیە"[1].

هەروەها پەیمانەکە بەرژەوەندییە نەوتییەکانی لە ویلایەتەکە و رێگای گەیاندنی ئیمپراتۆری زامنکرد، لەپاڵ زامنکردنی بەربەستێك لەبەردەم فراوانخوازی کۆمۆنیستی، هەروەها لەلایەك رێگەی لەو هەوڵێنەش گرت کە بە ئامانجی نزیککردنەوە و هاوکاری لە نێوان تورکیا و سۆڤێت دەدران[2]، لەلایەکی دیکەشەوە کاریگەرییەکی باش لەسەر دەروونی عەرەبی عێراق دانا، بەڵکو ژمارەی نەیار بە بوونی هێزەکانی بەریتانی لە عێراقیشی کەمکردەوە.

لێدوانەکەی مەلیك فەیسەڵ، کاردانەوەی عێراقی بوو بەرامبەر پەیمانەکە کاتێ گوتی: "هیچ هۆکارێك نابینم رێگر بێت لە بەستنی هاوپەیمانی دوستایەتی لەگەڵ بەریتانیا بۆ تەنها ٢٥ ساڵ، بەڵکو بۆماوەیەکی درێژیش....بەمەرجێ رێز لە حورمەتی نەتەوەکەی بگرێت...."[3]، هەروەها عەبدولموحسین سەعدون(سەرۆك وەزیرانی عێراق) پەیمانەکەی بە: "بۆندێکی بە قازانج بۆ عێراقییەکان" وەسفکرد، لە ١٧ی حوزێرانی ١٩٢٦ بۆ ئەنجوومەنی وەزیرانی نووسیووە کە: "من بە گونجاوی دەبینم کە لێبوردنی گشتی بۆ هەندێ بەندکراو دەربکرێت، بۆ ئەوەی ببێتە باشترین یادەوەری بۆ ئەو پەیمانە مێژووییە". هەروەها ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی بڕیاری دا کە عێراق بری (٥,٧٧٢,١٤٢) لیرەی تورکی بەشێوەی قیستی ساڵانە بە ئەنجوومەنی قەرزی عوسمانی دەدات[4].

گومانی تێدا نییە کە عێراق بەم پەیمانە "بۆندیکی بە قازانجی" بەدەستهینا، خاکی خرایە سەر "کە هیچ کاتێك بە بەشێك لەعێراق نە وەسفکراوە نە بەدەرکەوتووە"[5]، بەڵام

١- فاضل حسين، مشكلة...، ل ل ٢٦٤-٢٧٠.

2- R.Olson,Op.Cit.,P.152

٣- هنري فوستر، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٣.

٤- لطفي جعفر فرج، عبدالمحسن السعدون، بغداد، ١٩٧٨، ل ل ٢١٤-٢١٦.

5- League of Nations,Questions …,PP.28-29“



ئەمە بە فەزڵی بەریتانیاوە بووە و لە سەر حسابی کورد بووە، ئەمەش وای لە جۆرج ئەنتۆنیۆس کرد کە بڵێت "..... بەختی عێراق لەوەدابووە کە بەرژەوەندییەکانی لەگەڵ بەرژەوەندییە تایبەتەکانی بەریتانیا رێکهاتەوە،..... خواستی بەریتانیا بۆ زاڵبوون بەسەر سەرچاوەکانی نەوت لە ویلایەتی موسڵ، بووە هۆی ئەوەی کە هەموو ویلایەتەکە بە وڵاتێکی عەرەبی نوێوە بلکێنێ، چاکەی ئەمەش بۆ دیپلۆماسیەتی بەریتانی دەگەڕێتەوە. سەرباری ئەوەش بووە هۆی هاوکاری بەهێزی ئەنگلۆ- عێراقی سەبارەت بە رووبەڕووبوونەوەی کێشەی کوردی...."[1].

- فاضل حسين، مشكلة ...، ل ٧٨.

1- George Antonius,The Arab Awakening ,New York,1965,PP.364-365

## کێشەی کورد لە هاوکێشەی بەریتانی- تورکیدا
## (تەمووزی١٩٢٣-کانوونی دووەمی١٩٢٥)

درێژبوونەوەی دانووستاندنەکانی کێشەی موسڵ کاریگەرییەکی خراپی لەسەر چارەنووسی کورد دانا، بانگەشە دژەکانی هەردوو لاکە لەبارەی ویلایەتەکە، وایکرد سیاسەتێکی چەسپاو لەبەرامبەریان نەبێت، جا چ لەلایەن بەریتانیاوە بێت یان تورکیاوە بێت، ئەمەش زیاتر چارەنووسی سیاسی کوردی نارۆشن کرد، بەکورتی سیاسەتی هەردوولا لە ماوەی دوای پەیمانی لۆزان کاریگەری لە پێشکەوتن و پەرەسەندنی دانووستاندنەکان لەبارەی موسڵ هەبوو.

سیاسەتەکانی بەریتانیا ـ تورکیا رەنگدانەوەی کۆمەڵێ رێوشوێن و کارڕایی بوون کە هەردوو لاکە بۆ زامنکردنی مانەوەی کورد لەپاڵیان، گرتیانەبەر، لەرێگەی لێدوان و بەڵێنی ئیدارەی خۆبەڕێوەبردنیان پێدان، هەروەها هاندانی رۆشنبیری و زمانی کوردی، ئەگەر ئەو سیاسەتە ئامانجی هەردوو لاکەی بەدینەهێنابا، ئەوا پەنایان بۆ رێگاچارەی سەربازی دەبرد. کاتێ نزیکبوونەوەی گەیشتنی لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی، پێشبینییەکان لەبارەی داهاتووی ویلایەتە کێشەدارەکە زیاتر بەلای ئەوە دەچوو، کە ویلایەتەکە دەکەوێتە دەستی کوردانەوە[1].

سەبارەت بە بەریتانیا، کە بەرژەوەندییە ئیمپریالیەکانی بەسەریدا سەپاند کە کوردستانی باشوور بە عێراقەوە بلکێنێ، بۆ ئەوەی بەردەوامی بە دەوڵەتی تازە دروستبووی عێراق بدات، بەریتانیا توانی دوای زنجیرەیەك کردەوەی سەربازی کە سەرکوتکردنی بزووتنەوەکانی ئۆزدەمیر و دەستتێوەردانەکانی ئەم دواییەی تورکیای گرتەوە[2]، سەرباری رووبەڕووبوونەوەی خواستەکانی شێخ مەحموود، شارەزایانی سەربازی بەریتانی روپێوێکی ویلایەتەکەیان کرد و وردترین نەخشەیان دانا کە تائێستاش بەوردترین دادەنرێت[3].

---

1- League of Nations, Questions…, P. 45.

٢- سەیری پاشکۆی ژمارەی (٩) بکە.

٣- جرجیس فتح الله، النفط قرر…، ل ٣٨.



لەپاڵ ئەمەش سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر کوردی باشووری کوردستان ـ ویلایەتی موسڵ ـ بریتیبوو لە چالاککردن و نوێکردنەوەی سیاسەتە کۆنەکانی کە خۆی لە دیپلۆماسیەتی بەڵێن و لێدواندان دەنواند، بەڵام لە کۆتاییدا جێبەجێیانی نەدەکرد، هەروەها خواستەکانی کوردی بە نەرمی نواندن و تێگەیشتن لێی، بۆ خۆی دەقۆزتەوە، ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی لە ١١ی تەمووزی ١٩٢٣ ـ کە هەمان رۆژە شێخ مەحموود بۆ سلێمانی گەڕایەوە ـ بڕیاری دا کە حکومەتی عێراقی نیازی نییە، خەڵکی عەرەب لە شارۆچکەکانی کوردی دابمەزرێنێ، هەروەها نیازی نییە کوردان بۆ بەکارهێنا نی زمانی عەرەبی بە فەرمی ناچار بکات[1].

لەمیانەی گفتوگۆکانی قوستەنتینییە، کاتێ گفتوگۆکان لەبارەی داهاتووی ویلایەتی موسڵ بە بن بەست گەیشتبوو، بەریتانیا لە ویلایەتە جیناکۆکەکە هان و سەرپەرشتی نەتەوەیی کوردی دەکرد، بەئامانجی بەهێزکردنی بیری نەتەوەیی بە رووی بیری یەکێتی ئیسلامی، کە حکومەتی تورکی لەسەرەتای بیستەکانەوە لەنێو کورددا بانگەشەی بۆ دەکرد[2].

لە رێگەی هاندانی زمان و ئەدەب و رۆژنامەی کوردییەوە هانی رۆشنبیری کوردی درا، ئەو گرنگیدانە بە دەرچوواندنی رۆژنامەی (ژیانەوە) گەیشتە لوتکە، کە یەکەم ژمارەی لە ئابی ١٩٢٤ دەرچوو، تاساڵی ١٩٢٦ بەردەوام بوو[3].

ئەو رۆژنامەیە لەپاڵ بڵاوکردنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکان، وتاری زۆری بڵاودەکردەوە کە دەچوونە خانەی ئە بانگەشانەی کە رۆژنامەکانی ئینتیدابی بەریتانی لە عێراق بڵاویان دەکردەوە، کە تاوان و رێوشوێنەکانی تورکەکان دژ بە خواستەکانی کوردی بەیاد دەهێنانەوە[4].

---

1- Colonial Office, Special Report …1920-1931, P. 258.

٢- عثمان علي، العامل …، ل ٩.

٣- رۆژنامەی ژیانەوە: رۆژنامەیەك بوو دەسەڵاتدارانی حکومی لە سلێمانی بە زمانی کوردی لە ئابی ١٩٢٤ دەریان دەکرد، گرنگی بە بڵاوکردنەوەی بابەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی دەدا، کە بەکوردەوە پەیوەست بوون، دوایین ژمارەی لە ١٤ کانوونی دووەمی ١٩٢٦ دەرچوو. سەیری:
- عەبدوللا زەنگەنە، ژیانەوە وشوێنی …، ل ٢٨ .
- جبار جباری، تاریخ الصحافه الکوردییه فی العراق، بغداد، ١٩٧٥ل ٣٥.

٤- رۆژنامەکانی داگیرکەری بەریتانی بەتایبەتی ئەوانەی لە موسڵ دەردەچوون، جەختیان لەسەر زۆرداری و خراپەکاری تورك دژ بە کوردستان بەگشتی و کوردستانی باکوور بەتایبەتی دەکرد، بۆ نموونە سەیری رۆژنامەی موسڵ ژمارە ٩٠١ و ٩٠٢ ی تشرینی دووەمی ١٩٢٤ بکەن. وەرگیراوە لە:

سیاسەتمەدارانی بەریتانی توانیان کورد بە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی ڕازیبکەن، کە بۆیەکەمجار لە عێراق ئەنجامدەدرا، هەروەها دەستیان بە ناونووسین کرد بۆ سوپای عێراقیش، ئەفسەری بە ڕەگەز کورد لە سوپای عێراقی پەیدا بوو، زۆر پۆست و پایەی مەدەنیان پێدرا[1]، هەنگاوەکانی تێکەڵاوکردنی ناوچەکانیان(ویلایەتی موسڵ) لە پێشان خێراتر دەچووە پێش[2].

سیاسەتە قۆناغییەکانی بەریتانیا بەری خۆیدا، ئەو سیاسەتەی کە بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی لە ناوچە جیناکۆکەکان بە بەردەوام لە پێشەوە دادەنا.

تورکەکان هەستیان بە گرنگی فاکتەری کوردی لە کێشمەکێشیان لەگەڵ بەریتانییەکان کرد، دوای سەرکەوتنی کەمالییەکان لە جەنگی ڕزگاریخوازی، کە بە پەیمانی لۆزان تاجی لەسەر نرا، دروشمی "جیهاد کردن لە دژی بەریتانییە داگیرکەرەکان"ی وەك پێویستی ئەو سەردەمە بەزۆری بەرزدەکرایەوە، ئەو بانگەشەیەی کە کورد بە قەد تورك ئەگەر زۆرتریش نەبێت، بەدەنگییەوە چوو[3]. داخوازییەکانی قۆناغە نوێیەکە شێوازی نوێ بوو، کە مستەفا

- عبد الفتاح علي يحيى، وثائق عن الحركة القومية الكوردیية التحررية ملاحظات تاريخية ودراسات أولية، أربيل، ٢٠٠١، ل ل٥٩٩-٦٠٠.

١- دەستیەك لە کەسایەتی و ئەفسەرانی کورد کاری سەربازی و مەدەنی باڵایان وەرگرت، جەعفەر عەسکەر لە کەرکوك کە پۆستی یەکەم وەزیری بەرگری عێراقی لە ١٩٢١ وەرگرت، هەروەها محمد ئەمین زەکی کە پۆستی وەزیری گەیاندن و پەروەردەی وەرگرت.....سەرباری وەرگرتنی پۆستی بچوك بەڵام گرنگ وەك وەرگرتنی قائیمقامی شار و شارۆچکەکانی کوردی و عێراقی بۆ نموونە، عەلی کەمال، یان نوێنەر لە پەرلەمانی عێراقی وەك مەعروف جیاووك.. سەیری:

- مير بصري، اعلام الكرد، لندن — قبرص، ١٩٩١، ل ٢٠٠و ص١٧٤- ١٨٠

- علي كمال، مذكرات علي كمال عبد الرحمن، تقديم وتحقيق جمال بابان، بغداد، ٢٠٠١.

2- Colonial Office, Iraq Report on Iraq Administration, His Majesty's Government, April 1923- December 1924, London, 1925, P. 33; Colonial Office, Special Report ...1920-1931, P. 258.

٣- سلێمان نەزیف پاشا ـ یەکێك لە سەرانی جەنگی ڕزگاری ـ ئەو ڕۆڵەی لە گوتاریکی کە لە ڕۆژی پرسەی سەربازی ون دەربڕی کە گوتی: " زۆربەی گومانەکان بۆ ئەوەدەچن کە ئەو سەربازە ونە، کورد بیت". سەیری:



کەمال لە دۆزینەوە و هونەری نواندن تێیدا درێخی نەکرد، لەبەکارهێنانی کورد دژ بە لایەنی بەرامبەر، یان بەلای کەمەوە هێنانە پاڵ خۆی یان بێ لایەن کردنی تاکو ئەوکاتەی کێشەی موسڵ دەباتەوە[1].

کۆمەڵێ فاکتەر هەبوون، وایان دەکرد تورکەکان زیاتر لە بەریتانییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ دەست بە ویلایەتی موسڵەوە بگرین، دوای کۆتایی کۆنگرەی لۆزان کە دەمەقاڵێیەکی زۆری لەبارەی کێشەی موسڵەوە لەنێوان تورکەکان و بەریتانییەکان بەخۆیەوە، بینی، تورك هەڵوێستێکی زیاتر توندیان بەرامبەر بەریتانییەکان نواند، بەتایبەتی دوای ئەوەی بیری نەتەوەییەکان بۆ وەرگرتنی ویلایەتەکە دەخستە ڕوو، واتە بوونی زۆرینەی کوردی ـ تورکی ویلایەتەکە، دواتر پرسەکەیان وەك پرسێکی نەتەوەیی ئەمنی واپێشاندا کە بە ئاسایشی نەتەوەیی تورکییەوە پەیوەستە، گرنگترین پاڵنەری دواوەی ئەو نیگەرانیەشیان ترسیان بوو لە نەتەوەی کوردی، ڕۆژنامەی مانچیستەر گاردیانی بەریتانی کە بەدواداچوونی پەرەسەندنەکانی تەگژەیەکەی کرد و بەمجۆە ئەو ترسەی دەربڕی و گوتی: "تورکەکان یەك پاڵنەری بەهێزیان بۆ داواکردنی موسڵ هەیە. ئەوان لەوە دەترسن لە سایەی ئیدارە و سەرپەشتی ئیمە (بەریتانیا)، ویلایەتەکە ببێتە پەناگەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی، کە دووەم گەورە نەتەوەی ناو تورکیا"[2]. ئەندامێکی ئەنجوومەنی عمومی بەریتانی گوتی: "ئەوەی جێگەی نیگەرانیە لە تەواوی کێشەکەدا، خۆی لە کێشانی سنوور ناشارێتەوە و پەیوەندی بە پرسی کەمە نەتەوەییەکانیشەوە نییە، بەڵکو کێشەکە خۆی لە پرسی گەورەی کوردی Kurdish Problem Great شاردۆتەوە[3]. بەرپرسانی تورکی ڕونتر ئەمەیان دەردەبڕی، عیسمەت پاشا لەمیانەی گفتوگۆکانی لۆزان بەروخستنێکی کریزنی لەبارەی پیدانی بەشێك لە نەوتی موسڵی ڕەتکردەوە، گوتی کێشەی

- معروف جياووك، القضية الكوردیية، بغداد، ١٩٢٥، ل ٧٩" فريق من شباب الكورد، العرب والأكراد، بغداد، ١٩٣٧، ل ١١.

١- منتشاشفيلي، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٣١.

2- Manchester Guardian, 11June1924 .

- نقلاً عن: عثمان علي، العامل...، ل ٩.

٣- كمال مظهر احمد، كركوك وتوابعها حكم التاريخ والضمير دراسة وثائقية عن القضية الكوردیية في العراق، كوردستان، ٢٠٠٤، ج١، ل ١٨٩.

موسڵ بۆ تورکیا کێشەیەکی نەتەوەییە[1]. بەرپرسانی دیکەی تورکی زیاتر روونتر و سووورتربوون لە داواکردنی موسڵ، لەوانە جێگری سەرۆك وەزیرانی تورکی کە گوتاری بۆ ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی دا و گوتی: "فاکتەری کوردی و بوونی کورد لە ویلایەتەکە خاڵێکی گرنگی پرسی موسڵە"[2]. ئەندامێکی ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی چارەنووسی تورکیا بە چارەنووسی ویلایەتەکە گرێدا کاتێ گوتی: "پرسی موسڵ، پرسی ویلایەتی رۆژهەڵاتە- مەبەستی ویلایەتەکانی کوردییە کە رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی تورکیادان- پرسی ویلایەتی رۆژهەڵاتیش پرسی تورکیایە، ئەگەر ویلایەتی رۆژهەڵات بکەوێتە مەترسییەوە، تورکیاش دەکەویتە مەترسییەوە"[3]. ئەندامێکی پەرلەمان لە ئەرزەرۆم هەمان ئاراستەی دووپاتکردەوە کاتێ گوتی: "لە پەیمانی سیڤەر بەریتانییەکان بەڵێنی زۆریان بە کورد لەبارەی دەوڵەتی کوردی دابوو،بەڵام سەرکەوتوو نەبوو..... ئەوان دووبارە دەیانەویت قەوارەیەکی کوردی لە ویلایەتی موسڵ پێکبێنن بۆ ئەوەی یەکێتی نیشتیمانییمان تێکبشکێنن....دەتوانین موسڵیان بۆ جێبهێڵین بەڵام نەوەك کورد...."[4].

لێدوانەکانی بەڕێز Sirri نوێنەری ویلایەتی ئەزمیر زیاتر روون بوو، مەترسییەکانی تورکیا دەربڕی کاتێ گوتی: "بەریتانییەکان تەنها لەبەر فاکتەری ئابووری گرنگی بەو خاکە نادەن ـ ویلایەتی موسڵ ـ بەڵکو دەیانەویت تۆی ناکۆکی لەجەرگەی خاکی ئیسلام بچێنن. دوای ئەوەی حکوومەتی کوردی لە ویلایەتی موسڵ دادەمەزرێنن، هانی کوردی ئێران دەدەن بێنە پاڵ ئەو حکوومەتە، بەڵام بەر لەوان هانی کوردی تورکیا دەدەن بچنە پالیان، ئەوکات ئەو قوربانیە گەورەیەی کە لە سیڤەرەوە تا ئێستا داومانە هەمموو بە فیڕۆ دەروات"[5].

ئامانجەکانی حکوومەتی تورکی بۆ دەستگرتنی بە ویلایەتی موسڵ زۆر لەوە گەورەتر بوو بۆ مەبەستی ئابووری و بەدەستهێنانی نەوت یان فراوانکردنی رووبەری جوگرافی تورکیا بێت، بەڵکو پرسی گرنگ "پرسی ئاسایش و هەڕشەی یەکێتی بوونی تورکیایە" ئەمەش ئەوە راقە

١- عثمان علي، العامل...، ل ١٠.

٢- المصدر نفسه، ل ١٠.

3- Ismael Güldas, A.G.E, S. 130.

٤- عثمان علي، العامل...، ل ١٠.

٥- المصدر نفسه، ل ١٠.



دەکات کە بۆچی تورکەکان هەموو کارتێکیان دەبەخشی تەنها بۆ وەرگرتنی ویلایەتەکە، بە کارتی نەوت و ئیمتیازەکانیشەوە، بۆ دەمچەورکردن و ترساندنی بەریتانییەکان یان بەلای کەمەوە دروستکردنی دووبەرەکیێ لەنێوان بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی، بۆ ئەوەی ناچاری بکات دەستبەرداری موسڵ بێت[1].

ئەگەر قۆناغی ١٩١٩ تا ١٩٢٢، قۆناغی بانگەوازی تورکەکان بووبێ بۆ یەکێتی تورك و کورد و جیهاد لەپێناوی خەلیفە، کە لە میساقی نیشتیمانی بە روونی باسی لە زۆرینەی موسڵمانانی عوسمانی کردبوو کە لە تورك و کورد پێکهاتووە[2]. ئەوا قۆناغی دانووستاندنەکانی لۆزان، قۆناغی بەڵێندان بە کورد بۆ بەخشینی ئۆتۆنۆمی و مافی زیاتری سەپاند، ئەوا قۆناغی نوێ وای دەخواست ئەو سیاسەتە بەهێزبکرێت، چونکە هەڵوێستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ورد و ئەو قۆناغەی کە کێشەی موسڵ پێی گەیشتبوو هەستیار بوو، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەمە کۆسپ یان کار لە پلانەکانی مستەفا کەمال لە دامەزراندنی دەوڵەتیکی تاکلایەنەی نەتەوەیی عەلمانی بکات. بۆیە سەیر نییە کە مستەفا کەمال خۆی بابەتی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی باکوور لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی کە لە شاری ئەزمیت لە شەوی ١٧/١٦ی کانونی دووەمی ١٩٢٣ سازیکرد، بڕیار بدات[3].

مستەفا کەمال وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئەحمەد ئەمینی سەرنووسەری رۆژنامەی (وەقت- Vakt) کردی، دایەوە، کاتێ پرسیاری لە رای مستەفا کەمال لەبارەی کێشەی کوردەوە کرد[4]،

١- ئەمە لە میانەی دانوستاندنەکانی لۆزان بەروونی بەدەرکەوت، کاتێ عیسمەت پاشا بەبێ ئاگاداری کریزن کارمەندانی تورکی بۆ لای کۆمپانیا بازگانییەکانی بەریتانیا نارد، هەروەها ئیمتیازی جستەر، کە پەرلەمانی تورکی وروژاندنی و بە کۆمپانیای جستەری ئەمریکی بەخشی.

٢- دانکورت أ.روستو، سەرچاوەی پێشو، ل ٤١٣.

٣- لەساڵی ١٩٨٧ موسا عەنتەری رۆشنبیری کورد، بەڵگەنامەیەکی مێژووی دۆزییەوە کە جەخت لەوە دەکات مستەفا کەمال خۆی دانی بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی باکوور ناوە، ئەم دۆزینەوەیە کاردانەوەی جیاواز و گەورەی لە نیوەندە حکومی و رۆشنبیریەکان لە تورکیا لێکەوتەوە. سەیری:

- إبراهیم الداقوقي، سەرچاوەی پێشو، ل٣٠٨-٣١١

٤- ئەمە بە ئامادەبوونی سەرنووسەرانی رۆژنامەکانی ئەوسا بوو، کە ئەدیب و نووسەری دیارن، وەك عەدنان ئەدوار و خالد ئەدیب و سوبحی نوری و فالح رفقی و یەعقوب قەدری و ئەوانی دیکە....سەیری: -

"رەگەزی کوردی کە لە چوارچێوەی سنووری نیشتیمانمان دەژین، لە هەندێ ناوچە بە چڕی نیشتەجێبوونە، لە هەندێ ناوچەی دیکە لەگەڵ تورك تێکەڵاوبوونە، ......بۆیە ئەگەر بمانەویت هێڵێك بکێشین یان سنووری جیاکەرەوەی نێوان کورد و تورك بکیشین، بەمە ئیمە کورد و تورك لە بووندا رەشدەکەینەوە.... بۆیە ناکریت بوونی کورد لە دەرەوەی تورك وێنا بکەین، لەبری ئەوەی بیری نەتەوەیی کورد جیبەجی بکەین، پێویستە حکوومەتی لۆکاڵی و ئیدارەی خۆجێیەتی لەو ناوچانەی کە کورد زۆرینەی پێکدینن، دابمەزرێنین[1].

وەك زانراوە دوای ئەوەی پەیمانی لۆزان سنوور و سەروەری تورکیا دابینکرد، مستەفا کەمال دەستی بە پیادەکردنی سیاسەتی بە رۆژئاواییکردن کرد، وەك بنەمایەك بۆ بونیادنانی تورکیای نوێ، هەر وەك پێشتر باسکرا، مستەفا کەمال بە بیروڕا فیکری و کۆمەڵایەتی زیا کۆك ئەلب کاریگەر بوو، وەك ئامرازێکی جیبەجیکردنی پرۆژە چاکسازییەکەی بەکاریهێنا، بە تێڕوانینەوە سەیری بونیادی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردستان دەکرد، هەروەها زمانی کوردی کەلە زمانی تورکی جیاوازە، ئەم دوو فاکتەرە کۆسپ لەبەردەم بیناکردنی تورکیای نوێ و یەککگرتوو وەك گەلێك دروستدەکات[2]. بۆیە لە هاوینی ١٩٢٣ەوە حکوومەتی تورکی لەو هەموو بەڵێنە ئاشکرایانەی کە دابووی پاشگەزبووەوە، لەوەی کە کورد وەك هاوبەشی تورك لە وڵاتدا قبول بکات، دەستی بە سیاسەتی تێکەڵاوکردن بە پلەی گەورەو بەهێز کرد. لە ساڵی ١٩٢٣ یاسای

- المصدر نفسه، ل ٣٠٩.

١- دیڤید ماکدوال سەرچاوەی پێشوو، ل ل٤٠٠-٤٠١ .

ئەو لێدوانە دەرەنجامی فشاری نوێنەرانی کوردی ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی بوو، کە پێشتر ٣ دانیشتنی رۆژەکانی ٩ و ١٠ و ١١ ی شوباتی ١٩٢٢ ی بە ئامادەبوونی مستەفا کەمال بۆ لیکۆڵینەوەی یاسای ئیدارەی خۆجێیەتی بۆ کورد تەرخانکردبوو، پرۆژەکە بە زۆرینەی ٣٧٣ دەنگ و دژایەتی ٦٤ دەنگ پەسندکرا، ئەو ٦٤ دەنگەش نوێنەرانی کورد بوون، لەبەرئەوەی پرۆژە یاساکەسان بە ناتەواو بینی دەنگیان بۆنەدا، سەیری:

- محمد نور الدین، سەرچاوەی پێشو، ل ١٠١.

٢- دیڤید ماکدوال، سەرچاوەی پێشوویل٤٦٧

- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی تیروانینەکانی ئەلب لە بارەی کورد.سەیری:

R. R.Olson, OP.Cit.,PP. 43-44.



ژمارەی ١٥٠٥ دەرکرد، کە زەوی سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان و شێخانی زانایانی ئایینی دەستبەسەراگرت، یاساکە پەردەی بە تورککردنی ناوچەکە بوو، چونکە حکوومەت زەویە دەستبەسەراگیراوەکانی بە کۆچبەرە تورکەکان کە لە یۆنان و چەند بەشێکی ئەوروپای عوسمانی دەرکرابوون، بەخشی[1].

لە ئاداری ١٩٢٤ مەرسومێك دەرچوو، تەنها زمانی تورکی لە مامەڵەی فەرمی و قوتابخانەکان سەپاند[2]. لەمیانەی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی کە لە هاوینی ١٩٢٣ بەڕێوەچوو، بوار بە کورد نەدرا نوێنەری خۆیان هەلبژێرن، مستەفا کەمال بەخۆی بە گوێرەی لایەنگیری بۆ خۆی هەڵبژاردن، هەڵبژاردنەکان هیچ متمانەیەکی لە ناوچە کوردییەکان نەبوو[3]. بەمەش خشتی یەکەمی بە تورککردنی لە کوردستان دانا، بەرەبەرە کارمەندانی تورك یان کوردی ئەلقە لەگۆێی حکوومەتی لە ناوچە کوردییەکان دادەمەزراند، ئەمەش لە سیاسەتێك کە ئامانجیەتی کورد لە بۆتەی نەتەوەی تورك بتوێنێتەوە. ماکدواڵ دەڵێت: "پیشە و کارەکانی کوردستان بەدەست تورکەوە بوون، ئەو کوردانەی کە لە پۆستی قائیمقام مانەوە، بەهۆی ئەوەی مەیلی نەتەوەیی کوردیان نەبوو، بۆیە لانەبران[4]. بەرە بەرە ناوی کوردستان لە هەموو نووسراوە فەرمییەکان و ئەتڵەس جوگرافییەکان رەشکرایەوە، لە بری ناوی کوردی،ناوی تورکی لەو شوێنانە نران[5]، ئەم ڕێوشوێنانە ئەو کوردانەشی گرتەوە کە لە سوپای تورکی لە خزمەت دابوون، حورمەتیان نە دەگیراو ریسوا دەکران[6].

1- M.M. Van Brunssen, Agha, Shaikh and State, Utrecht, 1978, PP.378-380; R.Olson, OP.Cit.,P. 45.

٢- جرجیس فتح الله، یقظة ...، ل ٢٩٢

- ئیحسان نوری پاشا، شۆڕشی نەتەوەی کورد لە تورکیا، وەرگیران: م.جەمیل روژ بیانی، بە غدا، ١٩٩٣، ل ل١٢-١٤ "دیفید ماکدوال، سەرچاوەی پێشووی، ل٤٠٢.

٣- ئیحسان نوری باشا، سەرچاوەی پێشووی، ل ل ٢١-٢٢.

٤- دیفید ماکدوال، سەرچاوەی پێشووی، ل ل٤٠٢-٤٠٣.

5- Erik. J. Zuches, OP.Cit.,P. 178; R.Olson, OP.Cit.,P. 44.

٦- دیفید ماکدوال، سەرچاوەی پێشووی، ل٤٠٣.

سەرجەم ئەو ڕێوشوێنانەی ئەو دوایەی تورکیا، نەتەوەخوازانی کورد و سەرکردەکانی گەیاندە ئەو باوەڕەی کە ئەگەر کارێك نەکەن، ئەوا مستەفا کەمال لە سیاسەتی تواندنەوە و سەرکوت لە کوردستان بەردەوام دەبێت، لەژێر فشاری ئەو نەتەوە خوازە کوردانەدا، لە یەکی ئابی ١٩٢٤ لەشاری دیاربەکر کۆنگرەی (تورکی- کوردی) بەسترا، کۆنگرەکە گرنگییەکی زۆری پێدرا، بەڵام چالاکییەکانی بە نهێنی مایەوە و هیچ بڵاوکراوەیەکی فەرمی تورکی ئاماژەی بۆ نەکرد[1].

وەڵامی حکوومەتی تورکی بۆ فشاری کوردی، بەمانای ئەوە نەدەهات کە لەگفتوگۆی داخوازییەکانی کورد جیدیە، بەڵکو لە وەڵامی ئەو جووڵانەوەیە هات کە بەریتانیا لە باشووری ناوچە کوردییەکانی سەربە تورکیا ئەنجامی دەدا- هەروەها بۆ زامنکردنی فاکتەری کوردی لە دانووستاندنەکانی لەگەڵ بەریتانییەکان لە بارەی کێشەی موسڵ. کۆنگرەکە بە بەشداری شاندە کوردییەکان کە لە پیاوە دیارەکان و سەرکردە کلاسیکیەکان پێکهاتبوو و نوێنەرانی لایەنی تورکی کرایەوە[2].

یەکەم و گرنگترین داخوازی کە نوێنەرانی کورد پێشکەشی کرد و سوربوو لەسەری ئەوەبوو کە ئیدارەیەکی تایبەت و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان وەك زامنکەری مافەکانی گەلی کورد دابمەزریت[3]. سەرباری داخوازی دیکە، کە قەرزدان بە جوتیارانی کورد و دەستبەجێ ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکان و وەستاندنی سەربازگیری بەخورتی و گەڕاندنەوەی دادگا شەرعیەکان بوو[4]. کورد لە بەرامبەر دابینکردنی داواکارییەکانیان بەڵێنییاندا هەر بزووتنەوەیەك یا شۆڕشێکی دژ بە تورکەکان لە ویلایەتی موسڵ یان هەر ناوچەیەکی دیکە بەرپا بێت، ئەوان دایدەمرکێننەوە، ئەوان هەڵمەتێك لە ناوچەی جێناکۆکەکان بۆ پاڵپشتی تورکیا سازدەکەن[5].

پێدەچوو بۆندەکەی کورد بۆ تورکەکان جێی چاوبڕین بێت، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، بەڵام بەتەواویش ڕەتیان نەکردەوە، درێژەیان بە وەڵامدانەوەکە دا، چونکە کێشەی موسڵ لە ئارادا

---

1- Henderson to Macdonald , Constantinople , 16-9-1924 , IBTK , No.685, P. 13.

2- R.Olson, OP.Cit., P. 45.

3- Henderson to MacDonald, Constantinople, 16-9-1924, IBTK. No. 685, P. 13.

4- Ibid,P. 13; A.L. Macfe, Atatürk, London, New York, 1994, P. 164.

5- Henderson to MacDonald, Constantinople, 16-9-1924, IBTK, No. 685, P. 12.



بوو، چاوەڕێ چارەسەر بوو، بۆیە تەنها دروشمەکانی پێشوویان لەبارەی برایەتی کورد و تورك دووبارە دەکردەوە، چەند ڕێوشوێنیکی شێوەییان بە مەبەستی بانگەشە و ئارامکردنەوەی کورد گرتەبەر، کە لێبووردنی گشتی بۆ کورد ڕاگەیەنرا و کار بە چەند بڕیارێکی تایبەتی دادگا شەرعیەکان دواخرا[1].

ئەم ڕێوشوێنە شێوەییانە وایکرد، هەندێ کورد لایەنگری بن یان بەلای کەمەوە بۆ حکوومەتی تورکی شەڕانگێز نەبن[2]، بەڵام نەوەك هەمویان، وەڵامی کوردان قۆچگیری[3] خێرا هات، کاتێ ڕاپەڕینێکی نوێیان لەدژی دەسەڵاتدارانی تورکی لە سیواس ڕاگەیاند، کە تورکیای ناچارکرد هێز بۆ سەرکوتکردنی بنێرێتە سیواس، کە ئەفسەری سوپای گشتی کە پێشەوایەتی ڕاپەڕینەکەی دەکرد لە سیواس دەستگیرکرد، ئەو ڕاپەڕینە بووە مایەی خۆشحاڵی بەریتانییەکان، کە چاودێری هەڵسوکەوتی تورکەکانیان بە هۆشیاریەوە دەکرد[4]. ڕاپەڕینی قوچگیری لە سیواس ئاماژەیەکی کرنگ بوو بۆ سەرنەکەوتنی کۆنگرەی دیاربەکری کوردی- تورکی و سەرەتایەکی نوێی پەیوەندی نێوان کورد و تورك بوو، سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینی دیاربەکر و ئەو ڕووداوانەی دوایی، سەکردە کوردەکانی گەیاندە ئەو باوەڕەی کە ڕێگای خەباتی ئاشتی لەگەڵ تورکەکان سوود ی نابێت، پێویستە ڕێگای سەربازی بگیرێتەبەر. بۆیە ڕێکخستنی ئازادی کورد[5] دەستی بە ئامادەباشی بۆ ڕاپەڕینێکی

---

1- Henderson to MacDonald, Constantinople, 16-9-1924, IBTK, No. 685, PP. 13-14.

2- Al. Macfe, OP.Cit., P. 164.

٣- قۆچگیری: ناحیەیەکی سەنجەقی سیواسە، کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەلاتی شارەکەوە، سەنتەری زازایە، ژمارەیان ئەوساکە نزیکەی ٥٧٩٥٣ کەس دەبوون، زۆربەی کوردی موسڵمان بوون، هەروەها ڕیژەیەك لە مەسیحی و ئەرمەن و تورکی تێدا نیشتەجێ بوو، سەیری:

- فەیسەل دەباغ، کوردستان لە چاپکراوە عوسمانلییەکاندا، کوردستان، ٢٠٠٤، ل ل ١١-١١٨.

4- Henderson to MacDonald, Constantinople, 16-9-1924, IBTK, No.685, PP. 13-14.

٥- ڕێکخستنی ئازادی: یان (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد ـ کورد استقلال جمعیتی) ڕێکخراوێکی سیاسی نهێنی کوردی بوو، لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٢ لە ئەرزەرووم بەسەرۆکایەتی عەقید خالد بەگ جوبرانلی و یوسف زیا بەگ (نوێنەری بەتلیس) دامەزراوە، ریکخراوەکە لقی لە بەتلیس و خەربوت و دیاربەکر و ئورفا و سیرت....هەبوو، کۆمەڵەکە سەرجەم چین و توێژەی کۆمەڵگەی کوردی لە خۆگرتبوو، هەروەها زۆربەی

چەكداری كرد، چەندین كۆبوونەوەی نهێنی بۆئەم مەبەستە بەستا. لەهەمان چوارچێوەدا زیا یوسف بەگی بەدلیسی لە هاوینی ١٩٢٤ گەشتێكی بۆ ئەستەمبۆڵ و ئەنقەرە دەسپێكردو لەمیانەی دا چەند سەكردەی سیاسی و سەرۆكی پارتی تەرەقی كۆماری بینی[1]، كە دیاریترینیان فەتحی ئۆكیار و رەئوف ئۆباری و ئەوانی دیكە بوون، ئەوانە بەڵێنیاندا كە یارمەتی و پاڵپشتی هەر شۆڕشێكی كوردی دەكەن[2]. دوای تەواوبوونی ئەو ئەركە، ئامادەباشیەكانی دیكە دەرویشت بەڕێوە.

یوسف زیا بێك[3] نامەیەكی بۆ رەزا بێك كە ئەفسەر بوو لە بەیتی شەباب، نارد[4]. كە حاڵەتی سیاسی و دەرەنجامی چالاكییەكانی تێدا روونكرابووەوە[5].

---

كەسایەتیە دیارەكانی كوردی بۆخۆی كێشكردبوو، وەك ژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا و مەلا سەعیدی كوردی (سەعید نەورەسی) و شێخ عەبدولقادر ئەفەندی و شێخ شەریف بالۆ....، شایانی باسە راپەڕینی ١٩٢٥ كە شێخ سەعیدی پیران سەركردایەتی دەكرد، بەهۆی پلان و هەماهەنگی ئەو كۆمەڵەیە بووە. سەیری:

- M.Emin ASLAN,Siyaseta Netewi u Helsengandina Tevgera Netewi ya Kurd, Wasanen War, Istanbul,2002,L.168“

-خليل علي مراد، القضية...، ل ٢٢.

١- حزب تەرقی جمهوری: لە ١٧ ی تشرینی یەكەمی ١٩٢٤ دامەزراوە، بەڵام رەگوڕیشەكەی بۆ ساڵی ١٩٢١ دەگەڕێتەوە، كاتێ چەند هاورییەكی مستەفا كەمال هێڵێكی سیاسی دژ بە سیاسەتی مستەفا كەمالیان گرتەبەر، كە لەوكاتەوە لە دكتاتۆریانە بڕیاری دەدا. دیاریترین سەركردەكان بریتی بوون لە: رەئوف بەگ و كازم قەرە بەكر پاشا و رەفعەت پاشا ....سەیری:

- قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات واتجاهات...، ل ل ١٦٣-١٧٤.

2- H.Hisyar, Ditin u birhatinen min 1907-1985, Libnan,2000,L.255

٣- ئەوانەش لە دیاریترین سەركردەكانی بزووتنەوەی كوردی باكووری كوردستانن، پێشتر ئەندامی كۆمەڵەی سەربەخۆیی كوردستان بوون، سەیری:

- زنار سلوبي، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٦ وما بعدها.

٤- بەیت شەبان شارۆچكەیەكێ كوردییە دەكەویتە باشووری رۆژهەڵاتی توركیاوە، بە (ئەلكی)ش ناودەبرێت. سەیری پاشكۆی ژمارە (٩) بكەن.

5- M.M. Van Brunssen,OP.Cit., P. 382.



پێدەچێت كە رەزا بێك لە مەبەستی ئەو نامەیە نەگەیشتبێ، كاتێ هانی ئەفسەرانی كوردی ئەو كەتیبەیەی كە لە بەیتی شەباب بوون درا بۆ ئەوەی جووڵانەوەیەك بكەن[1]، بۆیە ئیحسان نوری پاشا[2] و هاوڕێیانی كە لە كەتیبەی بەیتی شەباب بوون، بزووتنەوەكەیان

---

١- سەبارەت بەو راپەڕینە سەیری:

- ئیحسان نوری باشا، سەرچاوەی پێشووی، ل٢٣ لاپەرەكانی دوای بكە.

- زنار سلوبي، سەرچاوەی پێشو، ل ٩٦

- A.J.Toynbee, OP.Cit.,P. 507.

٢- ئیحسان نوری پاشا (١٨٩٢-١٩٧٦)یەكێك لە گرنگترین سەركردەكانی بزووتنەوەی كوردی باكووری كوردستان بوو، لە ساڵی ١٩١٩ ناوی بەدەركەوت، كاتێ لە نێو نوێنەرانی حامیەی ئەستەمبۆڵ بۆ یارمەتی دانی مستەفا كەمال سەركردایەتی یاخیبوونیكی لە دژی حكوومەتی فەرید پاشا كرد و ناچاری بە دەست لەكاركێشانەوە كرد، ناوی وەك سەركردەیەكی سەربازی لەمیانەی بەشداریكردنی لە جەنگی سەربەخۆیی درەوشایەوە، یەكێك لە نوێنەرانی كۆنگرەی سیواسی ١٩١٩ بوو، دواتر پەیوەندی بە سوپای ٩ی توركی لە تەرابزۆنەوە كرد و بە فەرماندەی فەوجی یەكی لیوای ١٢ دامەزرا، خەبات و خزمەتەكانی ئیحسان نوری پاشا و ئەوان وەك ئەو لە كورد زۆرن، بەڵام ئەو خزمەت و خەباتەی نە بۆ خۆی و نە بۆ نەوەكانی سودی نەبوو، لە سیاسەتی توانەوەی نەتەوەیی و بە توركردن نەیپاراستن، ئەو سیاسەتەی كە كەمالییەكان بڕیاری جێبەجێكردنیان بەسەر هەموو نەتەوە نا توركییەكاندا، بۆیە پەیوەندی بە ریزەكانی كۆمەڵە سیاسییە كوردییەكانەوە كرد، كە چالاك بوون و داوای مافەكانی كوردیان دەكرد، بەناوبانگترینیان كۆمەڵەی سەربەخۆیی كوردستان(ئازادی) بوو كە جولانەوەی بەیتی شەبابی رێكخست و زوو لەباربرا، بەهۆیەوە لەگەڵ هاوڕێكانی بۆ عێراق رایانكرد. هەروەها یەكێك بووە لەسەركردەكانی راپەڕینی ١٩٢٥، دواتر سەركردەی راپەڕینی ئارارات (١٩٢٧-١٩٣١) كە توركان بە سەختی لەناویان برد و زۆربەی سەركردەكانی لەسێدارەدان، بەڵام ئیحسان نوری پاشا توانی بۆ تاران رابكات، لەوێ بووە پەنابەری سیاسی، ژیانی سیاسی لەوێ كۆتایی هات. سەیری:

- إحسان نوري باشا، مذكرات –انتفاضة ا ـرى ١٩٢٦-١٩٣٠، ترجمة صلاح برواري، بيروت، ١٩٩٠، ل ٩

-كونی رە ش، جمعية خويبون ١٩٢٧ووقائع ثورة ارارات ١٩٣٠، تقديم ومراجعة عبدالفتاح البوتاني، اربيل، ٢٠٠٠، ل ل ٥٢- ٥٤

- عزيز الحاج، االسەرچاوەی پێشو، ل ٢٢.

راگەیاند، ئەوانە لە فیرقەی دووی کەتیبەی ١٨ی پیادەبوون بۆ سەرکوتکردنی جوولانەوەی ئاشورییەکان[1] لە ئابی ١٩٢٤ ناردرابوونە ویلایەتی هەکاری. بۆ ئەوەی بوونی دەسەڵاتی تورکی لەناوچەکە بەهێز بکەن، بۆ ئەوەی هەڵوێستی سیاسی تورکی لە کێشمەکێشی لەگەڵ بەریتانیا لەسەر ویلایەتی موسڵ تۆکمە بکەن[2].

شەوی 3/4 ی ئەیلول لەساتەوەختی راگەیاندنی بزووتنەوەیەك لەلایەن ئەفسەرانی کورد، هەوڵی زۆر بۆ هەماهەنگی لە نێوان ئەفسەرانی کورد لە سوپای تورکی درا، هەروەها سەرانی عەشیرەتە کوردییەکان رازیکران بەشداری لە راپەڕینەکەدا بکەن[3]، بەڵام لاوازی وەڵامدانەوەی ئەو سەرۆکانە وایکرد پلانەکە سەرنەکەوێت و بەهۆی هێنانی هێزی زۆری تورکەکان لەناوچەکانی دەوروبەر[4] هێزەکانی شۆڕشگێڕان تووشی دۆڕانی گەورە بوون[5].

دوای سەرنەکەوتنی بزووتنەوەکە، زۆربەی سەرکردەکانی رایانکرد، لەپێشەوایانەوە ئیحسان نوری پاشا بۆ سوریا، دواتر لە رێگەی سنجارەوە[6] هاتنەوە ناو ویلایەتی موسڵی ژێر ئینتیدابی بەریتانی. هەروەها ٥٠٠ کەسی کەتیبەی ١٨ کە ئیحسان نوری پاشا پێشەوایەتی دەکرد، رایانکرد[7].

بزووتنەوەی بەیتی شەباب سەرباری دۆڕان و سنووردارییەکەی، زۆر رەهەندی هەبوو، لەلایەك بێتوانایی رێکخستنی کوردی کە رۆشنبیر و ئەفسەرانی کورد سەرکردایەتیان دەکرد لە کۆکردنەوەی

---

١- كتاب دائرة ضباط الخدمات الخاصة، بغداد إلى مقر القيادة الجوية، بغداد، سري، دى/٦، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٦.

2- H.Hisyar, Jedere Bere,L. 225.

٣- مذكرة من مقر القيادة الجوية للقوات البريطانية في العراق، بغداد، إلى مستشار وزارة الدفاع، بغداد، في ٥تشرين الثاني ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٣.

4- H.Hisyar, Jedere Bere, L. 225.

5- N. Intisar, OP.Cit.,P. 84.

٦- عبد الفتاح علي يحيى، وثائق...، ل ٦٦٤.

٧- كتاب دائرة الخدمات الخاصة، بغداد، إلى مقر القيادة الجوية، بغداد، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري، دى/٦، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة، ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٧.



جەماوەرێکی فراوان، پێشاندا. هەروەها ئەوەشی دەرخست کە کەلێنێکی گەورە لە نێوان گەلی کورد و دەستەبژێری کوردی هەیە، هەروەها سەرنجی حکوومەتی تورکیشی بۆ چالاکبوونی کورد و رێکخستنەکانی لە کارکردن لە دژیان راکێشا، ئەوەش هانیدا رێوشوێنەکان لەدژیان توندتر بکاتەوە، تەنگ بە سەرۆك وسەرکردەکانی کورد هەڵبچنێ و چالاکیان سنووردار بکات.

گرنگترین رەهەندی ئەنجامەکانی ئەم یاخیبوونە، رەهەندە هەرێمایەتییەکەی بوو، کە بەریتانیای وەك لایەنێکی ناڕاستەوخۆی رووداوەکان، هێنایە ناوەوە، هەوڵیدا سەرانی بزووتنەوە لەباربراوەکە وەك کارتێکی زیادە بۆ فشار دروستکردن لەسەر تورکەکان لە دانووستاندنەکانی موسڵ بەکاربهێنێت.

بەڵگەنامە بەریتانییەکان رۆشنایی زیاتر دەخەنە سەر گرنگترین سەرکردەکانی بزووتنەوەی پەنابەران لە عێراق، لە نموونەی ئیحسان نوری پاشا و یوزباشی (نەقیب) عەلی زەکی کوڕی وەلی و یوزباشی ئیسماعیل حەقی ئەفەندی کوڕی محەمەد عەلی و ئەوانی دیکە، هەروەها زانیاری زۆر لەبارەی هەریەکەیان پێشکەشدەکات[1]، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بەریتانیا بە جیدی بیری لە بەکارهێنا نی ئەوانە کردۆتەوە، دوای لە تواناکانی هەریەکەیان کۆڵیوەتەوە.

بەکردەوە، دەسەڵاتی ئینتیدابی بەریتانی لە عێراق پێشوازی لیکردن، یوزباشی عەلی زەکی کوڕی وەلی لە قوتابخانەی سەربازی سوپای عێراق وەرگیرا، یوزباشی ئیسماعیل حەقی ئەفەندیش لە پۆستی بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناسریە دامەزرا[2].

هەرچی سەرانی دیکە بوو لە ئەفسەرانی کەتیبەی ١٨، پێدەچێت بەریتانییەکان بە تواناکانیان سەرسام بووبن، بۆیە بیریان کردەوە کە لە دووبارە چالاککردنەوەی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد دا یارمەتیان بدەن، کە لە پشت بزووتنەوەکە بوو[3].

---

١- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی ناوی ئەو کەسایەتیانە و چالاکییەکانیان، سەیری:

-: مذكرة القيادة الجوية للقوات البريطانية في العراق، بغداد، إلى مستشار وزارة الدفاع في بغداد، في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري للغاية، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ل٢-٥ .

٢- مذكرة القيادة الجوية للقوات البريطانية في العراق، بغداد، إلى مستشار وزارة الدفاع في بغداد، في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري للغاية، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٢ .

3- N. Entisar, Op.Cit.,P. 83.

ئەوەی دوایین بەرووخستن گرنگ دەکات، ئەو یادداشتە بەرزکراوە بوو لە بارەگای سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی عێراقی لە بەغدا بۆ راوێژکاری وەزارەتی بەرگری عێراق بوو،کە توندی رایسپاردووە کە "ئەو ئەفسەرانە پلەی ئەفسەریان لە سوپای عێراقی پێ بدرێت، ئەمەش لەو باوەڕەوە کە دەبێت حکوومەتی عێراقی بە ڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ کوردا بکات، بۆ ئەوەی خۆیان لەدژی تورکەکان بپارێزن". چونکە "ئەوانە خزمەتی راستەقینەیان بەهەردوو حکوومەتی بەریتانی و عێراقی کردووە"، یادداشتەکە پێشنیازی کرد کە "ئەوانە لە کوردستان لە یەکەی نوێدا کە ئێستا لە دروستکردندایە لە کەرکوك بەکاربهێنرێن"[١].

بەڵگەنامەیەکی دیکەی بەریتانی ئاماژە بۆ قەبارەی ئەو شڵەژان و تووڕەییە دەکات کە یاخیبوونی ئەفسەرانی کورد بەرمبەر حکوومەتی تورکی دروستیکردووە، دەکات، بەڵگەنامەکە هۆکاری ئەو یاخیبوونە بۆ وڵامنەدانەوەی ئەنقەرە بۆ داخوازییەکانی کورد کە لە کۆنگرەی دیاربەکر خرابووە، گەڕاندەوە[٢].

پێدەچێت ئەوەی پاڵی بە بریتانیەکانەوە نابێت کە بەجیدی بیر لە بەکارهێنانی ئەندامانی ڕێکخستنە کوردییەکەی کە بەرپرسی بزووتنەوەکە بوو، بکەنەوە، توانا کاریگەرەکەی بوو[٣]. ئەوانە توانیان لەماوەیەکی زۆر کەمدا نیوەی تاکەکانی کەتیبەی ١٨ -واتە نزیکەی ٥٠٠کەس- بۆ بزووتنەوەیەك دژ بە دەسەڵاتی تورکی[٤] ئامادە بکەن. ناکریت بەریتانیا ئەوکارە لە یەلاییکردنەوەی کێشەی موسڵ لەبەرچاو نەگریت. لەلایەکی دیکەوە، دوو هۆکار هەبوون وایان لە ئەفسەرانی کورد کرد لەکاتێ پەنابردینان بۆ دەسەڵاتی بەریتانی لە عێراق، دەست بە چالاکی

١- كتاب القيادة الجوية البريطانية إلى مستشار وزارة الداخلية العراقية، في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة ١٩٢٤- ١٩٢٦، ل ٥ .

٢- كتاب القيادة الجوية البريطانية إلى مستشار وزارة الداخلية العراقية ـ بغداد، في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤، الوثيقة (٢) تابع، المرفق ٣ آ، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٦ .

3- N. Entisar, Op.Cit.,P. 83.

٤- تقرير استخبارات هيئة أركان الجو ـ مقر القيادة الجوية البريطانية في العراق، سري للغاية، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٦ .



بکەنەوە، یەکەم ئەو ڕێگا و شێوازەی کە دەسەڵاتی بەریتانی پێشوازی لێکردن، بە پیدانی مافی پەنابەرێتی سیاسی و پێدانی بڕە دارایی و پێدانی پۆستی سەربازی. دووەم، کە لەیەکەم گرنگترە، ویستیان سوود لە ڕەوشی هەرێمایەتی هەستیار و ئەو دژایەتیەی کە لەنێوان بەریتانیا و تورکیا بەهۆی ویلایەتی موسڵەوە لە ئارادابوو وەربگرن. ئەفسەرانی کورد لەو باوەڕەدابوون دەکرێت بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ ئاڕاستەی بەرژەوەندی بەریتانیا یەکبخەن.

لەم قەناعەتەوە، کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستا، پێشنیازی کرد لە تەواوی دیرسیم و شەرناخ بەتایبەتی شۆڕشی کوردی لەدژی تورکەکان بکات، شۆڕشگێڕان داوای یارمەتیان لە بەریتانیا کرد بەهۆی نزیکی هەردوو ناوچەکە لە ناوچەی جیناکۆك(موسڵ)ەوە، کە هێزەکانی بەریتانی تێدایە، هەروەها عەشیرەتەکانی ئەو ناچە کوردییە بەدرێژایی چەندین ساڵ سەرکەوتوو بوون لەوەی بەرگری دەسەڵاتی تورکی بکەن. چاوەڕێی پاڵپشتی بەریتانیان دەکرد، بەهۆی ئەوەی ئاسانی و خێرایی گەیشتنی ئەو پاڵپشتییە[١].

لەپێناوی رازی کردنی بەریتانیا بە پاڵپشتیکردنی خواستە رەواکانی کورد، کۆمەڵە کوردییەکە لەو یادداشتەی کە بۆ دەسەڵاتدارنی عێراقی بەرزیکردەوە، هەوڵی پاساوی جۆراوجۆر پێشکەشبکات، ئەوەی روونکردبووە کە "کورد بەردەوامن لەو باوەڕەی کە بەریتانیا....لە کۆتاییدا کێشەکەیان وەردەگریت و رزگاریان دەکات"، ئەوان "هیوایەکی زۆریان بەمە هەیە"[٢].

لەپاڵ هەوڵەکانی پاڕانەوە لەبەریتانیا، ئەوا کۆمەڵەکە ویستی بەریتانیا بەوە رازیبکات کە هەڕەشەی بەردەوامی تورکەکان بۆسەر ویلایەتی موسڵ و عێراق هەیە، ئەو هەڕەشەیەش کۆتایی نایەت تاکو "بەربەستێکی مرۆیی کە خاوەن رەگەزیکی سەربەخۆ بێت لە ناوچەکە دانەمەزرێت و کار بۆ پچڕاندنی پشتێنەی تۆرانی بکات، ببێتە بەرەی دژی تورك و فارس و روس"[٣].

١- مذكرة من دائرة ضابط الخدمات الخاصة، بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريطانية، بغداد، سري، دي/٦، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٠.

٢- هارفي موريس وجان بلوج، لا أصدقاء سوى الجبال، ترجمة راج آل محمد، تقديم هادي العلوي، بيروت، ١٩٩٦، ل ٨٧.

٣- مذكرة من المقر الجوي البريطاني في العراق، بغداد، إلى أمين سر وزارة الطيران البريطانية، كنغواي، لندن، في ٢٦ تشرين الثاني ١٩٢٤، دبليو. سي. ٢، سري جداً، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٢٠.

کۆمەڵە کوردییەکە بۆ بەرپرسانی بەریتانی روونکردەوە کە ئەوەی پاڵی بە سوپای تورکییەوە نا لەم دواییە هێرش بۆسەر ئاشوورییەکان بکات و ناوچەکانیان داگیربکات، ئەوەبوو ئەوان لەگەیشتن بە موسڵ لەرێگەی زاخۆ و فیشخاپۆرەوە سەرکەوتوو نەبوون، تورکەکان بەم رێوشوێنەی دواییان، چەند ئامانجێکیان پێکا، گرنگترینیان توندوتۆڵکردنەوەی پێگەکانیان بوون بەرلەوەی زستان بێت و دروستکردنی رێگا و کۆگاکان، سەرباری هەوڵدانیان بۆ ناردنی یەکەی تورکی بە جلوبەرگی کورد بەو ناوچانە، بۆ ئەوەی سەرلەنوی پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحموودی بەرزنجی شۆڕشگێڕ لە سلێمانی دروستبکاتەوە[1].

دوای ئەمەش رێگا بۆ داگیرکردنی کەرکوك و سلێمانی خۆشدەکەن، لەوێشەوە هەڕەشەی موسڵ دەکەن، دواتر داوا لە هۆزە کوردییەکانی باکوور دەکەن هانی هۆزە کوردییەکانی باشوور بدەن بۆ ئەوەی یاخی بن، بەمەش ئەنقەرە کارێکی وا دەکات کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ دەرکردنی بڕیار لە بەرژەوەندی خۆیان ناچار دەکات[2].

---

١- لەراستیدا پەیوەندی شێخ بە کەمالییەکانەوە راستەخۆ دوای گەڕانەوەی لە تاراوگە لە ئەیلولی ١٩٢٢ دەستی پێکردەوە، بەبێ ئاگاداری بەریتانییەکان، بازنەی پەیوەندیەکە و بەرپرسەکە ئەحمەد تەقی بوو کە یەکێك بوو لە پیاوانی شێخ و لە ١٧ /١١/ ١٩٢٣ لە ریگەی ئورمێوە بۆ سلێمانی گەرابووەوە، لەوێ باسی "گەڕانەوەی دڵنیایی ویلایەتی موسڵی بۆ تورکان کرد..."، هەروەها باسی لە "ئەگەر بەخشینی ئۆتۆنۆمی بە شێخ مەحموود کرد"، هەروەها بەڵگەنامە بەریتانییەکان باس لە کەسێکی خەلکی ئامیدی دەکەن کە لەنێوان کەمالییەکان و شێخ مەحموود چالاك بووە، ئەوەی لە بەڵگەنامە بەریتانییەکە دەردەکەویت کە بەریتانیا تورەیی توندی خۆی لەبەرامبەر ئەو پەیوەندی پێشانداوە، بەتایبەتی ئەو پەیوەندی لەماوەی هاتنی لێژنەی لێکۆڵینەوە و دوای ئەو ماوەیەش بەردەوام بووە، بەکردەوە بەریتانییەکان توانیان سنوورێك بۆ ئەو پەیوەندیانە دابنێن، ...چونکە بەرادەوامی پەوەندیەکان کاریگەری خراپی لەسەر کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بە عێراق دروستدەکرد. سەیری:

- کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەك لە مێژووی گەلی کورد، هەولێر، ٢٠٠١، بەرگی ٢، ل ل١٠٩-١١٤.
- كمال مظهر احمد، وثيقة مهمة حول موقف الإنكليز من الشيَخ محمود وحركاته، ترجمة عبدالله بابان، گولان العربي، العدد ٦٤، أربيل ٣٠ أيلول ٢٠٠١، ل ل٤٨-٥٣.

٢- من دائرة ضابط الخدمات الخاصة ـ بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريطانية ـ بغداد، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، دى/٦، سري، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ل١١-١٢.



نەتەوەخوازانی کورد، بۆ بەریتانیایان دووپاتکردەوە کە برا کوردەکانیان ئەوانەی لە نزیك سنووری رۆمیەی (تورکی) نیشتەجێن، بە پلەیەکی زۆر لەگەڵ کوردی باشوور هاوسۆزن، هەمان پلەی هەستی نەتەوەیی بەرزیان هەیە[1]، رێژەی کوردی نێو سوپای تورکیان بە ٥٠٪ مەزەندە کرد، سەربازی رێژەیەکی زۆر لەو ئەفسەرانەی کە هاوسۆزن لەگەڵ کورد، ئەوانەش پەیوەندیان کردووە و بەڵێنیان داوە کە دێنە پاڵ کورد ئەگەر سۆرشیان لەدژی حکوومەتی کەمالی کرد[2].

راپۆرتەکەی بەریتانیا ئەگەر پاڵپشتیکردنی لە کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان گفتوگۆکرد، پاڵپشتی بەریتانی بە گرنگ و پێویست راسپارد، باسی لەوەکردبوو کە بزووتنەوەی ئەفسەرانی کورد لە بەیتی شەباب ئەگەر چی سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام بووە هۆی ئەوەی ٥٠٠تاکی کەتیبەکە رابکەن، سەرباری لاوازکردنی یەکەکانی سوپای تورکی، گرنگتر لەهەموو ئەوەبوو کە بزووتنەوەکە وای لە تورکەکان کرد بزانن کە بیرکردنەوە لە چالاکی دژی موسڵ ئەوا: "بەرگری نەوەك پاڵپشتی لە کوردی ئەو ناوچەیە دەبینن". راپۆرتەکەی بەریتانیا پێشنیازی پاڵپشتیکردنی بەریتانیای لە هەر بزووتنەوەی کوردی کرد، چونکە ئەو پاڵپشتییە زۆر شت دەگریتەوە: یەکەم، وادەکات کورد دوژمندارانە رووبەڕووی بەریتانیا نەبنەوە. دووەم، وادەکات یەکە سەربازییەکانی سوپای تورکی لە چیاکانی ئاشورییەکان (هەکاری) نەمێننەوە. سێیەم، لاوازکردنی وردەی سوپای تورکی[3].

---

١- مذكرة من المركز الجوي للقوات البريطانية في العراق ـ بغداد، إلى أمين سر وزارة الطيران، كنغواي، لندن، دبليو. سي٢٠، في ٢٦ تشري الثاني ١٩٢٤، سري جداً، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٢٠.

٢- مذكرة من دائرة ضابط الخدمات الخاصة ـ بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريطانية ـ بغداد، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري، دي/٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٢.

٣- مذكرة من دائرة ضابط الخدمات الخاصة ـ بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريطانية ـ بغداد، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري، دي/٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٢ .

- هارفي موريس وجون بلوخ، سەرچاوەی پێشو، ل ٨٧.

لەو ماوەیەدا کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان، پلانێکی هەمە لایەنە و هەمە شێوەی بۆ هاواری لەگەڵ بەریتانییەکان پێشنیاز کرد، گرنگترینیان داوای کرد ئەفسەرانی کورد یاوەری ئەفسەرانی بەریتانی بۆ یەکەکانی سنوور بکەن کە چاوەڕێ دەکرێت چالاکی لە دژی تورکەکان تێدا ئەنجامبدرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی زامنی پەیوەندی کردنی نێوان کوردانی دانیشتووی ئەوێ و سەرکردە عەشایەریەکانیان بکەن. هەروەها داوایان کرد رۆژنامەیەك لە موسڵ دەربکەن، بۆ ئەوەی کاریگەری بانگەشەی تورکەکان[1] کەمکاتەوە و هانی بیری شۆڕشگێری لە کوردستان بدات، هەروەها رێگەیان پێبدرێت کە سەنتەرێك لە زاخۆ بۆ زامنکردنی پەیوەندیکردن بە سەرکردەی عەشیرەتەکانی گۆیان و سیواس و شەرناخ، بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەوانەوە رۆژنامەکان بۆ ناو جەرگەی وڵاتەکەیان بنێرن[2].

کۆمەڵە کوردییەکە بە بەریتانیای راگەیاند کە تورکەکان، هێزێکی گەورەیان کۆکردۆتەوە، بۆ ئەوەی موسڵی پێداگیر بکەن، بەڵام لە راستیدا بۆ سەرکوتی بزووتنەوەی کوردی بەکاریدەهێنن[3].

پێدەچوو بەریتانیا لە وەڵامدانەوەی داخوازیەکانی کورد رارا بوو بێت، کە داوای هاوکاریەکانی لە دژی کەمالییەکان دەکرد، چونکە بەرژەوەندییە سیاسییەکانی بەسەریدا سەپاند ئەو کارە نەکات، یان هیچ یارمەتی کورد نەدا لە پێناوی بەدیهێنانی ماف و خواستەکانی، چونکە ئەمە لە بنەماوە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی یەکانگیر دەبوو، بە زیاتر لە ئاراستەیەك: "یەکەم، دەبێتەهۆی دانەمەزراندنی وڵاتێکی بەهێز لە عێراق، بەهۆی ویلایەتی موسڵی کوردییەوە، کە رەتیان دەکردەوە بچنە پاڵ دەوڵەتی عەرەبی عێراقەوە. دووەم، بەریتانیا لەوە گەیشتبوو پاڵپشتی کورد واتە دوژمنداری زیاتر تورك بۆ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا، دوای چارەسەری کێشەی موسڵ بەریتانیا بەخێرایی بیری لە گەڕانەوەی

---

١- لەم بەڵگەنامەیە بە هەڵە نوسراوە بانگەشەی کوردی، کە هەڵەی چاپە و مەبەستی بانگەشەی تورکییە.

٢- مذكرة من دائرة ضابط الخدمات الخاصة ـ بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريطانية ـ بغداد، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري، دي/٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٤

٣- مذكرة من دائرة ضابط الخدمات الخاصة ـ بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريطانية ـ بغداد، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤، سري، دي/٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٤.



پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکەکان کردەوە، چونکە بەرژەوەندییەکانی پێویستی زیاتر بە ئارامی ناوچەکە هەیە، ئارامیش بەبێ ئارامی تورکیا نەدەبوو. نەدەبوو بەریتانیا ستراتیژەیەتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە حساباتی خۆی بەدەر بنێت، تورکیا پێگەیەکی جیاوازی هەبوو، ئەو پێگەیەی بە زیادبوونی پێگەی سیاسی سۆڤێت زیاتر دەبوو. کاتێ بەریتانیا هەریەکە لە کورد و تورکی لە تای تەرازوی حساباتە داهاتووەکانی دادانا، بینیمان کە پشتی لە کورد کرد و رووی بەرەو تورکەکان وەرگێڕا.

بۆیە ئەمجارە هەرگیز لە پاڵپشتیکردنی کورد جیدی نەبووە، هەروەك جارانی پێشووش وابوو، ئەو رێوشوێنە دیپلۆماسی و سەربازیانەی کە دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە بەغدا دژ بە بانگەشەکەرانی (کوردستان سەربەخۆ) لە کوردستانی باشوور لەسەروی هەموویانەوە شێخ مەحموود ئەنجامی دان، ئەو قسەی سەرەوە دەسەلمێنی. سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر کورد جگە لە سیاسەتی بەلارێدابردنی بانگەشەکەرانی نەتەوەیی کوردی نەبێت بە میانرەو توندڕەوییەوە هیچی دیکە نەبووە.

بەڵام لە دەرەنجامی کۆتاییدا، هەموو ئەو رووداوانە وایکرد، کورد بەئاگابێن و لەسەر قەبارەی زیانە زۆرەکانیان کە لە لۆزان دایان بوەستن. ئەو بەڵگەنامەیەی کە دانی نا و بە فەرمی دەوڵەتی کوردی پێشنیازکراوی بە قوربانی بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکان دانا. ئەم رابوونەی کورد (کە دواکەوت) وایکرد لەسەرەتادا داوای مافەکانیان بەرێگەی ئاشتی بکەن، لەرێگەی وروژاندنی بابەتی مافەکانی کورد لە ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورەی تورکی یان بەستنی کۆنگرەوە. دوای ئەوەی ئەو شێوازە ئاشتیانەش سەرنەکەوت، پەنایان بۆ رێگاچارەی چەکداری برد بۆ ئەوەی تورکەکان ناچار بکەن، پابەندی بەڵێنەکانیان بن کە بەر لە لۆزان و دوای لۆزانیش دابوویان. بزووتنەوەی بەیتی شەباب لەلایەك ئاماژەی بە سەرەتای قۆناغێکی خوێناوی پەیوەندییەکانی کورد و تورك دا، لەلایەکی دیکەوە بەڵگەنامەیەکی زیندووە بۆ دۆڕانی دەستەبژێری کوردی لە جووڵاندنی جەماوەر و رێکخستنیان. لەلایەك سەرلەنوێ پێویستی کوردی بۆ رزگاربوون لە میراتی عوسمانی دەرخست کە پرییبوو لە نەزانی و دواکەوتەیی. لەلایەکی دیکەوە هەڵەی پشتبەستن بەهێزی گەورە یان وەرگرتنی پاڵپشتی لێیان بەتایبەت بەریتانیا سەلماند، چونکە ئەو هێزە گەورانە بەردەوام داخوازییە رەواکانی گەلی کوردیان لە پێناوی بەدیهێنانی بەرژەوەندی و ئامانجی داگیرکاری خۆیان بەکارهێنا وە. ئەوە بۆ کورد دەرکەوت کەرێگایەکی سەخت و درێژیان لەپێشە بۆ وەرگرتنی مافەکانیان.

# ڕاپەڕینی کوردی ساڵی ١٩٢٥

دواکەوتنی یەکلاییکردنەوەی کێشەی موسڵ وایکرد بەرپرسانی بەریتانی و تورکی، نەتوانن سیاسەتێکی روون و دیاریکراو بەرامبەر کێشەی کـورد وەربگـرن، بـەردەوامی ناکۆکییـەکانی بەریتانی ـ تورکیا لـەبارەی باشـووری کوردسـتان کاریگەرییـەکی نێگـەتیڤی لەسـەر ریـرەوی پەرەسـەندنی کێـشەی کـوەردی لـە بـاکووری کوردسـتان هـەبوو. لەمیانـەی کەڵەکـەبوونی ناکۆکییەکانی نێوان بەریتانیا ـ تورکیا، سیاسـەتی بـەڵێن و دژە بـەڵێن ـ کـە هـەردوو لاکـە دەیاندا ـ هەلی بە دەوڵەتیکردنی کێشەی کوردی لە دەست سـەرکردە کوردییـەکان دەرهێنـا[١]، ئینجا کۆمەڵەی نەتەوەکان دیتەناو کێشەکەو شاندی بەسەرکردنەوەی راسـتییەکان بـۆ زانـینی رای دانیشتووانی ولایەتەکە نارد. سەکردە کوردییەکان هەر لە بـە نێودەوڵـەتیکردنی کێـشەی کوردی شکستیان نەخوارد، بەڵکو لە دروستکردنی راگشتی کـوردی یـان هەڵوێـستیکی لیـك نزیك لەبەردەم ئەندامانی لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکانیش شکستیان خوارد، بەڵام ئەمە لەبەردەم بەدەرکەوتنی سەرلەنۆی کێشەی کورد رێگر نەبوو، دوای ئەوەی دەنگی کزکرا، بەهۆی مۆرکردنی پەیمانی لۆزانەوە.

ئەمجارەیان کێشەی کورد بەشێوەیەکی بـەهێز و کاریگـەر لەسیاسـەتی تـورکی دەرکـەوت، لەسەر دوو ئاستی ناوەوە و دەرەوە، کە خۆی لە راپەڕینی کـوردی سـاڵی ١٩٢٥ دەنوانـد، کـە زۆربەی سەرچاوەکان بە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران ناوی دەهێنن[٢].

---

١- ئەدمۆندز بەخۆی دانی بەم راستیەوە ناوە کاتێ لێـدوانی لـە بـارەی ئـەو بەڵێنانـەی کـە حکوومەتەکـەی بەدرێژایی کێشەی موسڵ دەیدا، کاتێ گوتی: "بەداخەوە هەموو زانیاری و بەڵێنانەی راگەیەنران، بـۆ زاڵبـوون بەسەر رەوشە ناسکەکە و هەڵوێستە سەختەکان دراون، بەنەمانی رەوش و هەڵوێستەکە لە بیرکراون، سەیری:

- عزیز حسن البارزاني، الحركـة القوميـة الكورديـة التحرريـة في كوردسـتان العـراق ١٩٣٩-١٩٤٥، دهـوك، ٢٠٠٢، ل ٢١.

٢- باسیل نیکیتین، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٣٥



لـە ناوەڕاسـتی شـوباتی ١٩٢٥ رۆژنامـە تورکییـەکان و ئاژانـسەکانی هـەواڵی ئـەنادۆڵ خەبەریان لەبارەی روودانـی پێکـدادان لـە نێـوان ژەندرمـەی تـورك و دانیـشتووانی ویلایەتـە کوردییەکانی باشووری رۆژهـەلات بلاوکـردەوە. رۆژنامـە تورکییـەکان ئـەو رووداوانـەیان بـە یاخیبوونێك کە کۆمەڵێ دز و رێگر ئەنجامیان داوە پێناسەکرد"[١].

ئەو رووداوە بووە سەرەتای راپەڕینی چەکداری کوردی، بەخێرا ویلایەتەکانی موش، ئـەرغنی، دێرسیم، ماردین، سیورك، بەدلیس، وان، هەکاری ئورفای گرتەوە[٢]. رۆژنامەی "تایمسی" لەندەنی ژمارەی چەکدارانی بە ٢٠ هەزار مەزەندە کرد[٣]. ئەوانە سەرکەوتنی یەکبـەدوای یـەکیان بەسـەر هێزە تورکییەکاندا دەهێنا، گرنگترینیان گەمارۆدانی شاری دیاربەکر بوو[٤].

کۆمەڵەی سەربەخۆی کوردستان (ئازادی) کات و چالاکییەکانی راپەڕینەکـەی دیـاریکرد[٥]، شێخ سەعید[٦] پیرانیشی دیاریکرد بۆ پێشەوایەتیکردنی شۆڕشگێڕان.

---

- Dr.Sivan,Kürt Millet Harekatleri ve irak'ta Kürdistan Ihtilali, Stokholm,1997,S.76.

1- News Summary of the Local Press Respecting the Geng Revolt, IBTK, Enclosure 2 in No. 9, P.33 “

- جرجیس فتح الله، يقظة ...، ل ٣٠٠.

2- News Summary of the Local Press Respecting the Geng Revolt, IBTK, Enclosure 2 in No. 9, P.33.

3- The Times, April, 28, 1925 .

- نقلاً عن: كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥ في كردستان تركيا، بيروت، ٢٠٠١. ص ٥٢.

٤- سعاد حسن جواد، التطورات...، ل ١٧.

- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی شەڕەکان و رێرەوی راپەڕینەکە سەیری:

- كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥ ...، ل ل ٥٢-٥٤.

- صبرية احمد لافي، سەرچاوەی پێشو، ل ل٨٨-٩٣.

5- Nadir Intissar, Op.Cit., P.83 “

- زنار سلوبي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٥٣-٥٤.

٦- شێخ سەعیدی پـیران لـە خانەوادەیـەکی ئـایینی کـە خزمـەتی تەریقـەتی سـوفی نەقـشبەندیان کـردووە، لەدایکبووە، نەوەی یەکێك لە گەورە شێخەکانی نەقشبەندی بـووە، کـە رۆڵـی لـە نوێکردنـەوەی نەقـشبەندی

دەسەڵاتدارانی تورکی ڕێوشوێنی زۆری وەرگرت، پیداویستیەکانی دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکەی بەخێرایی دابینکرد، هێزی زیاتری بۆ بەرەکانی جەنگ نارد، یاسای باری لەناکاوی دارِشت کە بەناوبانگترینیان یاسای "تەقریر سکون- Takriri Sukun[1]" و دامەزراندنی دادگا سەربەخۆکان (کە ناوبانگیان خراپ بوو)، کە دەسەڵاتدارانی سەربازی تورکی دەسەڵاتی دەرکردنی حوکمی دەستبەجێی لە سێدارەدانیان پێدابوون[2]. دەرەنجامی ئەو ڕێوشوێنانە راپەریوان پاشەکشەیانکرد، دواتر شێخ سەعید لە ٢٧ نیسانی بەدیلگیرا، ئەمەش ئاماژەی کۆتایی هاتنی راپەڕینە کوردییەکە بوو[3].

هەبووە، بەشداری لە جەنگەکانی رووسی عوسمانی کردووە، لەسەروبەندی دامەزراندنی کۆماری تورکی چالاکییەکی سیاسی بەچاوی بۆ رازیکردنی ئەفسەرانی لیوای حەمیدیە و بانگەشەکەرانی کۆمەڵگای ئیسلامی بە **پاڵپشتی** رێکخستنی ئازادی نواند، هەرچەندیش سەربەخۆ رێکخستنەش نەبوو. هەموو ئەمانە وایان لە ئەندامانی ئازادی کرد بۆ پێشەوایەتی کردنی راپەڕینی ١٩٢٥ هەڵیببژێر ن، شایانی باسە شێخ سەعید لە گەورە موڵکدارەکانی کوردستایش بوو سەیری:

- دیاری کردستان، مجلة، بغداد، العدد ١٣-١٤، ٥ شباط ١٩٢٦، ل ل ٣-٨.

- دیاری کوردستان (١٩٢٥-١٩٢٦)، ئامادەکردنی رەفیق ساڵح، لێکولینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمین و سەدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١

– M.M. Van Brunssen.Op.Cit.,PP.278-279 .

١- تقریر سکون: یان یاسای پاراستنی سیستەم، لە ٤ی ئاداری ١٩٢٥ دەرچووە، کە کار بۆ قەدەغەکردنی پارت و رێکخراو و رۆژنامەی ئۆپۆزسیۆن دەکات، یاساکە لە بنەماوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی راپەڕینی ١٩٢٥ کورد و پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان داریژراوە. پارتی تەرەقی کۆماری، بەهێزترین پارتی سیاسی ئۆپۆزسیۆن بە پشتبەستن بەم یاسایە هەڵوەشایەوە، دەسەڵاتدارانی تورکی بەم یاسایە مامەڵەیان لەگەڵ بەشداربووانی راپەڕینی ١٩٢٥ کرد. سەیری:

- سعاد حسن جواد، التطورات ...، ل ل ١٨-١٩.

٢- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی ئەو یاسا و رینمایانە سەیری:

- Kamal H.Karpat.Op.Cit.,PP.46-49

- خلیل علي مراد، القضیة...، ل ل ٢٥-٢٦.

3- Erik J.Zurches,Op.Cit.,P.179.



بەدواداچوونی وردەکاری و ڕووداوەکانی ئەم راپەڕینە، ناچێتە چوارچێوەی ئەو توێژینەوەیە، هەروەها زۆر توێژینەوە و نووسراوی دیکە لایەنە جۆراوجۆرەکانی بە شێوەیەکی دوورودرێژ باسکردووە[1]، ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە، تاوتوێی بانگەشەکانی بەرپرسانی تورکەکان و چەند نووسەرێك لەبارەی بوونی رۆڵی بەریتانی لە راپەڕینەکەدا بکەین، هەروەها دیاریکردنی هەڵوێستی بەریتانیا لەبەرامبەر راپەڕینەکە.

راپەڕینەکە لەکاتێکدا روویدا کە هەموو چاویان بڕیبووە ویلایەتی موسڵ، لەکاتێکدا کە لیژنەی بەسەرکردنەوەی راستییەکان کارەکانی لە لایەکی ویلایەتەکە ئەنجام دەدا، راپەڕینەکە لە باکووری کوردستان گەیشتە لوتکەی، لە دووری چەند میلێك لە شوێنی لیژنەکە، ئەمەش بەڵگەیەکی روونی بەدەستی بەریتانییەکاندا و تا رادەیەکی زۆر هەڵوێستی بەهێزکردن، لەبەرامبەردا تورکەکانی خستە هەڵوێستی ناسك و لاوازەوە. ئەمەش گومانی ئەوەی لای تورکەکان دروستکرد کە بەریتانییەکان ئاگری راپەڕینەکەیان خۆشکردووە[2].

- بۆ وردەکاری لە بارەی ڕێوشوێنە تۆڵەسەندنەوەکانی دەسەڵاتی تورکی دژ بە کورد سەیری:

- Hoybon, The Case of Kurdistan Against Turkey,New York, 1957,P. 50.

1- A.J.Toynbee,OP.Cit.,P.508. 511;M.Nuri Dersimi,Kürdistan Tarihinde Dersim, Halep,1952,SS,176-177;M.Ciwan,1925 Kurd Ayklanmaşi (Şeyh Sait Hareketi), Jina Nŭ ForlagT, 1985. SS, 46-49 “

- تەلار علی ئەمین، سیاسەتی کەمالی و بزافی رزگاری خوازی نەتەوەیی کورد لە باکووری کوردستان ١٩١٨-١٩٣٨، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی- کومەلایەتی-ئابووری یە، نامەی ماستەرە پێشکەشی کولیجی ئادابی زانکویی سەلاحەدین کراوە، ٢٠٠٠، ل ل ٩٣-١٠٤.

٢- سەرباری گرنگیدانی هێزە دەرەکیەکان بە راپەڕینەکە، دەسەڵاتدارانی تورکی لە جەنگەکەدا مۆرکێکی نەتەوەییان لە میدیاکانی خۆیان بە بزووتنەوەکە بەخشی، لە لێدوان و بەیاننامە حکومیەکانی بەرپرسانی تورکی کە ئارستەی دەرەوەیان دەکرد، جەختیان لەسەر ناسنامەی ئیسلامی "پاشکەوتوو" بە راپەڕینەکە کردووە. ئامانجی ئەو پلانەش ئەوە بووکە شۆڕشگێران لە ژینگە ئیسلامییە تورکییەکەی دابڕێنن، تەنها بە ناوچەی ناوەوەی کوردان تایبەتی بکەن، هەروەها ئانجی ئەوەبوو لە هەموو **پاڵپشتی**یەکی دەرەکی مەحرومی بکات، ئەوەش بە وەسفکردنی بە بزووتنەوەیەکی پاشکەوتوو کە دەیەوێت خەلافەت بگەڕێنێتەوە، ئەمەش هێزی ئەورووپی دەترساند. سەیری:

هەردوو ڕۆژنامەی تەوحیدی ئـەفکار ـ Tevhid Afkar ــ و تـەنین ـ Tenin ــ تـورکی، ڕاپۆرتیان لەبارەی فرۆکە بەریتانییەکان بڵاوکردەوە کە چۆن بەیاننامە و بڵاوکراوەیـان لەناوچـە کوردییەکان بۆ بانگەشەی شێخ سەعیدی پیران پەخش کردووە، لە بەیاننامەکـەدا باسـی ئـەوە کراوە کە "حکوومەتی تورکی ژنان بۆ لەشفرۆشـی هانـدەدا و پـەرە بـە بـێ بـاوەڕی دەدات و خەلیفەی دەرکردووە و شێخ بەناوی ئایین و ڕێـسا ئەخلاقییەکانـەوە کاردەکـات و کوردسـتانی سەربەخۆ دادەمەزرێ و خەلیفە دەگەڕێنێتەوە"[1]. ڕۆژنامەی تەوحیدی ئەفکار ئەمەی نووسـیبوو: "بەداخەوە برا کوردەکانمان لەو کاتە ناسکەدا کێشەمان بۆ دروست دەکەن، کە یۆنانییەکان لـە ڕۆژئاوا و ئینگلیز لە باشووری ڕۆژهەڵات هەڕەشەمان لێ دەکەن"[2]. کار بـەوە گەیـشت هەنـدێ ڕۆژنامە چیرۆکیان لەبارەی بوونی بەکرێگیراوانی ئینگلیز دروستدەکرد، کە لەگـەڵ شۆڕشـگێڕان لە ناوچەی شۆڕش کاردەکەن، ڕۆژنامەی وەقـت بڵاویکـردەوە کـە: "ڕاپـۆرت لـەبارەی بـوونی وەکیلی بەریتانی بەناوی تەمبلەن هەیە"[3]. کە کاری سیخوری بۆ بەرژەوەندی بەریتانیا دەکـات و پەیوەندی بە کەسایەتی نیشتیمانپەروەری وەك عەبدولقادر شەمزینییەوە کردووە[4].

---

- كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥...، ل ٧٦.

- عثمان علي، حركة الشيَخ سعيد بيران ١٩٢٥، دور الشريعة والفكر القومي، ل ل ٦-٨.

-*WWW.AlayIslam.com*.

1- F.O.371\10867, PRESS Summary, February 24, 1925, Enclosure 1 in No: 1, P.2; News Summary of the local Press Respecting the Genj Revolt, 25, February 1925, , IBTK, Enclosure 2 in No: 9,PP.33-34.

2- Press Summary, February 25-1925, IBTK, Enclosure 2 in No.5 , P.25.

٣- وقت، غزته، استانبول ١٣ ذي القعدة ١٣٤٣، ٧ حزيران ١٩٢٥. ينظر الملحق رقم ( ١٤ ) .

4- Lindsay to Chamberlain, 2-JUN. 1925, No.435, IBTK,P.60; Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 9 Jun 1925, IBTK, No.468 ,P.64.

- ئامانجی حکوومەتی تورکی لە برەودان بەم جۆرە بانگەشانە ڕوون بوو، ئەوەبوو تۆڵە لەسـەرانی بزووتنـەوەی کوردی بسەنێتەوە، هەتاکو ئەوانەشی کە بەشداری شۆڕشەکەیان نـەکردووە، وەك عەبـدولقادر شـەمزینی، کـە لەسێدارە درا بەبێ ئەوەی هەرگیز بەشداری ڕاپەڕینی کردبێ، نەوەك هەرئەوەندەش بەڵکو لەسێدارەدان بەوانەش گەیشت کە یارمەتی دەسەڵاتدارانی حکوومەتیان بۆ سەرکوتی شۆڕشەکە دابوو. بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:



نەوەك هەر ڕۆژنامە و لێدوانەکانی بەرپرسانی تورکی ئەم جۆرە قسانەی بەخۆیـەوە بـینی، بەڵکو ئەنجوومـەنی نیـشتیمانی تـورکیش لەمیانـەی گفتوگـۆی تەنگژەکـە جـەختیان لەسـەر ئەوەکردەوە کە ڕاپەڕینە کوردییەکە پیلانێکـی بیـانی لەپـشتەوەیە[1]، بـەڵکو مـستەفا کـەمال لەمیانـەی وتـارێکی لەبـەردەم ئەنجوومـەنی نیـشتیمانی تـورکی کـە لەمیانـەی بـەردەوامی ڕاپەڕینەکە پێشکەشی کرد گوتی: "ئەوەی کارەکەی زۆر خراپترکرد، ئەوەبوو کـە ئینگلیـز لـە پشتەوەی بوون. بەریتانیا بەردەوام کورد بۆ زیان لێدان لـە تورکیـا بـەکاردێنێت. لـە جـەنگی گشتی وەکیلەکانی (لۆرنس) و (نۆئیل)ی نارد بۆ ئەوەی هانی خەڵکی بدەن بۆ شۆڕشکردن، بـۆ ئەوەی لە پشتەوە لە تورکیا بدەن. لە پەیمانی سیڤەر پەیمانی پێکهێنانی حکوومەتی سەربەخۆی پێدان. دووبارە وەکیلەکانی لێرەن بۆ ئەوەی هۆزەکان چەکدار بکەن و هانیان بدەن....بـەریتانیا موسڵ و نەوتەکەی دەوێت. کورد کلیلی موسڵ و ڕێگای نـەوتی عێـراقن. ئـەوان ئـەو زللەیـە بەکاردینن، بۆ ئەوەی تورکیا ناچار بکەن واز لە ویلایەتی موسڵ بهێنێت"[2]. هـەروەها هەنـدێ نووسەریش وایان بینی کە بەریتانیا لەپشت ڕاپەڕینەکەوەیە[3]، هەندێکیان وایان دانا کە: "زێڕی ئینگلیز کە لە کوردستان پەخسیکردووە"، دەستیکی لە شۆڕشەکەدا هەیە[4]. هەنـدێکی دیکـە بەبێ ئەوەی هیچ پاڵپشتییەکیان بۆ قسەکەیان هەبێت بە دەستی سۆڤێتیان لەقەڵەم دا[5].

---

- إسماعيل بيشكجي، كردستان ...، ل ل ٣٠٣-٣٠٥.

1- Press Summary, 25 February 1925, IBTK, Enclosure 2 in No.5, P.26.

2- H.C.Armstrong: Grey Wolf, London, 1932,P .225 .

-جرجيس فتح الله، يقظة...، ل ل ٣١٣-٣١٤" يوسف إبراهيم الجهماني، اتاتوركيـة القـرن العـشرين، سلسلة ملفات تركية، دمشق، ٢٠٠٠، ل ٢٦.

٣- محمد صبيح عبدالقادر، كمال أتاتورك، مصر، ١٩٣٧، ل ١٣٨.

٤- محمد محمد توفيق، كمال اتاتورك، دار الهلال، مصر، ١٩٣٦، ل ١٤٣.

5- Stanford J. Shaw And Ezel Kural, Op.Cit.,P.381.

- سەیر ئەوەیە کە سەرچاوە سۆڤێتییەکان کە بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێنەوە، ڕاپەڕینەکەی بـە " دەرەبەگایـەتی گرێدراو بە بەریتانیای "وەسفکرد، بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- ئەفراسیاو هەورامی، شورشی شێخ سـەعیدی پـیران وسـۆفێت، پێداچـونەوەی حەسـەن عەبدولکـەریم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

توێژەرانی تورك دوای گەڕانێکی ورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی، نەیانتوانی هیچ پەیوەستییەك یان هەماهەنگییەك لەنێوان راپەڕینی کوردان و دەسەڵاتدارانی ئینگلیز بدۆزنەوە[1]. توێژەری تورکی M.K.Oke دانی بەو راستیە نا کاتێ گوتی: "توێژەرانی ئینگلیز نەیانتوانی هەتا بەلگەیەکیش لەسەر پەوەندی ئینگلیز بە راپەڕینی کوردان بدۆزنەوە"، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوان ئەو کارتەیان (کورد) تا سەر ئیسقان بۆ پووچەڵکردنەوەی گوتاری برایەتی تورکی ـ کوردی بەکارنەهێنابی لەبەردەم ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان[2].

هەروەها بیلال شمشێریش B.Şimşir کە پێسپۆڕی بەڵگەنامەکانی بەریتانی بوو لەبارەی تورکیا لەو ماوەیەدا، هیچ بەڵگەنامەیەکی لەمبارەوە چنگ نەکەوت کە بیسەلمێنی راپەڕینەکە بە پلانی بەریتانی بووە[3]. هەروەها هیچ ئاماژەیەکی لەبارەی رۆلی بەریتانی چاوەڕوانکراوی لە قسەکانی مستەفا کەمال نەبینی[4].

زۆربەی توێژەران و پێسپۆڕان ئەوە رەتدەکەنەوە کە بەریتانیا لە دواوەی راپەڕینەکە بووبێ. هەریەکە لە باسیل نیکیتن[5] و قاسملۆ[6] و توینبی لەسەر ئەوە کۆکن کە راپەڕینە کوردییەکە هەڵوێستی بەریتانیای لەسەر حسابی تورکیای لەبەرامبەر کۆمەڵەی نەتەوەکان بەهێزکرد، بەبێ ئەوەی بەریتانیا هیچ رۆلیکی لەرووداوەکانی راپەڕینەکە هەبێت یان دواتریش پاڵپشتی لێکردبێ[7].

مینۆرسکی دەڵێت: "گومانی تێدا نییە کە رەوشی نێودەوڵەتی و ململانێی بەریتانی تورکی لەسەر ویلایەتی موسڵ، کاریگەری لەسەر راپەڕینی کوردان هەبووە، چونکە ئەو راپەڕینە کۆتایی بەو دەمەقاڵێیە لەبارەی موڵکیەتی ویلایەتەکە بۆ بەرژەوەندی بەریتانیا و

– صديق عثمان، تطور القضية الكوردىية من معاهدة لوزان الى الحماية الدولية

- الثقافة الكوردستانية-روشنبيرى كوردستان، مجلة، اربيل، العدد ١٠٥، تشرين الثاني ٢٠٠٢، ل ل ١٦٦-١٧٢.

1- Mim.K.Oke,A Chronology...,P.72.

2 Ibid,PP.61 –62- .

٣- سەیری نووسینەکەی خۆی بکە: Ingiliz ..., S. ٣ ff.

٤- محمد عزة دروزة، سەرچاوەی پێشو، ل ٧٥.

٥- سەیری نووسینەکەی خۆی بکە ....ل ٣٠٩

٦- سەیری نووسینەکەی خۆی بکە ....ل ٨١

٧- سەیری نووسینەکەی خۆی بکە: Survey ...، P. ٥١٠.



عێراق هێنا"[1]. ئەوەی لە قسەی مینۆرسکی دەردەکەوێت ئەوەیە کە تورکیا سەرکەوتوو نەبووە رۆڵی بەیتانی باسکراو لە راپەڕینە کوردییەکە بسەلمێنێ، تەنها ئەوەی گوتووە، کە راپەڕینەکە بە رەوشی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی کاریگەر بووە. دکتۆر خەلیل عەلی موراد وای دەبینی کە: "بەرپا بوونی راپەڕینەکە لە کاتێکدا بوو کە دەمەقاڵێ کێشەی نێوان بەریتانیا- تورکیا لەبارەی ویلایەتی موسڵ بە بنبەست گەیشتبوو، بۆیە وا دەهاتە بەرچاو کە ئینگلیز لە دواوەی بووبێت، بەڵام ئەم جۆرە تۆمەتانە بەڵگەی لەبارەیەوە نییە"[2].

بەڵگەنامە بەریتانییە بەردەستەکان، ئەوە دەردەخەن کە بەریتانییەکان چاودێری رووداوەکانییان لە نزیکەوە دەکرد، زۆربەی یادداشتە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان بەرپرسانی ئینگلیز و ئەستەمبۆڵ و بەغدا و لەندەن، ئەوە دەردەخەن کە بەرپرسانی بەریتانی نەیانتوانیووە پاڵنەری راستەقینەی شۆڕشەکە هەڵبسەنگێنن. هەروەها سەرسورمانی خۆیان لەبارەی بانگەشەکانی تورکی لەبارەی بوونی پەیوەندی نێوان شێخ سەعید و بەریتانییەکان، دەرنابڕێ[3], بۆ نموونە لەبارەی چیرۆکە دروستکراوەکەی رۆژنامەی فەرمی تورکی لەبارەی تەمبلنی بەریتانی و پەیوەندی بە بالیۆزخانەی بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ و سەرکردە کوردەکان. بە پشتبەستن بە یادداشتە نێهێنیەکان کە لیندسی- بالیۆزی بەریتانی لە ئەستەمبۆڵ- بۆ جمبرلنی ـ وەزیری دەرەوەی بەریتانیاـ ناردووە، ئەوە دەسەلمێنێ کە هیچ زانیار و پەیوەندییەك لە نێوان ئەو نێوەندە سیاسی یان فەرمییەکانی بەریتانیا بە راپەڕینەکەوە نییە، بەڵکو ئەو یادداشتانە راپەریوان بە بەکریگیراوی بەلاشیڤەکان دادەنیت. سەرسوڕمانی خۆی لەبارەی ئەو درۆ و چیرۆکە[4] هەلبەستراوانەی بەرپرسانی تورکی دەربڕی، یەکێك لەو یادداشتانە دەڵێت: "هەموو ئەوەی رۆژنامەی تورکی کردوویەتی ئەوە کە چەند رووداویکی لە بارەی پەیوەندی بە کوردەوە هیناوەتەوە کە بۆ ساڵانی ١٩١٩-١٩٢١ دەگەڕێنەوە، لەو ماوەیەشدا بەریتانیا بە کردەوە توێژینەوەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەکرد، بەڵام ئەمڕۆ (١٩٢٥) ئەوا حکوومەتی خاوەن

١- سەیری نووسینەکەی خۆی بکەن.

Musul ..., 44-45.

٢- سەیری نووسینکەی خۆی بکەن: القضية ...، ل ٢٨.

3- Lindsay to Chamberlain,Constantinople,2 Jun 1925,IBTK, No.17, P.60- .

4- Lindsay to Chamberlain, Constantinople,9 Jun 1925, IBTK, No.18, PP.63-64.

شكۆ بەشێوەیەكی دیكە بیر دەكاتەوە و پاڵپشتی لە دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی سەربەخۆ ناكات[1]. لە چاوپێكەوتنێك كە لیندسی بە سەرۆك ئەركانی توركی گەیاند، بالیۆزە بەریتانییەكە بێزاری توندی خۆی لەبارەی ئەوەی رۆژنامەكانی توركی لەبارەی پەیوەندی ولاتەكەی بە شێخ سەعیدەوە بڵاویان كردەوە، دەربڕی، وەڵامی بەرپرسە توركییەكە ئەوەبوو كە سەركردایەتی توركی ئەو بانگەشانە بەهەند وەرناگرێت[2]. بۆ ئۆلسن لە توێژینەوەیەكدا روونبووەوە كە لەبارەی راپەڕینەكەی شێخ سەعید ئەنجامیدا كە: "هیچ بەڵگە یان ئاماژەیەك نییە پەیوەندی شێخ سەعید و ئینگلیز بسەلمێنێ، مەزەندەكانی توركیا تەنها بانگەشەی راگەیاندن بوو"[3].

دەرهاوێشتەكانی راپەڕینەكە ئەوەی هێنایە پێش كە هیوای ئەوە هەیە یارمەتی لە بەریتانیا وەربگیرێت، بەڵام بەریتانیا لەلای خۆیەوە ئەو هیوایەی بڕی، چونكە لەبەرژەوەندیدا نەبوو یارمەتی هیچ راپەڕینێكی كوردی بدات، بەڵكو بەپێچەوانەوە سەركەوتنی راپەڕینەكە بەواتای زیندووكردنەوەی پەیمانی سێڤەر دەهات، دواتر دووبارە كیشانەوەی داهاتووی ویلایەتی موسڵ كە بەریتانیا هەوڵیدا و هێشتا هەوڵدەدا بە عێراقەوەی بلكێنێ، بۆیە لە توندترین كێشمەكێش لەگەڵ توركیا، رەوتێكی سیاسی بەهێز لە ناو بەریتانیا هەبوو، بۆ دامەزراندنی باشترین پەیوەندی لەگەڵ توركیا بەپەرۆش بوو، بۆئەمەش چەندی قوربانی بدرێت كەمە، بەمشێوەیە بڕیاری حكوومەتی بەریتانی لەو ماوەیە بەتایبەتی -سەرەتای ئاداری ١٩٢٥- ئەوە بوو كە دەبێت نوێنەرایەتیكردنی لە توركیا لە پلەی بالیۆز بێت، دانانی یەكەم بالیۆزی بەریتانی دوای جەنگەكە لە توركیا، لەگەڵ سروشتی پەیوەندییەكانی نێوانیان و حساباتەكانیان بۆ داهاتوو دەهاتەوە[4].

ئەوەی ئەو تێڕوانینە پشتەستوور دەكات، ئەو یادداشتە بوو كە لیندسی بۆ جمبرلن لە ١٩٢٥/١٠/١٦ بەرزی كردبووەوە، كە باسی لە: "یاخیبوونی كورد كردبوو، بە گورزێكی ترسناكی دانا كە بەر سیاسەتی لێنزیككەوتنەوەی بەریتانی توركی كەوت...هەستی نەتەوەیی

١- روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢١٠.

– ولید حمدي، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٣٦٢-٣٦٣.

2- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 22 April 1925, IBTK, No.14 ,PP.53-54.

3- The Emergence ..., P. 128-.

٤- كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥...، ل ل ٩٤-٩٥.



لە كوردستان هەیە، بەڵام هەستێكی نەتەوەیی كوردییە نەوەك توركی، نەتەوەخوازی توركی ئەوەی حسابی بۆ نەكردبوو، ئەوە بوو كە ناتوانێت كوردی پاشكەوتوو بە بەرنامە عەلمانییەكەی رازیبكات..."، بۆ ئەوەی تێكچوونی پەیوەندییەكانی توركی بەریتانی رابگرێت و خواستی بەریتانیا بۆ دامەزراندنی پەیوەندییەكی باش لەگەڵ حكوومەتی ئەنقەرە، لیندسی لەهەمان یادداشت پێشنیاز دەكات كە: "نەتەوەخوازی كوردی بەهەر نرخێك بێت دەبێت رابگیرێت"[1].

توێژەری توركی M.K.Oke فاكتەری دیكە لەبارەی ئەوەی كە بەریتانیای لە دەرەنجامەكانی راپەڕینەكە نیگەران كرد، پێشكەشدەكات، لەوانە: سیاسەتی بەریتانیا لەماوەی دوای لۆزان ـ تەمووزی ١٩٢٣ ـ كە ئامانجی بوو فراوانخوازی كۆمۆنیستی رووسیای سۆڤێتی و پارتە كۆمۆنیستەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەورە بدات. ئەمەش لەسەر بەریتانیا پێویست دەكات كە پاڵپشتی لە حكوومەتی مەركەزی بەهێز لە هەریەكە لە توركیا و ئێران و عێراق بكات[2]، بۆ ئەوەی ببێتە بەربەستێك لەبەردەم فراوانخوازی كۆمۆنیستی كە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا لە تەنگەبەرەكانی توركیا و ناوچەی كەنداو دروست دەكات. مامەڵەی بەریتانیا لە عێراق لەگەڵ بزووتنەوەكانی شێخ مەحموود رەنگدانەوەی ئەو سیاسەتە بوون، كاتێ هێزی ئاسمانی بەریتانی هێرشی كردە سەر ئەو گوندانەی كە پاڵپشتیان لە خواستە سەربەخۆییەكانی شێخ مەحموود دەكرد، بەڵام لەهەمان كاتدا جەختی لەسەر زامنكردنی مافە رۆشنبیرییەكانی كورد لە عێراق دەكردەوە. ئۆلسن زیاتر لەوەی توێژەرە توركییەكە بۆی چووە، دەڕوات، كاتێ باس لەوە دەكات كە هەرچەندە دامەزراندنی كوردستانی سەربەخۆ بە بەریتانیاوە گرێدراوە، بەڵام دەبێتە هۆی ئارامی و ئاسایش لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام ئەمە پاڵ بە توركەكانەوە دەنبێت، بۆ باوەشی سۆڤێت، هەروەها دەستكەوتەكانی بەریتانیا كە لە لۆزان بەدەستی هێناون دەخاتە مەترسییەوە[3].

دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد هۆكاری دیكە پێشكەشدەكات كە پاڵپشتی لە هەمان ڕێڕەو دەكات، دەڵێت: لەبەر ئەوەی ئینگلیز بەتەواوی بەسەر سنووری باشووری ناوچەی راپەڕینەكە

1- Lindsay to Chamberlain,Constantinople,16 -10- 1925,IBTK, No.25, P.80.

2- A Chronology …, 1918-1926,Op.Cit.,PP. 60-61.

3- The Emergence …, Op.Cit.,P. 130“

- راپەڕینی ...، ل ٢١٤.

زاڵبوون، دەیانتوانی کوردستانی تورکیا پڕ لە چەك و جبەخانە بکەن، کە بە هۆیەوە شۆڕشگێڕانی کورد دەیانتوانی بۆ ماوەیەکی درێژتر بەرگری بکەن، بەتایبەت یەکێك لە هۆکارەکانی هەرەسی ڕاپەڕینەکە نەبوونی پاڵپشتی دەرەکی بوو. هەروەها ئەوە جەخت لەو هەڵوێستەی بەریتانیا دەکات لەبارەی مامەڵەی نادۆستانەی لەگەڵ پەنابەرانی کوردی هەڵاتوو لە ستەمی تورکی[1]. پێدەچێت ترسی بەریتانیا لە پاڵپشتیکردنی شۆڕشگێڕان لەوە بووبێت، کە لەوانەیە پاڵپشتییەکەی ببێتە هۆی سەرکەوزتنی ڕاپەڕینەکە، دواتر لەدەستچوونی جلەوی ڕووداوەکان لەدەستی، چونکە ئەو ڕاپەریوانە بەدلینیایەوە داوای لکانەوە بە براکانیان لە ویلایەتی موسڵ دەکەن، هەموو ئەوانە وایان لەبەریتانیا کرد لە نزیکەوە چاودێری ڕاپەڕینەکە بکات[2]، بەڵام بەبێ ئەوەی پاڵپشتی بکات. بەتایبەتی ئەوان (ئینگلیز) تاڵیان لە مامەڵەکردن لەگەڵ سەرانی کورد لە کوردستانی باشوور چەشتبوو، وەك شێخ مەحموود کە لە ساڵی ١٩٢٥ دووجار شۆڕشی لەدژ کردن، ئینگلیز گەیشتە ئەو باوەڕەی کە سوود پاڵپشتیکردن لەسەرکردەی کوردی جوداخواز نییە"[3]، بەڵام لە ڕاستیدا دابەشکردنی کوردستان لە زۆر ڕووەوە زیاتر لەگەڵ سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە ناوچەکە دەگونجا[4].

بەڵگەنامەکانی بەریتانیا جەخت لەبارەی ئەوەی کە ئەو توێژەرانەی ناویانهێنرا بۆی چوون، دەکاتەوە[5]، لە ئاداری ١٩٢٥ لیندسی بۆ چەمبرلێنی لە وەسفکردنی بزووتنەوەکەی شێخ سەعید نووسی،: "کورد گەلیکی دواکەوتوو و دەمارگیری خەلافەتە، مستەفا کەمال سەرباری ئەوەی -ئێستا- لەنێوانماندا هەیە، پیاوێکی سەردەمیانەیە و لاسایی ڕۆژئاوا

١- سەیری نووسینەکەی خۆی: ڕاپەڕینی ١٩٢٥ .....ل ٩٩، ـ ١٠١ بکە.

2- Mim.K.Oke,A Chronology..., PP. 60-61.

٣- عثمان علي، حركة ...، ل ١٦.

٤- خاتوو بیل سیاسەتمەداری ئینگلیز و ئاگادار لەکاروباری عێراق و کێشەی کورد، چوارچێوەی ئەو سیاسەتەی لە زووەوە لە هاوینی ١٩٢١ ەوە دیاریکرد، کە بە ئاشکرا جەختی لەسەر " پێویست ی بوونی کوردستانی دابەشکراو " دەکردەوە. سەیری:

- كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥ ...، ل ٩٧.

5- Memorandum by Lindsay, Constantinople, 8-2-1926, BDFP,IA.Sir, Vol.I, No. 570,P. 819.



دەکاتەوە و سورە لەسەر پرۆسەی تازەگەری، تورکیا فاکتەری ئارامی و بەربەستی بەهێزی بەردەم بەلشەفیکە، بۆیە هەردەبێت پاڵپشتی لێبکەین، بزووتنەوەی شێخ سەعید بزووتنەوەی هێزی دواکەوتوو و تاریکیە، سەرکەوتنی دەرەنجامی باشی نابێت، بەتایبەتی کە دەیەویت خەلافەتی عوسمانی بگەڕێنێتەوە..."[1].

ئۆلسن سەرباری ئەو ڕایە، بەڵگەنامەیەك پێشکەش دەکات، هەڵوێستی حکوومەتی بەریتانی لە ڕاپەڕینی کوردی ١٩٢٥ پێشاندەدات، بە پشتبەستن بەو بەڵگەنامەی کە بەرواری ٨ی نیسانی ١٩٢٦ بەسەرەوەیە، واتە دوای ساڵێك لە لەناوبردنی ڕاپەڕینەکە، کە لیندسی بۆ چەمبرلێنی نووسیووە، لەبارەی کۆبوونەوەی بە عیسمەت پاشای -سەرۆك وەزیرانی ئەوسا- دەڵێت: "ئەگەر بمانویستبا گرفت بۆ تورکیا دروستبکەین، دەمانتوانی پڕیشکی شۆڕشەکە -واتە ڕاپەڕینی ١٩٢٥- بۆ هەموو پارچەیەکی خاکی تورکیا بگوازینەوە، بەڵام ئەمەمان نەکرد، دەبێت باش ئەوە بزانی.."[2].

سەرباری ئەمانەی باسکرا، ڕێنەگرتنی بەریتانیا لەسەر ئەو پاڵپشتییەی کە ئیدارەی فەڕەنسی لە سوریا پێشکەشی هێزەکانی تورکیا کرد، بە ڕێگەدانی بۆ بەکارهێنا نی هێڵی ئاسنی حەلەب لەناو خاکی سوریە بە مەبەستی لەپشتەوە گەمارۆدانی شۆڕشگێڕان[3]، بەڵگەیەکی دیکە بوو لەسەر ڕازی بوونی بەریتانیا لەو ڕێوشوێنانەی دژ بە شۆڕشگێڕان گرتییەبەر[4]، بەتایبەت کە فەڕەنسا هاوپەیمانی بوو، کە دژایەتی بەریتانیای نەدەکرد و لەگەڵی ناکۆك نەدەبوو[5].

١- عثمان علي، حركة ...، ل ١٧.

2- The Emergence ..., P. 130

3- News Summary of the local press respecting the Genj Revolt, 1-3-1925, IBTK. Enclosure 2 in No.9. P. 35“

- ژیانەوە، ڕوژنامە، سلێمانی، ژمارە ٤٠، ١٧-٩-١٩٢٥.لە: ژیانەوە وشوێنی ....

٤- كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥...، ل ل ٩٩-١٠٠.

٥- تۆینبی ئەو هەڵوێستەی بەریتانیا بۆ بوونی ڕێککەوتنی نێوان فەڕەنسا و تورکیا کە لە ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٢١ مۆرکرا، گەڕاندە. مادەی ١٠ی ڕێککەوتنەکە ڕێگە بە تورکیا دەدات داوا لە فەڕەنسا هەنگاوێکی وا بهاوێژێت. سەیری

- Survey …,P. 510 .

زیاتریش لەمە هەندێ بەرپرسانی بەریتانی زۆر لەراپەڕینە کوردییەکەی ساڵی **١٩٢٥** نیگەران بوون، بەڵکو هەندێکیان بە شانۆگەریەکیان دانا کە مستەفا کەمال بەهاوکاری کورد ڕێکیانخستووە، بۆ ئەوەی داگیرکردنی ویلایەتی موسڵ پەردەپۆش بکەن[١]. یان وەك پاساویك بۆ زیادکردنی هێزە سەربازییەکان لەسەر سنوور، بوئەوەی بیکات بە کارتیکی فشار تاکو کار لە هەڵوێستی بەریتانی و خەڵکی ویلایەتەکە لەبارەی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ بکات[٢].

لەراستیدا نە بەریتانیا نە تورکیا هیچ ڕۆلیکیان لە پلاندانان یان ئامادەکاری بۆ راپەڕینەکە نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێ فاکتەری زاتی ناوخۆیی و هەرێمایەتی[٣] ڕۆلی بینی، هەستی نەتەوەیی کوردی ڕۆلێکی گرنگی لە بەرپابوونی راپەڕینەکەدا گێڕا[٤]. ئەمە بەمانی ئەوە نەدەهات کە شۆڕشگێڕانی کورد فاکتەری هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی کە ناوچەکە و کوردستان بەخۆیەوە دەبینی، بەکاربهێنێت، ئەوەی لەبارەی ئامانجی راپەڕینەکەی **١٩٢٥** گوتراوە، هەر چ تۆمەتیکی بخەنە پاڵ، ئەوا راپەڕینە کوردییەکە، نەتەوەیی بوو، داوا کوردستانی سەربەخۆی دەکرد[٥]. هەروەها کاردانەوەی دەمارگیری کۆنەپارێز نەبوو، بخرێتە ناو چوارچێوەی "خەباتی گشتی لە نێوان پێشکەتووخواز و کۆنەپارێز"ەوە، هەر وەك ئەوەی حکوومەتی تورکی و

---

1- F.O.371\10867\5807, E-1360, P.123; Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 31 -3- 1925, IBTK.No.12, P. 50.

- پاشکۆی ژمارە (١٥)

2- Heare to Chamberlain, Therapia,30-5-1925,IBTK,No.19,P.65.

٣- سعاد حسن جواد، التطورات ...، ل ل ١٥-١٧ " تەلار علی ئەمین، سەرچاوە ی پێشووی، ل ل٩٣- ٩٨.

4- F.O. 371\40219\127357, RRX/9/I, P.5.

٥- سەرباری قسەی ئەوانەی بەشداری شۆڕشەکەیان کرد و سەرکردەکانی کە ئامانجی شۆڕشەکەیان باسکردوە، ئەوا سەرۆکی دادگا کە رووی لەوانە کرد کە حوکمی لەسیدارەدانیان بۆ دەرچووە و گوتی: "هەندێکتان خراپی بەرێوەبردنتان لەلایەن حکوومەتتان کردۆتە پاساوی راپەڕینەکە، هەندێکی دیکەتان خۆتان بە بەرگریکەر لە خەلیفە دەزانن، بەڵام هەمووتان لەسەر یەك پرس کۆکن، ئەویش ئەوەیە کە ئیوە کوردستانیکی سەربەخۆتان ویستووە.....". ئەمە بەلگەی ئامانجی راپەڕینەکەیە. سەیری:

- Heare to Chamberlain, Therapia, 1-7- 1925, IBTK, No.20,p70

- محمد شیرزاد، نضال الاکراد، القاهرة، ١٩٤٦، ل ٧.



میدیاکانی وێنەیان دەکرد[١]. بەڵکو نوێنەرایەتی ململانێی نێوان دوو نەتەوەی کوردی و تورکی دەکرد[٢]، ئەمەش یەکەمجار نەبوو کە ئایین بۆ مەبەستی نەتەوەیی و نیشتیمانی بەکاردێت. تورکەکان خۆیان لە زۆربەی جار ئایینیان وەك ئامرازیك بۆ یەکێتی یان جیایی بەو شێوەیەی کە خزمەتی ئامانجەکەی بکات، بەکارهێنا وە[٣].

جیاوازی توێژەرانی لەبارەی پالنەر و سروشتی راپەڕینە کوردییەکە، ڕێی لەوە نەگرت لەسەر ئەوە کۆك بن کە راپەڕینەکە هەڵوێستی تورکیا لەبارەی کێشەی موسڵەوە لەبەرامبەر بەریتانیا لاواز کرد[٤]، بەتایبەت بەهێزترین کارتی تورکیا لەبارەی ئارەزووی کورد بۆ پێکەوە ژیانیان لەگەڵ برا تورکە موسڵمانەکانیان لە دانووستاندنەکان لاوازکرد، کە تورکیا بەردەوام داوای راپرسی لەو ویلایەتە دەکرد کە زۆربەی دانشتوانەکەی کوردن.

---

١- کمال مظهر، انتفاضة عام ١٩٢٥...، ل ١٣٧.

- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P. 508.

- Mim.K.Oke سیاسەتی بەریتانیا لەکاتی روودانی شۆڕشەکە بە گورزێکی کوشندە بۆ دیپلۆماسییە سەرکەوتووەکەی دژ بە ئەنقەرە لەمیانەی کێشەی موەسل دانا.سەیری:

- A chronology …, P.62.

٢- تۆینبی گەڕاندنەوەی هۆکار راپەڕینەکە بۆ پالنەری دەمارگیری کۆنەخوازی هەتاکو ئاینیش ڕەت دەکاتەوە، پاساوی وا پێشکەشدەکات کە **پالپشتی** لە بیرۆکەکەی دەکات، ئەوانیش:

١- زۆربەی رووداو و زانیارییەکانی تایبەت بە راپەڕینەکە لە سەرچاوە حکومیە تورکییەکان وەرگیراون، کە بە ئەنقەست شێوێنراوە.

٢- ئەگەر راپەڕینەکە ئایینی بوو، بۆچی لە ناوچەکانی دیکەی تورکیا لە ئەرزەروم و تەرابیزۆن و سامسۆن بلاونەبووەوە، ئەو شوێنانە لە رووی پلەی دواکەوتەیی و کۆنەپاریزی وەك کورد بوون، بەڵکو ئەوانە بەخۆیان دوای سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی کوردان شۆڕشیان دژ بە عەلمانیەتی ئەنقەرە کرد.

٣- رەفتاری دانیشتووانی ویلایەتەکە بەڵگەی ئەوەدا بەدەستەوە کە سیفەتی یاخیبوونەکە ئایینی نەبووە، بەلکو نەتەوەیی بووە، سەیری نووسینەکەی خۆی بکە:

- Survey ..., PP. 508-510.

٣- جرجیس فتح الله، یقظة ...، ل ٣١٣.

4- Mim.K.Oke,A Chronology..., PP.61-62; A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.510; Vladimer F.Minorsky, A.G.E, SS.44-45- .

شێوازی مامەڵەکردنی تورکەکان لەگەڵ شۆڕشگێڕان هەڵەیەکی دیکەبوو لە زنجیرەی ئەو هەڵانەی کە وایکرد لە کۆتاییدا ویلایەتی موسڵیان لەدەست بچێت، ئەو هەڵەیەی کە هەر لەسەرەتاوە زۆر روون بوو، ئەویش بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت بوو، کە تاکە داوی بەیەکەوە گیردانی کورد و تورك بوو[1].

دەرەنجامەکانی راپەڕینی کوردان لەسەر سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی حکوومەتی ئەنقەرە زۆر نێگەتیڤ بوو، سەبارەت بە دەرەنجامە ناوخۆییەکانی، سەرباری ئەوەی مستەفا کەمال راوەدووی ئۆپۆزسیۆن و سەرانی ئۆپۆزسیۆنی دەنا[2]، ئەوا گەورەترین دەرەنجامی ئەوە بوو کە پەیوەندییەکانی تورك و کوردی زۆر خراپ کرد، کە دواتر تورکیا زۆری بەدەستەوە ناڵاند، بەرەبەرە بووە ناکۆکی نێوان حکوومەتی تورکی و گەلی کورد[3]، ئەمەش وایکرد متمانەیان لەنێوان نەمێنی و گومان بکەوێتە نێوان هەر گەلەکە. گەلی کورد لە باکووری کوردستان باجی ئەو هەڵوێستەیان بەگران دا، مستەفا کەمال راپەڕینەکەی ئەو دواییەی بە "گورزێك کە

١- لیندسی بەر لە لەسیدارەدانی شێخ سەعید قسەی شێخمان بۆ دەگوازێتەوە کە گوتبوو: "تاکە داوێك کە کورد بە تورکەوە دەبەستێتەوە، ئاینی ئیسلام بوو، دوای ئەوەی تورکان ئەو داوەیان پچڕاند، ئەوا کورد ناچارن بۆخۆیان هەوڵی دابینکردنی داهاتووی خۆیان بدەن. سەیری:

- Lindsay to Chamberlain,Constantinople,2 -2-1925, IBTK,No.5,P. 21.

٢- سعاد حسن جواد، التطورات...، ل ل ١٨-٢٠.

٣- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦.

- N. Intissar, Op.Cit., P. 84 .

تۆینبی بە توندی رەخنە لە ساسەت و شێوازی مامەڵەی تورکیا لەگەڵ شۆڕشەکە دەگرێت، بە "سیاسەتێکی گێلانەو ناحەکیمانەی" وەسفکرد، شێوازی مامەڵەی بەریتانیای لەگەڵ عێراقەکان لەمیانە و دوای شۆڕشی بیست بە رەفتاری حکوومەتی تورکی بەرامبەر کوردە راپەریوەکان بەراورد کرد، بەڵام رەفتار و مامەڵەی بەریتانیای لەگەڵ شۆڕشەکانی شێخ مەحموود لەبیرکرد، کە بەریتانیا نوێترین چەکی بەکاریهێنا، بۆیەکەمین جار فرۆکەی بۆ مەبەستی سەربازی لەدژی کورد لە کوردستانی باشوور بەکارهێنا، بۆردومانی ئەو فرۆکانە لەسەر گوندە کوردییەکان زۆر توند بوو، هەندێکیان لەگەڵ زەوی تەختکران، ئەوە سەرباری زیانی مرۆیی. سەیری نووسینەکەی خۆی بکە:

- Survey …, P.510.



لەپشتەوەڕا لە تورکیا درابێت لە ناسکترین ساتەوەختەکانی مێژووی سیستەمەکەی، ئەمەش پاڵی پیوەنا جامی تووڕەیی خۆی بەسەریاندا بڕژێنێ.."[1].

هەرچی دەرەنجامەکانی راپەڕینەکە بوو لەسەر سیاسەتی دەرەوەی، کە بە توێژینەوەکەی ئێمەوە پەیوەستە، گرنگترینیان ئەوەبوو کە ململانێی لەسەر ویلایەتی موسڵی بە بەرژەوەندی بەریتانییەکان یەکلاییکردەوە، "چونکە راپەڕینەکە بەسادەیی بەمانای ئەوە دەهات کە کوردان بە پالنەری نەتەوەیی و ئایینی تورکیای کەمالی رەتدەکەنەوە، ئەمەش کاریگەرییەکی ئاشکرای لەسەر رای گشتی جیهانی دانا،.... کارێکی سروشتی بوو ئەمە بەتوندی لە کۆمەڵەی نەتەوەکان رەنگدانەوەی هەبێت،.. بە تایبەت لیژنەکە تازە دەستی بە ئامادەکردنی راپۆرتەکەی بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵە کردبوو[2]، ئەو راپەڕینە پاڵی بە تورکیا و بەریتانیا نا تاکو لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ناکۆکییەکانیان پەلە بکەن، وای لە هەردوولاکە کرد نەرمی زیاتر لە گفتوگۆکان بنوێنن، ئەمەش بۆ نزیککردنەوەی بیروبۆچوونیان یارمەتی دەربوو[3].

هەروەها راپەڕینە کوردییەکە تورکەکان و بەریتانییەکانی بۆ هاوکاری لە دۆزینەوەی شێواز و پلانێکی هاوبەش هاندا کە لەسەر ئاستی هەرێمایەتی رووبەڕووی داخوازی و داواکارییە داهاتووییەکانی کورد ببنەوە، کە هەڕەشە لە قەوارەی تورکی و عێراقی هەتاکو ئێرانیش دەکات، ئەو هاوکاریە ئەو بنەمایەی پێکهینا کە رێککەوتنی حوزێرانی ١٩٢٦[4]ی لێکەوتەوە، لەنێوان تورکیا لەلایەك و بەریتانیا و عێراق لەلایەکی دیکەوە.

لەهەمان چوارچێوەدا، راپەڕینەکە لە دەرخستنی هاوکاری هەرێمایەتی تورکی- فەرەنسی بەشداریکرد و پەیوەندی تورکیا بە فەرەنساوە بەهێز کرد، کاتێ فەرەنسا رێگەی بە هێزەکانی تورکیادا بەناو سوریا (کە ژێر ئینتیدابی فەرەنسی بوو) لە پشتەوەڕا بۆ شۆڕشگێڕان بسوڕێنەوە[5]. ئەو هاوکاریە بەشێوەیەکی گەورەتر لە هەوڵەکانی ئاساییکردنەوەی بەریتانی - عێراقی- تورکی بەرجەستەبوو، هەروەك دواتر روون دەبێتەوە.

١ -کمال مظهراحمد، کرکوك...، ل ٢١٠.

٢ - المصدر نفسه...، ل ل٢٠٨-٢٠٩.

3- N. Intissar, Op.Cit., PP. 84-84“

- روبەرت ئۆلسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢١٥.

٤- سەیری پاشکۆی ژمارە (١٣) بکە.

5- A.J.Toynbee, Op.Cit., P. 510.

# گۆڕاوی کوردی لە پەیوەندییەکانی تورکیا- بەریتانیا

# (١٩٢٥- ١٩٢٦)

بە رای زۆربەی توێژەران پرسی کورد، ڕۆڵێکی گرنگ و گەورەی لـە نزیککردنـەوەی نێـوان بەریتانی و تورکیای داوە[1]، یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کە پەلەی لەهەردوولاکە کردووە، بگەنە ڕێککەوتن. بەهۆی ئاڵۆزییەکانی کێشەی موسڵ و دابەشکردنی لە نێوان چەند دەوڵەتیك، بووە ڕەگەزیکی وا کە جۆرێك لە گرنگی پێبدرێت[2].

ئەو یادشتانەی کە لە نێوان لیندسی- بالیوزی بەریتانی لە تورکیا- و وەزارەتـی دەرەوەی بەریتانیا ئاڵوگۆڕدەکران، ئەوە دەردەخات کە لایەنیکی گرنگی دانووسـتاندنەکانی تورکـەکان لەگـەڵ بەریتانییـەکان بـە پرسـی کـوردەوە پەیوەسـتبوو. هـەروەك ئـەو یادداشـتانە ڕوونـی دەکەنەوە، زۆربەی چاوپێکەوتنەکانی نێوان بەرپرسانی تورکی و هاوتا بەریتانییەکـەیان بـەبێ باسکردنی پرسی کوردی نەبووە، لەمبارەیەوە ئۆلسن دەڵێت: "خواستی تورکیا بـۆ ئـارامی و بێ توانایی لە زاڵبوون بەسەر شۆڕشەکانی کورد و پرسی نەوت، فاکتەری یارمەتی بەخشی بە بریتانیا لە دانووستانەکانی لەگەڵ تورکەکان دا بەدەستەوە"[3]. ڕۆژنامەی (تایمس)ی لەندەنیش ئەو بابەتەی دووپاتکردەوە، کاتێ پەیامنێرەکەی لە ئەنقەرەوە ڕاپۆرتیکی لـە ١٩ی کـانوونی یەکەمی ١٩٢٥ بۆ ڕۆژنامەکە نارد، ئەمەی تێدا هاتبوو: "چەندی مرۆڤ لە گفتوگۆی دۆسـتە تورکـەکانمان وردبێتـەوە، ئـەوەی بـۆ دەردەکـەوێت کـە کێـشەی کـورد بنـەمای هـەموو

1- N. Intissar, Op.Cit.,PP. 84-85

- İsrafil kurtÇephe, OP.Cit..P.4.

– روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢٣٩"جەبار قادر، سەرچاوەی پێشووی، ل ٥٩.

٢- برهان الدین ابابکر، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٣.

٣- روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢٣٥.



کێشمەکێشەکە پێکدێنێ. ئەو بابەت کەم لە ڕۆژنامەی تورکی باسدەکرێت، ...لە ڕاستیشدا، خاڵێکی جەوهەری هەموو پرسەکەیە"[1].

بەرلەوەی باسی پێگەی کورد لە دانووستاندنەکانی ئێستای نێوان بەریتانییەکان و تورکەکان بکەین، دەتوانین ئەوە بلێین کە حکوومەتی تورکی لەوەتەی ١٩٢٥ەوە جـەنگیکی بـەردەوامی دژ بە کوردی بەرپاکردووە[2]. لەو ماوەیەی کە لە تشرینی دووەمی ١٩٢٥ەوە دەسـت پیـدەکات کوردستانی تورکیا ناسراوە "ڕۆژگار مێژووەکەی حەلال کـرد"، "کوردسـتان بـە ئـاگر وئاسـن ویرانکرا، پیاوانی ئازاردران و کوژران، گوندەکانی سوتینران و بەروبوومەکەی بێ کەڵکرا و ژن و منداڵ ڕفێنران و تیرۆرکران..."[3].

سەرلەنوێ زۆربوونی گفتوگۆکان لە کۆمەڵەی نەتەوەکان و نزیککبوونـەوە لـە دیـاریکردنی چارەنووسی کۆتایی ویلایەتەکە، نەبووە ڕێگر لەبەردەم تورکەکان بۆ ئەوەی پرۆژەکانیان لەبارەی ڕاگواستنی کورد و **مەسیحییە**کان بۆ باشووری **هێڵی** برۆکسل بوەستێنن یان ڕابگرن. لیندۆنـەر نێردەی تایبەتی ئەنجوومەنی کۆمەڵە لەمیانەی ئامـادەبوونی لـە زاخـۆ بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە سکاڵایەك کەپێشتر لەمبارەیەوە پێشکەشکرابوو، شاهێدی کردەوەکـانی ڕاگواسـتن و ئـازاردان بوو، کە تورك دەرهەق بە کورد و **مەسیحییە**کانی دەکرد[4].

هەرچۆنێ بێت، دوای دەرچوونی بڕیاری کۆمەڵە لە ١٦ کانوونی یەکـەمی ١٩٢٥ سـەبارەت بـە لکاندنی موسڵ بە عێراقەوە، دەنگی میدیای تورکی بەرزبووەوە، هەروەها گفتوگۆیەکی زۆر لـەنێوان بەرپرسانی تورکی سەبارەت بە گەڕاندنەوەی موسڵ بە زەبری هێز. ئەوەی وای لە تورکەکان کرد کە لە ئەنجامدانی هێرشێکی چاوەڕوانکراو تەمبەڵی بکەن، ئەوە بوو کە متمانەیان بە لایەنی کوردی نەبوو، کە باکووری ویلایەتەکە و ناو تورکیا و خـودی ویلایەتەکـە نیـشتەجێن، هەنـدێکیان گومانیـان لـە مانەوەی کورد بەهێمنی و ئەنجام نەدانی کردەوەی چەکداری لەپشت هێـزە تورکییـە هێرشـبەرەکان،

1- The Times", No.44, 150, December 21, 1925.

- نقلا عن: کمال مظهر احمد، کرکوك ...، ل ل ١٨٩-١٩٠.

٢- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٦.

٣- نورالدین زازا، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢.

٤- بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو کردەوانە سەیری:

- (نص رسمي تتمة لأعمال لجنة ليدونر في الجانب العراقي)، ل ورة كتاب قائمقام قضاء زاخو، المرقم ٣٥٦٨ والمؤرخ ١٤ تشرين الثاني، ملخص أعمال اللجنة في زاخو، مقتبس من: مريم عزيز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ل ١٢٥-١٢٧.

پێشاندا. هێزە تورکییە هێرشبەرەکە پشتی دەکەوێتە ناوچەی کوردستانی تورکیا، کە دوای راپەڕینی ١٩٢٥ زۆر لە ئارامی دوور بوو، کە زۆربەی سوپای تورکی لەوێ مۆڵگەی داکوتابوو..."[1].

لەلایەکی دیکەوە سوپای تورکی بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی و خۆ دوورگرتن لە کاردانەوەی لایەنی کوردی لە ویلایەتی موسڵ، بەریتانیا لەرێگەی دەسەڵاتدارانی عێراقی هەوڵیدا کورد لە وەرگرتنی مافەکانیان دڵنیا بکاتەوە، کاتێ عەبدولموحسین سەعدون سەرۆك وەزیرانی عێراقی لە ٢١ ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ لەبەردەم پەرلەمانی عێراقی وتاریکی پێشکەشکرد، باسی لەوەکرد کە ئەرکی حکوومەتی عێراقییە "کە نەتەوەکانی باکوور بەتایبەتی کورد مافی نەتەوەییان پێ بدات، سوربوو لەسەر ئەوەی کە ئیدارەیەکی وایان هەبێت کە لەگەڵ خواست و بەرژەوەندییەکانیان بگونجێ"[2].

بەهۆی ئەو ئەزموونە زۆرەی کە بەریتانییەکان لە دانووستاندن لەگەڵ تورکیا بەدەستی هینابوو، سەبارەت بە پرسی موسڵ (هەر لە داگیرکردنی موسڵەوە لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ تا ١٦ کانونی یەکەمی ١٩٢٥)، ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە یەکێك لە فاکتەرەکانی کەللە رەقی تورکیا سەبارەت بە کێشەی موسڵ ئەوە بوو کە: "ترسیان لە سەروەری یاسا و ئاسایشی نێوان کوردان هەیە کە، لە تورکیا ببێتە هۆی بزووتنەوەیەکی جوداخوازی"[3]. بەریتانییەك توێژینەوەیەکی لە گۆڤاری Journal of central Asia studies نووسی کە ترسی تورکەکانی تێدا بەدەرخست، کە تێیدا هاتبوو کە: "ئەو لەوباوەڕەدایە کە تورکەکان بەهۆی مەیلی جوداخوزی هاوڵاتییە کوردەکانی پەشۆکاون، هەستیان بەوەکردووە کە تاکە رێگا بۆ سەرکوتکردنی چالاکییەکانیان ئەوە کە چەندی بکرێت دەستبەسەر ناوچە کوردییەکانی عێراق دابگرن"[4].

---

1- Memorandum Respecting the Iraq Frontier Dispute, Foreign Office, 23-10-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.524,P.767.

٢- مقتطف من كلمة ألقاها رئيس الوزراء في مجلس النواب، ٢١ كانون الثاني ١٩٢٦، ملحق للمرفق ٢٧، جو ٤١١/٢٣ الجزء ١، اكس رام ٤٥٨٣، ل ٨٤.المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٨٤"

- Peter Sluglett, Op.Cit., PP.182-183.

٣- فاضل حسين، مشكلة...، ل ٢٧٠.

٤- المصدر نفسه، ل ٢٥٥.



لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٦ لیندسی گەیشتە ئەو باوەڕەی کە: "نیگەرانییەکی کردەیی لە پرسی نەتەوەیی کوردییەوە هەیە، لەرووی بوونە کردارییەکەی لە کوردستانی تورکیا، تورکیا ئامادەیە هەر نرخێك بدات بۆ ئەوەی ئەو پرسە لەناو ببات"[1]. لەهەمان کاتدا پرسی موسڵ دوایین کۆسپ و تاکە کۆسپی بەردەم بەهێزبوونی پەیوەندییە دۆستانەکانی نێوان بەریتانیا و تورکیایە.

لەمەوە، سیاسەتمەدارانی بەریتانی لەوە گەیشتن کە ئەوەی تورکەکان دەیڵێن شتێکەو ئەوەی دەیخوازن شتێکی دیکەیە، هەروەك توینبی دەڵێت: "پرسی نەوت بۆ تورکەکان وەك پرسی کوردی لە تەرازوودا هاوسەنگ نییە"[2]. روشدی بەگ لە کۆبوونەوەی بە لیندسی لە ٢٩ کانوونی دووەمی ١٩٢٦ زیاتر رۆشن بوو، کاتێ گوتی: "خاڵی یەکەم پرسی ئاسایشە، چونکە بە هەڵوێستی کوردەوە کاریگەر دەبێت...کێشەیەکی چاوەڕوانکراو لەلایەن کوردی ئێرانەوە لە ئارادا نییە[3]، بەڵام بە بوونی ژمارەیەکی زۆر کورد لە دەستی هێزی سێیەم، کێشە لە ئارادا دەبێت"، زیاتر جەختی لە پرسەکە کردەوە کاتێ گوتی: "کوردی باشوور بەردەوام حەزدەکەن بە

---

١- روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ل ٢٣٩-٢٣٠.

٢- توینبی بەرگری لە هەڵوێستی حکوومەتی لەندەن دەکات، لەوەی کە پرسەکە پرسی نەوت نەبووە، لەمەشدا قسەیەکێ جمبرلێن بۆ پاڵپشتی قسەکەی دەهێنێتەوە کە لەبەردەم پەرلەمانی بەریتانی لە ١٨ شوباتی ١٩٢٦ پێشکەشی کردبوو، کە ئەو لە ئازاری ١٩٢٥ لەلایەن حکوومەتی تورکییەوە بە دوو قۆڵی چەندی ئیمتیازاتی نەوت و مافی گەڕان بەدوای نەوت و بەکارهێنانی بەندەرە تورکییەکان و نزیکەی ٣٠٠٠ کیلۆمەتر هێڵی ئاسنی بە بەریتانیا بەخشیوە، بەڵام ئەو بەرووخستنە تورکییەی رەتکردۆتەوە، چونکە حکوومەتی خاوەن شکۆ ئەمیندارە بەسەر عێراقەوە نەوەك مولکدار و هیچ سازشێك لەسەر مافەکان و بەرژەوەندییەکانی عێراق و گەلەکەی لەبەرامبەر ئیمتیازاتی خاوەن سەرمایە بەریتانییەکان ناکات. سەیری: نووسینەکەی خۆی بکە:

- Survey ..., P.529.

٣- هەڵوێستی رەزا شا بەرامبەر سەرجەم نەتەوە نا فارسییەکان دوژمندارانە بوو، ئەویش هەر لە ساڵی ١٩٢٦ سیاسەتی راگوازتن و قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی جێبەجێکرد، بۆ وردەکاری زیاتر سەیری:

- کمال مظهر احمد، دراسات...، ل ل ٢٥٥-٢٥٦.

- R.Olson,Op.Cit.,PP.162-163.

کوڕان باپیرەیان لە تورکیا گرێبدرێن..."[1]. ئەوکات لیندسی بۆ بەرپرسی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی روونیکردەوە کە پرسی ئاسایش بۆ تورکیا لە پێش پرسی زەوی و موسڵەوە دێت[2].

هەریەکە لە فەرید هالیدای و هێنری بارکلی- کە دوو نووسەرن لەبارەی کێشەی کوردەوە بە تیروتەلی نووسیوویانە - کۆکن لەسەر ئەوەی کە "نەوت تەوەری سیاسەتی تورکی نییە لە بەرامبەر کوردستانی عێراق. تاکە پاڵنەرێکی سیاسەتی تورکیا ئەوەیە کە دەخوازێت هەر: "دەسەڵاتێك یان کاریگەرییەك لەنابەریت کە هانی کوردی تورکیا بدات بۆ ئەوەی داوای سەربەخۆیی زاتی یان سەربەخۆیی تەواو بدات..."[3].

لەراستیدا، بەریتانیا خۆی دەیووست رێگای گەیاندنی بە هیند و تورکیا زامن و بەتین بکات، ئەوەش بە بوونی **هێڵی** پشتەوەی کوردی بەدی نەدەهات، بۆیە نەدبوو بیر لە وروژاندنی کورد بکاتەوە[4]. کێشەی کوردستان بە: "ترسناکترین کێشەی رژێمی ئێستا (کەمالی) دادەنرێت"[5].

بەم شێوەی پەرەسەندنەکانی پرسی موسڵ و دانووستاندنەکانی تورکی- بەریتانی زیاتر کێشەی کوردی بەگشتی و کێشەی کورد لە باکووری کوردستانی بەتایبەتی ئالۆز، دژایەتی لەنێوان بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا و تورکیا لەلایەك دروستکرد، لەلایەکی دیکەوە لە نێوان ماف و چارەنووسی کوردستان دروستکرد، بەریتانیا بە **دڵنیاییەوە** هەوڵی زامنکرد بەرژەوەندییەکانی دەدا، ئەمەش بەهۆی رازی بوونی تورکەکان لەسەر لکاندنی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە دابین دەبوو، ئەوەش هەر تەنها بەمانای نەبەخشینی مافە ئیداری و رۆشنبیریەکان

---

1- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 29-1-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.561, P.806.

2- Ibid,PP. 806-807.

٣- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ٥٠.

٤- روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢٣١.

٥- رۆبیرت ئۆلسن لەو باوەڕەدایە کە هەتاکو بەر لە کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی عەبدولحەمیدی دووەم، تورکە لاوەکان لەگەڵ نەتەوە خوازانی کورد لە کێشە دابوو، لەناوبردنی ئەرمەن - بێگومان بەهۆی قەسابخانەوە - وایکرد بەربەستی نێوان نەتەوەکەی کوردی و تورکی نەهێشت، بەردەوامی ململانێکە ئاماژەی ئەوە بوو کە نەتەوەی کورد و کۆماری تورکی (عەلمانی) نایانەوێت بە ئاشتی بەیەکەوە بژین، لە راستیدا رووداوەکانی دوایی **پاڵپشتیان** لەوەی ئۆلسن بۆی چوو کرد. سەیری: هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٠ بکە.



بە کوردانی باشووری کوردستان نەدەهات، بەڵکو جەختکردنەوەی تورکەکان لەسەر پڕۆژەی تواندنەوەی کورد لە کوردستانی باکوور لە بۆتەی نەتەوەی تورکی دەهات و بەرگریکردن لە هەر ئاڕاستەیەك کە هەڕەشە بۆ پڕۆژە تورکییەکان دەنێتەوە، " بوونی تورکیایەکی بەهێز بۆ سیاسەتی بەریتانی پێویستە..چونکە ململانێ ناوخۆییەکان زیاتر تورکیا لاواز دەکات....و دەیکات بە پارۆێکی چەور کە جیرانە دوور و نزیکەکان چاوی لێ دەبڕن..."[1].

ئەو یادداشتەی کە لیندسی بۆ دائیرەکانی دەرەوەی لەندەن، بەرزیکردەوە، تێڕوانینی بەریتانیای بەرامبەر کوردی تێیدا رەنگدابووەوە، کە تێیدا باسی ئەوەی کردبوو کە "کورد هەڕەشەیەکی گەورە بۆ سەر بیری حکوومەتی تورکی دروست دەکەن....، تورکیا ناتوانێت ناوچەیەکی فراوان کە کوردی بەشێکی گەورەی دانیشتووانەکەی پێکدێنن، واز لێبێنێ، لە هەمانکاتدا کورد لە تورك دواکەوتوو ترن....، ئەوان (کورد) بە قوڵی بۆ ئایین دەچن و سەرەتای هەستی نەتەوەییان هەیە..."، بەمشێوەیە پاساوی بۆ سیاسەتی تورکەکان لەبەرامبەر کورد هینایەوە و گوتی: "کۆمار بەو جۆرە ئارام نییە کە بتوانیت تاکە سیاسەتێك لە رۆژهەڵات و ناوچەکانی دیکە رۆژئاوا جیبەجی بکات، بۆیە ناچارە ساسەتی هاوچەرخی و مەدەنی بەسەر کوردەکانی جێبەجێ بکات، هەروەك بەسەر تورکەکانی جێبەجێ دەکات، زیاتریش لەمە بەزۆر بەکارهێنانی فشار ئەگەر بزانێ پێویست دەکات، بەسەر هەر شتێك کە هێما بێت بۆ نەتەوەیی کورد[2].

بەریتانیا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ئەگەر جۆرێك لە گەرەنتی لە دژی مەترسی لەدەستچوونی ناوچەی کوردی لە تورکیا، بە تورکیا بدرێت، لەرێگەی دابینکردنی سنووری تورکیا عێراق[3]، لەوانەیە ئەمە لەو هەڵوێستەی ئێستای دابەزێنێ و بۆ رێککەوتن لەگەڵی رابکێشرێت. ئەمەش تەنها لەسەر حسابی کورد نەبێت روونادات، بەریتانییەکان بەخۆیان

---

1- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 18-1-1920, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.557, P.803.

2- Memorandum by sir Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 8-2-1926, BDFP, IA .Sir,Vol.I, No.570,P.819.

3- Memoranda respecting the Iraq Frontier Dispute, Foreign Office, 23-10-1925, BDFP. IA. Sir, Vol.I, No.534, P.768.

دانیان بەوە نا کاتێ باسی ئەوەیان کرد کە بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان دەسەڵاتی بە بەریتانیا داوە کە "ئۆتۆنۆمی لەناو کوردی عێراق بڕوێنێ، ئەنجامی ئەمەش ئەوە دەبێت کە کوردی سەر سنووری تورکیا بەرگری زیاتری پرۆسەکانی توانەوە دەکەن، زوو یان درەنگ داوای یەکگرتن بە برا نیمچە سەربەخۆکانیان لە عێراق دەکەن، ئەمەش واتە زیان دان لە تورکیا لە رووی گەل و خاکەوە. ئەمەش ئەو هەڵەیەیە کە دەبێت بە هەر نرخێك بێت لێی دووربکەوینەوە.."، یادداشتەکە پاراستنی سنووری تورکی عێراقی لەلایەن بەریتانیاوە بە گەرەنتی بۆ تورکیا لەم مەترسییەی دانا و لەوانەیە مستەفا کەمالی پێ رازی بکرێت. دواتر یادداشتەکە پرسیاری کردووە "چۆن ئەمە دەکرێت بەبێ ئەوەی خیانەت لەو مافانە نەکەین کە گفتوگۆ هەڵناگریت، لەبارەی پرسی پێشکەوتن و پەرەسەندنی نەتەوەیی و سەربەخۆیی....؟"[1].

بەریتانیا لە دانووستاندنەکان گەیشتە دوو رێگا، یەکەم یا ئەوەتا لەسەر بنەمای ئەو بەڵێن و سۆزانەی خۆی یان حکوومەتی عێراقی پێشتر پێیداون و بە گوێرەی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان (ماددەی ٣ و ٤) کە زامنی مافە نەتەوەییەکانی کورد و ئیدارە و رۆشنبیری، پابەندییەکانی بەرامبەر کورد لە ویلایەتی موسڵ بێنێتەدی، یان ئەوەتا رێگای دووەم، بەرژەوەندییەکانی زامن بکات، ئەوەش نایەدی تەنها بە گەڕانەوەی پەیوەندییە پچڕاوەکانی بە تورکیاوە نەبێت، بۆ سەردەمی گەشەسەندووی جارانی، بۆ ئەوەی زامنی بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆر بکرێت و رێگە لە چوونی تورکیا بۆ باوەشی سۆڤیێت بگرێت، ئەمەش تەنها بە رازی کردنی تورکەکان لە رێگەی دانووستاندنی دوو قۆڵی لەگەڵیان دەبێت، کە تێدا تورکەکان بەوە رازی بکرین کە لکاندنی موسڵ بە زۆرینە کوردییەکەیەوە بە عێراقەوە، هەڕەشە لەسەر یەکێتی و ئاسایش و سەلامەتی خاکی تورکیا دروست ناکات.

سروشتی بوو بەریتانیا هەوڵ تا دوا توانی کار بۆ بەدیهێنانی رێگای دووەم بکات، بۆیە لە دانووستاندنەکانیان جەختیان لەسەر پرسی کورد کردەوە، کورد و پرسی مافەکانی بووە تەوەری گفتوگۆی دوو لایەنەکە، تیریل- کارمەندیکی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی ـ لە هەوڵێك بۆ دڵنیاییکردنەوە تورکەکان: "ئێمە مەبەستمان نییە لە عێراق (ئینتیدابی خۆیانە) لە نزیك سنوور، هیچ شێوەیەك لە شیوەکان ئۆتۆنۆمی کوردان پەرەپێ بدەین، هەرچییەکی کردمان،

1- Memoranda rRespecting the Iraq Frontier Dispute, Foreign Office, 23-10-1925, BDFP. IA. Sir, Vol.I, No.534, P.766.



مەبەستمانە بیکەین، لە رێگەدان بە قسەکردن بە زمانی کوردی و دامەزراندنی فەرمانبەرانی کوردی لۆکالی....زیاتر نیە"[1].

بروسکەیەکی بەرواری ١ی شوباتی ١٩٢٦ کە لە سکرتاریەتی مەندوبی سامی بەریتانی لە عێراق بۆ بارەگای هێزی ئاسمانی بەریتانی لە بەغدا بەرزکراوەتەوە، سیاسەتی نوێی بەریتانیا روون دەکاتەوە، کە باسی ماددەی دووی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی تایبەت بە لکاندنی موسڵ بە عێراقەوە" وا دێتە بەرچاو کە سیاسەتی حکوومەتی خاوەن شکۆ هانی هەستی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستان دەدات بە ئامانجی هێنانە کایەوەی وڵاتێکی سەربەخۆی کوردی . راستییەکەی ئەوەیە کە حکوومەتی خاوەن شکۆ لەمیانەی جەنگەکەدا زۆری بۆ هاندانی کورد کردووە، کاتێ وای زانی کە پەسندکردنی پەیمانی سیڤەر کارێکی شیاو دەکات، ئەمەش دەرەنجامی خراپی لێکەوتەوە، بەڵام سیاسەتی ئێستای حکوومەتی خاوەن شکۆ بێگومان لای فەرماندەی هێزی ئاسمانی زانراوە، ئەویش هان نەدانی هیچ هەوڵێك بۆ بەگرتنەبەری سیاسەتی جوداخوزای لەلایەن کوردانی عێراقەوە...". لە کۆتاییدا یادداشتەکە دەڵێت: "حکوومەتی خاوەن شکۆ باوەڕی وایە کە دەبێت ئەمانە(کوردی عێراق) بەتوندی بە دەوڵەتی عێراقەوە تێکەڵاوبکرێن"[2].

ماددەی دووەم روون بوو لەبارەی پارێزگاریکردن لە تایبەتمەندێتی گەلی کورد، بەریتانیا ئەو کات پێشوازی لەو ماددەیە کرد، هەتاکو بەر لە دەرچوونی بڕیارەکەش، دانوستانکارانی بەریتانی بەوەی کە یارمەتی کوردا دەدەن لە دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی تورکەکانیان شەرمەزار دەکرد، بەڵام یادداشتە بەریتانییەکە و سیاسەتەکان دواتری ئەوەی بەدەرخست کە فێڵی لەماددەکە و مافەکانی گەلی کورد بەتەواوی کردووە، هەرکە بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان لەبارەی لکانی موسڵ بەعیراوە دەرچوو، بەریتانیا لەو بەڵێنانەی بە گەلی کوردی دابوو پاشگەزبووەوە.

1- Tyrell to Lindsay, Foreign office, 30-12-1925, BDFP, IA.Sir,Vol.I, No.554, P.797.

٢- من سكرتارية فخامة المندب السامي للعراق الى مقر القيادة الجوي، بغداد سري، رقم. جي١٠و ١١٨، في ١ شباط ١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٤٣.ينظر الملحق رقم ( ١٦ ) .

لە راستیدا ئەو تێزانەی بەریتانیا لەلایەن تورکەکانەوە وەڵامدرایەوە، لەمیانەی دانووستاندنەکانی نێوان بەرپرسانی تورك و بەریتانییەکان، دانوستانکاری تورکی دوای ئەوەی لەلایەن بەریتانیاوە لەبارەی داهاتووی کوردی دەرەوەی تورکیا بەتایبەت لە ویلایەتی موسڵ **دڵنیا**کرایەوە، ئەو وەڵامەی دەربڕی. لیندسی تێبینی ئەوەی کرد کە روشدی بەگ چیدی بەهیچ شێوەیەك لە شیوەکان باسی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە تورکیاوە ناکات، بەڵام بەردەوام باسی لەوە دەکرد کە پرسی کورد لەگەڵ پرسە بنەڕەتییەکەی(موسڵ) یەکتری کێش دەکەن"[1].

لەوانەیە ئەوانەی دەیانگوت کە تورکەکان بەپلەی یەکەم کوردیان ویستووە، پشتیان بەو لێدوانەی روشدی بەگ کە لە **٢٩** کانونی دووەمی **١٩٢٦** لەمیانەی چاوپێکەوتنی بە لیندسی دانوستانکاری بەریتانی گوتبووی بەستووە، کاتێ گوتی: "پرسی یەکەم بۆ تورکیا، ئاسایشە، ئەویش بە هەڵوێستی کوردەوە کاریگەر دەبێت..."[2]. لێرەوە روشدی بەگ بیرۆکەیەکی نوێی داهێنا، کە نە لەگەڵ بەریتانییەکان باسی کردبوو نە چاوەڕێشیان دەکرد، ئەویش بەستنی پەیمانی "زامنکردنی هاوبەشی سنوور" بوو، کە جگە لە تورکیا و عێراق کە لە شوێنی بەریتانیایە، ئێرانیش بگرێتەخۆ[3]، بەوپێیەی کە لەو وڵاتانەیە کە کوردستانی بەسەر دابەشکراوە. پێ دەچێت ئەو بیرۆکەیە لەو قۆناغە رۆناکی نەدیبێ، بەڵام لەلایەن بەریتانیاوە دەنگدانەوە و وەڵامی هەبوو[4]، پێدەچوو ئەم جۆرە پرۆژەیە پێشوەختە بێت، چونکە رەوشی ناوخۆیی تورکیا و عێراق و ئێران هێشتا ئارام نەبوو[5].

---

1- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 29-1-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.561,PP.806-07.

2- Lindsay to Chamberlain, Constantinople, 29-1-1926, BDFP, IA.Sir, Vol.I, No.561, P.806.

3- Ibid,P.807.

4- Oliphant to Lindsay Foreign office, 1-2-1926,BDFP.IA.Sir,Vol,I, No. 566,P.810.

**٥-** تەنها بە بەردەستبوونی رەوشەکە و ئارامی رژێمەکان، بیرۆکەکە جێبەجێکرا، واژۆکەران (ئێران ـ عێراق ـ تورکیا) لەسەر میساقی سەعد ئاباد لە کۆشکی شا سەیفی لە تاران (٨ی تەمووزی **١٩٣٧**) تەنها گرنگیان بە رووبەڕووبوونەوەی کورد دەدا، هەروەها ئەمە حاڵی پەیمانی بەغدا **١٩٥٥** و پەیمانەکانی دیکەش بوو. سەیری:

- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ٣٩



نیگەرانی تورکەکان و موناوەرەکانی بەریتانییەکان لەبارەی کێشەی موسڵ لەسەر بەندەکانی پەیمانەکە گریدراوەکەی نێوانیان لە **٥**ی حوزێرانی **١٩٢٦** رەنگیدایەوە، لە کۆی **١٨**مادده، **١٦** ماددەی بە پرسی سنوور و کوردەوە پەیوەست بوون. ماددەی **٦** تا **١٣** و ماددەی **١٥** و **١٦** باسی لە پەیمان بەستن بۆ رادەستکردنەوەی تاوانباران و بەهێزکردنی پەیوەندییە دۆستایەتی و هاوسیەتیەکانی کردبوو[1]، ئەمەش بەکردەوە واتا زاڵبوونی تەواو بەسەر سنووری کورددا[2]، بەڵام ترسناکترین مادده کە بە کوردەوە پەیوەست بوو ماددەی **١٠** بوو کە مافی بە هەردوو لاکە دا بۆ راوەدوونانی "هێرشەکانی هۆزەکان" تا ماوەی **٧٥** کم بێنە ناو سنووری یەکترەوە[3]. ئەو ناوچانەی کە ئەو ماددەیەی پەیمانەکە دەیانگرێتەوە، بە سنووری جیاکەرەوەی نێوان تورکیا و عێراق پێناسەکرا، هەروەها هەردوو لای سنوور بە درێژایی **٧٥** کم بۆناو سنوور[4].

---

- صبحي ناظم توفيق، حلف شمال الأطلسي وحلف بغداد، في وثائق المثليات العراقية في استانبول وأنقرة ١٩٣٠-١٩٥٣، بغداد، ٢٠٠٢، ل ٢٤٠ وما بعدها.

١- روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ٧.

- سەیری پاشکۆی ژمارە (١٣)بکە.

٢- روبەرت ئولسن، سەرچاوەی پێشووی، ل ٢٣٤.

٣- المعاهدة العراقية ـ البريطانية ـ التركية ...، ل ٥.

- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P.527

٤- مديرية الأمن العامة —مركز التطوير الأمني، الجمهورية التركية الجارة الشمالية، (محدود التوزيع)، د.م، د.ت، ل ١٤٥.

لە راستیدا کورد تا ئێستاش بەدەست ئەم مادەیەوە دەناڵێنێ، هەردوولاکە لە میساقی سەعد ئاباد و پەیمانی بەغدا ـ تورکیای ساڵی **١٩٤٦** لە مادەکانی **٢** و **٥** و لە پەیمانی بەغدا جەختیان لەم بابەتە کردۆتەوە، بەڵام دەسەڵات گرتنە دەستی بەعسیەکان لە عێراق لە ساڵی **١٩٦٨** ئاماژەی پەرەسەندیکی گەورە بوو لە بارەی هاوکاری دژ بە کورد لە هەردوو وڵاتەکە، سەدام حوسێن جێگری سەرۆك کۆماری ئەوسای عێراق لە **١٩٧١** سەردانی تورکیای کرد، دوای ئەویش ئەحمەد حەسەن بەکر لە ساڵی **١٩٧٣** سەردانی تورکیای کرد.دوای ئەوەش بە ساڵێك دووبارە سەدام حوسین بە سیفەتی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش سەردانی تورکیای کردەوە، لەگەڵ بولند ئەجەڤیدی سەرۆك وەزیرانی تورکی کۆبووەوە، دەرەنجامی ئەو چاوپیکەوتنانە بە لوتکەی هاوکاری ئەمنی لە بارەی سنوورەوە دادەنرێت، رێککەوتن لەسەر ئەوەی کە

بەریتانیا بۆ ئەوەی زامنی سەرکەوتنی پەیمانەکە بکات لە جیبەجیکردنی بەندەکانی ڕێککەوتنە، دەستپێشخەر بوو، بەتایبەت ئەو بەندانەی بە کوردەوە پەیوەست بوون. لە ڕاگواستنی کورد و مەسیحییەکان لە ساڵی ١٩٢٦ و دواتریش، بێ دەنگ نەبوو[1]، هەرچەندە کوردی کوردستانی باشوور(ویلایەتی موسڵ) لە هێمنیەکی ڕێژەیی و کاتێ دەژیان، بە پیوانە بە کوردی باکووری کوردستان کە "ڕووبەڕووی ڕاپەڕینی و تیرۆر هاتبوو"[2]، بەڵام سەرباری کیشانی سنوور و بەستنی پەیمان لە نێوان هەردوولای کێشەدارەکە، هاتوچۆی نێوان هەردوو پارچەکەی کوردستان باکوور و باشوور هێشتا مابوو، ئەمەش گرنگی سیاسی و مرۆیی و جوگرافی ئەو سنوورە کە تازە کیشرابوو و کوردستانی کردبوو بە دوو کەرتەوە لای کورد ڕەتدەکردەوە، ئەو هاموشۆیەش ئەگەر مانایەکی هەبێت، ئەویش ئەوەیە کە ئاماژەیە بۆ یەکێتی خەبات و هەستی نەتەوەیی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان.

تورکیا بۆ دروێنەکردنی بەری پەیمانەکە ئەوەندە چاوەڕێی نەکرد، بەریتانیاش بۆ بەدیهێنانی بەڵێنەکانی لەماوەی دانووستاندنەکان و لەماوەی مۆرکردنی پەیمانەکە ئەوەندە دوانەکەوت، ئەمەش بەڕوونی لە هەڵسوکەوتی بەریتانییەکان لەگەڵ شێخ عەلی ڕەزای کوردی شێخ سەعیدی پیران بەجوانی دەرکەوت، کاتێ لەگەڵ ئەندامانی دیکەی چالاك لە بواری بزووتنەوەی کوردی و پەنابەرانی کوردی باکووری کوردستان، پەنایان بۆ عێراق بردبوو،

هاوکاری لە نێوان پاریزگارەکانی دیاربەکر و وان و ماردین و ئورفە وهەکاری لەگەڵ پاریزگارەکانی دهۆك و نەینەوا و هەولێردا هەبیت، ....، لە ساڵی ١٩٨٤ هەردوو وڵاتەکە ریکەوتنیکی ئەمنی نوێیان بەست، کە رێگە بە هەردوو لاکە درا راوەدووی " کوردە یاخیبووەکان" بۆ ماوەی ٢٥ کم بۆ ناو خاکی هەریەکەیان بنرێت، تورکیا رێککەوتنێکی هاوشێوەی لەگەڵ سوریا بۆ " زامنکردنی ئاسایشی سنووریان" بەست. سەیری:

- المصدر نفسه، ل ل ١٤٥-١٥٩.
- فیلیب روبنس، سەرچاوەی پێشو، ل ٧٧.
- طلعت مسلم، مشروع النظام الشرق أوسطي وموقف العرب والأتراك منه وموقعهم فيه، في: العلاقات العربية –التركية حوار مستقبلي، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٥، ل ل ٤١٠-٤١١.

1- S.H. Longrigg, Op.Cit.,P.157-.

2- Ibid,P. 157.



جووڵانەوە و چالاکیان لەلایەنت بەریتانییەکانەوە خرابووە ژێر چاودێرییەوە[1]. لە ١٩ی حوزێرانی ١٩٢٦ دەسەڵاتی بەریتانی زەرفێکی دەستبەسەراگرت، کە زانیاری و پێشنیازی لەبارەی ئەگەر سازکردنی کاریك دژ بە تورکەکان تێدابوو، کەسایەتی کوردی باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەشداری تێدا دەکەن. هەروەها زەرفەکە ئەو نامەی ئالوگۆڕکراوی تێدابوو زانیاری لەبارەی ئەو هۆزە کوردیانەی کە بەشداری هەر کاریك دەکەن لەدژی تورکەکان و لەگەڵ ژمارەی مەزەندەکراوی جەنگاوەرەکانیان[2]، هەروەها لە ١٧ تەمووزی ١٩٢٦ ڕێگە لە دوو نامەی شێخ مەهدی برای شێخ سەعید گیران، کە ئاڕاستەی کەسایەتی کوردی لە ڕەواندز و موسڵ کردبوو[3].

بەردەوامی نامەگۆڕینەوەکانی نێوان کەسایەتی کوردی کوردستانی باکوور لەوانەی کە لە عێراق بوون، لەوانە شێخ مەهدی برای شێخ سەعیدی پیران، وای کرد ترسی بەریتانییەکان زیاد بێت، بەتایبەت کە ئەو نامانە وایکرد بانگەشەی کوردی دژ بە تورکەکان بەتایبەت لە نێوان ئەفسەرانی کورد کە لە سوپای عێراقی کاریان دەکرد و لەوێ مۆڵگەیان هەبوو، زیاتر بێت"[4].

---

١- مذكرة من البعثة البريطانية في طهران، الى ضابط الركن الاول، استخبارات قيادة القوة الجوية ـ بغداد، سري، رقم ١٤٣، ٢٣-٤-١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٦٩.

٢- مذكرة من النجف إلى الموصل إلى امين والآخرى بواسطة امين بك من رواندوز، ١٩-٦-١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ص ص٧٧-٨٠.

٣- مذكرة من ضابط الخدمات الخاصة، الموصل، الى استخبارات الاركان الجوية، قيادة القوة الجوية، بغداد، سري، رقم ٩/ي/٣٣٣، ١٧-٧-١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ل٧٣-٧٤.

٤- مذكرة من سكرتارية فخامة المندوب السامي العراق بغداد، الى قياد القوة الجوية، مستشار وزارة الداخلية، بغداد، رقم.جي١٠و ٧٩١، ٢٢-٧-١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ل٨٩-٩١. ينظر الملحق رقم (١٧).

ئەو جووڵانەوانە هاوکات بوو لەگەڵ جووڵانەوەی هەریەکە لە دکتۆر موراديان، کە ئەرمەنێکی سامسۆنە و دکتۆر ئەحمەد سەبری کە لە کوردستانی باکوور بوو، ئەو دووانە پلانیکیان بەناوی "لیژنەی کوردستانی" پێشکەشی بەرپرسانی بەریتانی لە عێراق کرد، پلانەکە بەرپاکردنی راپەڕینێکی لە دێرسیم و مەلاتیەی لە خۆگرتبوو، ئەو شارەش سەر بە کوردستانی باکوورن، ئەو راپەڕینە بە پاڵپشتی ناراستەخۆی بەریتانیا بە پارە و جبەخانەوە "بۆ ئەوەی کورد بتوانن خۆیان لە ستەمی عوسمانی رزگار بکەن، بەریتانیاش لەبەرامبەر ئەمەدا دەسەڵاتی ئینتیدابی بەسەر کۆردستانەوە دەبێت"[1].

لە راستیدا دەسەڵاتی بەریتانی بە نیگەرانی و وردیەکی زۆرەوە سەیری بابەتەکەی کرد، ئەمەی بە مەترسییەك کە هەڕەشە لە پەیوەندی و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە تورکیا و عێراق دەکات، بینی. بۆیە حکوومەتی عێراقی لە "ترسناکی رێگەدان بە بەردەوامی ئەو چالاکیانە ...." ئاگادار کردەوە و پێویستی "وەرگرتنی هەنگاوی توندی بۆ کپکردنی ئەو چالاکیانە.." بەباشزانی[2]. بەکردەوە دەسەڵاتدارانی عێراقی بە فشاری بەریتانی، هەنگاوی جیدی و بەرچەردانەوەی لەدژی هەر ئاراستەیەك وەرگرت کە وابکات پەشێوی بخاتە پەیوەندییەکانی تورکیا و بەریتانیاوە، لەسەر ئەم بنەمایە شێخ مەهدی برای شێخ سەعید لە زاخۆ دەستگیر کرا و بۆ بەغدا گوازرایەوە، لەسەرداوای خۆی دەسەڵاتی بەریتانی رێگەی پێدا بۆ ئێران بگوازرێتەوە، بەمەرجی ئەمە لە رێگەی خانەقینەوە بکرێت، نەوەك بەرێگەی دیکە کە بەناوچە کوردییەکانی باکووری عێراقدا تێدەپەڕێ"[3].

---

١- مذكرة من المفتش الاداري في لواء الموصل، الى مستشار وزارة الداخلية، بغداد، سري، اس، ٣٤٢٤، ٢٨-٧-١٩٢٦، ل ل، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ٩٨-١٠٠. ينظر الملحق رقم (١٨).

٢- مذكرة من سكرتارية فخامة المندوب السامي في العراق بغداد، الى قيادة القوة الجوية بغداد، مستشار وزارة الداخلي، بغداد، رقم. جي١٠ و ٧٩١، ٢٢-٧-١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ٩١.

٣- مذكرة من دار الاعتماد، بغداد، سري، رقم، بي، او ٢٥٤٧، ٢١-١٠-١٩٢٦، المركز الوطني لحفظ الوثائق، البلاط الملكي، الديوان، ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤-١٩٢٦، ل ١٠٧.



لایەنی دۆڕاوی ئەم بۆندە گەلی کوردە، چونگە پەیمانەکە بۆئەوە مۆرکرا بوو تاکو بۆندی جیاکردنەوەی کوردستانی باشوور لە کوردستانی باکووری پێ تەواو بکرێت"[1]. بەپێی دەرچوونی بڕیاری نێودەوڵەتی، جیاکردنەوەکە "لەرێگەی هێڵێکی سروشتی جوگرافی نێوان دوو دەوڵەت نابێت، هەروەها نە لە نێوان نەتەوە جیاوازەکانیش دەبێت، بەڵکو تەنها کورد، بەلکاندنی بەشێکی بە تورکیا و بەشەکەی دیکە بەعێراق دەکات بە دووبەشەوە"[2].

بەمشێوەیە پەیمانەکە کە بە "راشکاوی و دۆستانە" لە نێوان حکوومەتەکانی بەریتانیا- تورکیا- عێراق بەسترا، گۆڕاوێکی نوێی خستە گۆرەپانی نێودەوڵەتیەوە، حکوومەتی ئێرانیش بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەشداریکردن[3]، ئەویش هاوکاری هەماهەنگی بۆ رووبەڕووبوونەوەی کورد، کە لە نێوان قەوارە نوێیەکان (ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا) دابەشکراون[4]. لەو کاتەی کە ئەو بۆندە بەقازانجە تەواو بوو، هێزەکانی حکوومەتی عێراقی و بەریتانی بەهاوکاری حکوومەتی ئێرانی قۆڵی خۆیان بۆ لەناوبردنی هەر داخوازییەکی کوردی هەڵماڵی بوو، ئەویش بە سەرکوتکردنی بزووتنەوەکەی شێخ مەحموود بە شێوەیەکی توند و دڕندانە[5]. حکوومەتی عێراقی چووە پاڵ دەسەڵاتی بەریتانی لە بەلارێدابردنی رای گشتی کوردی لە رێگەی پیدانی بەڵێنی زیاتر لەبارەی هیوا و خواست و مافەکانی نەتەوەیی کوردی[6].

---

١- غانم الحفو وعبدالفتاح علي يحيى، سەرچاوەی پێشو، ل ١٦.

٢- مريم عزيز فتاح، سەرچاوەی پێشو، ل ٥٠.

٣- هەریەکە لە ئێران و تورکیا لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٦ رێککەوتنی (هاوکاری و دۆستایەتی)یان لە تاران مۆرکرد. لە گرنگترین بەندەکان، ریگەنەدان بوو بەهیچ کۆمەڵە یان ریکخراویك کە لە خاکی هەرلایەکەوە بێت دژ بەلاکەی دیکە کاربکات، ئەمەش بەتایبەت ئاراستەی کورد کرابوو. سەیری:

- محمد كامل عبدالرحمن سياسة ايران الخارجية في عهد رضا شاه ١٩٢١-١٩٤١، مراجعة الدكتور كمال مظهر احمد، بغداد، ١٩٨٨، ل ٩٣.

4- A.J.Toynbee, Op.Cit.,P. 528 “

-روبرت اولسن، سەرچاوەی پێشو، ل ل ٦١- ٧٠.

٥- بۆ وردەکاری زیاتر لە بارەی بزووتنەوە نوێیەکەی شێخ مەحموود و کۆتایی هاتنەکەی لە حوزیرانی ١٩٢٧، سەیری:

- محەمەد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، ١٩٩١.

٦- غانم الحفو وعبدالفتاح علي يحيى، سەرچاوەی پێشو، ل ل١٦-١٧.

بەمشێوەیە بەدیهێنانی بەرژەوەندییە باڵاکانی بەریتانیا وای خواست کە قـەوارە سیاسـییە نوێکان لەسەر حسابی داهاتووی گەلی کورد بەهێز بکـات، بەریتانییـەکان و تورکیـان کاریـان لەسەر ئەوە کرد کە کوردیان وەك "گروپ و هۆزی لیك جیاواز پێشاندا کە ناتوانن خۆیان ببـەن بەریوە و شایەنی سەربەخۆیی نین"، بەریتانیا ئامادە نەبوو سیاسەتی شەریف- حسینی کوڕی عەلی ـ (کـە کـۆکس و خـاتوو بێـل و دوبـس لـە عێـراق نوێنەرایـەتیان دەکـرد) و سـەرجەم سیاسەتەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهۆی کوردەوە بخاتە مەترسییەوە..."[1].

لەوکاتەوە کێشەی کورد بۆتە کێشەیەکی درێژخایەن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت، نـاوە نـاوە دەخرێتە بەر گفتوگۆ و دەمەقاڵێ و هەندێجاریش بەنێودەوڵـەتی دەبێـت، بـەڵام بـەبێ ئـەوەی پاڵنەریکی راستەقینەو نیازێکی راستگۆیانەی بۆ دۆزینـەوەی چارەسـەرێکی دادپەروەرانـە لـە دواوە بێـت. بەمـشێوەیە بـیری سـەربەخۆیی کـوردی بەتـەواوی لـە راوێـژەکانی ئێـستای نائامادەبوو،چونکە ئەوسا بیرۆکەکە بـە نـاواقعی دەچـوو، هـیچ یـەکێك لـەو وڵاتانـەی کـە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە (تورکیا ـ ئێران ـ عێراق ـ سوریا و یەکێتی سۆڤێت) بە حـاك و گەلەوە، ئارەزووی ئەوەیان نەدەکرد قەوارەیەکی کوردی بێتە کایەوە[2].

1- Quoted in: R.Olson, Op.Cit., P.150.

٢- برهان الدين ابو بكر ياسين، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٣.

-رۆبیرت ئۆلسن، ئەو دەرکەوتنە نوێیەی بزووتنەوەی نیشتیمانی کوردی لـە کوردسـتانی عێـراق، لەسـەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، کە خۆی لە دامەزراندنی قەوارەی فیدرالی کوردی بینیەوە، کە خاوەن ئۆتۆنۆمیە، هەروەها ئەو پەرەسەندنە سیاسەیانەی کە ئەو بەشەی کوردستان بەخۆیەوە بینی، پاڵی بە تورکیا و ئێرانەوە نـا زنجیرەیەك پرۆتۆکۆلی ئەمنی مۆر بکەن، بۆ ئەوەی رێگەی هەر هەولێك لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوەردی بگرن لەو بەشەی کوردستان. هەروەها ئەوەشی زیاد کرد کە لەوەتەی ساڵی ١٩٩٣ ەوە تورك و ئێرانیەکان (سەرباری سوریا و عێراق) نایانەویت لەدایکبوونی دەوڵەتێکی کورد ببینن...نایانەویت ناوچـەکە ئـارام بێـت و دەسـتی ئەوانی نەگاتێ...سەرباری ئەو لێدوانە گرنگانەی نێوان ئەنقەرە و دیمەشق لە بارەی پرسی کورد و پرسـی ئـاو، دەبینین کە بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستانی عێراق رووناکی نەبینی، دەچنە پاڵ تاران.. "هـەروەها دەڵیت: " بەهاتنی مـانگی ئـەیلولی ١٩٩٤، دە کۆبوونـەوە لـە نێـوان گـەورە بەرپرسـانی تورکیـا و ئێـران سازکرا...کە جەختی لەسەر ئەو ریگا و هەوڵانە دەکردەوە کە وا لە هەردوو وڵاتەکە بکات بەسەر ئەو گروپانـە زاڵ بن کە بەهەرەشە بۆسەر رژێمی خۆیان دەیبینن.لەمیانەی ئەو سەردانەی کە دیمیریـل سـەرۆکی تورکیـا بـۆ



تارانی کردی لە ١٥/١٧/ ١٩٩٤ و کۆبوونەوەیی بە رەفسەنجارنی سەرۆکی ئێران، پرسی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ هەردوولاکە بە پرسی کوردەوە پەیوەست بوو. ئەمەش یەکەمین سەردانی سەرۆکی تورکیا بوو بۆ ئێران لەماوەی ١٠ ساڵاندا، بە پلەی یەکەم تاوتوێی هەرەشەی کوردیان کرد... سەیری نووسینەکەی خۆی بکە:

- **المسالَة ...، ل ل ٦٣-٦٥.**

# کۆتایی

پەیمانی سیڤەر قۆناغێکی جیای لە سیاسەتی بەریتانیای بەرامبەر تورکیا پێکهێنا، کە رەنگدانەوەی پلان و پڕۆژە بەریتانییەکانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەکرد، بەلام سەرکەوتنی مستەفا کەمال لە قۆزتنەوەی تورەیی گەورەی تورکەکان و بەکارهێنا نی ناکۆکی نێوان بەریتانیا و هاوپەیمانان لەلایەك و رووسیا و ولاتانی رۆژئاوا لەلایەکی دیکەوە، تا ئەوپەری ئاست، نەوەك هەر پەیمانی سیڤەری پۆچەلکردەوە، بەلکو بەریتانییەکانی هاوێشتە هەلوێستێکی ناخۆشەوە. بەندەکانی شەڕوەستانی مۆدانیا و رێککەوتن لەسەر بەستنی کۆنگرەی تازە لەسەر بنەمای هاوسەنگی هێزە نوێیەکان، سەرەتای قۆناغێکی تازەی لەسیاسەتی بەریتانیای بەرامبەر رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە گشتی و تورکیا بەتایبەتی تۆمارکرد.

تورکیا لە کۆنگرەی لۆزان دەستکەوتی گەورەی بەدەستهێنا، کە بە سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی و سیاسی گرنگ دانرا، سەرباری ئەوەی کە تواناکانی بەریتانیا لە رووی دیپلۆماسی و سیاسی و سەربازی و ئابووری لەچاو تورکیا زۆر گەورە بوو، بەلام دانوستانکاری تورکی بە شێوەی دوژمن بەرامبەر دوژمن دانوستانی لەگەلْ هاوتا بەریتانییەکەی کرد، بەمەش پەیمانی لۆزان بەشی هەرە گەورەی خواستەکانی تورکەکانی بەدیهێنا، کە لەوەی پێی دەگوترا "میساقی نیشتیمانی" دانی پیانرا، بە داننانی نێودەولەتی تورکەکان سنوورەکان زامنکرد.

کێشەی ویلایەتی موسلْ لە کۆنگرەی لۆزان دەستی پێکرد، بەهۆی بانگەشەی تورکەکان سەبارەت بەوەی کە ویلایەتەکە بەشیکە لە تورکیا و دانیشتووانەکەی کە زۆربەی کوردن ئەم داوایە دەکەن، بۆیە موناوەرە سیاسی و دەستتیوەردانە بەردەوامەکانیان لە ژێر دروشمی "گەڕاندنەوەی زەوی تورکییە دابڕاوەکە" بەرەو پێش دەبرد، بەلام حکوومەتی بەریتانی و رەوشی ئیمپراتۆرەکەی لە رۆژهەلات بەگشتی، وابینی کە ویلایەتەکە پێویستە بە عێراقەوە بلکێنرێت، ئەویش دیپلۆماسەیەت و توانا سەربازییەکانی بە چەکی فڕۆکەوانیش خستیە خزمەت چەسپاندنی ئەو واقعەی کە لە دوای شەڕوەستانی مۆدرۆس هاتبووە کایەوە، بەلام دەستگرتنی توندی تورکیا بە ویلایەتەکە لە راستیدا لە هەر تەنها لە گرنگی جوگرافی و



سیاسی و ئابووری و ئەتنیەوە ...نەهاتوە، هەروەك ئەوەی لە میانەی کۆنگرەی لۆزان بانگەشەی بۆ دەکرد، بەلکو بە پرسی کوردەوە پەیوەست بوو، دەستگرتنی بە "باکووری کوردستانی" بەهۆی پەیمانی لۆزانەوە، گومانی ئەوەی لا دروستبوو، نەوەك لەدەستی بدات، ئەوەش وای لێکرد کە هەولێ دەستبەسەراگرتنی زۆرترین زەوی بەکورد نیشتەجێ بدات، بەرپرسانی تورکی بە راشکاوی لە زۆر بۆنەدا ئەو گومان و ترسەیان دەربڕیووە و هێشتاش دەری دەبڕن. سەبارەت بە بانگەشەی بەریتانیا لەمەڕ مافی عێراق لە ویلایەتەکە، بەهۆی چەندین گرنگییەوە هاتبوو، هەروەك باوە نەوت لە پێشەوەدا دیت، پلان دارێژەر و ئەندازیارانی سیاسەتی بەریتانی لە عێراق، وایان بینی کە کوردی "سوننە" رەگەزێکی چالاکن لە درێژەدان بە هاوسەنگی ئەتنی لە دەولەتی عێراقی، کە زۆرینەی شیعەیە و تازە بەریتانیا دایمەزراندووە و پادشایەکی عەرەبی سوننەی بەسەرەوە داناوە. هەروەها چیاکانی کوردستانیان بە سنووریکی سروشتکی بینی کە تەگەرە دەخاتە بەردەم هەر هێرشێکی دەرەکی بۆ سەر ەعێراق.

بەلام هەموو ئەوانە لەسەر حسابی کێشەی کورد و مافەکانی گەلی کورد تەواو بوو، کە هەموو هیوایەکی بە کۆنگرەی پاریسی ١٩١٩ بەستبوو، لەبارەی ئەگەر پێکهینانی قەوارەیەکی نەتەوەیی کوردی سەربەخۆ بۆیان. شاراوە نییە کە بەریتانیەکان پالْپشتی کوردیان لەبەدیهێنانی داخوازییەکانیان کرد، کاتێ لە پەیمانی سیڤەر بۆ یەکەمجار چەند بەندیکیان بۆ "مافی کورد لە دامەزراندنی دەولەتی کوردی" تەرخانکرد، بەلام گۆڕانکارییە کانی کێشەی تورکی کاریگەرییەکی نێگەتیڤی لەسەر چارەنووسی کێشەی کورد دانا، کاتێ بەریتانیا وای بینی کە پڕۆژەی کوردی لەگەلْ بەرژەوەندییەکانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست نایەتەوە، پشتی لە کورد کرد و لە پەیمانی لۆزان بەندە کوردییەکانی رەشکردەوە، لە ئارەزووی نەکرد لە دانووستاندنەکانی لەگەلْ شاندی تورکی گفتوگۆی بکات. بەمشێوەیە کێشەی کوردی لە پەیمانی لۆزان لە قۆناغی بە نێودەولەتیکردنەوە بۆ قۆناغی فەرامۆشکردن گواستراوە، ئەمەش بە روونی لە دەقەکانی پەیمانەکە رەنگی دایەوە، کە مافی کەمینەکانیشی زامن نەکرد. لەلایەکی دیکەوە پەیمانەکە یارمەتی بەریتانیای دا کە کورد وەك ئامرازی فشار لە کێشەی موسلْ بقۆزێتەوە.

بزووتنەوەی ئەفسەرانی کورد لە بەیت شەباب ١٩٢٤ و راپەڕینی کوردی ١٩٢٥ لەچوارچێوەی ئەو هەولێنەدا هات کە کورد دەیوست رەوشی هەرێمایەتی و نێودەولەتی ئەوسا بۆ خۆی بقۆزیتەوە، بۆ وەلامدانەوەی سیاسەتی نەتەوەپەرستانی کەمالی لەدژیان، هەولێان دا سوود لە دژایەتی نێوان بەریتانیا و تورکیا وەربگرن و چاوەڕێ پالْپشتی بەریتانیایان دەکرد،

بەڵام خوێندنەوەی سەرکردە کوردەکان بۆ هەڵوێستەکە ورد نەبوو، بەریتانیا بەخۆشی گازاندەی لەو بزووتنەوە کوردییە کرد کە شێخ مەحموود بەرزنجی لەدژی بەرپای کرد، بەڵکو دژایەتی هەر ئاڕاستەیەکی کرد کە هەوڵی زیندوکردنەوەی پەیمانی سیڤەر بدات، بەو پێیەی ئەمە هەڕەشەیە بۆ سەر قەوارەی عێراقی تازە پێکهاتوو.

چارەسەری کێشەی موسڵ بە کۆتایی، بە مۆرکردنی پەیمانی حوزێرانی ١٩٢٦، دەستکەوتێکی گەورەی بۆ بەریتانیا و عێراق تێدابوو، هەروەها بۆ تورکەکانیش دەستکەوتی دارایی گرنگی تێدا بوو، کە کوڕێکی بەهێزی بە پڕۆژەی نوێخوازیەکەی مستەفا کەمالی لە ناوەوە دا، بەڵام گرنگییەکەی بۆ دوو دەوڵەتەکە لەوە دێت کە سنووری نێوانیانی دیاریکرد و زامنی تەواوی ئاسایشی ئەو ناوچە سنوورییانەی نێوانیانی کرد، بەمەش دەرگای لەسەر پشت کردەوە بۆ ئەوەی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتی و هەرێمایەتییەکان لاپەرەیەکی تازە بکرێتەوە، پەیوەندییەکانی بەریتانیا- تورکیا دوای پەیمانەکە پەرەسەندنیکی راستەوانەی بەخۆیەوە بینی.

پەیمانەکە بووە بەڵام بەسەر کورد و داهاتووە سیاسی کێشەکەی، زەمینەی دیاردەی هاوکاری هەرێمایەتی ڕێکخراوی نێوان ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە (عێراق، تورکیا، ئێران، سوریا) هێنایە کایەوە. هەرچەندە پەیوەندییەکانی نێوان ئەو وڵاتانە پڕیەتی لە ناکۆکی توند هەریەکە لەگەڵ ئەوەی دیکە، کێشەی کورد بووە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو ئەوانە.

سەرجەم سیاسەتەکانی بەریتانیا بەرامبەر تورکیا، لەماوەی ئەو توێژینەوەیەدا، هیچ قەوارەیەکی سیاسی بۆ کوردی لە نەخشەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەخۆنەگرتبوو، کە خواست و هیواکانی نەتەوەیی کورد بینیتە دی، بەڵکو کوردی کردە قوربانی سیاسەتی رەگەز پەرستی و هەڵمەتی تواندنەوە و پاکتازی رەگەزی، کە لە قۆناغی دوایی مۆرکردنی پەیمانە سێ قۆڵییەکە بەدەرکەوت و تائێستاش لەلایەن ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، بەردەوامە. هیچ وڵاتێك یان هێزێکی نێودەوڵەتی کێشەی کورد و ئازارەکانی کورد بەهۆی ئەو سیاسەتانەوە لەپێناوی یان هەتاکو لەپێناوی مرۆڤایەتیش لەخۆنەگرت، بەڵکو ئەو وڵاتانە کارتی کوردیان هێشتەوە و ماوە ماوە بۆ گفتوگۆ و دەمەقاڵێ و بە نێودەوڵەتیکردنی دەیانخستە روو، بەڵام بەبێ ئەوەی پاڵنەری راستەقینە و نیازی راستگۆیانە بۆ چارەسەری کێشەکە بە دادپەروەرانە لە ئارادابێت. تورکیا هەر لە پێشەوەی ئەو وڵاتانەدا دەمینێتەوە کە بەرگری لە هەر پڕۆژەیەك دەکات کە بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشە کۆنەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بدرێت، تورکیا هێشتا لە قسەکردن بە کوردی و دەستگرتن بە ناسنامەی کورد، مەترسییەکی گەورە دەبینی کە هەڕەشە لە بوون و یەکێتی تورکیا دەدات.



مستەفا کەمال ئەتاتوک لەگەڵ شێخ فەوزی ئەرزنجانی و حەسبی حاکمی سیواس



دیمەنێک لە دەروازەی زانکۆی لۆزان،
ئامادەبووانی کۆنگرەکە خواحافیزی لەیەکتری دەکەن، 1922-1919.





دەستەی نوێنەرایەتی لە کۆنگرەب سیواس سالی 1919.




مستەفا کەمال و دیاب ئاغا
یەکێک لە سەرکردە عەشایەرییەکان دەرسیم.




دەقە رەسەنەکەی پەیمانی لۆزان.






دوو مەدالیا کە پەیمانی لۆزان و سەرکردەی
شاندی تورکی بۆ کۆنگرەی لۆزان بەرز رادەگرن.



مستەفا کەمال و دیاب ئاغا یەکێک نوینەرانی کوردی دەرسیم 1921.




ئەو نەخشەیەی کە لە سیڤەر بریاری لێدراو دواتر جێبەجێنەکرا.





کۆنگرەی ئەرزەرۆم.



مستەفا کەمال لە سەردانێکی بەناو سەرکردە و ئاغا و شێخانی ئایینی کوردی.






کۆنگرەی سیواس.



مستەفا کەمال ئەتاتوک لەگەڵ
شێخ فەوزی ئەرزنجانی و حەسبی حاکمی سیواس.



مستەفا کەمال و منداڵێکی کورد.





مستەفا کەمال لەمیانەی قۆرغکردنی هەستی ئایینی.



مستەفا کەمال لەنیو کوردانی سنە 1921.




پرۆژەی کوردستان لە کۆنگرەی سیڤەر.



سمکۆی ئاغای شکاک.





شەریف پاشا 1937.



شەفیق ئۆزدەمیر.



شێخ مەحموود.



تیمی دانوستانکاری تورکان لە کۆنگرەی لوزان.





تەلاری زانکۆی لۆزان کە زۆربەی گفتوگۆکانی تیدا ئەنجامدرا.



ریورەسمی مۆرکردنی پەیمانی لۆزان 24 تەمووزی 1923.

# ليستى سەرچاوە و ژێدەرەكان

## یەكەم: بەڵگەنامە بڵاونەكراوەكان:

### أ- بەڵگەنامەكانی خانەی كتێب و ئەرشیف:


- ملف الأخبار الخارجية عن الحدود، ش ـ بغداد ٩ كانون الأول ١٩٢٣ ـ ٣٠ كانون الأول ١٩٢٤:

- برقية من متصرف الموصل إلى وزارة الداخلية، العدد ٦٧٥، في ١٨ أيلول ١٩٢٤.
- برقية من متصرف الموصل إلى وزارة الداخلية، العدد ٣٥٩، في ١٩حزيران ١٩٢٤.
- برقية من متصرف الموصل إلى وزارة الداخلية، العدد ٣٦٠ (ملحق)، في ١٩ حزيران ١٩٢٤.
- برقية من متصرف الموصل إلى وزارة الداخلية، بدون عدد، في ١٩ أيلول ١٩٢٤.
- برقية من متصرف لواء الموصل إلى وزارة الداخلية، عدد ٦٩٤، في ٢٠ أيلول ١٩٢٤.
- مذكرة من متصرف لواء الموصل إلى وزير الداخلية، نموذج عام (١٢)، سري، في ١٩٢٤/١٢/٣٠.

- ملف تشكيل دولة كوردیية مستقلة ١٩٢٤- ١٩٢٦(وثائق بريَطانية)(*):

- تقرير استخبارات هيئة أركان الجو ـ مقر القيادة الجوية البريَطانية في العراق، سري للغاية، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤.
- كتاب القيادة الجوية البريَطانية إلى مستشار وزارة الداخلية العراقية، في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤.
- كتاب القيادة الجوية البريَطانية إلى مستشار وزارة الداخلية العراقية ـ بغداد، الوثيقة (٢) تابع، المرفق ٣ آ،في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤.
- كتاب دائرة الخدمات الخاصة، بغداد، إلى مقر القيادة الجوية، بغداد، سري، دى/٦، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤.


---

(*) الملف بحوزة الدكتور عبد الفتاح علي البوتاني.




- مذكرة القيادة الجوية للقوات البريَطانية في العراق، بغداد، إلى مستشار وزارة الدفاع في بغداد، سري للغاية، في ٥ تشرين الثاني ١٩٢٤.
- مذكرة من المركز الجوي للقوات البريَطانية في العراق ـ بغداد، إلى أمين سر وزارة الطيران، كنغواى، لندن، دبليو. سى٢٠، سري جداً، في ٢٦ تشرين الثاني ١٩٢٤.
- مذكرة من دائرة ضابط الخدمات الخاصة ـ بغداد، إلى مقر القيادة الجوية البريَطانية ـ بغداد، سري، دي/٦، في ٨ تشرين الثاني ١٩٢٤.
- مقتطف من كلمة ألقاها رئيس الوزراء في مجلس النواب، ملحق للمرفق ٢٧، جو ٤١١/٢٣ الجزء ١، اكس رام ٤٥٨٣، في ٢١ كانون الثاني ١٩٢٦.
- مذكرة من البعثة البريَطانية في طهران، الى ضابط الركن الأول، استخبارات قيادة القوة الجوية ـ بغداد، سري، رقم ١٤٣،في ٢٣-٤-١٩٢٦.
- مذكرة من المفتش الإداري في لواء الموصل، الى مستشار وزارة الداخلية، بغداد، سري، اس، ٣٤٢٤، ص ص، المركز ،في ٢٨-٧-١٩٢٦.
- مذكرة من النجف إلى الموصل إلى امين والاخر بواسطة امين بك من رواندوز، في ١٩-٦-١٩٢٦.
- مذكرة من جورج ر.كليرك الى اوستن جمبرلَن،ثيرابيا،وزارة الطيران ٢٣\٤١٢،القسم (٢) اكس \ ام ٤٥٨٣، رقم ٣٢١\١٩٢٧-١٠٨-١٨٣،في٢٢-٦-١٩٢٧.
- دار الاعتماد، بغداد، سري، رقم بي، او ٢٥٤٧،في ٢١-١٠-١٩٢٦.


### ب- بەڵگەنامەكانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی:


-Foreign Office:

- F.O. 371\40219\127357, RRX/9/I, P.5.
- F.O.371\10867, PRESS Summary, February 24, 1925, Enclosure 1 in No: 1, P.2 .
- F.O.371\10867\5807, E-1360, P.123.

## دووەم: بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان:

### أ- بەریتانییەکان:

- بەڵگەنامە بەریتانییەکان لەبارەی ئەتاتورك:


- British Documents on Atatürk (1919-1938), Edited by Bilal Şimşir.
- BDA,1919,Vol.I,Türk Tarih Kürümu Basmevi,Ankara, 1973.
- BDA,1920,Vol.2,Türk Tarih Kürumu Basmevi,Ankara, 1975.
- BDA,1921-1922,Vol.4,Türk Tarih Kürumu Basmevi, Ankara, 1984.


- الوثائق البريَطانية عن المسالَة الكوردييە في تركيا(١٩٢٤-١٩٣٨):


-Ingliz Belğelerile Türkey'de Kürt Sorünü(1924-1938), Hazirlayan B.N.Şimşir, Ankara,1991.


- بەڵگەنامەکانی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانی:


-Documents on British Foreign Policy (1919-1939), Edited by W.N.Medlcott, Douglas Dakin, and M.E.Lambert .
- BDFP, 1919-1920, First series, Vol.4, Oxford University Press, London,1959.
- BDFP, 1920, First series, Vol.13, Oxford University Press, London, 1962.
- BDFP,1921-1922,First series, Vol.17, Oxford University Press, London,1970.
- BDFP,1922-1923,First series, Vol.18, Oxford University Press, London,1972.
- BDFP,1925-1926,First series, Vol.I, Oxford University Press, London,1966.




- بەڵگەنامەکانی وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانی:


- Colonial Office, Iraq Report on Iraq Administration, October 1920- March 1922, His Majesty's Stationary Office, London, 1922.
- Colonial Office, Special Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the council of the League of Nations on the progress of Iraq During the period 1920-1931,London,1931.
- Colonial Office, Iraq Report on Iraq Administration, His Majesty's Government, April 1923- December 1924, London, 1925.
- Colonial Office, Report by His Majesty's Government on the Administration of Iraq for the period April 1922 - March 1923, issued, London, 1924.
- Colonial Office, Lausanne Conference on Near Eastern Affairs 1922-1923,His Majesty's Stationary Office, London, 1923.


### ب-تورکییەکان:

#### ١-ئەوانەی بە پیتی لاتینی چاپکراون:

- بەڵگەنامە عوسمانییەکان لەبارەی موسڵ و کەرکوك (١٥٢٥-١٩١٩):


- Musul- Kerkuk ile iligili Arşiv Belgeleri 1525-1919, T.C. Başbakanlik Devlet Arşivleri genel mudur Lugu Osmanli Arşivi daire Başbanligi, Ankara, 1993.


- بەڵگە نامە عوسمانییەکان لەبارەی ئەرمەن (١٩١٥-١٩٢٠):


- Osmanlli Belgererinda Ermeniler 1915-120, T.C. Başbakanlik Devlet Arşivleri genel mudur Lugu Osmanli Arsivi daire Başbanligi,, Ankara, 1994.

